مانیفستۆی شارستانێتی دیموکراتی

# مۆدێرنیتەی دیموکراتی و کێشەکانی تێپەڕاندنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری

١

## شارستانی


عەبدوڵڵا ئۆجالان

و: لوقمان عەبدوڵڵا






# مانیفستۆی شارستانێتی دیموکراتی

مۆدێرنیتەی دیموکراتی و
کێشەکانی تێپەڕاندنی مۆدێرنیتەی
سەرمایەداری

پەرتووکی یەکەم

# شارستانی

## ـ سەردەمی خوداوەندە دەمامکدارو پادشا داپۆشراوەکان ـ

ن: عەبدوللا ئۆج ئالان
و: لوقمان عەبدوللا

## ناوەڕۆک

## گووتەی وەرگێڕ

ئەم پەرتووکەی لەبەردەستتاندایە "**مانیفستۆی شارستانیتی دیموکراتی**" دوا بەرگرینامەی ڕێبەر عەبدوڵڵا ئۆج ئالانە کەبۆ دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا ئامادەی دەکات. بەرگرینامەکە لە پێنج پەرتووک پێکهاتووە، تا ئێستا سێ پەرتووکی نووسیوە و بەردەستمان کەوتووە. وەک بەڕێزی لەمیانەی دیدارەکانی لەگەڵ پارێزەرەکانی ئاماژەی پێکردووە، لە داهاتوویەکی نزیکدا هەوڵی نووسینی دوو بەرگەکەی دیکەش دەدات. بەڕێزی گرنگیەکی زۆر

بەم بەرگرینامە دەدات، تەنانەت بەدوا بەرگرینامە و شەرەفی خۆی دادەنێت. شایانی باسە کە ئەم بەرگرینامەیە لەهەلومەرجێکی نائاسایی لەزیندانی تاکەکەسی ئیمرالی لەژێر فشار و ئەشکەنجەیەکی هەمەلایەنەی سیستەماتیک نووسراوە، بەڕێزیشی ئاماژەی بەم لایەنە کردووە.

ئەو سێ پەرتووکەی کەوتۆتە بەر دەستمان، منیش لەلای خۆمەوە، بە یارمەتی چەند هەڤاڵێکی هێژا، دەستمان بە کوردانی کرد بۆ سەر زاراوەی سۆرانی. پەرتووکی یەکەم و دووەمیمان تەواو کرد، لە داهاتوویەکی نزیکدا هەوڵی تەواوکردنی بەرگی سێیەمی دەدەین.

لە ڕاستیدا بە نیاز بووم پێشەکییەک بنووسم، بەڵام بەڕێز عەبدوڵڵا ئۆج ئالان پێشەکی و دەروازەی تایبەتی بۆ هەر پەرتووکێک نووسیوە، بۆیە من نووسینی شتێکی لەم جۆرەم پێویست و گونجاو نەدیت.

دەبێ ئەوە بڵێم وەرگێڕانی شاکارێکی بەهادار و بەنرخی بەم جۆرە، لەڕاستیدا چەندە پێویستی بە خەباتێکی بێ ووچان و ماندوو نەناسانە هەیە، لەوەش زیاتر جۆش و خرۆشێکی تایبەت بە مرۆڤ دەبەخشێت، مرۆڤ ئاسوودە دەکات، زەلالبوونێکی رۆحی و هزری بە مرۆڤ دەبەخشێت. ئاسۆی مرۆڤ فراوان دەکات و فێری بوێری هزراندنێکی ئازاد و پالاوتەی دەکات.

بۆ من جێگای سەرفرازییە کە ماف و ئەرکی وەرگێڕانی ئەم شاکارە بوو بە بەشم.چونکە شاکارێکە پرسە مێژوویی، فەلسەفی، زانستی، حقوقی، سیاسی و ئەخلاقیەکانی جیهانی ئەمڕۆمان تاوتوێ دەکات، شرۆڤەیان دەکات، هۆکارەکانیان دەستنیشان دەکات و ڕێگەکانی چارەسەریش دەخاتەڕوو. بەکورتی دەتوانم بڵێم ئاراستە و ئایندەی مرۆڤایەتیش دیار دەکات.

گومانی تێدا نییە سەرباری هەستیاری و خەریکبوونی زۆر بەلام دیسان ئەم وەرگێڕانە بێ کەم و کورتی نییە، لەگەڵ ئەوەی

داواکارم بەگەورەیی خۆتان لە کەم وکورتیەکان بمان بوورن، هیوادارم لە ڕێگای ناردنی تێبینیەکانتانەوە ئاگادارمان بکەنەوە تا لە چاپی داهاتوو ڕەچاویان بکەین.

لەو بڕوایەدام لە میانەی ئەم هەوڵە بچووکەی داومانە خزمەتێکمان بە پەرتووکخانەی کوردی و هۆگرانی بزاڤی ئاپۆچێتی کردووە.

لە کۆتایی سوپاسی خۆم پێشکەشی هەر کەسێک دەکەم کە بەجۆرێک لە جۆرەکان یارمەتیداوم و لە ئامادەکردن و پێشکەشکردنی ئەم شاکارە بە خوێنەران ڕەنجی هەبووە.

**١ی حوزەیرانی ٢٠٠٩**

## پێشەکی

کاتێک منیان هێنایە دوورگەی ئیمرالی، یەکەمین کەس کە پێشوازی لێکردم نوێنەری سەرۆکایەتی کۆمیتەی رێگرتن لە ئەشکەنجەی سەر بە کۆنسەی ئەوروپا بوو. هەر لە سەرەتادا پێی گووتم: "**تۆ لەم زیندانە دەمێنی، ئێمەش لە رێگای کۆنسەی ئەوروپاوە چاودێری دەکەین و هەوڵی پێشخستنی هەندێک چارەسەری دەدەین**". لەسەر بنەمای خیانەتێک بەرامبەر بە دۆستایەتی کە هاوتاکەی ئێجگار دەگمەنە دەوڵەت ـ نەتەوەی یونان، کاتێک پەیوەندییەکانی لەگەڵ کۆماری تورکیا تەوەرەی بەرژەوەندیپەرستی هاتەسەر، منی

رادەستی کۆنترۆلی ئەمریکا ـ CIA[1]ـ کرد. لە سەردەمی "**پادشا رووت و خوداوەندە بێ دەمامکەکان**"دا بە شێوەیەک کە ئەفسانەی پرۆمیتۆس[2] لەچاویدا بە سەد ئاو شۆردراوەتەوە، لە گاشە بەردەکانی ئیمرالی بەندکرام و دووچاری حوکمی قەدەرگەرایی کرام.

هاوکێشەکەی سوریا زۆر لەمە سەرسوورهێنەرترە: لە ناوەڕۆکدا ئەو چەمکەی منی لە سوریا دەرخست دەگەڕێتەوە بۆ بەیەکدا کێشانی بایەخ دانانی من بۆ دۆستایەتی و سیاسەتی ناکۆکی ئیسرائیل سەبارەت بە کوردان. ئیسرائیل کە بە تایبەتی لە دوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە خۆی کردۆتە سەرداری کێشەی کورد، بەرامبەر بە بەردەوام کاریگەرتربوونی دووەمین شێوازی چارەسەری کێشەی کورد کە لە کەسایەتی مندا سەریهەڵدا بوو، هێندە هەستیار بوو بەرگەی نەدەگرت. مسۆگەر لەگەڵ حیساب و لێکدانەوەکانیاندا نەدەگونجاین. نابێت نکۆلی لە هەوڵەکانیان بکەم؛ مۆساد ناڕاستەوخۆ بۆ چارەسەری بە ڕێگای خۆی بانگێشتی کردم. بەڵام لایەنی ئەخلاقی و سیاسییم بۆ ئەمە کراوە نەبوو و ئامادە نەبووم. بەڕێوەبەرایەتی عەرەبی سوریا هەرگیز خوازیار نەبوو ئەو شێوە پەیوەندییە تێپەڕ بکات کە زۆرتر تاکتیکی بوو. هەر وەکو دەزانرێت سەرکردایەتی "**حافز ئەسەد**" لە سایەی

---

١ـ یەکێک لە گرنگترین دەزگاکانی هەواڵگری و ڕووبەڕووبونەوەی کاری سیخوڕییە، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ گرێدراوی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکایە. دوای دووەمین جەنگی جیهانی لەساڵی ١٩٤٧ بە فەرمانی سەرۆکی ئەمریکی ئەوکاتە هاری ترومان دامەزراوە.

٢ـ یەکێکە لە ئەفسانەکانی یۆنان. پرۆمیتۆس کوڕی ئاپێتۆس و کلیمێنایە ئەوەی تیتانەکانە کە بەردەوام دژبەری سیستەمی خوداوەندەکانی ئۆلۆمپیۆس بوون. ئەمیش وەک برا و باو و باپیرەکانی بەرەنگاری هەمان سیستەم بۆتەوە و لە دژیان شەڕی کردووە، بەڵام بە شێوەیەکی زۆر زیرەک و فێڵبازانە. ئەوەی لە براکانیی جیادەکاتەوە ئەوەیە کە دواجار هەستاوە بە دروست کردنی مرۆڤ لە قوڕێک کە بە فرمێسکی خۆی گرتویەتیەوە و بۆ ئەوەی لاواز نەبێت لە هیفاهیستۆسی خودای ئاگر، ترووسکەی ئاگر (خولقکاری، زانست، شارستانی)ی دزیوە و داویەتی بە مرۆڤ. بەمەش سیستەمی خوداوەندی گۆڕیوە. لەسەر ئەمە زیۆسی خوداوەند سزای دەدات بەوەی کە لە چیای قەفقاسدا بە زنجیر دەیبەستنەوە و هەموو ڕۆژێک لە لایەن داڵێکەوە کە خوداوەندەکان ئەرکداریان کردووە جگەری دەخورێت کە هەموو شەوێک خۆی دروست دەکاتەوە. هێرۆکلیسی نیوە خوداوەندی کوڕی زیۆس، پرۆمیتۆس لەم [illegible] ڕزگار دەکات، بەڵام پرۆمیتۆس دەڵێت: "تا زیۆس لەسەر تەخت بێت هەرگیز ئەشکەنجەی من ناوەستێت [illegible]" [illegible] ڕێگای ئازادی پێشانی مرۆڤ دەدات.

پێکدادانی هەیمەنەی ئەمریکا ـ یەکێتی سۆڤییەت لەسەر پێیان بوو. لە قۆناخی مەترسیداری دوای هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤییەتدا، ئامادە نەبوو هیچ پەیوەندییەکی تاکتیکی بپارێزێت. لە واتایەکدا هاوسەنگ کردنی تورکیا بە من (پێکهاتەی PKK) گەڕان بوو بە دوای وەڵامێک بۆ هەڕەشەکانی ساڵی ١٩٥٨ ی کۆماری تورکیا لەسەر سوریا و پشتگیری کردنی بەهێزی بۆ ئیسرائیل. لەبەرئەوەی (PKK) ئامرازێکی گونجاو بوو، دەرفەتی بە پەیوەندییەکی تاکتیکی درێژخایەن دا. نەیان دەویست ئەوە ببینن کە ئەم پەیوەندییە دەبێتە ڕێگا خۆشکەر بۆ دووەمین جۆری سیاسەتی کورد. لەم واتایەدا گشت هەوڵەکانی بەڕێوەبەرایەتی تورک بێ کاریگەربوو.

تەنانەت ئەم باسە کورتەش پیشانی دەدات کە ئەو هێزە سەرەکییەی منی لە سوریا دەرخست ئیسرائیل بوو. بێگومان فشارە سیاسییەکانی ئەمریکا و سەربازییەکانی تورکیاش لەمەدا ڕۆڵیان هەبووە. نابێت لەبیری بکەین کە لە ساڵانی ١٩٥٠ کانەوە ئیسرائیل ڕێکەوتنی نهێنی و پشت پەردەی لەگەڵ تورکیا هەبوو، دواتر لە ساڵی ١٩٩٦ دا لە میانەی ڕێکەوتنێکی دیکە لەژێر ناوی "**دژە تیرۆر**"دا لەسەری زیاد کرا و بەمەش پەیمانی دژە (PKK)یی ئەمریکا ـ ئیسرائیل ـ تورکیا تەواو کرا.

فاکتەرێکی دیکەی گرنگ کە پێویستە لەم قۆناخە زیادبکرێت: لەسەر بنەمای (دژە ـ PKK = ئانتی PKK) هاوکاری نێوان کۆماری تورکیا و ئەو بەڕێوەبەرایەتییە پەرلەمانییە فیدراڵییەی کوردانە کە لە ساڵی ١٩٩٢ ەوە لە ڕێگای پەیوەندی نێوان بەڕێوەبەرایەتی (YNK ـ PDK) بە ئەمریکا و ئیسرائیلەوە دامەزرێنراوە. بێگومان حکومەتەکانی کۆماری تورکیا و هێزە چەکدارەکانی بە گوێرەی هەلومەرجی ئەو ڕۆژانە لە میانەی چەمکێکی تاکتیکییەوە ڕەفتاریان دەکرد، بەڵام مێژوو ڕێڕەوێکی تایبەت بەخۆی هەبوو. تێگەیشتنی هەمەلایەنە پێشکەوتنی گرنگ دەستنیشان دەکات. ئەو بەهەڵەداچوونە مێژووییەی کە ڕۆژگاری ئەمڕۆمان تورکیا تووڕە

و دڕدۆنگ دەكات، سەرچاوەی خۆی لە تێگەیشتنێكی تەسک، خۆپەرست و یەكلایەنە وەردەگرێت.
كاتێک لە ساڵی ١٩٩٨ دا ئەم فاكتەرانە دژی ئێمە بوون بەیەک، لە سوریا دەرچووم. بە ئاشكرا دەتوانم بڵێم، كە خۆشم بە تەواوی ئاگاداری پێویستی بەجێهێشتنی سوریا بووم. قۆناخێكی درێژخایەنی چاوەڕوانیم بەسەربرد. سەرنج ڕاكێشی ئەو ڕێبازە سیاسییەی سەبارەت بە كوردستان پێشم خستبوو، هەروەها هەڵوێستی دۆستایەتی كە خوازیاربووم بیگەیەنم بە ئاستی ستراتیژی منیان بەند كردبوو. پێویستە دان بەوەدا بنێم، كە بەڕێوەبەرایەتی سوریا لە بەرزترین ئاستدا بە بایەخەوە ئاماژەی بەمەترسی ئەمە كردبوو. بەڵام هێشتا لایەنگری پاراستن و گرنگی پێدانی دۆستایەتی ستراتیژی نێوان گەلانم. هەر هەمان چەمک بەرەو یۆنان ڕاكێشی كردم. ئەگەر لەگەڵ دەوڵەتی یۆنانیش نەبێت، پێشخستنی پەیوەندی دۆستایەتی بەهادار لەگەڵ گەلی یۆنان بە پلەی دووەم سەرنجی ڕادەكێشام. تا بڵێی ئاڵوگۆڕ لەگەڵ كلتووری كلاسیک و مێژووی تراژیدیا گرنگ بوو؛ بەجێگەیاندنی پێویستی دۆستایەتی چۆنێتیەكی سەپێنراوی پەیدا كردبوو.
ڕێگایەكی دیكە چوونم بوو بۆ شاخەكانی كوردستان. هێشتا منداڵ بووم ناوەكەی دیكەم **"شەیدای چیا و چۆڵ"** بوو. بەڵام لێكدانەوەم بۆ دوو فاكتەر، ئەم بژارەی لە پیلانی دووەمدا هێشتەوە. یەكەم لە چیادا ئەو شوێنەی منی لێبم مسۆگەر هەموو جۆرە چەک و بۆردومانێكی لەسەر بەكاردەهێنرێت و وێرانكارییەكی لەسەر گەل و هەڤاڵان، سنوورداربوونێكی لە پەیوەندییەكاندا لێدەكەوتەوە كە، تەنیا قاڵبوونەوە لە لایەنی سەربازی و لە ڕێ دەرچوونێكی وەک سنووردار‌بوون بە لایەنی سەربازییەوە دەكردە ناچارییەک. دووەم فاكتەری گرنگ، بێ پەروەردەیی لە ڕادبەدەری لاوان بوو، پێویستی پەروەردەكردنیان ڕێگای پێنەدەدام.
بە كورتی: بانگەشەكانی **"فشارمان بۆهێنا، سەیركەن چۆن

**ئەنجامـمان بەدەست خست"** کە لە لایەن زۆرێک لە ناوەندە فەرمی و نافەرمییەکانی تورکیاوە دەگوترا، دووربوون لەوەی راستی پیشان بدەن. ئەوەتا هەمان سیاسەتی فشار بۆهێنان تا ئێستا بە چڕی لەسەر ئێران و ئێراق تاقی دەکرێتەوە، لە جیاتی ئەنجام گرتن رێگای لە پێش کەللە رەقییەکی کوێرانە کردۆتەوە. لە ئێستاوە ناتوانرێت بخەملێنرێت کە ئەو پەیوەندییە تاکتیکییانەی لەگەڵ ئێران و سوریادا پێشدەخرێت، رێ لە پێش کامە ئەنجام دەکاتەوە. دەتوانرێت بگوترێت بە سیاسەتێک گەیشتووە کە لەوانەیە زۆر شتی لێبکەوێتەوە. کاتێک دووالیزمی ئەمریکا ـ یەکێتی ئەوروپا[١]ـ ئیسرائیل یان ئێران ـ روسیا ـ چین دژوار بوو، ئایا حکومەتەکانی کۆماری تورکیا ئامادەی هەموو جۆرە ئەنجامێکن؟

ئەو وانانەی لە ماجەرا سێ مانگییەکەی ئەسینا ـ مۆسکۆ ـ رۆما وەرم گرت، بەهایەکی مێژووییان هەیە. سەرباری هەزاران دەمامک و قەڵغان کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری خۆی پێداپۆشیوە، توانام بۆ لێکدانەوە و پێناسەکردنی وەک زاراوەیەکی سەرەکی لەم بەرگرینامەیەدا، راستەوخۆ بۆ ئەم ماجەرایەم دەگەڕێتەوە. ئەمە نەبووایە، نەک هەر نەمدەتوانی ئەم شیکردنەوانە بکەم، بەڵکو یان وەکو میللیگەرایەکی کلاسیکی سەرەتایی لە نێو دەوڵەتی نەتەوەییدا گیرم دەخوارد، یاخود وەکو سەدان نموونەی دیکە، تەنانەت بەوانەشەوە کە دەوڵەتیان ئاوا کردبوو، وەک بزووتنەوەیەکی چەپی کلاسیک کۆتاییم بە چارەنووسی خۆم دەهێنا. هەڵبەتە وەکو پرەنسیپێکی زانیاری کۆمەڵایەتی هەمیشە رەهایانە قسەنەکردن رەچاو دەکەم، بەڵام زۆر بەهێز هەست بەوە دەکەم کە ئەم هێزەی چارەسەرییەی ئێستام نەدەبوو.

بۆ من ئاشکرایە کە: **مۆدێرنیتەی سەرمایەداری هێزی بنەڕەتی خۆی لە پارە و چەکەکانی وەرناگرێت، هێزی راستەقینەی خۆی**

---

١ـ کۆمەڵەیەکی تایبەت بە دەوڵەتە ئەوروپییەکانە، ٢٧دەوڵەت تێیدا ئەندامە. لەساڵی ١٩٩٢ لەسەربنەمای رێککەوتننامەی ماستریخت دامەزراوە. خاوەن بازار و دراوێکی هاوبەشە (یۆرۆ). یەکێتی ئەوروپا سێ دەزگای ئیداری بەبنەما دەگرێت ئەوانیش: ئەنجومەنی یەکێتی ئەوروپا؛ کۆمیسیاری ئەوروپی و پەرلەمانی ئەوروپین.

**لەولیبرالیزمە وەردەگریت، کە لە سیحربازیک زۆر ئەفسوناوی تر، سەرجەم یۆتۆپیاکان، بە یۆتۆپیای سۆسیالیستیشەوە کە دوایین و بەهێزترینیانە هەموویان بۆ رەنگی جیاواز دەگۆرێت و لەناو خۆیدا دەیان خنکێنێت.** تا راستینەی خنکاندنی گشت یۆتۆپیاکانی مرۆڤایەتی لەناو لیبرالیزمەکەیدا شیکار نەکرێت، نەک هەر تێکۆشان بەرامبەر سەرمایەداری ناکرێت، بەڵکو دەگمەنترین قوتابخانەی هزری کە خۆی بە کەس ناگۆڕێتەوە، ناتوانێت خۆی لە ڕەوشی بوون بە خزمەتکاری سەرمایەداری رزگار بکات. هیچ کەسێک هێندەی مارکس[1] شیکاری سەرمایەی نەکردووە، کەم کەسیش هێندەی لینین دەرهەق بە دەوڵەت و شۆڕش قووڵ بوونەتەوە، بەڵام ئەمڕۆ ئاشکرا بووە هەرچەندە خۆیان وەکو رکابەر پیشان دابێت، بەڵام نەریتی مارکسیست ـ لینینیست لە ئاستێکی هێندە بەرزدا ماتریال و واتایان پێشکەش بە سەرمایەداری کردووە کە بچووک ناکرێتەوە. چونکە وەک رەوشێک کە زۆر جار رووبەڕووی دەبینەوە هەندێک ئەنجامی لە سەرووی چاوەڕوانییە ئیرادە (کە گردبوونەوەی تێگەیشتنە جیاوازەکانی مێژووە) بیەکانمانەوە لێکەوتەوە. ئەمە وەکو چارەنووس و پەیوەندییەکی دیالیکتیکی کە هەر دەبێت ببێت ناخەمە ڕوو، بە پێچەوانەوە ئەنجامی ئەوەی لێبەدەست دێنم کە پێویستە زیاتر هەڵوەستە لەسەر یۆتۆپیاکانی ئازادی بکرێت.

تا ئەو کۆمەڵگا و تاکە شینەکرێنەوە کە لیبرالیزم[2] دەیان وروژێنێت، و نەچنەوە سەر ئاراستەی سروشتی مرۆڤایەتی خۆیان، دەرئەنجام لە مەرگێک بەهۆی شێرپەنجەی کۆمەڵگاوە تێپەڕ نابێت، دواتر بە درێژی باسی ئەمە دەکەم.

---

١ـ کارل مارکس (١٨١٨ـ١٨٨٣).فەیلەسوفێکی ئەڵمانی بەرەچەڵەک یەهودییە؛ سیاسەتمەدار؛ رۆژنامەوان و تیۆریزانێکی کۆمەلایەتییە. چەندین پەرتووکی نووسیوە؛ بەلام لەمیانەی تیۆریەکەی سەبارەت بە سەرمایە و رکابەرایەتیکردنی بۆ پرەنسیپی کرێی کرێکاران ناوبانگێکی جیهانی پێبەخشیوە. هەربۆیە بە دامەزرێنەری فکری مارکسی دادەنرێت. بەیەکەوە لەگەڵ فریدریک ئەنگلس ئەو فکرو سیستەمەیان پێشکەشکرد کەئەمڕۆ بەسۆسیالیزمی زانستی دەناسرێت. لەشاری تریری ویلایەتی ریناتیای ئەلمانیا لەدایک بووە، لەساڵی ١٨٨٣کۆچی دوایی کردووە.

٢ـ لەزمانی ئیتالیدا وشەی (لیبرۆ) بەمانای مرۆڤی ئازاد دێت، هەروەها وشەی (لیبرتاس)ی لاتینی بەواتای ئازاد دێت. لیبرالیزم مەزهەبێکی سیاسی تایبەت بە مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە ، ئازادی تاک و تاکرەویتی بەبنەما دەگرێت.

لێرەدا دەمەوێت بڵێم: تا ئەو سیستەمە ئەفسوونییە، مۆدێرنیتەی سەرمایەداری شینەکەمەوە کە لە پشت ئەو خانمە حەفتا ساڵیەی نوێنەری کۆنسەی ئەوروپاوەیە کە بۆ زیندانی ئیمرالی فەرمووی لێکردم، ناتوانم بە شێوەیەکی راست چارەنووسی خۆشم شیکار بکەم. قۆناخی گەیاندنم بە ئیمرالی لە سەرەتاوە تا کۆتایی لە لایەن ئیسرائیل ـ ئەمریکا ـ یەکێتی ئەوروپا و روسیای پاشماوەی یەکێتی سۆڤێتی هەڵوەشاوەوە ئامادە کراوە. هەرچی رۆڵی حکومەتەکانی سوریا، یۆنان و تورکیایە لە خزمەتی بیرۆکراتییەتی پلە دوو بەولاوە تێپەڕ ناکات. لە رۆژانی لێپرسینەوەدا، بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا بە کاربەدەستە تورکەکان (نوێنەری چوار دەزگای سەرەکی؛ هەواڵگری سەرۆک ئەرکان، دەزگای هەواڵگری میللی (MIT)، بەڕێوەبەرایەتی گشتی ئاسایش و هەواڵگری جەندرمە) م گووت: خۆشحاڵ بوونتان بە دەستگیرکردنی من بێواتایە. بە شێوەیەکی نارەسەن و چەپەڵی وەها کە تەنانەت بەدەوییەکانی بیابانیش شایستەی ناوەڕۆکی مرۆییانەی خۆیانی نابینن، لە میانەی پیلانگێرییەک که هاوتاکەی نەبینراوە پەیوەندی دۆستایەتییان قۆستەوە، فڕێدانم بۆ ناو فڕۆکەکە و داباریینیان بەسەرمدا شێوازی شەڕێکی دلێرانە نەبوو. تەنانەت ئەم راستینەیە بە شێوەیەکی زۆر زەق و بەرچاو پیشانی دەدات، مۆدێرنیتەی سەرمایەداری کە ئەمریکا سەرکێشی دەکات چ جۆرە لیبرالیزمێکی چەپەڵ و قێزەونە: **سیستەمێکە لەفشار و چەوساندنەوەدا سنوور ناناسێت.**

کەسێک نەبووم لە سیستەمی تێکۆشانمدا دەوڵەت پەرستی ـ نەتەوە پەرستی تورک نەناسم. بە تەنیا و لە ڕەوشی هەرە لاوازمدا بوێری بەرەنگاربوونەوەم پیشاندا. تەواوی شاهێدانی ئەمە دەزانن کە تێکۆشانێکی باشم کرد، لایەنی سەیریش لەمەدا نییە. ئەوەی لە ئارادایە فەرمانی مردنە دەرهەق بە کوردایەتی. یان دەبوو دەستبەرداری مرۆڤایەتی و کەرامەتی خۆم نەبم و بەرخودان بکەم، یاخود لە کۆیلایەتییەکدا کە رەنگ و نەژادەکەی دیار نییە

وون دەبووم و لەناو دەچووم. گفتوگۆ لەسەر ئەم راستینەیە ناکەم و رق ئەستووریش نیم بەرامبەری.

ئەو خاڵە بنەڕەتییەی تووڕەم دەکات و رقم لێی هەڵدەستێ: بە هیچ جۆرێک رێگری لە دەبەنگی هزری و ئایدیۆلۆژی نەکرا. سیستەمێکی وەهایە بە زارەکی هێندە بەها بە مافەکانی مرۆڤ دەدرێت، کە لە ئەرز و ئاسمان جێی نابێتەوە. کەچی ئەوەی لە واقیعدا هەیە، لە سیستەمی هیچ زیندەوەرێکدا نەبینراوە کە بەرامبەر جۆری خۆی بە وێنەی مرۆڤ، گرووپێکیان چەوساندنەوە و شەڕ بکاتە بەشی تەواوی ئەوەکانی تر. بەوەش ناوەستێت، بەسەر زەمین و ژێر زەمین و سروشتیشەوە تەواوی ژینگە ژەهراوی دەکات و بەم شێوەیە پێشکەشی مرۆڤایەتی دەکات.

ئەو کۆمەڵگایەی تێیدا لەدایک بووم، پڕبوو لەکاریگەرییەکانی گوندی نیولیتیک[1]. دۆستایەتییەکی بێ گەرد و تێکۆشانێکی رەسەن جێگای باسە. بەم سۆزانە گۆش کرام و گەورە بووم. بەڵام هەر وەکو بڵێی هێشتنەوەی کوردان لە دەرەوەی گشت قوناخەکانی شارستانێتی بەس نەبێت کە تەواوی کاریگەرییە نێگەتیفەکانی بە شێوەی نامۆبوونێکی رەها وەکو چارەنووسێک بەسەریاندا بڕایەوە، هەستان مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییان لەگەڵ توندترین و مەحافەزەکارترین نەریتدا کردە یەک و بەم جۆرە لە ڕێگای میللیگەراییەکی ئەتنیکی ئەوپەڕگەری شۆفینزمەوە کوردانیان خستە ناو گەمارۆی دەوڵەت ـ نەتەوەوە، ئەمەش هەیمەنەیەکی ئایدیۆلۆژییە کە هەڵوەشاندنەوەی زۆر سەختە. کاتێک ئامادەباشی توندوتیژییەکی پەتیشی بێتە سەر، ئەوا بەر لە لەدایکبوون لە جێی خۆدا ژماردن ناوەکەی دیکەی چارەنووسە.

دەرکەوتنم لە سنوورەکانی کۆماری تورکیا بە بەرخودانێکی شان و شەوکەت بەدینەهات. ئەم کاروانە گەڕان بوو بە دوای

---

١ـ چاخی بەردینی نوێ؛ سەردەمی شۆڕشی کشتوکاڵ وئاواکردنی گوندە، بۆ یەکەمین جار لە هیلالی زێڕین: میزۆپۆتامیای سەروو پێشکەوت، مێژووەکەی بۆ زیاتر لە١٠٠٠٠ساڵ پ.ز دەگەڕێتەوە .کلتووری دایکسالاری و دایکە خوداوەند تێیدا زاڵ بووە.

گۆڕەپانیکی نوێی ژیان بۆ شیکردنەوەی چەپگەری تایبەت بە کێشەی نەتەوەیی، کە بە شێوەیەکی دۆگماتیکانە پەیوەستی بووین. (PKK)ی رۆژهەلاتی ناوین جگە لە بەدەستهێنانی هەندێک ئەنجام بە سوود وەرگرتن لە بۆشاییەکانی سیستەم شانسیکی دیکەی نەبوو. بەلام دیسان وەکو رکابەرێکی سیستەم درێژەدان و پێشخستنی هەبوونەکەی بۆ رۆژهەلاتی ناوین چەمکێکە نابێت بچووک بکرێتەوە.

بە شێوەیەکی هەمیشەیی پەڕینەوە بۆ شاخ و بەرخودانی چەکداری، لە رووی ئەو دەرئەنجامانەوە کە لێی بکەوێتەوە گرنگە. هەرچی بۆ کوردانە، ئەم هەنگاوە بە واتای سیاسیبوون دێت. بە دابڕان لە کارەکتەرە بەکرێگیراو و کلاسیکەکان، بۆ یەکەمین جار ئەلتەرناتیفی ئازادی کردۆتە ڕاستییەکی دەرک پێکراو. هەنگاوێک جێگای باسە کە هەم رژێمە دەسپۆتەکانی پاشماوەی چاخەکانی ناوین هەم دەولەت ـ نەتەوەکانی بەردەوامی ئەوان کە لافی هاوچەرخی لێدەدەن چاوەڕوانی نەبوون و پەسەندیان نەدەکرد. رێکەوتنی کوردە بەکرێگیراوەکان و دەولەت ـ نەتەوەکانی ناوچەکە لەگەڵ ئیمپریالیستە هەژموونگەراکان سەبارەت بە سەپاندنەکانی **"(PKK)ە رێکخراوێکی تیرۆریستە"** بۆ ئەم هۆکارە دەگەڕێتەوە. چونکە کوردی ئازاد بەتاک و کۆمەڵگاوە تەواوی ئەزبەرەکانیان تێکدەدات. ئایدیۆلۆژیای فەتحکاری ئیسلامی و ئایدیۆلۆژی لیبرالیزمی نەتەوە پەرستی لە مێژە کوردایەتی ئازادیان لە دەفتەری خۆیاندا سڕیوەتەوە، بە نەبووی دادەنێن.

**ئەوەی لە کەسایەتی مندا بەرکەنار دەکرێت و دەخوازن مەحکومی زیندانی دوورگەیەکی بکەن لە بنەڕەتدا ئەم کوردایەتییە ئازادەیە.** نۆ ساڵە لە ئیمرالی بە شێوەیەکی رۆژانە بەرامبەر کەسایەتی من سیاسەت و کردارێکی سیستەماتیک بەرێوەدەبرێت. تەنیا تاوتوێ کردنی وەکو سیاسەتی تورکیا دەرهەق بە زیندانی ئیمرالی رێگا لەبەردەم بەهەڵەداچوونی گەورە دەکاتەوە. ئەمەش هەم بۆ کوردان

هەم بۆ تورکان بێچاردیی سیاسی و پێکدادانی لیدەکەویتەوە.
بەلام زۆر چاک دەرکم بەوە کرد کە تورکێتی بە ناوی خۆیەوە نە دەتوانێت شەڕ بکات نە ئاشتی. ئەو رولەی سەرمایەداری مۆدێرنیتە پێی بەخشیوە: رۆلی چاوشی، زێرەڤانی و جەندرمەیەکی رووتە بۆ ئەوەی تەواوی گەلانی رۆژهەلاتی ناوین بە گەلی تورکیشەوە، بۆ چەوسانەوە و فشاری سیستەمی سەرمایەداری کراوە بن.
کوردە جلەوکراوەکانی ئەنادۆل و تورکیا بۆ ئەوروپا لە ناوخۆ و دەرەوەدا گرنگن. ئەوەی پەیڕەو دەکرێت سیاسەتێکی ئاسایی نییە. لە میانەی تەلەکەبازانەترین سیاسەتەوە و زۆر ژێر بە ژێرانە ستراتیژیەتێکی بەرفروان و یەکگرتوو بەڕێوەدەبرێت. دەتوانین باشتر لە پەیوەندییەکانی ناتۆ و یەکێتی ئەوروپا بگەین.
تەنانەت ئەو مەسەلانەی تا ئێرە هەولی باسکردنیانم دا، ئەو راستییە پیشان دەدەن کە تا بە قوولی دەرک بە سەرمایەداری مۆدێرنیتە نەکرێت، ناتوانم بەرگری کردنێکی واتادار بکەم. ئاشکرایە کە پالپشت کردنی بەرگرینامەکەم بە یاسا و حقوقیکی وشک هیچ واتایەکی نابێت. هەلوێستێکی رووکەشیانەی سیاسی و ستراتیژی ناتوانێت هۆکاری پەردە پۆشکردنی پرۆسەی **"سەرلەنوێ دادگایی کردنەوە"** روون بکاتەوە. تێگەیشتن لە مەسەلەی سەرلەنوێ دادگایی کردنەوە سەبارەت بە روونکردنەوەی رێگا چارەی کوردایەتی ئازاد بایەخێکی مەزنی هەیە. وەلامدانەوەی دادی رووکەشیانەی تورک بە **"کۆماری دیموکراتی"** و لە دۆزەکەی دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپاشدا پێشکەش کردنی بەرگرینامەکانم لەژێر ناوی **"لەدەولەتی راهیبی سۆمەرەوە بەرەو شارستانێتی دیموکراتی"** و **"بەرگری کردن لە گەلێک"** لە ناوەڕۆکدا هەولی روون کردنەوەی دادوەری و دیموکراسی راستەقینە بوون. هەرچی سەرلەنوێ دادگایی کردنە ئامانجەکەی دەستنیشان کردنی **"بە کێشە بوونی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و پێویستی تێپەڕاندنی"** و وەک ئەلتەرناتیفێکی چارەسەر ئامێز گەیاندنی دیموکراتیزەبوونە بە

دەوڵەمەندێتی واتا لە ڕووی سیستەمی سیاسی و پەیوەندییەکەی بە ئازادییەوە. هەروەها جارێکی دیکە تایبەتمەندی و ناوەڕۆکی یەک پارچەیی و تەواوکاری بەرگرینامەکانم دەخاتە ڕوو.

پێشتر گوتبووم دادگایی کردنەکەی ئیمرالی وەک نمایشێک ئامادە کرابوو و هیچی تر. بە ڕاستی هەلومەرجی پێشخستنی بەرگرییەکی حقوقی لە ئارادا نەبوو. هەموو شتێک تەنانەت بچووکترین وردەکارییەکانیشی پێشتر بەرنامەڕێژ کرابوو. ئەو ڕۆژەی گوایە بڕیار دەدرا، هەموو شتێک ئامادە کرابوو: ماهییەت، مەملەکەتی سەرۆکی دادوەران، بەشداربووانی دانیشتنەکە، ماوە و چاپەمەنی، چۆنییەتی بەکارهێنانی میدیا و دەزگاکانی ڕاگەیاندن، هەموو شتێک بە گوێرەی پێویستییەکانی پیلانەکە بەڕێوەدەچوون. لەم بارەیەوە لەگەڵ ئەمریکا و یەکێتی ئەوروپا ڕێکەوتبوون. ئەوەی بەرامبەر بەم ڕەوشە دەکەوتە سەرشانم:نەبمە بەرگریکارێکی حقوقی ساختە. هەڵبەتە شتێک بە ناوی حقوق لە ئارادا نەبوو، هەمان شت سەبارەت بە یەکێتی ئەوروپاش جێگای باس بوو. تەواوی کێشەکان سەبارەت بە چۆنییەتی بەکارهێنانی من بوو لە کێشەی کورددا. دەبوایە هەموو شتێک خزمەت بەم ئامانجە بکات. قۆناخی کینیا خۆی پێشێل کردنی حقوقی یەکێتی ئەوروپا بوو. نەک هەر حقوقی کینیا تەنانەت سیستەمی حقوقی تورکیاش پێشێل کرابوو. بەردەوام هێشتنەوەی لە سێدارەدانم لە ڕۆژەڤدا پەیوەندی بە ئامانجە سیاسییەکەوە هەبوو. گوایە **"ترسابوو"**م! هەر بۆیە بە زیندوو هێشتنەوەی بە کەڵک تر بوو. بەرامبەر بە ڕەوشێکی وەها، ئەوەی دەبوایە ئەنجامی بدەم، کۆمەک کردنی پرۆسەی سیاسی بوو. بۆیە ناوەڕۆکی پەیامی سیاسی بەرگرینامەکەم گرنگ بوو. هەروەها ئەوەی دەبوایە بکرێت: گەڕان بوو بە دوای وەڵامێکی ڕیشەییدا بۆ ئەو بەهەڵەداچوونانەی ڕێگایان لەبەردەم ئەم جۆرە ئاکامە کردەوە، هەوڵی ئەنجامدانی درا. ئەو چەمکەی لەو قۆناخەدا بەسەر تەواوی بەرگرینامەکانم دا زاڵ بوو لەسەر ئەم بنەمایە بوو،

تەنیا لەسەر ئەم پرەنسیپانە دەتوانرا کومەک بە تیکوشانی ئازادی بکریت و کەمتر ببیت بەئامرازی گەمەکە.
ئاشکرا بیلیم چاوەروان بووم دادگای مافی مروڤی ئەوروپا بریار بدات کە دەستگیرکردنم پیچەوانەی حقوقە و نایاسایی بووە. بەم جورە دەرفەتی دادگاییەکی عادیلانە برەخسیت. بە ناهەقییەکی روون و ئاشکرا ئەم بریارەیان نەدا. ئەوەی مایەوە: ناچار بوون بلین دادگایی کردنەکە عادیلانە نەبووە. بیگومان هەموو شتیک وەکو شانوگەری لەبەرچاوان بوو. دوای هەلاواردنیکی دریژخایەنی دوزەکە، لە کاتیکدا ئیمە چاوەروانی دادگاییەکی عادیلانە بووین، کونسەی یەکیتی ئەوروپا بە شیوەیەکی یەکلایەنە و لە ئاکامی مامەلە و سەودایەکی زور لەگەل حکومەتی تورکیا و لە میانەی بە دەست هینانی دەسکەوتی سیاسی گرنگ بو خویان، هاوشیوەی حوکمی دادگای ئاسایشی دەولەتی جاران و دادگای سزای گرانی ژمارە (١١) ی ئەنقەرە و ژمارە (١٢)ی ئەستەنبول کە تەواو شەرمەزارییەکی حقوقییە، ئەوانیش لەسەر هەمان دوسییە حوکمیان دا. لەسەر ئەم بنەمایە تورکیا لەگەل کومیتەی وەزیرانی یەکیتی ئەوروپا ریکەوتن و دیسان دوسییەکە بو دادگای مافی مروڤی ئەوروپا رەوانەکرایەوە. تا ئیستاش چاوەروانی هەلویستی دادگای مافی مروڤی ئەوروپا دەکریت. بە راستی هەلویستی لە بەرامبەر بریاری خوی دەرهەق بە دادگای عادیلانە جیگای مەراقە. لە کاتیکدا بەرگرینامەیەکی راستەقینەی حقوقیمان بو ئەم سەرلەنوی دادگایی کردنە ئامادە دەکرد ئیمەیان ڤالا دەرخست. هەر بویە دادگایی کردنی حقوقی لە شانوگەرییەک زیاتر تیپەری نەکرد.
مەسەلەیەکی تر کە لەم قوناخەدا باشتر لیی تیگەیشتین: پەیوەندی چر و پر و ریکەوتنی ئەمریکا ـ یەکیتی ئەوروپا ـ کوماری تورکیایە سەبارەت بە (PKK) و کەسایەتی من و تەواوی کیشەی کورد. تورکیا بەرامبەر بە سازشکردنیکی فراوانی ئابووری پیداگری لەسەر پاکتاوکردنی کیشەی کورد لەتورکیا و پشتگیرییەکی مەرجدار بو

پێکهاتەی فیدرالی کورد لە ئێراق دەکات. ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر ئاشکرا دەبێت کە لەم بارەیەوە دیدار و چاوپێکەوتنی بەردەوام ئەنجام دەدەن. خۆی لە خۆیدا ئەم ڕێکەوتن و سازشانە لەگەڵ ئەمریکادا بە شێوەیەکی ئاشکرا بەڕێوەچووبوون. کەواتە گرنگترین خاڵەکانی ئەم ڕێکەوتنە: دەستگیرکردنم، هێشتنەوەم لە ڕەوشی **"جێبەجێ کردنی حوکم بە بێ دادگایی کردن"**، پاکتاوکردنی کێشەی کورد لە تورکیا و ڕاگەیاندنی (PKK) وەکو ڕێکخراوێکی تیرۆر. هەرچی سندوقی دراوی نێو دەوڵەتی (IMF)[1] و پێوانەکانی کۆپنهاگنی[2] یەکێتی ئەورووپاشە دوو دەمامکی باشی ڕێکەوتنە قێزەونەکە بوون.

دەبێت ڕاشکاوانە ئاماژەی پێ بکەم چاوەڕوانی ئەم جۆرە هەڵوێستە قێزەون و گوماناوییانەم لە دەزگاکانی یەکێتی ئەورووپا نەدەکرد. ئەم ڕاستیانە، دەرهەق بە پێوانەکانی دیموکراسی و مافی مرۆڤی ئەورووپا منیان ڕاپێچی نێو لێپرسینەوەیەکی قووڵ کرد. قووڵبوونەوەم سەبارەت بەم بابەتانە، ئەو دەرئەنجامەی پیشان دام کە کێشەکان زۆر لەوە ڕیشەدارترن کە دەبینرێت، تێپەڕاندنیشیان (چارەسەرکردنیشیان) پێویستی بە هەڵوێستی ڕیشەداری هاوشێوە هەیە. بێگومان سەبارەت بە بابەتەکانی دیموکراسی و مافی مرۆڤ یەکێتی ئەورووپا خاوەن هەڵمەتێکی پێشکەوتووە، لەم لایەنەوە دەروازەی ئومێدی جیهانە. بەڵام مۆدێرنیتەی سەرمایەداری کە بناخەکەی پێکدێنێت وەکو کۆت و بەند و زنجیر بەستوویەتییەوە، لە ڕووی ئەنجامدانی هەڵمەتێکی پێشکەوتووترەوە مایەی ڕەشبینییە.

شۆڕشگێڕەکانی ڕوسیا لەو بڕوایەدابوون کە بەلانی کەمەوە لە ڕێگای شۆڕشەکانی بەشێکی ئەورووپاوە، دەتوانن سەرکەوتنی

---

۱ـ ڕێکخراوێکی گرێدراو بە نەتەوە یەکگرتووەکانە؛ ناوەندە سەرەکییەکەی لە ئەمریکایە؛ لەساڵی ۱۹٤٥ دامەزراوە. ئامانجەکانی: پشتگیریکردن لەسەقامگیری دراو؛ جێگیری نرخی دراو؛ پێشخستن و بەهێزکردنی هاوکاری دراوی نێوان دەوڵەتەکان؛ بەخشینی قەرز بەوڵاتان وبەستنەوەیان بە هەلومەرجەکانی خۆیانەوە.

۲ـ پێکهاتووە لە ۱ـ مەرجە سیاسییەکان: پێویستە دەوڵەتی بەرئەندام خاوەن دامەزراوێکی سەربەخۆ بێت؛ دیموکراسی (مۆدێرنیتە) زامن بکات؛ دەبێ دەوڵەتی یاسا ڕێز لە مافی مرۆڤ و کەمایەتییەکان بگرێت. ۲ـ مەرجە ئابوورییەکان: دەبێت خاوەن سیستەمێکی ئابووری چالاک و پشت بەستوو بە بازاڕی ئازاد بێت. ۳ـ مەرجەکانی یاسادانان: دەبێت وڵاتی بەرئەندام یاساکانی بەگوێرەی یاساکانی یەکێتی ئەورووپا هەموار بکات.

شۆڕشەکەیان گەرەنتی بکەن. بەڵام هەر وەکو دەزانرێت ئەم چاوەڕوانییەیان پێکنەهات. بە پێچەوانەوە دژە شۆڕشی لیبرالی ئەورووپا روسیا و ئەو سیستەمەی پێشەنگایەتی بۆ دەکرد لەناو خۆیدا تواندەوە. لە ڕۆژی ئەمڕۆماندا هەمان شت بۆ شۆڕشە دیموکراتییەکانیش جێگای باسە. بۆ ئەوەی چاوەڕوانییەکان سەبارەت بە ئەورووپا ڕێگا لە پێش هەمان ئەنجام نەکاتەوە، لە سەردەمی هەرە پێشکەوتووی سەرمایەی گلۆباڵدا، کەوتنە ناو لێگەڕینی دیموکراتیزەبوونی گلۆباڵ (جیهانگیری) ڕێگایەکی واقیعیانەترە. تەنیا لە سایەی پارادیگمایەکی ودهادا دیموکراسی و مافی مرۆڤ و ئازادییەکانی ئەورووپا دەتوانێت کۆمەکەکانی خۆی واتادار بکات.

ئەو بەڵگانەی هەوڵماندا لە ڕێگای هێڵێکی گشتیی ڕوونی بکەینەوە، پێشانی دەدەن کە بۆچی ناخوازن **"دادگاییەکی عادیلانە"** ئەنجام بدرێت. لە هەمانکاتدا شیکارکردنی بابەتەکە بە هەموو قووڵاییەکەوە لەسەر بنەمای پۆلێن بەندییەکی سەرەکی دەکاتە پێویستییەک. ئەمە پەیڕەوکردنی میتۆدی بچووک کردنەوە[1] (Reduction) بۆ گەیاندنی ئەو خاڵە سەرەکیانەی پێشتر لە ڕاستینەی بەرگرینامەکانمدا ئاماژەم پێ کردبوون بە سەرچاوە بنەڕەتییەکانیان بایەخدار دەکات. هەرچەندە زێدەڕۆیی کردن لە پەیڕەوکردنی میتۆدی بچووک کردنەوە ڕێگا لە پێش بەهەڵەداچوونی گەورەش بکاتەوە، ئەوا کاتێک مۆدێرنیتە سەرچاوەی کێشەکە بێت، پێویستە ئەم مەترسیانە لەبەرچاو بگیرێت. ئەو بەشە سەرەکیانەی هەوڵی شیکار کردنیانم دا یەکێتییەکی ناواخنیان هەیە و مەترسییەکانی میتۆدی بچووک کردنەوە بۆ نزمترین ئاست کەمدەکاتەوە.

بەشێکی لەپێشینە کە دوای پێشەکی خوازیارم تاوتوێی بکەم پەیڕەو و ڕژێمی حەقیقەتە. هەروەکو باود پەیڕدو لای هەموان

---

١- بە واتای لێکردنەوە و بچووک کردنەوە دێت و لە لێکۆڵینەوە تیۆرییەکاندا ناوی میتۆدی بچووک کردنەوەی مۆدێلی گەورەیە و لە ڕێی ئەو بچووک کردنەوەیەوە بە دەست هێنانی ئەنجامە لەسەر مۆدێلە گەورەکە.

بە ڕێگای لێکۆڵینەوە ـ لێتوێژینەوە ناسراوە. پێناسەکردنی ئەم خووە کە لە مێژووەوە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان تاقیدەکرێتەوە ڕێگا ڕۆشنکەرەوە دەبێت. ڕوونکردنەوەی هۆکارە سەرەکییەکانی چەمکەکانی پەیڕەوگەرایی، لە ڕووی لایەنی ئەرێنی و نەرێنییەوە، ئاسانکارییەکە بۆ شیکردنەوەکانمان. ئەگەر پەیڕەو نا تەواوە و (نەخۆش)یش بێت، بەردەوام ڕێگایەک بۆ پێڕەوکردن پێویستە.

مەبەستمان لە ڕژێمی حەقیقەت ئەوەیە: **"چۆن بە باشترین شێوە بە واتای ژیان بگەین"**. گەڕان بە دوای وەلامی پرسیارەکانی **"حەقیقەت، ڕاستی"** چییە؟ چۆن پێی دەگەی؟ یاخود کێشەی نەگەیشتن بە حەقیقەت چییە؟ یەکێکە لەو خاڵە سەرەکیانەی کە هەموو لێکۆڵینەوەیەکی جددی دەبێت شییان بکاتەوە. هەروەها لەگەڵ زاراوەکانی **"ئۆبژێکتیڤیزم"**[1] و **"سوبژەکتیڤیزم"**[2] دا کە خەیاڵ و هزری تەواوی مرۆڤایەتی بەند کردووە، هەولدەدەین هەندێک تیۆری سەرەکی هزری تریش ئاشکرا بکەین.

لە بەشی **"جیاوازی واتاداری جوگرافیا و مێژوو لەپەرەسەندنی کومەلگادا"** هەوڵ دەدرێت ئەو ڕاستییە ڕوون بکرێتەوە کە ناکرێت کێشەکانی پێشخستنی پۆلێن بەندیی لە کۆمەڵگادا، دابڕاو لە شوێن و کات تاوتوێ بکرێت. باسکردنی شێوە گرتنەکانی کۆمەڵگا یان بنەچەکەیان بە شێوەی **"ڕووداوی مێژوویی"** وشک یان بە جۆرێک وەک بڵێی تۆماری شوێن بوونی نەبێت و کردنیان بە چیرۆکی واتایی(ئەبستراکت)، تێگەیشتنی کۆمەلایەتیمانی تووشی کێشمەکێش و بوون بە ئامرازی چەپەڵترین بەرژەوەندی کردووە، کە لە ئەنجامدا لەژێر ناوی **"ڕاستی"** ڕێگای بۆ ڕەوانبێژی درۆزنی و دیماگۆجییەتی کومەلگا خۆش کردووە. لە کاتی بونیادنانی ڕاستینە

---

١ـ (Nesnelcilik) ڕەوتێکی هزرییە کە ئۆبژە بە تاکە ڕاستی دادەنێت و سەبارەت بە هەموو شتێک و لە هەموو کات و شوێنێکدا بە دوای ئەو زانیاریانەوەیە کە واتایی و خۆیی نین: پشت بە تاقی کردنەوە و ڕاستی بەرجەستە دەبەستن.

٢ـ (Oznelcilik) ڕەوتێکی هزرییە کە ڕاستی ڕەها لە خود (ذات)دا دەبینێت. داکۆکی لەوە دەکات کە هەرچی زانیاریمانە سەبارەت بە ئۆبژەکان بریتییە لە کاریگەری ئۆبژەکان لەسەرمان و هیچی تر. پێی وایە هەموو زانیارییەکان بە گوێرەی شتە واتاییەکانە و هەموو بەهاکان خۆیی و واتایین.

کۆمەلایەتییەکاندا، بە روونی بەبنەما گرتنی رەهەندی شوێن و کاتی ئۆرجینەکان، دەرفەتەکانی واتادارکردنی **"ژیانی مرۆڤ"** زیاد دەکات. هەر کەس تێدەگات کە ئەو زۆر بلێیی و فریودان و قەبلاندنە چەوتانەی سەبارەت بە هەندێک زاراوە و بیرۆکە بەڕێوەدەبرێن، بریتین لە **"کلێشەگەری وشە"** و هیچی تر. لە میانەی فاکتەرە سەرەکییەکانەوە هەوڵدەدرێت پێشکەوتنی مێژوویی و جوگرافی شارستانیتی (مەبەست لەوەیانە کە سەرووەرە) رۆژگاری ئەمرۆمان واتادار بکرێت.

لە بەشی **"سەردەمی خوداوەندە بێدەمامک و پادشا رووتەکان"**دا هەوڵ دەدرێت وەکو شێوەیەکی بەرهەمهێنان لەدایکبوونی سەرمایەداری و ئەو بە شێرپەنجە بوونە روون بکرێتەوە کە لەناو کۆمەڵگادا رێگای لە پێش دەکاتەوە. هەوڵ دەدرێت رووی راستەقینەی ئەو سیستەمە ئاشکرا بکرێت کە لە دەرەوە زۆر روون (شفاف) دیارە، بەلام لە ناوەرۆکدا لە رێگای زانست و ئەو دەسەلاتە سیاسییەی بە خۆیەوە بەستوتەوە هەمووانی کردووە بە گژیەکدا و خستونیەتە ناو کێشمەکێش و شەڕەوە. هەروەها هەوڵ دەدرێت ئەوە روون بکرێتەوە کە چۆن ئەم شەڕە لە گۆرەپانی زهنیدا لە رێگای بیرۆکە و تیۆری و پەیڕەوی زانستگەراییەوە کراوەتە بازنەیەکی داخراوی وەها کە رزگاربوون لێی ئەستەمە. سیستەمێکی ئەوتۆیە کە دەتوانێت مارکسیزم، ئەنارشیزم، رزگاری نیشتمانی و تەنانەت رەوتەکانی لە جۆری سۆسیال ـ دیموکرات و تەواوی ئەو رەوتانەش کە لە بەرامبەریدا دەجەنگان لە خزمەتی خۆیدا بەکاریان بێنێت و بیانکات بە ئامرازێک؛ هەوڵ دەدرێت ئەم بەهرە و لێهاتووییەی روون بکرێتەوە. کالاو بەهای گۆڕینەوە کە سەرەتا لە لایەن تەواوی کۆمەڵگاکان بچووک و بێ نرخ دەبینرا چۆنە وا بوون بەو خوداوندە نوێیانەی حوکمی کۆمەڵگا بکەن؟ چۆن ئەو ژمارە کەمەی پاشاکان کە جاران خۆیان لەنێو دەمامک و پۆشاکی هەمەڕەنگ دەشاردەوە، لە قەلاو و کۆشکەکانیاندا ژیانێکی جیا لە

خەلکیان هەبوو ، ژمارەیان ئێجگار زۆر بووە و بەشێوەیەکی رووتن کە لە رەعیەکانیان جیاناکرینەوە؟ سەرباری ئەوەی سیستەمێکی ئێجگار زانستییە، بە دەسەلاتە و توانایەکی گەورەی ماددی هەیە، بۆچی دەوروبەر و بونیادی ناوەوەی بۆ ئەو کۆمەلگایانە دەگۆرین کە لە میانەی ئەو مەرگ و نەخۆشیانە لەناودەچن کە تەنانەت نەزان (جاهیل)ترین کەسانیش رێگای پێنادەن؟ هەول دەدرێت لە میانەی نهێنییەکانی ئەم پرسانە وەلامەکان بدۆزرێتەوە. سیستەم جیهانی بۆ پارچەکانی دەولەت ـ نەتەوە دابەش کردووە، دەولەت ـ نەتەوەش کۆمەلگای بۆ پارچەکانی لە جۆری بونیادی ئابووری، کۆمەلایەتی و دام و دەزگا سیاسیەکان دابەش کردووە، ئەوەی لێرەدا لێکۆلینەوەی لەسەر دەکرێت: رۆلی راستەقینەی ئەو دابەشبوونە زانستیانە چییە کە زادەی ئەم چەمکانەن، ئایا ژیانیان چۆن واتادار یان بێ واتا کردووە. میللیگەرایی کە وەکو تاکرەوێتی ئایینی فەرمییە، رولی راستەقینەی لیبرالیزم ئاشکرا دەکات. ئەو راستییە پیشان دەدەین کە لە سایەی سەرمایەداریدا بەردەوام لە دەرەوە و ناوەوەی بونیادی کۆمەلگا شەڕ لە ئارادایە، ژیان لەناو دۆخێکی گرژی، پەشێوی، قەیران و **"کائیوس"**[1] دا دەبێت.

لە بەشی لەژێر ناونیشانی **"سەردەمی سەرلەنوێ ژیان لەگەل یۆتۆپیای ئازادی"** دا ئەوە تاوتوێ دەکرێت کە چۆن لە ژیانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پڕ لە کائیوس و قەیرانەوە بە شێوازی ژیانێک دەگەین کە یۆتۆپیاکانی ئازادی بۆ گەڕابێتەوە. باس لەوە دەکرێت: بۆ دووبارە گەیشتن بەو گوزارشتە یۆتۆپی و ئەفسوناویانەی ژیان، کە لە ژیانی ماددیەتپەرستی مودێرنی سەرمایەداری بەدەرنراون، چۆن بە یەکپارچەیی واتای زهنی و رۆحی نوێ بگەین، چۆن بەردو گەردوونێک بال بگرین کە **"ژیانی ئازاد"**ی پێدەلێن. بەلی لەم بەشەدا ئەوە پیشان دەدرێت:

---

[1] ـ قۆناغێکی راگوزارییە لە نێوان رووخانی کۆن و بونیادنانی نوێدا: کە کۆن رووخاوە و هێشتا نوێیەکە بونیاد نەنراوە و دیار نییە نوێیەکەی داهاتوو چی دەبێت.

قاڵبە مۆدێرنەکانی سەرمایەداری کە جێی واتا ناکەنەوە و فڕێیان داوە دۆخێکی ڕاکردنن لە مردن، بەوەی دووالیزمی ژیان و مەرگیان بێواتا کردووە، و پیرۆزییان تێکداوە، چۆن ژیانیان لە واتا سەرسوڕهێنەر و ئەفسوناوی و شیعرییەکەی بێبەری کردووە و سەردەمی مەحشەر و مردنێکی ئەبەدییان ئاوا کردووە. هەرچەندە بژاری ژیانێکی ئازادی خاوەن یۆتۆپیا بە شێوەیەکی سیمبۆلی لە میانەی بیرۆکەی پۆست مۆدێرنیزمەوە دەرنابڕدرێت، بەڵام پارچە پارچە لە زۆر شوێن گوزارشتەکەی دەبینرێت: لێرەدا هەوڵدەدرێت وەک دۆخی جەژنێکی گەردوونی واتادار بکرێت. ئەم نزیکایەتییەمان لە شێوەی زۆر وەبەرگیراوی بەرهەم هێنان و کۆمەڵگا زیاتر، هەروەها لە جیاتی شێواندنە تیۆری و زاراوەییە سەرچاوە گرتووەکان لەم جیاوازیانەوە، وێنەی پێکهاتنی ژیانی واتاداری ساتەوەخت و ڕۆژانەی جڤاتەکان دەنەخشێنێت و نمایشی دەکات.

ڕۆژهەڵاتی ناوین لە سەردەمی سەرمایەداریدا لە نێو تایبەتبوونی خۆیدا بە جیا تاوتوێ دەکرێت. ئەو فاکتەرە سەرەکییانە چین کە لە هەردوو شەڕی جیهانیدا نەیهێشت سەرمایەداری ڕۆژهەڵاتی ناوین بخات، بۆچی بووە بە ناوچەیەکی هەرە بە کێشەی جیهان؟ بە واتایەکی دیکە ڕۆژهەڵاتی ناوین کە شوێن و کاتی سەرەکی سێیەمین شەڕی جیهانی ڕۆژگاری ئەمڕۆمانە، کامە پێشهات و ئەگەری لە ناواخنی خۆیدا شاردۆتەوە؟ ئەو بەرخودانە چۆن واتادار بکەین کە بەرامبەر مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پیشانی دەدات؟ ئەم ناوچەیە کە لانکەی مرۆڤایەتی بوو، ئەمڕۆش بە پێچەوانەوە بووە بە گۆڕستانەکەی، ئایا دەشێت ئێستا ببێتە گۆڕەپانی پەڕینەوە بۆ سەردەمی یۆتۆپیاکانی ژیانی ئازاد؟ ئەم گۆڕەپانە کە هەرەزێدە پیرۆزییەکانی خۆی خستۆتە زەلکاوەوە و لێرەوە ژیانی کەوتۆتە ژێر پێیان، ئایا دەتوانێت لە میانەی سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی پیرۆزییەکانی **"شێوازەکانی ژیانێکی ئازاد"**ی پڕ واتا، ئەفسون، ئاواز

و شاعیری بخولقێنیت؟ ئایا لەم پێناوەدا دەتوانیت قالبە ماددی و بەناو زانستییەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و بتەکانی بشکێنیت، شێوەکانی بەڕێوەبەرایەتی دیموکراتی، گرووپە بەرهەمهێنەرە ئاوێتەبووەکانی لەگەڵ ژینگە و ئەنجوومەنی پڕ واتای داناکان ئاوا بکات کە دەرفەتێکی زیاتر بە ژیانی ئازاد دەدەن؟ لە وەلامی ئەم جۆرە پرسیارە بنەڕەتیانە دەگەڕێین.

ڕۆڵی کوردان لە شەڕی **"ئارمەگیدۆن"**[١] ی ڕۆژهەلاتی ناویندا کە ئیسلامی کاریگەر بوو بە سەرمایەداری، واتا ئیسلامی واتادار کراو لە لایەن ئایینەکانی کرستیانی و موسەوییەوە، بە **"مەحشەر"** ناوی دەبات، وەکو بەشێکی جیا دەگیرێتە دەست. بە واتایەک لە واتاکان دەتوانرێت بەکوردان بگووترێت: **"ئەو گەلەی نەبوو بە گەل"** چونکە ناشێت جڤاتێکی مرۆیی تری وەها جیاواز یان گەلێکی دیکە وەک ئەم گەلە لە بەها بنچینەییەکانی رادەکات و دوور دەخرێتەوە. ناکرێت بگوترێت گەلێکی زۆر لاواز و بێ بەهرەیە لە شەڕدا، لە میانەی جوگرافیای ستراتیژی و کارەکتەرە **"ئانترۆپۆلۆژی"**[٢] یەکەیان جڤاتێکی ئەو مرۆڤانەن کە هەرە زیندە دەتوانن شەڕ بکەن و سەربکەون. پۆتانسییەل (ماتە ووزە)ی بوێری ژنان و لاوانی زۆر بەرزە. بەلام هێندە تۆقێنراون کە تەنانەت وایان لێهاتووە لە سێبەری خۆشیان بترسن. لە ڕۆژهەلاتی ناویندا ئەمریکا کوردانی وەکو هاوپەیمانێکی نوێی خۆی هەلبژاردووە. ئیسرائیلیش پرۆژەیەکی جیاوازتری سەبارەت بە کوردان هەیە.

ئەم گەلە کە ئیسلام وەهای لێکردووە، لەبیربکرێت و نکوڵی لێ

---

١- ئەو شوێنەیە کە شەڕی یەکلاکەرەوە لەنێوان هێزی چاکە و خراپە ڕوودەدات.وشەیەکی عیبرانی - عەرەبییە، لە دوو بەشی ئەرز مەجیدۆن پێکهاتووە، بەشوێنێک دەگوترێت کەوتۆتە ئیسرائیل - فەلەستینی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان.لە رابردوو چەندین شەڕی خوێناوی تێدا ئەنجامدراوە.بەگوێرەی ئایینی مەسیحی شەڕێکی ئێکجار مەزن تێیدا ڕوودەدات،لە ئاکامدا لایەنگرانی خوداوەند سەردەکەون، ئیسلام بە ڕۆژی قیامەت یان مەحشەری ناو دەبات. بە پێی زانستی سیاسیش گوایە ئەم شەڕە بە شەڕی دژە تیرۆر ناودەبرێت.

٢- ئەنترۆپۆلۆژیا یان مرۆڤناسی: زانستێکە لە بنەچەی جۆری مرۆڤ، تایبەتمەندییە زیندوەکانی : پەرەسەندن، نەریت و باوەڕیەکانی دەکۆڵێتەوە.خەسڵەتە سەرەکیەکەی کە لەبواردکانی دیکەی جیادەکاتەوە جەختکردنەوەیەتی لەسەر بەراوردکاری کلتووری لەنێوان گشت کلتوورەکان. ئەم زانستە بۆ چوار بوار دابەش دەبێت: مرزڤناسی زیندوو، مرۆڤناسی سروشتی، مرۆڤناسی کلتووری و مرۆڤناسی زمان.

بکرێت، لە ئارمەگیدۆندا بەرامبەر تەواوی پێکهاتەی تەریقەتەکان بە خەستی لە بەرەی مەسیحی و موسەوییەکاندا جێگا دەگرێت. هەڵبەتە عەلەوی، ئێزیدی و عەلمانییەکانی مەزهەبەکانی دیکەی هەژاران کە لە مێژە واتای خۆیان لە دەستداوە، زۆرینە پێکدێنن. ژمارە کەمەکەی چینی سەروو، سەرۆکی گروپ و تەریقەتە ئیسلامییە باو و نوێکانیش بە خێرایی دەست لە کرێگرتەیی بۆ عەرەب و عەجەم و تورکەکان هەڵدەگرن، ئیتر لە مەترەپۆلەکانی ئیمپریالیزمدا بە شوێن سەرگەورەیەکی نوێدا دەگەڕێن بۆ خۆیان. ئەمانە گروپ و کەسانێکن کە بە ئاسانترین شێوە پاکتاو دەکرێن.

بەڵام ترخاندنی رۆڵی کوردان لەم قۆناخی کائیۆس و پێکدادانە نوێیەی رۆژهەڵاتی ناویندا بە بەکرێگیراویتی کەم و کورتی گەورەیە. ئەو زۆرینەیەی هەرە زێدە تینووی فەلسەفەی **"ژیانی ئازاد"**ن، بەردەوام چاوەڕوانی ئەو پێشەنگانە دەبن کە تینوێتییەکەیان دەشکێنن. لە کاتێکدا بە خێرایی دەتوانێت دەستبەرداری قاڵبە لە مێژەوە لەناوچووەکانی ژیانی چاخەکانی ناوین ببێت، زۆر گیرۆدەی قاڵبی دەوڵەت ـ نەتەوەی پێشکەش کراویش نابێت کە شانسی ژیانی ئازادی بە هیچ گەلێک نەبەخشیوە و کۆلەکەی بەهێزی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە. شێوەی بەڕێوەبەرایەتی کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی کە زۆرترین شانس و دەرفەتی گەیشتن بە یەکسانی و هزرەکانی ئازادی دەدات، بۆ کوردان هەم لە رووی مێژوویی و جوگرافی هەم لە رووی تایبەتمەندی کەسایەتییەوە گونجاوترین شێوەی سیاسییە. لەم لایەنەوە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی لەگەڵ ئەو دەوڵەت ـ نەتەوانەی گەمارۆیان داوە، هەم بۆ ئەوەی لە میانەی بونیادی ماددی دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی نوێوە نەکەوێتە ناو زەمینەی دەردێکی نوێوە (KCK = کۆما جڤاکێن کوردستان) وەکو لەبارترین هەلومەرج و دەرفەتی چارەسەری رۆڵ دەبینێت و بە واتایە. (KCK) مۆدێلێکی پێشەنگە بۆ فۆرمێکی سەرەکی وەک **"کۆنفیدرالیزمی دیموکراتییانەی رۆژهەڵاتی ناوین"** کە تەواوی مەزهەب و ئایینەکان،

ئەو جڤاتانەی مافی مروڤ و دیموکراسی ئەوروپایان بەخۆیانەوە نەدیوە، ئەتنیک و بە بنەچە قەفقاسی، یەهودی، رۆم، ئەرمەنی، کورد، تورک، ئێرانی و عەرەبانەی لەئەنجامی سەپاندنی شەڕەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەسەر موزاییکی گەلانی رۆژهەڵاتی ناویندا، دووچاری کۆمەڵکوژی، لەناوبردن، فشار و چەوسانەوە هاتوون؛ سەرلەنوێ بە پیرۆزی خۆیان و گوزارشتی ژیانی ئازاد و دەسکەوتە ماددییەکانیان دەگەیەنێت.

ئەگەر کائیوسی ئێراق کۆمارێکی دیموکراتی فیدراڵی لێ بەرهەم بێت، دەشێت گۆڕانکارییەکی بەم شێوەیەش رۆڵێکی پێشەنگایەتی ببینێت. سێیەمین جەنگی جیهانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەنێو رەهەندی کات و شوێنی رۆژهەڵاتی ناوین کراوەیە بۆ ئەوەی پێشکەوتنی هەرە ئەرێنی تا هەرە نەرێنی لێبکەوێتەوە. دەستپێشخەری و کۆششی ئەو گروپانە ئەنجام دیاردەکەن کە پڕن لە واتا. (PKK)ش تەنیا یەکێک لەو گروپانەیە کە پڕە لە واتا، خاوەن بانگەشەی ژیانی ئازادە و بەردەوام بەرەو پێشەوە دەچێت.

لە بەشی ئەنجامدا ئەو بابەتە روون دەکرێتەوە و دەسەلمێنرێت کە لە هەلومەرجی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا نە بۆ خۆم، نە بۆ گەلەکەمان کە کردومی بە پێشەنگی خۆی و نە بۆ چەندین کەسایەتی و گروپ و گەلی دیکە دادگاییەکی عادیلانە ئەنجام نادرێت. تێپەڕکردنی سیستەمێک کە لە ناوەوە و دەرەوەی کۆمەڵگا بەردەوام لە رێگای شەڕەوە گەورە و تێرخۆراک دەبێت، تەنیا لە میانەی لە ئامێزگرتنی یۆتۆپیاکانی ئازادیمان و پێکهێنانی ناوەندەکانی دادوەری و بەرخودانێکی واتادار بەرامبەر دەسەڵات و پاوانخوازی لە هەموو شوێنێکدا بەدیدێت. تەواوی رێگاکانی دیکە بۆ ژیان لە دەرەوەی بە فیڕۆدانی تەمەن و خولانەوە لەناو بازنەیەکی بەتاڵ بەولاوە هیچ ئامانج و ئەنجامێکی دیکەی نییە.

ئەم بەرگرینامەیە لە دوورگەی ئیمرالی لەژێر هەل و مەرجێکی کۆشەگیری رەهادا دەنووسم. هەرچەندە ئەو دەرفەتەی لێکۆڵینەوە

و لێتوێژینەوەیەی تێدا نییە کە خەڵک لەسەری ڕاهاتوون، بەڵام خۆشم ئەو ڕێگایە هەڵنابژێرم. ڕیزکردنی ناوی شاکاردکانی ئەو پێشەنگانەی مرۆڤایەتی کە کۆمەکیان پێشکەش بە یەکتری کردووە و بۆ منیش سەرچاوەیەکی سەرەکی بوون، بێواتا دەبینم. جەنگاوەرە مەزنەکانی هزر و کردار- لەپێناو ژیانی ئازاددا- بە گوێرەی چەندایەتی تاوتوێ ناکرێن، لەم لایەنەشەوە دژی پێکهاتەی زانستی مۆدێرنیتەم. بەو بڕوایەی کە هیچ دەنگ و ئیرادەیەکی ژیانی ئازاد، بە ئەندازەی هی من لەژێر ئەم هەلومەرجەی گۆشەگیرییدا لایەنگری ئازادی و دادوەری نابێت، ئەم بەرگرینامەیە پێشکەش بەو کەسانە دەکەم کە تا ئێستا زانیویانە لەسەر ڕێگای دۆستایەتی و هەڤاڵێتی بەڕێوەبچن و لەمەودواش بەم جۆرە بەڕێودەچن.

پەیڕەو وەکو زاراوە ئەو ڕێگا و شێوە ڕاهاتن و نزیکایەتییە هۆشمەندییەیە کە بە هۆیەوە بە کەمترین ماوە ئامانجەکان بەدیدێت. کامە ڕێگا ڕاستەوخۆ و بەماوەیەکی کورت بەرەو ئەنجامت ببات، ئەوە ئەو پەیڕەوەیە کە لە جێی خۆیدایە. لایەنی ئەرێنی: تاقیکرانەوەی و سەرکەوتنیەتی لە بەدەست هێنانی ئەنجامدا. خۆ ئەگەر دوای تاقیکردنەوەی درێژخایەن دەستنیشان بکرێت، بۆ ڕێبوارانی کاروانەکە دەست لێبەرنەدراو دەبێت. ئەمەش پەیوەندی مورید- مورشید بە بیری مرۆڤدا دێنێتەوە.

کاتێک بمانەوێت واتاکەی لە قوولاییەکانی مێژووا بدۆزینەوە، یەکەمین پەیڕەوی تاقیکراوە کە لەبەردەمماندا قووت دەبێتەوە، نزیکایەتییەکی میتۆلۆژییانەیە سەبارەت بە گشت چەمک و ڕووداوەکان. بە واتا بەرتەسکەکەی میتۆلۆژیا[1] ش پەیڕەوێکە، میتۆدی ڕوون کردنەوەی حەقیقەتە. لە پشت میتۆلۆژیاوە چەمکێکی گەردوونی هەیە. هەڵسەنگاندنی سروشت وەکو بوونێکی زیندوو و پڕ لە ڕۆح هەرچەندە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆمان بە منداڵانە ببینرێت، کاتێک ئەو ئاستە ڕەچاو بکرێت کە زانست پێی گەیشتووە، دەردەکەوێت لە ڕاستیدا وەک ئەو زێدەڕۆییە نییە کە دەرهەقی

---

١-میتۆلۆژیا (Mythology) وشەیەکی یۆنانییە لە دوو بەش پێکهاتووە Mythosبەواتای ئەفسانە دێت، Logy بە واتای زانست دێت. واتە زانستی ئەفسانە یان ئەفسانەناسی یە. گرنگی بە ئەفسانە دێرینەکان و ڕاڤەکردنیان دەدات. لە چوار بەش پێکدێت: تیۆگۆنیا thyogoy کە لە بنەڕەتی خوداوەندەکان دەکۆڵێتەوە. زانستی دروستبوونی گەردوون Cosmogeny ئەنترۆپۆلۆژیا کە لەبنەڕەتی جۆری مرۆڤ دەکۆڵێتەوە. هەروەها زانستی باوەڕی بە ئاخیرەت.

دەکریت و پەیڕەویکی هێندە هەڵە نییە. بە پێچەوانەوە چەمکە مردوو و بێ رۆحەکانی پەیڕەو کە بێبەشن لە دینامیزم زیاتر لە میتۆلۆژیا لە واتا بێبەشن.

هەڵویستی میتۆلۆژیانە لە پەیوەندی لەگەڵ ژیاندا مسۆگەر ژینگە پارێزە، دوورە لە قەدەر[1] و دیتێرمینیستی[2] (حەتمیەت) و بۆ ئازادی کراوەیە. ئەم چەمکەی ژیان کە لەگەڵ سروشتی بوون تەبایە تا سەردەمی ئایینە مەزنەکان جڤاتی مرۆڤی هەمەڕەنگ و پڕ جۆش و خرۆش کردووە. میتۆلۆژییەکان کە پڕن لە ئەفسانە و داستان و پیرۆزییەکان بە تایبەتی زهنییەتی بنچینەیی سەردەمی نیولیتیکن. ناکۆکبوونی چیرۆک لەگەڵ واقیعدا بەو واتایە نایەت کە لە ناواخنیدا شرۆڤەی واتادار پێش ناخریت. دەتوانریت راڤەی ئەوتۆی وەها دەرهەق بە میتۆلۆژییەکان بکریت، کە بەهای واتایان زۆر بەرز بێت. بە بی ئەم جۆرە شرۆڤانە مێژوو زۆر بە کەمی دەرکی پێدەکریت. میتۆلۆژیا پەیڕەویکی دەست لێبەرنەدراوە بۆ تێگەیشتن لەو جڤاتانەی مرۆڤ کە درێژترین سەردەمی ژیانیان بە شێوەی ئەفسانە بەسەر بردووە. وەک پێویست سەلمێنراوە کە ئەو پەیڕەوە زانستیانەی لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا دەگیرێنە بەر و بە دژە پەیڕەوی میتۆلۆژی نیشان دەدرین هەر یەکەیان بۆ خۆی میتۆلۆژیایەکە.

پەیڕەوی زانستی کە لە میانەی بانگەشەکانی: دۆگما ئایینییەکان بەردەوامی میتۆلۆژیایە و لە ڕێگای یاسا وشکەکانەوە بەڕێوەدەچێت، تا بۆی کراوە پەیڕەوی میتۆلۆژی لەبەرچاو خستووە، ناچارە دووبارە پلە و پایەی واتا میتۆلۆژییەکان بگێڕێتەوە. میتۆلۆژییەکان

١ـ هەڵویستێکی فەلسەفییە سەبارەت بە دونیا و رووداوەکان، بەگوێرەی ئەم بۆچوونە گشت رووداوەکان بەر لەرووداو نووسراون و دیارکراون، هەربۆیە روودەدەن. هەروەها مەحاڵە مرۆڤ بتوانێت ڕووبەڕووی ئەم قەدەرە بێتەوە. بەڵکو پێویستە پەسەندی بکات و بەسەبرەوە سوپاسگوزاری بکات.

٢ـ بە واتای هۆکاریتی دێت. زاراوەیەکی فەلسەفیە و بۆ کەس یان رێبازێک بەکار دێت کە هەموو شتێک لە رێی هۆکارەوە روون دەکاتەوە و پێداگری لەسەر ئەوە دەکات کە هەموو دیاردەیەکی سروشت گرێدراوی هەلومەرجێکن کە ناچارن رووبدەن. هەروەها پێی وایە ئێمە ناتوانین هیچ شتێک دیاری بکەین، چونکە هەموو شتەکان لەپێشیدا لە رێی کۆمەڵێک هۆکارەوە دیاری کراون و بەیەکەوە گرێدراون، واتا بە جۆرێک لە جۆرەکان دەچێتەوە سەر قەدەرگەرایی.

کە لەگەڵ یۆتۆپیاکان خزمن، واتا و شێودیەکی زهنین کە جۆری مرۆڤ ناتوانێت دەستبەرداریان بێت. هێشتنەوەی زهنی مرۆڤ بەبێ یۆتۆپیا و میتۆلۆژیا وەکو هێشتنەوەی جەستەیە بێ ئاو. لێرەشدا چاکتر دەرک بەو راستییە دەکرێت: زهنی مرۆڤ کە کۆی زهنی تەواوی زیندەوەرەکانە، ناتوانرێت دەوڵەمەندییەکی هێندە فراوان، تەنیا بۆ **"زهنییەتی ئەنالیتیکی"**[١] ماتماتیک سنوردار و بچووک بکرێتەوە، ئەمە لەگەڵ ژیاندا ناکۆکە. هەر وەکو چۆن زهنی بە ملیۆنان زیندەوەر ماتماتیک نازانن، کۆی ئەوان واتا زهنی مرۆڤیش مەحکومی زهنییەتی ماتماتیکی ناکرێت. تەنانەت بۆ یەکەمین جار دۆزینەوەی بیرکاری لە لایەن شارستانێتی سۆمەرەوە، بۆ ژماردنی بەرهەمی زیادە بووە. کەچی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا لۆژیکی مرۆڤ وەکو ئامێرێکی ژمێریاری لێکراوە. کەواتە چۆن و لە ڕێگای چییەوە لە زهنی ملیۆنان زیندەوەر، تەنانەت لە جووڵەی نە پێوراوی تەنۆکە ورد و لەڕادەبەدەر زلەکان تێبگەین؟ ئاشکرایە کە هێزی بیرکاری تیژی بڕکردنی ئەم میکرۆ و ماکرۆ گەردوونانە ناکات. بەلانی کەمەوە دەبێت دەرگامان بۆ پەیڕەوەکانی واتای نوێ کراوە بێت تا هەر لەسەرەتاوە خۆمان لەناو قاڵبە - دۆگماکاندا نەخنکێنین.

نەست[٢] **(الحدس)**ی زیندەوەرەکان بچووک ناکرێتەوە. بە ناوی ژیان هەرچی هەبێت لە نەستدا شاراوەیە. ناکرێت بڵێین کە ئەم نەستانە دابڕاو لە میکرۆ و ماکرۆ (ورد و گەورەکان) گەردوونەکانن. ئەوەی زیاتر چەمکێکی ماقووڵە ئەوەیە کە دونیای ئەم هەستانە

---

١- زیهنی پشت ئەسنوور بە زیری ئانالیتیکی، کە زیریەکە توانایەکی بەرزی وەرگرتن و تێگەیشتنی هەیە و لەسەر بنەمای بەستنەوەی ئەنجام بە هۆکارەوە کار دەکات. واتا ئەو بەشەیە کە پێی دەگوترێت زیریاری (مَنطق) ئەم زیریە نایبەت بە مرۆڤە و لە ئاژەڵاندا بوونی نییە. سەرباری لایەنە ئەرێنییەکانی پێویستە لە زیری سۆزداری دانەبڕێت تا ڕێ لەبەر کارەسات نەکاتەوە. زیری گریمانەیی یان راڤەکاریشی پێدەگوترێت.

٢- Limitبە عەرەبی الحدس: لەلای فەیلەسوفە کۆنەکان بەواتای خێرایی پەڕینەوەی زهن لە بنەماکان بۆ داواکاری دێت. بەلام لەفەلسەفەی نوێدا چەندین مانای هەیە: لای دیکارت بەواتای پێداچوونەوەی راستەوخۆی ئەقڵ بەراستییە سروشتیەکاندا دێت، لای کانتیش پێداچوونەوەیەکی راستەوخۆیە سەبارەت بە واتایەکی ئامادە لەزهندا کە راستیەکی پارچە و بە ئەنیایە؛ لای شوبنهاوەریش ئەو مەعریفەیە کە بەبێ پێداچوونێکی ئەقڵی بەیەکجار لەزهن جێگیر بووە. ئەستگەراییش مەزهەبێکە باوەڕمەندەکانی پێیان وایە کە ئەست پێگەی یەکەمی هەیە لەپێکهاتنی مەعریفەدا.

تایبەتمەندییەکی سەرەکی گەردوونە. هەربۆیە پەیڕەوی میتۆلۆژی لە تێگەیشتنی گەردووندا ئەوەندە بێبەها نییە. لەوانەیە بەلانی کەمەوە هێندەی پەیڕەو (میتۆد)ی زانستی لە تێگەیشتنی گەردووندا یارمەتیمان بدات.

پەڕینەوە لە چەمکی میتۆلۆژییەوە بۆ چەمکی ئایینی قۆناخێکی ڕاگوزاری گەورەیە. لە نزیکەوە گرێدراوی دەست بەسەردا گرتنی گۆڕەپانی زهنییە لە لایەن ئەو وەرچەرخانەوە کە پشت بە پلەداری و جیابوونەوەی چینایەتی لەناو کۆمەڵگادا بەدیهات. پەیوەندی چەوسێنەر و چەوسێنراو پێویستی بەو دۆگمایانەیە کە لێپرسینەوە و لێپێچینەوەیان نەبێت. پێشکەش کردنی دۆگماکان لە ڕێگای بەهای تابۆکراوی لە جۆری **"دەست لێنەدراوی، گووتەی خوداوەند و پیرۆزی"**یەوە پەیوەندی بەو دەسەڵات، چەوساندنەوە، بەرژەوەندی چینایەتی و پلەدارییەوە هەیە کە شاردویانەتەوە و ڕەوایان کردووە. لە چەمکێکدا چەندە حوکمێکی وشک هەبێت، لەوێدا ئەوەندە زۆرداری و چەوساندنەوە شاراوەیە.

لە دوای چاخی میتۆلۆژیا هەڵوێستە ئایینییەکان خاوەن درێژترین ماوە و تەمەنی مێژوویین. دەشێت بە مێژووی نووسراو، یان تۆزێک بەرلەو یاخود دوای ئەو دەست پێبکرێت. ئەوەی پێویستە دەرکی پێبکرێت: بۆچی هێندە پێویستی بە دۆگمای ئایینی بینرا؟ ئاشکرایە کە ئەم هەڵوێستە پەیڕەوێک بووە. بنەمای سەرەکی بۆ ئامانجی ژیان و ڕێگای گەیشتن بە ڕاستی جوڵانەوە و ڕەفتارکردنە بە گوێرەی ئەو گوتانەی بۆ خوداوەندێک دەگەڕێنرێنەوە، کە شیمانەی هەبوونی دەکرێت و لە سەرووی سروشت و کۆمەڵگاوەیە. ئەوەی لەم فەرموودانە دەرچێت لە ژیانیدا ڕووبەڕووی زۆرەملێ و کۆیلایەتی دەبێتەوە و، دوای مردنیش دەچێتە دۆزەخەوە. واتا لە سەردەمی خوڵقاندنی خوداوەندە دەمامکدارەکان نزیک بووینەتەوە. زۆر بەئاسانی دەرکی پێدەکرێت کە ئەو خوداوەندە لە هەمان کاتدا ئەو گەورە و دەسپۆتەیە کە بە فەرمایشت و چەوساندنەوە

کۆمەڵگا بەڕێوەدەبات. لە سنوور بەدەر دەمامکدارکردنی لە نزیکەوە پەیوەندی بە فریودانی ئەقڵی مرۆڤەوە هەیە. لە سەرەتای دەرکەوتنیاندا بە پادشا- خوداوەندەکان خۆ بەناوکردنیان تەواو ئەم بابەتە روون دەکاتەوە. دواتر بە یاساکردنی گووتەکانی خۆیان، هەروەها پێشکەشکردنی وەکو حەقیقەتێکی رەها و مسۆگەر قۆناخێکی مێژوویی باوە. لەگەڵ قووڵ بوونەوەی فشار و زیادبوونی چەوساندنەوەدا، پەیڕەوی دۆگماتیکی ئایینی کرا بە رێگای سەرەکی زهنییەتی مرۆڤ. راستتر وەکو راستییەکی کۆمەلایەتی ئاوا کرا. مرۆڤایەتی بۆ ماوەیەکی درێژخایەن لە ڕێگای ئەم پەیڕەوە ملکەچی کۆیلایەتییەک کرا کە لەژێر حوکمی، ژیان تاسێنەر و وشککەری دەسپۆتە خاوەن دەمامکە خوداییەکاندا بوو.

پەیڕەوی ئایینی وەکو ڕێگایەکی راهاتنی زهنی گرنگییەکەی لەوەدایە کە لە ئەنجامی داب و نەریتی وشکی هەزاران ساڵە، وەکو کۆیلە دەستەمۆیی ئاپۆڕای مرۆڤی رەوا کرد و چەمکی قەدەرگەرایی ریشەدار کرد. چەوساندنەوەی مەزن و شەڕە نەگریسەکان لە سایەی ئەم پەیڕەوە مەیسەر کراون. بێگومان پەیڕەوی **"بە گوێرەی گووتەی پیرۆز و فەرمانەکانی خودا بژی!"** ئاسانکارییەکی مەزن بۆ ئەو کەسانە دەکات کە لە پێگەی بەڕێوەبەرایەتیدان. لێرەدا دیالیکتیکی مێگەل - شوان دروست کراوە. لێرەدا کۆیلایەتی وەک پێشکەوتنێکی دەست لێبەرنەدراوی کۆمەڵگا پێشکەش کراوە و لەمەش زیاتر لەمیانەی چەمکێکی نەگۆڕی کۆمەڵگا راستینەی سروشتی راوەستێنراوە. لە لایەکەوە چەمکی سروشت و کۆمەڵگایەکی پاسیف، لە لایەکی دیکەشەوە چەمکی بەڕێوەبەری زەبەلاح کە زۆر ئاکتیفە، هەموو شتێک دەخوڵقێنێت و دەکوژێت، کراوە بە پەیوەندییەکی دیالیکتیکی دەست لێبەرنەدراو. ئەگەر بڵێین ئەم پەیڕەوە چاخەکانی یەکەمین و ناوینی بەڕێوە بردووە زێدەڕۆییەکی ئەوتومان نەکردووە.

مەترسیدارترین لایەنی پەیڕەوی دۆگماتیک ئەوەیە: لە جیاتی چەمکی سروشتێک کە خۆی بۆ خۆی گۆڕانکاری دەکات و زیندووە، ڕێگای سروشتێکی پاسیف کە تەنیا لە میانەی فەرمانەکانی گەورەی شکۆدارەوە دەکەوێتە جووڵە بەسەر مرۆڤایەتیدا دەسەپێنێت. گرنگترین ڕەنگدانەوەش لە گۆڕەپانی کۆمەڵگادا، بە سروشتی دانانی هەمان پێکهاتەی پاسیف و بەڕێوەبەرایەتی شوانکارییە. سۆبژێکتیڤیتی[1] ئەم پەیڕەوە هەرە کۆنە لە چاخی ناوین گەیشتە لووتکە، ئیتر دونیای بەرجەستەی ئۆبژێکتیڤ[2] دەرکی پێنەدەکرا و تەنانەت بە نەبوو دادەنرا. بە گوێرەی ئەم چەمکە لە کاتێکدا دونیا وێستگەیەکی کاتی ژیانە، خەیاڵە ئەبەدییەکان (دونیای دیکە) وەکو شێوەی ژیانی بنەڕەتی و هەتا هەتایی بینراوە. کێ هەرە زێدە دۆگما و کلیشە (ئەزبەرە)کان بزانێت، ئەو بە زانا دانراوە و بەرزترین پایەی بۆ خۆی گرتووە. ئەم ڕێچکەی بیرکردنەوە کە خاوەن کارەکتەرێکی دژە میتۆلۆژییە لە جڵەوکردنی مێژوو، ژیان و بەندکردنیاندا وەکو پێشەنگێک ڕۆڵی خۆی بینیوە.

هەرچی لایەنی ئەرێنی پەیڕەوی ئایینییە ئەوەیە کە سەبارەت بە دیاردەی ئەخلاق مەودایەکی باشی بە کۆمەڵگا بڕیوە. لەم قۆناخەدا و لەژێر سایەی ئەم پەیڕەوەدا هزری باشی و خراپی دووچاری جیابوونەوەی مەزن هاتووە و حوکمی مسۆگەری بۆ دانراوە. خاڵی سەرەکی کە ئەم پەیڕەوە پەی پێبردووە، نەرمایی زهنی مرۆڤ و تایبەتمەندی شیانێتی بۆ شێوە پێدان. لە میانەی ئەم زهنیەتەوە دەرکەوتنی جیاوازی مرۆڤ لەگەڵ جیهانی ئاژەڵەکانی خوار خۆی، بناخەی پێشکەوتنی ئەخلاقە.

بێ گەڕانەوە بۆ ئەخلاق نە کۆمەڵگابوون بەدیدێت، نە کۆمەڵگا بەڕێوەدەبرێت. ئەخلاق لە پەیڕەودا بۆ کۆمەڵگا پێکهاتەیەکی دەست

---

١- لە واتای فەلسەفیدا بەکارهاتووە. واتا هەموو ئەو پێکهاتە سۆبژێکتانەی لە جیاتی ڕاستییە بەرجەستەکان پشت بە سۆز و بیر و نەستی کەس دەبەستن: کە "خۆیی" بوونیشی پێدەگوترێت.

٢- لە واتای فەلسەفیدا بەکارهاتووە. واتا پشت بەستن بە ڕاستییە بەرجەستەکان، یان هەموو شتێک کە ڕاستییەکی بەرجەستە دەگرێتەوە دوور لە سۆبژێکتیڤ بوون. "بابەتی" بوونیشی پێدەگوترێت.

لێبەرنەدراوە، تێگەیشتن و ڕاستینەی بەڕێوەبەرایەتییە. بەبێ گفتوگۆکردنی ناوەڕۆکی ئەرێنی و نەرێنی ئەخلاق، پێشکەوتنێکی بەم جۆرە دەبێت وەکو لایەنی دەست لێبەرنەدراوی تێگەیشتنی کۆمەڵایەتی لە قەڵەم بدرێت. بێگومان ئەخلاق زاراوەیەکی میتافیزیکییە[1]، بەڵام ئەم تایبەتمەندییە هەبوونەکەی بێ نرخ و بێواتا ناکات. بە گوێرەی ئەخلاقە سەرەتاییەکەی چاخی نیولیتیک دەتوانرێت باس لە باڵابوونی ئەخلاقی میتافیزیک بکرێت. ئەمەش بە زێدەڕۆیی دانانرێت. کۆمەڵگایەکی مرۆیی بێبەری لە ئەخلاق، یان وەکو ئەو دیناسۆرانەی بەهۆی نەهێشتنی لەوەڕ کۆتاییان بە بنەچە (نسل)ی خۆیان هێنا کۆتایی هێنانی مرۆڤە بە جۆری خۆی، یان کۆتایی هێنانە بەو ژینگە ژیاندارەی کە هەیە. هەردووکیشیان دەچنەوە سەر هەمان ڕێگا، لە ئەنجامدا مرۆڤیش دەبێتە جۆرێک کە چیتر ناتوانێت درێژە بە هەبوونی خۆی بدات. هەر ئەم داڕووخانە گەورەیەی ئەخلاقە کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا کێشەکانی ژینگەی بە لێواری کارەسات گەیاندووە.

تەنیا لە ئایینە سەرەکییەکان (ئاسمانییەکان)دا نییە، بەڵکو هزری یۆنانی کۆن پەیڕەوی دۆگماتیکی زیاترە. جێگای پەیڕەوی دیالیکتیک و هەڵوێستی واقیعی زۆر سنووردارە. پەیڕەوی زاڵی ئایدیالیستانەی ئەرستۆ و ئەفلاتون بەهێزترین کۆڵەکەی پەیڕەوە ئایینییە دۆگماتیکەکانی چاخی ناوینە. پەسەندکردنی ئەفلاتون وەکو گەورەترین فەیلەسوف تەنانەت وەکو خولقێنەری ئایدیالیزم، کردوویەتی بە کەسێکی خۆشەویستی نزیک بە هەڵوێستی پێغەمبەرانە. فەیلەسوفێکی هەرە نزیکە بە پێغەمبەرایەتی.

هەڵوێستی پێغەمبەرایەتی هەرسێ ئایینە مەزنەکەش

---

١. زاراوەیەکی فەلسەفیە. لە سەرەتای دەرکەوتنیدا بە واتای بۆچوونەکانی سەروو یان ئەودیو سروشت (ما وراء الطبيعة) بەکاربەهێنرا. ئەم واتایەی وایکرد کە زۆر تێکەڵی لەگەڵ ئایدیالیزم و ڕۆحگەرایی پەیدا بکات و جیهانبینیەکی دواکەوتووی لێبکەوێتەوە. لە چاخەکانی ناویندا بە زانستی خودایی پێناسە کراوە. دواتر لە لایەن دیسکارتس ەوە وەک هەبوونی دوو جیهانی جیای مادده و زەهنێک کە بیر دەکاتەوە لێکدرایەوە و پەیوەندی نێوان دوو جیهانەکەشی وەک پەیوەندی نێوان ڕۆح و جەستە پێناسە کرد. بە دوایدا مۆناد لەیبینز وەک ناوی حەقیقەتی کۆتایی نەنە ناکۆتا بچووکە ڕۆحییە ماددییەکان بەکاریهێنا و وەک باڵادەستبوونی یەکگرتن و یەکێتی هەردوو جیهانەکە لێکیدایەوە.

سەبارەت بە پەیڕەوی دۆگماتیکیانەی نەگۆڕ لە هەمان مەودای دامەزرێنەریدایە. ئەو لایەنەیان کە دەرکەوتۆتە پێش، بوونیانە بە ئەندامی دامەزرێنەری ئەخلاقی میتافیزیکی. لای بودا، زەردەشت، کۆنفۆشیوس و سوقرات ئەخلاق دەگاتە لووتکە. بە تایبەتی لە زەردەشتایەتیدا چاکە ـ خراپە وەکو فەلسەفەی بنەڕەتی هاوتای رووناکی ـ تاریکی بینراوە. مرۆڤایەتی لە کەسایەتی ئەم دانا و بەها گەورانەی مێژوودا قۆناخێکی گەورەی ئەخلاقی بڕیوە.

چەمک و میتۆدی زانستی، رۆڵێکی گرنگیان بینی لەوەی سەرمایەداری لەسەر ئاستی جیهاندا ببێت بە سیستەمێک. لە میانەی چەمکی پەیڕەوی نوێ کە (رۆجەر باکۆن[1]، فرانسیس باکۆن[2] و دیکارت[3]) پێشەنگایەتیان کرد، بە تایبەتی ئاماژە بە جیاوازی نێوان ئۆبژە[4] و سۆبژە[5] دەکرێت. لە پەیڕەوی دۆگماتیکی چاخەکانی ناوین، جێی ئۆبژە و سۆبژە نییە، هەبوون و نەبوونیان دیار نییە.

ئەورووپای رۆژئاوا کە لە رێگای رێنسانسەوە هەستایە سەر پێ، لە میانەی ریفۆرم لە ئایینی کرستیانی و شۆڕشی رۆشنگەرییەوە سەردەمێکی نوێی بۆ دۆخی ئۆبژە و سۆبژە کردەوە. سۆبژێکتیڤێتی[6] مرۆڤ و ئۆبژێکتیڤێتی[7] دونیا وەک دوو فاکتەری بنەڕەتی دەبنە

---

١ـ Roger Bacon رۆجەر باکۆن فەیلەسوف و زانایەکی ئینگلیزە، لە سالانی (١٢١٤ـ ١٢٩٤ ) ژیاوە، بە باپیرەی فرانسیس باکۆن ناو دەبرێت، بە میری هزری زانستی چاخی ناوین دادەنرێت، زانستی تاقیکاری پەیرەو کردووە؛ چەندین پێشبینی لەبواری ئەستێرەناسی، جوگرافیا و میکانیکی بەدیهاتووە، ئەنجامی گرنگیشی لەبوارەکانی کیمیا و پزیشکی چاو بەدەست هێناوە.

٢ـ Francis Bacon فەیلەسوف و پێشەنگی هزری زانستی تاقیکارییە. ئینگلیزە و لە سالانی (١٥٦١ — ١٦٢٦)دا ژیاوە. بە پێی هەندێک لە شارەزایانی مێژووی فەلسەفە ئەم پێشەنگی فەلسەفەی مۆدێرنە نەک دیکارت.

٣ـ Rene Descartes زاناو فەیلە سوف و مامۆستایەکی بیرکارییە، لە سالی ١٥٩٦ دا لە فەرەنسا لەدایک بووە و لە سالی ١٦٥٠ دا لە هۆڵەندا کۆچی دوایی کردووە. دوای گەڕان ، شەڕ و ماجەرایەکی پازدە سالی سیستەمێکی فەلسەفی دروست کرد کە هزری رۆژئاوایی سەرەو ژێر کرد. هەرچییەک فێر بوو بوو؛ بیستبووی و بڕوای پێکردبوو سڕییەوە و گومانی لە هەموو شتێک کرد. تاکە شتێک کە دڵنیا بووە لە بوونی "هزر" بووە. گەردوونی بە پێی بیرنەکەمەوە کەواتە من هەم لێکدایەوە. بەرهەمەکانی: دووان لەسەر میتۆد، چەند رێسایەکی پەیڕەوی ئەقڵی، بنەماکانی فەلسەفە، هزرە میتافیزیکیەکان، خولیاکانی رۆح، شتێکی رەها هەیە.

٤ـ لە واتا فەلسەفیەکەدا بەکارهاتووە. هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە لە جیهانی دەرەوەی کەس و سۆبژەکاندا وەک پارچەیەکی بەرجەستەی جیهان لەبەردەم زانابیماندا بوونیان هەیە

٥ـ لە واتا فەلسەفیەکەیدا بەکارهاتووە. هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە زانیارییەکی بەرجەستە نین؛ بە زانایی ، خەیاڵ و هەست دەرکیان پێدەکرێت.

٦ـ دۆخی نابەرجەستەیی و واتایی بوونی شتێک.

٧ـ دۆخی بەرجەستەیی بوون؛ یان واقعێک کە لە دەرەوەی خودی تاکدا هەیە

بەردی بناخەی ژیان. ئەو پەیڕەوە دوگماتیکییەی گووتەی خوداوەند بە بنەما دەگریت، پێکەوە لەگەڵ ئەخلاقدا هەردووکیان گرنگی خۆیان لە دەست دەدەن. ڕاستتر بڵێین لە جێگای پادشا داپۆشراو و خوداوەندە دەمامکدارەکانی جاران، قۆناخی پادشا ڕووت و خوداوەندە بێدەمامکەکان دەست پێدەکات. لێرەدا بزوێنەری سەرەکی، شێوازی داگیرکاری سەرمایەدارییە. ئەو قۆستنەوەیە (استغلال)ی لەژێر ناوی قازانجدا پێشدەخریت، پێویستی بە گۆڕینی هەمەلایەنەی تێگەیشتنی کۆمەڵگا هەیە. هۆکاری سەرەکی شاراوە لە پشت **"پەیڕەوی زانستی"** نوێوە ئەم ناچاری یان پێویستییەیە. مرۆڤایەتی و سروشت ڕووبەڕووی خراپ بەکارهێنانێکی یەکجار مەزن دەبێتەوە. ویژدان (ئەخلاق)ی کۆمەڵگا کە زوو بە زوو ئەم ڕەوشە پەسەند ناکات، مەگەر لە ڕێگای گۆڕانکارییەکی زهنییەوە سەرلەنوێ بونیاد بنرێتەوە. هەربۆیە وەک ڕێگایەکی سەرەکی ڕاستی ڕۆڵێکی مەزن دەکەوێتە سەر شانی **"پەیڕەو"**. هەروەکو دەزانرێت لەپێناو گۆڕانکارییەکی ڕیشەییدا **"دیکارت"** دووچاری نەخۆشییەکی مەزنی گومان کردن هاتووە، گومانی لە هەموو شتێک کردووە، هەر بۆیە پەنای بۆ حوکمی **"بیردەکەمەوە، کەواتە من هەم"** بردووە. ئەوەش دەزانرێت کە باکون (ڕۆجەر و فرانسیس) گرنگییەکی زۆریان بە ئۆبژێکتیڤیتی داوە. یەکەمیان ڕێگا لە پێش سەربەخۆ بیرکردنەوەی تاک دەکاتەوە، دووەم ڕێگا لە پێش ئەوە دەکاتەوە کە مرۆڤ چۆن دەخوازێت وەها ڕەفتار لەگەڵ ئۆبژەکاندا بکات.

لە پەیڕەوی زانستیدا پێویستە سەرلەنوێ و بە شێوەیەکی قووڵ بیرۆکەی ئۆبژێکتیڤیتە شرۆڤە بکرێت. لە دەرەوەی هزری ئەنالیتیکی، بە جەستەی مرۆڤیشەوە پێناسەکردنی تەواوی سروشت، گیاندار و بێ گیانەکان وەکو ئۆبژە، ئەمە لە بنەڕەتدا ڕۆڵی کلیل دەبینێت لە چەوساندنەوەی کۆمەڵگا و سروشت و کەوتنە ژێر هەژموونی سەرمایەداری. تا جیاوازی نێوان ئۆبژە و سوبژە قووڵ نەکرێتەوە

و رەواییەکی گەورەی پێدەدرێت، گۆرینی زهنی بە گوێرەی چاخی نوێ فەراهەم نابێت.

لە کاتێکدا سۆبژە فاکتەری هەرە سەرەکی و رەوای هزری ئەنالیتیکە، ئۆبژە فاکتەرێکی **"ماددی"**یە کە دەتوانرێت هەموو جۆرە خراپەکارییەکی لەسەر بکرێت. بە گووتەیەکی دیکە نوێنەرایەتی **"ئۆبژەکتیڤیتی"** دەکات. لەپێناو ئەم جیاوازییەدا شەڕی مەزن کراوە. نابێت شەڕی نێوان کلێساو زانست تەنیا وەکو ململانێیەک لە بارەی **"راستی"**یەوە ببینرێت. تێکۆشانێکی مەزنی کۆمەلایەتی لەژێر ئەم شەڕەدا شاراوەیە. بە واتایەکی دیکە کێشمەکێش و ململانێی نێوان کۆمەلگای کۆنی بارگاوی بە ئەخلاق و کۆمەلگای سەرمایەداری رووت و داماڵراو لە ئەخلاق جێی باسە. مەسەلەکە تەنیا ململانێی نێوان زانست و کلێساش نییە. لێرەدا بەشێوەیەکی گشتی دوو شت پێکەوە جێی باسن، یەکەمیان سیستەمێکە بە درێژایی مێژووی خۆی پارێزگاری لە وێژدانی کۆمەلگا کردووە، قوستنەوە(استغلال) ی قەدەخە کردووە، نەفرەتی لێکردووە و بەگوناحی داناوە، دووەمیان پرۆژەی نوێی سەرمایەدارییە بۆ کۆمەڵگا کە تا دوایی کۆمەڵگا بۆ چەوسانەوە و هەیمەنە دەکاتەوە و هیچ قەدەخە، گوناح و تاوانێک ناناسێت. **"هەلوێستی ئۆبژەکتیڤ"** زاراوەی سەرەکی ئەم پرۆژەیە.

لەژێر بۆچوونی **"ئۆبژێکتیڤ"**یتیدا هیچ بەهایەک نییە، کە **"هزری ئەنالیتیک"** نەیخاتە ژێر نەشتەرگەرییەوە. نەک تەنیا رەنجی مرۆڤ، تەنانەت تەواوی سروشتی زیندوو و بێ گیان دەستیان بەسەردا دەگیرێت و دەکرێنە موڵک. دەکرێنە بابەتی لێکۆلینەوە و لێتوێژینەوە، تا هەموو جورە چەوسانەوەیەکیان رەوا بێت. بەدەر لە سۆبژە بژاردەکان هەموو شتێک وەکو میکانیک هەلدەسەنگێنرێت، بێرەحمانە دەخرێتە ژێر هەیمەنە و قۆستنەوەوە. تاک ـ هاوولاتی ـ نەتەوە ـ دەولەت کە وەکو سۆبژدیەکی سەرەکی بەرامبەر کۆمەلگا و سروشت خۆی رێکخستووە، ئەو **"دۆزینەوە نوێیانەن"** کە

بەوێنەی خوداوەندە بێدەمامکە نوێیەکان هەر لە کۆمەڵکوژیەوە تا دەگاتە گۆڕینی ژینگە بۆ دۆزەخێک کە دەرفەتی ژیانی تێدا نەمێنێت، ئامادەن هەموو جۆرە سەر شێتییەک بکەن. **"لیڤی ئەتهان"**[1]ی کۆن هاربووە. هیچ شتێک نامێنێت پارچە پارچەی نەکات، حوکمی نەکات. دەبێت ئەو راستییە بەدی بکرێت کە بینینی هەڵوێستی ئۆبژەکتیڤ وەکو بیرۆکەیەکی یەکجار بێ تاوانی پەیڕەوی زانستی، بووە رێخۆشکەری کارەسات، لادان و کۆمەڵکوژییەکی زۆر دڕندانەتر لە کۆمەڵکوژییەکانی دادگاکانی ئەنگیزاسیۆنی[2] چاخەکانی ناوین. دەبێت بە جەخت کردنەوە ئاماژە بەوە بکرێت کە هیچ زاراوەیەکی زانستی بێتاوان نییە.

تا دەرک بەو راستییە نەکرێت کە خودی پەیڕەوی زانستی بۆ خۆی ئامرازی گەورەترین دابەشبوون و پارچەبوونی چینایەتییە، ڕەوشی ئیفلیجی، لە کارکەوتن و ئیفلاسکردنی کۆمەڵناسی رۆژگاری ئەمرۆمان روون نابێتەوە. بە شێوەکی روون و ئاشکرا دەبێت ئەوە بڵێم: **"پەیڕەی زانستی"** ئۆبژێکتیڤ رۆڵێکی دیاریکەری هەبوو لە ئیفلاسکردنی **"سۆسیالیزمی زانستی"** دا کە خۆی بە بانگەشەترین زانستی کۆمەڵناسی دادەنا و منیش سەردەمانێک بەم جۆرە سەیرم دەکرد.

سۆسیالیزمی زانستی و تەواوی لقەکانی دوای پراکتیکێکی درێژخایەن و ئاواکردنی سیستەمی کۆمەڵایەتییان، لە ناوەوە هەڵوەشانەوەیان یاخود گۆڕانیان لە سەرمایەداری دەوڵەتەوە بۆ سەرمایەداری تایبەت، بۆ **"پەیڕەوی زانستی"** و چەمکی بە ئۆبژە کردنیان دەگەڕێتەوە کە لە بناخەکەیاندا هەبوون. کاتێک شوێنی

---

١ـ Leiviathan بە گوێرەی تەورات لیڤی ئاتهان دڕندەیەکە لە شێوەی نەهەنگدایە و لە دەریادا دەژی و هەموو شتێک قووت دەدات. بۆ یەکەمین جار لەلایەن تۆماس هۆبزەوە بەواتای دەوڵەت و دەسەڵاتی ستەمکارانە بەکارهێنرا، تەنانەت پەرتووکێکی بەم ناوەوەیە.

٢ـ Engizisyon واتا لاتینیەکەی پشکنین (تفتيش)ە: سیستەمێکی دادگایی سەربە کەنیسەی کاسۆلیکی بووە. ئەنگیزاسیۆنی چاخی ناوین لە رووی سیاسی و ئاینی بڕیارییەوە یەکێکە لە بەناوبانگترین ئەنگیزاسیۆنەکان کە دامەزراندنەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی ١٢٣١ز. لەم دادگایەدا هەر کەسێک بە تاوانبار بگیرایە ئەشکەنجە دەکرا تا دانی بە تاوانەکەیدا دەنا. ئەگەر دانی بە تاوانەکەیدا نەنایە دەکوژرا کە دانیشی پێدا بنایە لە زینداندا دەرزی.

هات به‌ به‌رفراوانی ئه‌م بابه‌تانه‌ روون ده‌كه‌مه‌وه‌. ئه‌گه‌ر نا هیچ كۆمانیك له‌ نیاز پاكی و دڵسۆزیی ئه‌و كه‌سانه‌ ناكرێت كه‌ به‌باوه‌ڕی و هه‌وڵێكی مه‌زنه‌وه‌ جێگای خۆیان له‌ناو تێكۆشانی سۆسیالیزمدا گرت.

ته‌واوی ئه‌و بونیاده‌ زانستیانه‌ی رۆڵی له‌پێشینه‌ به‌ جیاوازی ئۆبژه‌- سۆبژه‌ ده‌ده‌ن زۆر گرێدراوی سه‌ربه‌خۆیی خۆیانن. به‌ جۆرێك بانگه‌شه‌ی ئه‌وه‌ ده‌كه‌ن، كه‌ له‌ سه‌رووی هه‌موو جۆره‌ نرخ و به‌هایه‌كی كۆمه‌ڵاتییه‌وه‌ هه‌ڵسوكه‌وت ده‌كه‌ن. گه‌وره‌ترین له‌ رێ لادانی ئه‌نجامدراو به‌ ناوی زانسته‌وه‌، له‌م بانگه‌شانه‌دا شاراوه‌یه‌. له‌وانه‌یه‌ له‌ هیچ سه‌رده‌مێكدا، هێنده‌ی چاخی سه‌رمایه‌داری ناوێته‌بوونی زانست له‌گه‌ڵ سیسته‌می زاڵدا نه‌بینرابێت. هه‌ر له‌ په‌یڕه‌وه‌وه‌ تا ناوه‌ڕۆك زانست گه‌وره‌ترین هێزی بوونیادنان و باراستن و ره‌واكردنی سیسته‌مه‌. په‌یڕه‌وی زانستی سه‌رده‌می سه‌رمایه‌داری و ئه‌و زانستانه‌ی له‌سه‌ر ئه‌و بنه‌مایه‌ن، هێزی سه‌ره‌كی رێخۆشكه‌رن بۆ ئه‌و میكانیزمی قازانجه‌ی سیسته‌م كه‌ له‌ ئه‌ڵقه‌كانی ده‌ره‌وه‌ و ناوه‌وه‌ی كۆمه‌ڵگادا رێگا له‌ پێش قه‌یران، نیش و ئازار، برسێتی و بێكاری، زیادبوونی ژماره‌ی دانیشتوان و شه‌ڕ ده‌كاته‌وه‌. گووته‌ی **"زانست هێزه‌"** به‌ شانازییه‌وه‌ گوزارشت كردنه‌ له‌م راستییه‌.

له‌وانه‌یه‌ بگووترێت: **"باشه‌ چی خراپ له‌مه‌دا هه‌یه‌؟"**. له‌و سیسته‌مه‌دا كه‌ خۆی به‌ قه‌ڵغانی بێتاوانی و ره‌وایی پێچاوه‌، ده‌نگدانه‌وه‌ی ئه‌م جۆره‌ ده‌نگ و داوه‌ریانه‌، به‌ هه‌ڵوێستێكی هه‌ره‌ سروشتی داده‌نرێت.

ئه‌گه‌ر له‌ رۆژگاری ئه‌مڕۆماندا ته‌واوی پارۆمه‌تره‌كانی سه‌رمایه‌داری هێمای به‌رده‌وامنه‌كردن پیشان ده‌ده‌ن، خاوه‌نی گه‌وره‌ترین رۆڵی ئه‌م ره‌وشه‌ **"په‌یڕه‌وی زانستییه‌"** هه‌ر بۆیه‌ له‌و په‌یره‌وه‌وه‌ كه‌ پشتی پێده‌به‌ستێت و له‌و **"دیسپلینه‌ زانستییانه‌وه‌"** كه‌ دایهیناون، ره‌خنه‌كردنی سیسته‌م گرنگی و بایه‌خێكی ژیانی

هەیە. بە رەخنەی سوسیالیستەکانیشەوە لاوازی رەخنەی تەواوی سیستەمەکان، بەکارهێنانی هەمان پەیڕەوە کە سیستەمی خولقاندووە و بڕبڕەی پشتێتی. هەڵبەتە رەخنەکردنی راستییەکی کۆمەڵایەتی بە هەمان ئەو پەیڕەوەی کە پێی دامەزرێنراوە هەر هەمان ئەنجامی لێدەکەوێتەوە و هەرگیز لەوە جیاوازتری لێناکەوێتەوە. ئەوانەی بەو رێگایانەدا دەڕۆن کە پێشتر زانراون و دۆزراونەتەوە و دەستنیشان کراون، جگە لە گەیشتن بەو گوند و شارانەی ئەو رێگایانە پێی دەگات بە شوێنێکی دیکە ناگەن. بە سۆسیالیزمی زانستیشەوە، ئەمەیە کە بەسەر هەموو رکابەرانی سیستەمدا هاتووە.

لە هەڵسەنگاندنەکانمدا بایەخێکی زۆر بەوە دەدەم کە کارەکتەری کۆمەڵایەتی و چینایەتیانەی جیاوازی ئۆبژد و سوبژە بە بنەما بگرم. چونکە ئەم دوو زاراوەیە کە بێگەرد و بێتاوان دیارن، هۆکاری پەیدابوونی ئەو مۆدێرنیتەیەن کە بە دۆخێک گەیشتووە چیتر ناتوانێت بەردەوام بێت. هەروەکو مەزەندە دەکرێت ئەم چەمکانە هیچ پەیوەندییەکی بە دەستکەوتە زانستییەکانەوە نییە. یاخود لە کارەکتەری رێژەیی بێبەری نین. بەلانی کەمەوە هێندەی پەیڕەوی دۆگماتیکی چاخەکانی ناوین، خاوەنی چەمکێکی چەقیوو و سەپێنراوی سۆبژە و سروشتە. لە میانەی پێشخستنی جیاوازییەکی روون و ئاشکرا لە نێوان ئۆبژە و سۆبژەدا، تێگەیشتن لە واتای ژیان بۆ ئاستێک دەگوێزێتەوە کە لە هی چاخەکانی ناوین دواکەوتووتر، نادیارتر و خنکێنراوترە. ژیانی مرۆڤ کە پەیڕەوی دۆگماتیک هەناسەی لەبەر بڕیوە و لە ئازادییەکانی بێبەشی کردووە، لە سەردەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا، بە پشت بەستن بە جیاوازی نێوان ئۆبژە ـ سۆبژە پارچە پارچە دەکرێت. لە تەواوی گۆڕەپان و بوارەکانی ژیاندا لە قووڵاییدا لێک جیاکردنەوەیەکی قووڵ پێشدەخرێت. لە میانەی"**دیسپلینی زانستی**" یەوە هەمووێتی (یەکگرتوویی) یەک پارچە تا دەگاتە خانەکانی پارچە پارچە دەکرێت. گەورەترین بەهای لە دەستدراو لە ئاکامی ئەم دوخەوە؛

یەک پارچەیی و پارچەنەبوونی تۆماری ژیانی کۆمەلاتییە لەگەڵ کات و شوێندا. هیچ تراژیدیایەکی ژیان هێندەی ئەم **"فشارخستنە سەر ژیان"**ە ی رۆژگاری ئەمڕۆمان لە رووی دابڕان لەجەوهەر و پاڵپشتەکانی شوێن و کاتەوە، ترسناک نییە. رووبەڕووی خراپترین جۆری چارەنووس بووینەتەوە. شێرپەنجەی کۆمەڵگا (کۆمەڵایەتی) هەڵوێستێکی ئالاگۆریانە (Allegori)[1] نییە، واتادارترین شرۆڤەکردنی سیستەمە بەرامبەر بە ژیان.

ئەم بابەتە کە پێویستی بە تاوتوێکردنێکی چڕ و تیروتەسەل هەیە، لە چوارچێوەی بەرگرینامەیەکی وەهادا مەگەر بە سنووردارێ هەڵوەستەی لەسەر بکرێت. لە میانەی رەخنەی دژ، پەیڕەوێکی نوێ پێشنیاز ناکەم. ئەمە بەو واتایەش نایەت کە بە تەواوی بێ پەیڕەوی پێشنیاز دەکەم. نەک تەنیا لە ژیانی مرۆڤدا، بەڵکو لە ژیانی تەواوی گیاندار و بێ گیانەکانی سروشتدا، دەرک بەو خاڵانە دەکەم کە رێگا، پەیڕەو و یاساکان گوزارشتی لێدەکەن و بەهاداریان دەبینم. دەبێت بە بایەخەوە ئاماژە بەوە بکەم کە هەرچەندە بەردەوام لە چەمکی پەیڕەو و یاسادا ناوەڕۆکێکی دیترمینیستی لەخۆوە دەگرێت، بەڵام زۆر سووربوون لەسەری و چەقبەستبوون پێیەوە دەبێتە مایەی مەترسییەکی وەک گەیشتن بە نکۆڵیکردن لە پێشکەوتن و ئازادی. بیر لە بوونی گەردوونی بێ یاسا و بێ پەیڕەو ناکەمەوە. بەڵام بڕوام بەوەش نییە کە گەردوون تەنیا خاوەنی سیستەمێکی ماتماتیکانەیە و میکانیزمی (دیکارت) بناخەکەیەتی. گومانێکی قووڵم هەیە کە لۆژیکی یاسا و بیرکاری تووشی نەخۆشی بوون. لێکچوونێکی زۆر لە نێوان راهیبە سۆمەرییە داهێنەرەکانی یاسا و بیرکاری و زهنییەتی زانستی رۆژگاری ئەمڕۆماندا دەبینم. لەو باوەڕەدام کە نوێنەرایەتی هەمان شارستانی دەکەن.

دژبەرایەتی کردنی پەیڕەو نە تەواو بە واتای نکۆڵیکردن لە پەیڕەو دێت، نە بە واتای گەڕان بە دوای پەیڕەوێکی ئەلتەرناتیفدا

1- بەکارهێنانی وشە و مانای گرنجاو و نواندنە بۆ ئاسانتر روون کردنەوەی مزر. مامەڵە یاخود چالاکیەک.

دێت. دەمەوێت بڵێم کراوەیی بۆ دەرفەتەکانی شرۆڤەی نزیکتر بە بژاری ژیانی ئازاد، بەهایەکی بەرزتر لەخۆوە دەگرێت. ئەگەر ئامانج گەیشتنە بە واتای ژیان، دەبێت پەیڕەو ببێتە ئامرازی گەیشتن پێی. دەوڵەتی گەورە و بەرهەمی پیشەسازی مەزن لە جیاتی بەختەوەری و خۆشگوزەرانی تەنیا شەڕ وماڵوێرانییان بۆ مرۆڤایەتی هێناوە. کاتێک بەرهەم و هێز دەبنە یەک زیاتر مرۆڤ لە واتا دوور دەخەنەوە. خاوەن موڵکەکان لە سەرووی ئەو کەسانەوە دێن کە بەردەوام گەورەترین بێ ڕێزییان بەرامبەر ژیان کردووە. لەناو کۆمەڵگادا بەردەوام بە گومانەوە سەیری کەڵەکەکردنی موڵک دەکرێت. تێپەڕاندن یان رزگاربوون لە گرفتی پەیڕەو گەوهەرێکی واتاداری هەیە: پێویستی بە لێپرسینەوە هەیە لەگەڵ ئەو سەردەم و شارستانییەی لەناویدا دەژین. لە کاتە جیاوازەکانی مێژوودا رووبەڕووی نموونەی بەرچاو دەبینەوە. تا رەخنەیەکی رادیکاڵانە ئاراستەی سەرمایەداری، پەیڕەو و لقەکانی زانستەکەی نەکرێت کە مۆرکی خۆی لە تەواوی قاڵب و دەزگا مۆدێرنەکان داوە، لەسەر ئەم بنەمایەش بەرەو سەرلەنوێ ئاواکردنەوەیەکی زانست هەنگاو نەهاوێژین کە ژیانی ئازاد نزیکتر دەکاتەوە، گەڕان بە دوای پێهەڵگرتنێکی نوێ هەوڵێکی بێهودەیە. نیازێکی وەهام نییە کۆمەک و یارمەتی پێشکەشی دووالیزمی مۆدێرن - پۆست مۆدێرنیزم بکەم. لەگەڵ ڕێزم بۆ هەموو ئەو هەڵوێستانەی لەم بارەیەوە پیشان دراون، بەڵام دیسان ئەو بڕوایە زۆر بڵاوە کە لە ناوەڕۆکی مەسەلەکە دوورن. تەنانەت وەها لێکدەدرێتەوە کە پۆست مۆدێرنیزم هەمان مۆدێرنیزمە و لەژێر پەردەی نوێدا درێژە بە هەبوونی خۆی دەدات.

شرۆڤەی خۆم لەژێر ناوی زاراوەی **"رژێمی حەقیقەت"** پێشکەش دەکەم. لە بری گەڕان بە دوای پەیڕەوێکی ئەڵتەرناتیفدا، بەدوای ڕێگای رزگاربوون لەو کێشانەی ژیان دەگەڕێم کە پڕن لە خەڵەتاندن و لە بەهای ئازادی دوورخراونەتەوە. بێگومان لە

کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا گەڕان بە دوای حەقیقەتدا بەردەوام هەبووە. لە میتۆلۆژیاکانەوە تا ئایینەکان، لە فەلسەفەوە تا دەگاتە زانستەکانی رۆژگاری ئەمڕۆمان، چەندین بژار وەکو وەلامێک بۆ ئەم لێگەڕینانە دەرکەوتن. هەروەکو چۆن ژیان لە دەرەوەی ئەم بژارانە بیری لێنەدەکرایەوە، بەلام رەوشێکی گاڵتەجاڕی نکۆلی لێنەکراویش ئەوەیە کە گرێکوێرەی کێشەکانیش لەم بژارانەوە سەرچاوە دەگرن. واتا نە لەگەڵ ئەودا دەبێت نەبێ ئەو. بەلام مۆدێرنیتەیەک کە ئێستا تێیدا دەژین جیاوازییەکی بێ وێنەی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە لە زۆر بواردا گەیشتۆتە سنوورەکانی بەردەوامنەبوون. ئەگەر زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان، نەمانی سەرچاوەکان، وێرانبوونی ژینگە، بێ سنوور گەورەبوونی درزە کۆمەلایەتییەکان، هەلوەشانەوەی پەیوەندی ئەخلاقی، دابڕانی ژیان لە کات و شوێن، ژیانی پڕ لە دلەڕاوکێ (ستریس) کە لایەنی ئەفسوونی و شاعیریانەی لە دەستداوە، کەڵەکەبوونی ئەو چەکە ناوکیانەی دەتوانێت جیهان بکاتە بیابان و جۆرە نوێکانی شەڕ کە کۆتایی نایەت و بونیادی کۆمەلگای گەمارۆداوە، لە یەک چاو تروکاندندا بژمێرین ئەوا دەزانین کە چەندە رۆژی مەحشەرێکی راستەقینە پیشان دەدەن. تەنیا گەیشتنی بەم ئاستە پیشانی دەدات کە رژێمەکانی حەقیقەت ئیفلاسیان کردووە. هەڵبەتە لە رەوشێکدا نیم کە تابلۆیەکی بێ ئۆمێد و رەشبین بنەخشێنم، بەلام لە رەوشێکدا نین کە بەرامبەر لەدەستدانی ژیان بە بەرچاومانەوە لە ناخماندا بێدەنگ بمێنین و هاوار نەکەین. با بێ ئۆمێد نەبین و خۆمان لەناو فرمێسکدا نەخنکێنین، بەلام چارەیەک بۆ ئەمە پێویستە. ئایا گەڕانمان بە دوای حەقیقەت هەولێکی بێ ئاکام و پووچ بوو، یاخود بە سەردەمی هێزەکانی تاریکیدا تێپەڕ دەبووین؟ هەڵە و چەقبەستنی گەورە لە کوێ و کەی کران؟

دلنیام لەوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بە زۆری هێزی خۆی لە بونیادە هەڵەکانی کۆمەلگا وەرگرتووە. نکۆلی لەوەش ناکرێت کە

تێکۆشانی مەزنی لە بەرامبەر کراوە. ڕەوشی ئەو سیستەمانەش لە بەرچاوە کە بە سەرکەوتوو پێشکەش دەکران. کەواتە ئایا هەر وەکو بەردەوام سیستەم بانگەشەی بۆ دەکات، ئەوەی تێیدا دەژین دونیای دوایی و ئەبەدییە؟ ئایا ناشێت دونیایەکی دیکە هەبێت؟ دەزانم ئەو پرسیارانە دووبارە دەکەمەوە کە ڕۆژانە دەکرێن، بەڵام دەبێت ئەوەش بچووک نەکرێتەوە کە توانیومە چەمکی هەژموونگەرایی و دام و دەزگاکانی ئاشکرا بکەم، هەر لە شرۆڤەی ئابووری و دەسەڵاتەوە تا جوانی و حقوق، لە زۆر خاڵی هەڵەی پەیڕەوەوە تا چەوتی دسپلین (لقەکان)ی زانست. ئاشکرا بکەم. لەم بارەیەوە هێزی تاقیکردنەوەی ئەزموونێک لە خۆمدا دەبینم. ئەمە وەکو ئەرکێک و قەرزێک دەبینم بەرامبەر بەهاکانی ئازادی کە پێویستە پیشان بدرێن.

وەکو ڕستەی دەستپێک بۆ بابەتەکە دەبێت ئاماژە بەوە بکەم کە پارچەکردنی لە جۆری سۆبژەکتیڤ ـ ئۆبژەکتیڤ، ئایدیالیست ـ ماتریالیست، دیالیکتیک ـ میتافیزیک، فەلسەفی ـ زانستی و میتۆلۆژی ـ ئایینی وەک ئەو قاڵبە سەرەکییە دوانیانەی بەسەر هزری مرۆڤدا زاڵن، واتایان لاواز و لاڕێ کردووە. هەڵەی سەرەکی لە پەیڕەودا کە ڕێگای لە پێش مۆدێرنیتەی سەرمایەداری کردۆتەوە، قووڵ کردنەوەی ئەم دوالیزمانەیە. لەم چوارچێوەیەدا پێشکەوتن و پێشخستنی هزر و باوەڕییەکان لە لایەن قۆرخکاران و دەسەڵاتدارانەوە بەردەوام بە درێژایی مێژووی شارستانی پشتگیری لێکراوە، لەبەرئەوەی ڕۆڵێکی سەرەکییان بۆ درێژە پێدانی ئەو سیستەمانە داوەتێ کە بونیادیان ناوە لە سەردەمی سەرمایەداریدا گەیشتۆتە لووتکە. شرۆڤەکردنی ئەم دووالیزمانە وەکو مێژوویێکی نابەرجەستە (ئەبستراکت) بە شێوەیەکی سەرەکی لە خزمەتی سیستەمی چەوسانەوە و دەسەڵاتدایە کە لەسەر کارە. ئەگەر زهنییەتی مرۆڤایەتی لەم دوالیزمانەدا نەگەوزێنرایە هیچ دەسەلات و سیستەمیکی قۆستنەوە لە مێژوودا هێندە بە کاریگەر

نەدەبوو. درێژەدان بە شەڕی زهنی لە بازنەی ئەم دووالیزمانەدا وەک شەهوەت ڕێگا لە پێش ئارەزووی چەوسانەوە و دەسەڵات دەكاتەوە. گەڕیدەكانی حەقیقەت بە گوێرەی ڕادەی سەركەوتنیان لەم دووالیزمانەدا بەردەوام لە لای خاوەن دەسەلات و ناوەندەكانی چەوسانەوە جێگای تایبەتیان بۆ خۆیان دۆزیوەتەوە. گووتەی **"حەقیقەت دەسەڵاتە، دەسەڵات حەقیقەتە"** ئەوپەڕی كاری پێدەكرێت. ئەو ڕژێمەی حەقیقەت كە لێرەدا جێگای باسە پتەوترین هاوپەیمانی ڕژێمی سیاسی و قۆستنەوەیە. ئەنجامی ئەم ڕێكەوتنە فشار و قۆستنەوەیەكی زیاترە. دەرئەنجامی ئەمەش وونبوونی ژیانی ئازاد و واتادارە.

لە حاڵەتێكی وەهادا وەكو پەیڕەو دەستبەردان لەم ڕژێمەی حەقیقەت یەكەمین كاری جددیمانە كە پێویستە بكرێت. لە ڕاستیدا راوەستەیەكی نێگەتیف پێویست دەكات: دەبێت لە هەموو لایەكەوە نەرێنیانە هەلسوكەوت لەگەل ڕژێمی حەقیقەتی سیستەم بكرێت! باس لە سەنگەر گرتنێكی وشک ناكەم. بەڵكو باس لە پێویستی دژە ڕاوەستەیەک دەكەم كە بە شێكاركردنی دەكرێت. نەک تەنیا بەرامبەر تۆڕەكانی دەسەڵات، بەلكو بەرامبەر بە گشت ناوەندەكانی چەوسانەوە، كاتێک لە هەموو شوێنێک بەرخودانێكی واتادار و هەوڵی ئاواكردنی جڤاتەكانی پێشبكەوێت، ئەو كاتە سیستەم لە خاڵی هەستیار و لاوازیدا دەستگیر دەكرێت و هەڵوەشانەوەی دەست پێدەكات. تەواوی بونیادە كۆمەڵایەتییەكان بەرهەمی زهنییەتن.بە پێچەوانەی بانگەشەكان، دەست و پێ كۆمەڵگا ئاوا ناكەن. ئەگەر بەم جۆرە بوایە ئەم دونیایەی لە بەرامبەرماندایە زۆر جیاوازتر دەبوو. تەواوی ڕووداوە گرنگ و قۆناخەكانی پێشكەوتن و بونیادەكانی سەرتاسەری مێژوو وەک شاكاری ئیرادە و زهنییەتە بە كاریگەرەكان دەركەوتوون. یەكێک لە هەڵە گەورەكانی ماركسیزم ئەوەبوو: بە بێ ئەوەی شۆڕش لە گۆڕەپانی زهنیدا قووڵ بكاتەوە، شۆڕشی لە پرۆلیتاریا چاوەڕوان دەكرد كە خۆی

لەژێر چەوسانەوە و فشاری ڕۆژانەدا بوو. ئەوەیان نەبینی کە پرۆلیتاریا بۆخۆی کۆیلەیەکە سەرلەنوێ فەتحکراوە. بە تایبەتیش کەوتوونەتە ناو چەنەبازییەکی وەک **"کرێکاری ئازاد"**. بەهۆی ئەمە و هەڵەکانی دیکەیەوە ئەو ئەنجامە دەزانرێت کە مارکسیزم ڕێگای لە پێش کردۆتەوە.

کەواتە دەبێت لە ڕێی واتادان بە دەسکەوتە زانستیەکانی مرۆڤایەتیەوە چۆن زهنیەتێک بە دەست بێنین؟

بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکراتر وەڵامی پرسیارەکە بدەینەوە، پێویستە بە شێوەیەکی قووڵتر ڕاوەستەی ئەو دوو زهنییەتە بخەینەڕوو کە لە **"ئۆبژەکتیڤێتی و سۆبژەکتیڤێتی"** یەوە سەرچاوە دەگرن، بەڵام لە ئاکامدا دەچنەوە سەر هەمان ڕێگا.

یەکەمیان: هەروەکو زۆرجار بانگەشەی بۆ کراوە ئۆبژێکتیڤێتی گوزارشتێکی خودی یاساکانی کۆمەڵگا و سروشت نییە. ئەگەر بە قووڵی لێتوێژینەوەی لە باردود بکرێت و سەرنج بدرێت دەبینرێت کە یاسای ئۆبژێکتیڤێتی شێودی هاوچەرخی **"گووتەی خوداوەند"**ە. زایەڵەی دەنگی هێزی سەرووی کۆمەڵگا و سروشت بەردەوام لەم ئۆبژێکتیڤێتیەدا دەنگ دەداتەوە. هەندێکی دیکە بنی بکۆڵدرێت دەرک بەوە دەکرێت کە دەسەڵات و هەیمەنەی زۆردار و چەوسێنەران سەرچاوەی ئەم دەنگەن. زهنی ئۆبژێکتیڤ و سیستەمی ئەو دەنگەی گوێبیستی دەبێت پەیوەندی نزیکی لەگەڵ سیستەمەکانی شارستانێتی هەیە. لە لایەن ئەم سیستەمانەوە پەروەدەکراوە و بە گوێکان ئاشنا کراوە. تەنانەت ئەگەر زانیاری نوێش دەرهەق بە ئۆبژەکان بەدەست بخرێت، دەست و برد بە شوێنێکی سیستەمەوە دەلکێنرێت. هەموو دۆزینەوە و داهێنانێکی نوێ لە لایەن خاوەنەکانی سیستەمی تەکنیکەوە پێش لە ڕاگەیاندنی یان دواتر، بە هەزار و یەک ڕێگا بە سیستەمەوە دەبەسترێتەوە. ئەگەر داکۆکی لەسەر پێچەوانەکەی بکرێت، ئەوا هەر وەکو زۆرجار لە مێژوودا لە

"**ئادەم**"ەوە تا "**ئیبراهیم**"، لە "**مانی**"[1] یەوە تا "**مەنسووری حەلاج**"، لە "**ساینت پاوڵ**"[2] ەوە تا "**جیردانۆ برونۆ**"[3] روویداوە دووچاری غەزەب و توورەیی خوداوەندەکانی سیستەم دین. کاتێک ئۆبژێکتیڤیتی نزیک و لایەنگری راستی و دادوەری بێت رووبەرووی هەزاران دوژمن دەبێتەوە. ئەگەر ئۆبژێکتیڤیتی بە راستی ئەو شتە بێت کە بە چاوی دڵ هەستی پێبکرێت و ببینرێت، زۆر بەهادارە. کاتێک بە بەهای ژیانی ئازادیش ببەسترێتەوە بەردەو دانایی راستەقینەت دەبات. بەلام لەم پێناودشدا پێویستە وەکو "**مەنسووری حەلاج**" و "**برونۆ**" بوون بە جەنگاوەری هزر لەبەرچاو بگرێت.

بە شێوەیەکی تایبەتی دەبێت بزانرێت کە سەبارەت بە یاسا زانستییەکان ئەنجامێکی دوو لایەنە لە ئۆبژێکتیڤیتی بە دەست دەهێنرێت. بۆ زانین و ناسینی کامەیان هی سیستەمی دەسەلاتداری بوونیادنراوە، کامەیان رەنگدانەوەی راستییە پێویستی بە

---

١- فەیلەسوف، پیاوێکی ئایینی و دانایەکە لەساڵی ٢١٠ زایینی لە دایک بووە. هەوڵیدا ریفۆرم لە ئایینی زەردەشتی ئەنجام بدات و لەگەڵ ئایینی مەسیحی بیکات بە یەک، بەم جۆرەش مۆرکێکی گەردوونی پێ ببەخشێت. لە سەردەمی ساسانیەکان ژیاوە، دژی موغە زەردەشتیەکان تێکۆشاوە؛ چونکە لە ئایینی خۆیان لایان دابو و گرێدراوی دەسەلاتی ساسانیەکان بوون. رکابەری دەسەلات بوو. هەوڵیدا کۆتێزی ئایینەکانی (بودی، مەسیحی، زەردەشتی) ئاوا بکات. حەوارییەکی خوازیاری ئاشتی و فرەرەنگی بوو. لەلایەن ئیمپراتۆری ساسانی دەستگیرکرا؛ سەرباری ئەشکەنجەیەکی زۆر دەستبەرداری باوەڕیەکانی نەبوو. لە ژێر ئەشکەنجە لە ساڵی ٢٧٦کوژرا و کەوڵ کرا

٢- یەکێکە لە دوازدە حەوارییەکەی عیسا، لە سەدەی یەکەمی زایینیدا ژیاوە. لە زۆر لایەنەوە بۆ ئایینی کرستیانی لە دوای حەزرەتی عیسا بە دووەم کەسی گرنگ دەژمێردرێت. بە رەچەڵەک منداڵی خێزانێکی یەهودی هاوڵاتی رۆمایە. سەرەتا هەر وەک لە خێزانەکەیەوە بۆی ماوەتەوە دوژمنی ئایینی کرستیانی بووە. دواجار بۆ وەرگرتنی پەروەردەی ئایینی خێزانەکەی دەینێرنە قودس. رۆژێک دەکەوێتە سەر رێ کە بچێت لە شام سزای کرستیانییەکان بدات، لە وێدا بەرجوویەکی بەسەر دێت و حەزرەتی عیسا خۆیی پیشان دەدات. لێرەوە ئایینی کرستیانی پەسەند دەکات و دەکەوێتە بڵاوکردنەوەی لە زۆر جێی جیهان و بە تایبەتیش لە رۆژهەلاتی ناویندا. گرنگترین خزمەت کە بۆ ئایینی کرستیانی کردوویەتی: بەرتەسک مانەوەی ئایینی کرستیانی لەناو یەهوودییەکاندا بەو باوەڕەی کە نوێگەرییەکە لە یەهودیەتدا و هیچی تر شکاندووە و لە جیاتی یەهودییەکان بڵاوکردنەوەی ئایینی کرستیانی لەناو گەلی پاگاندا بە بنەما گرتووە، شێوەیەکی نوێی داوە بە ئایینی کرستیانی ، رێساکانی پەرستن و بنەماکانی باوەڕی داناوە؛ بناخەی کردنەوەی کەنیسەی داناوە، هەروەها رۆڵێکی گرنگی هەبووە لە شێوەگرتنی ئەو ئینجیلەدا کە ئەمڕۆ بە بنەما دەگیرێت.

٣- فەیلەسوف، ئەستێرە ناس، راهیبێکی ئیتاڵییە، لە نێوان ساڵانی (١٥٤٨ – ١٦٠٠)دا ژیاوە. یەکێکە لە فەیلەسوفە دامەزرێنەرە گرنگەکانی فەلسەفەی رێنسانس و بەهۆی شاعیرییەوە بە نزیکترین فەیلەسوف دەژمێردرێت لە ئەدەبەوە. وەک هزرمەندێکی جۆشی سروشت پەروەرییش بە ناو دەکرێت. یەکەم کەس بووە کە گوتوویەتی گەردوون بێ سنوور و چونیەکە و زۆر هەسارەی تر لە شێوەی زەویدا هەن. هەر لەسەر ئەمەش لەلایەن ئەنگیزاسیۆنی کەنیسەی کاتۆلیکی رۆما دەسگیردەکرێت ، حەوت ساڵ لەزینداندا دەمێنێت، سەرباری فشارو ئەشکەنجەیەکی زۆر لەبۆچوونەکانی پاشگەز نابێتەوە، دواتر لەلایەن هەمان دادگاوە دادگایی دەکرێت و بە لە رێ دەرچوویەک رادەگەیەنرێت. بە زیندوویی لەبەرچاوی خەڵک لەمەیدانی کامبۆ دیفۆری دەسووتێنرێت. کاتێک حوکمەکەی رادەگەیەنن دەڵێت "کاتێک حوکمەکەم رادەگەیەنن لەمن زیاتر ترس لە دڵتاندایە .

سەرقالبوون و بەرخودانیکی مەزنە. شێوازی هزری ئۆبژێکتیڤ کە زیاتر سەر بە هزری ئەنالیتیکە، ئەگەر لەگەڵ هزرە ساتەوەختی و نەستیەکاندا کە ژێری سۆزداری[1] سەرچاودیانە پەیوەندی نەبێت، ئەوا رۆڵی دووەمین دیناسۆری مێژوو دەبینێت. ئەو درندەیەی بۆمبی ئەتۆمی دروست کرد، ڤێرسیۆنی[2] (نوسخەی) نوێی لیڤی ئەتهانی کۆنە کە بونیادی هزری ئەنالیتیکی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پرچەک و تەیاری کردووە. بەرپرسیاری ئەو تابلۆ نەرێنییەی باسم کرد ئەم ڤێرسیۆنە نوێیەیەتی. کاتێک خوداوەندە نوێیە بێدەمامکەکە کە بە شێوەی دەوڵەت ـ نەتەوەیە بپشکنین، لە نزیکەوە دەبینین کە هزری ئەنالیتیکی ئۆبژێکتیڤ توانای چی هەیە.

سۆبژێکتیڤی دژە جەمسەری ئۆبژێکتیڤییە، بانگەشەی ئەوە دەکات کە لە میانەی دەروون بینییەوە و بێ سوود وەرگرتن لە ئۆبژەکان بە ڕاستی دەگەین. ئەمە شێوەیەکی ئەفلاتونگەراییە. کاتێک تەنیا سەربەخۆ بەجێ بهێڵدرێت ئەویش وەکو ئۆبژێکتیڤی یەکسەر لایەنی چەق بەستن و بەهەڵەداچوونی دەردەکەوێت: ڕاستی ئەوەندەیە کە هەستی پێدەکرێت. لایەکی تا بوونگەرایی دەچێت. لای ئەو مرۆڤ بریتییە لەوەی چەندە خۆی خوڵقاندووە. سەرباری ئەوەی چەندین قوتابخانەی هزری بە ناویەوە ئاواکراون، بەڵام وەکو ئۆبژێکتیڤی ئەویش لە جێگرتن لەناو سیستەمدا درەنگ ناکەوێت. لە بەرئەوەی لە چەمکیدا دەرهەق بە کۆمەڵگا و سروشت دەکەوێتە ناو **"سۆبژێکتیڤیزم"**ەوە (نکۆلیکردن لە ئۆبژە) دەبێتە پاڵپشتێکی بەهێزی تاکرەوێتی. ئەو چەمکەی تاکی مۆدێرنیتەی خۆپەرست کردووە لە نزیکەوە پەیوەندی بە سۆبژێکتیڤیزمەوە هەیە. لە جیاتی **"من"**ێکی تەندروستانە رێکردنەوەی لە پێش تاکرەوێتی،

---

١ـ کە بە ئینگلیزی (EQ Emotional Quotient) پێدەڵێن بە کۆنترین ژێری دادەنرێت کە بە مرۆڤیشەوە لە هەموو زیندەوەراندا بوونی هەیە. ژیرییەکی مەرجدارە. پشت بەو ئەزموونانە پێشبینی دەکات و بریار دەدات کە لە هەست و نەستدا جێگیر بوون. زۆر کەم تووشی بە هەڵەداچوون دەبێت؛ بەڵام زۆر کراوە نییە بۆ فەڵەمباز و گۆڕانکاری.

٢ـ لە ئینگلیزیدا بە واتای چاپ یان وەرگێران دێت، بەڵام لە تورکیدا بە واتای وەرگرتنی نموونە لە شتێک بە دەستکارییەوە دێت.

بە ئاراستەکردنیکی بنەڕەتی وابەستەی ئاقاریکی دەکات کە بەرەو کۆمەڵگای بەکاربردن دەچیت.

سوبژێکتیڤیزم بەرپرسیارە لە بیری چەقبەستوو و سەپێنراوی **"چەندە تاکڕەویتی، هێندە حەقیقەت"**. سیستەمی سەرمایەداری زور قەرزاری ئەم بونیادە هزرییەیە. لە سەرووی هەموویانەوە رەنگدانەوەی ئەم شێوازی هزرە لە ئەدەبدا و ئینجا لە جیهانی هونەردا بە خولقاندنی دونیای وەهمی[1] ئەنجامگیر بووە. لە ڕێگای پیشەسازییەوە هونەر تەواوی کۆمەڵگا دەخاتە ژێر کاریگەری خۆی، بە زیادەوە ئەو مەشروعییەتە دابین دەکات کە سیستەم پێویستی پییەتی. بە هێشتنەوەی سات بە ساتی کۆمەڵگا لەژێر بۆمباباراني جیهانی خەیاڵدا، توانای بیرکردنەوەی گەوهەرییانە بەردەوام ڕووبەڕووی وون بوون و لەناوچوون دەکرێتەوە.

**حەقیقەت بۆ دونیایەکی کۆپی کردن(سیمولاسیۆن)[2] بچووک دەکرێتەوە. واتای جیاوازی نێوان رەسەن و کۆپیەکە نامێنێت.**

وەکو دەروون بینی لایەنی ئەرێنی سوبژەکتیڤی ئەوەیە کە لە نزیکەوە پەیوەندی لەگەڵ هزری سۆزدارییدا هەیە. لە بابەتی دەروون بینیدا لە ڕێی هەست و نەستەوە داهێنان لایەنێکی سەرەکییە.

لە سۆفیگەرایی و دانایی رۆژهەلاتی ناویندا لە ڕێگای پەیرەوی دەروون بینیەوە هەوڵدراوە یەکپارچەیی کۆمەڵگا و سروشت بە دەست بهێنرێت. لەمەشدا مەودایەکی باش بڕکراوە. تا ئێستاش وەکو سەرچاوەیەکی بەهێز دەتوانرێت ڕۆڵی پێبدرێت و ئاکتیف بکرێت. بەرامبەر بە ئۆبژێکتیڤیزمی رۆژئاوا سوبژێکتیڤیزمی رۆژهەلات لە رووی هەڵوێستی ئەخلاقییەوە لە بارەی کۆمەڵگا و سروشت خاوەن پێگەیەکی باڵاترە. سوبژێکتیڤیزمیش وەکو ئۆبژێکتیڤیزم بەردەوام

---

١. تورکیەکەی Sanal Dunya یە، جیهانێکە کە لە ڕێگای ئامرازە تەکنۆلۆژیەکان، بەرنامە کۆمپیوتەرییەکان و بەتایبەتیش لەڕێگای ئەنتەرنێتەوە پەیوەندی بە کەسانێک یان دەوروبەرێک دەکرێت. بەمجۆرە پەیوەندییەکی زەمەنی و شوێنی تایبەت دەبەسترێت. پەیوەندیەکی وەهمی لەگەڵ شوێن و زەمەنێکی جیاواز دەبەسترێت. وەهای لێدەکات هەست بە جیاوازی نێوان جیهانی واقیعی و وەهمی نەکات.

٢. Simulation لێکچواندن یان چۆنیەکسازی ـ لاسایی کردنەوە یان کۆپیەیەکی ساختەی ئۆرژینەکە.

دووچاری ئەو نەخۆشییە هاتووە، کە خۆی وەکو دەنگی خوداوەند پیشان دەدات. لەم لایەنەوە هەردووکیان دەبنە یەک. هەڵویستی دەرهەق بە خوداوەندی دەروونی و سەرووی سروشت، سروشت و کۆمەڵگا وای لیکردووە لە بوون بە ئامرازیکی خزمەتکردنی پادشا رووت و داپۆشراوەکان رزگاریان نەبیت کە لە جیگای خوداوەندە بیدەمامک و دەمامکدارەکاندان.

لە رۆژگاری ئەمرۆماندا، راستتر بلیین لە مۆدیرنیتەی سەرمایەداریدا ئۆبژیکتیڤیزم لە میانەی دام و دەزگاکانی زانکۆ و قوتابخانە پۆزیتیڤیستەکانەوە، سۆبژیکتیڤیزمیش لە میانەی هەموو جۆرە رۆحانییەت و دام و دەزگاکانی ئایینگەرایی شوینی خۆیان پتەو کردووە و لە هەردوو لاوە مەشروعییەت بو سیستەم دەخولقینن. هەر یەکەو لە پەیرەو و رژیمیکی حەقیقەت زیاتر رۆڵی روندان دەبینن. وەکو کادیر و دەزگاکانی بەخشینی مەشروعییەت بە دەسەڵات و قۆستنەوە هیندەی دەزگاکانی چەوسانەوە و توندوتیژی رووت رۆلیان هەیە. دووبارە ئەو هیزانەی سیستەم لە بەرامبەرماندا قووت دەبنەوە کە لەگەڵ گووتەی **"دەسەڵات حەقیقەتە، زانست هیزە"** ئاویتە بوون. لیگەرینی حەقیقەت ناوی ئەو یارییەیە کە لە سی کوچکەی یان کۆمپانیای **"سەرمایە-زانست - سیاسەت"**دا بەرجەستە بووە. لە دەرەوەی ئەم یارییە هەر لیگەرینیکی حەقیقەت دوژمنی سیستەمە، لەناودەبریت، یاخود راکیشی ناو سیستەم دەکریت و هەوڵی تواندنەوەی دەدریت. لەگەڵ

ونبوونی مەزنی واتادا بە پێگەیشتووترین قۆناخی شارستانی ماددی گەمارۆدراوین. چۆن لە ئابلۆقەی **"سەرمایە ـ زانست ـ سیاسەت"** رزگار ببین؟ ئەم پرسیارە کە فەیلەسوفەکانی ئازادی هەر لە نیچە[1] وە تا دەگاتە میشیل فۆکۆ[2] بە دوای وەلامەکەیدا گەڕاون، بە ئاسانی وەلام نادرێتەوە. دەبێت لەم فەیلەسوفانە تێبگەین، کە گەیشتوون بە داوەرییەکی وەک **"مرۆڤی مردوو و کۆمەڵگای خەسێنراو بەرامبەر مۆدێرنیتە"**. هەر وەکو چۆن کامپەکانی مردن، بۆمبی ئەتۆمی، شەڕەکانی پاکتاوی نەژادی، ویرانبوونی ژینگە، سوپای بێکاران، هەناسە لەبەر بڕینی ژیان، زیادبوونی شێرپەنجە و نەخۆشییەکانی لە جۆری ئایدز ئەم داوەریانە پشتراست دەکەنەوە، بەو ئەندازەیەش لێگەڕینی دژ دەرهەق بە حەقیقەت دەکەنە پێویستییەکی ژیانی و بە پەلە.

جارێکی دیکەش ئاماژەی پێدەکەم، رەوتەکانی سۆسیالیزمی زانستی، سۆسیال دیموکرات و رزگاری نیشتمانی کە وەکو تیۆری ئۆپۆزیسۆنە مەزنەکان هەڵدەسەنگێنرێن لە مێژە وەکو مەزهەبەکانی مۆدێرنیتە جێگای خۆیان دیار کردووە و رۆڵی خۆیان دەگێڕن. دەرک بەوەش دەکرێت کە زۆرێک لە لێگەڕینە پۆست مۆدێرنەکانیش لە بنەڕەتدا رەوتە هزرییەکانی مۆدێرنیتەن

---

١. Fredric Nietzsche فەیلەسوفێکی ئەلمانییە لەساڵی ١٨٤٤ لەدایک بووە. بە هاوڕێی زەردەشت دەناسرێت. بە بڕوای نیچە ئایین چارەسەری نییە؛ هەربۆیە لێپرسینەوە و لێتوێژینەوەی لەبارەوە ئەنجامداوە. لە فکر، ژیان و نووسینەکانیدا دژایەتیەکی توندی لە بەرامبەر نەتەوەپەرستی نازی ئەڵمانی نیشانداوە، هەروەها رکابەرایەتی تەواوی ئەو ئایدیۆلۆژیانەشی کردووە کە سووکایەتی بەتاک دەکەن، کۆسپی بۆ دادەنێن و سروشتەکەی بەربەست دەکەن. ئایدیالیزمی ئەلمانی بە نکوڵیکردن لەژیان تاوانبار کردووە، بانگەشەی دامەزراندنی فەلسەفەیەکی کردووە کە پێشوازی لەژیان دەکات. هەروەها مرۆڤی باڵای وەک نموونەیەکی بەرزی مرۆڤایەتی رزگاربوو دەستنیشان کردووە. بانگەشەی فەلسەفەیەکی کردووە کە لەباشە و خراپە دەکۆڵێتەوە، مرۆڤ لە وەهمە دروستکراوەکان و هزریش لە ساویلکەیی رزگار دەکات. لەساڵی ١٩٠٠کۆچی دوایی کردووە.

٢ـ نووسەر و رەخنەگرێکی فەرەنسی سەدەی بیستەمە. لە فەلسەفە، مێژوو، زانستی سیاسەت، کۆمەڵناسی و ئەدەب و زۆر بواری تردا نووسینی هەیە. لە ساڵی ١٩٨٤ لە پاریس کۆچی دوایی کردووە. بە یەکێک لە جەوارییەکانی نیتشە لە قەڵەم دەدرێت. لە هەڵوێستی تیژ و رادیکاڵانەیدا بەرامبەر بە سیستەمی مۆدێرنیتە بە ئاڵۆزتر دەچوێنرێت. لە ناوەرۆکی کارەکانیدا هەڵگری سۆزی ئەوەکەی تر (هەموو شتێک کە خود بە شتێکی بەدەر لە خۆیی دادەنێت)ە کە بە وێنەی نیچە ئەمیش بە شێوەی جیا جیا وێنە بەرجەستەکەی پیشان دەدات. ئەوەکەی تر بەلای فۆکۆوە هێز و سۆزێکە لە ناخیدا؛ شتێکە کە رەنگدانەوەی گۆڕانی بەردەوام و ناکۆتا دەداتە رووخساری کارەکانی و شێوە بە هەموویان دەدات.نوسراوەکانی بەهای مانیفێستۆیەکیان هەیە بۆ ئەو لە رێ دەرچووانەی بەرامبەر بە کۆمەڵگا شەڕ دەکەن. لەمانەش سەیرتر ئەوەیە کە هۆکاری لێکۆڵینەوەی سەبارەت بە پێناسە و نموونە و هزر و هەموو شتێکی لە سنوور بەدەر، سەرنج راکێشی ئەم شتانەیە بەلایەوە.

که کراسی خۆیان گۆڕیوە.

سیستەمەکان کاتێک لە لووتکەدان هەڵوەشانەوەیان دەست پێدەکات و دەڕووخێن. ساڵانی (١٩٧٠)کان گوزارشت لە قۆناخی چوونی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەرەو رووخان دەکات. لە هەمان کاتدا قۆناخی لەبەرچاو کەوتن و بە رۆژەڤبوونی پارچە بوونە لە پەیرەودا. کەوتنە گەڕی هزری ئیکۆلۆژی[1]، رەوتەکانی فیمینیزم[2] و بزووتنەوە ئەتنیکی ـ کلتوورییەکان پەیوەندی بەم قۆناخەوە هەیە. پارچەبوونی پەیڕەوی زانستی هەبوونی دونیای دیکە و بەهای شرۆڤەی ئازادی خستۆتە ڕوو. زۆر گرنگە بە دەوڵەمەندی هەستەوە پێشوازی لەم قۆناخە بکەین کە دەتوانین وەکو کائیوسیش راڤەی بکەین. گرووپە زهنییە جۆر بە جۆرەکان لەناو واقیعی بەرجەستەی خۆیاندا وەک چاوگێکی بەرخودانی مەزن لە هەر کوچەیەکی دەسەڵاتدا ببینرێت، بایەخێکی گەورەی هەیە.

دەستنیشان کردنی بە پێی ئەم قۆناخە مێژووییە لە رووی پەیڕەوە نوێ و جیاوازەکان و تیۆرەکانی حەقیقەتەوە؛ شانسی سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی کۆمەڵگا لەسەر ئاستی جڤاتەکان زیاد دەکات. ئیتر بەرجەستەکردنی یۆتۆپیاکانی ئازادی و یەکسانی بە شێوەی پێکهاتە کۆمەڵایەتییە بونیادنراوەکان دەکەوێتە چوارچێوەی ئەرکە کردارییە رۆژانەییەکانمانەوە. ئەوەی پێویستە: بەهای زانستی ئەو رێگایەی گیراوەتە بەر لەگەڵ هێزی ئیرادەی ئازاد. باس لەو قۆناخە دەکەین کە ئەشقی حەقیقەت لە ژیانی ئازاد نزیکبۆتەوە. دروشممان ئەمەیە: **حەقیقەت ئەشقە، ئەشق ژیانی ئازادە!**

کەواتە هەتا وەکو هەم وەک پەیڕەو، هەم وەک رژێمی حەقیقەت بە ئەشقەوە نەکەوینە شوێن ژیانی ئازاد، نە بە زانیاری پێویست دەگەین، نە دەتوانین پێشەنگایەتی نوێ و دونیای کۆمەڵایەتیمان

---

١ـ Ecology توێژینەوەیەکی کردارییە سەبارەت بە دابەشبوون و گونجانی بوونەوەرە زیندووەکان لەگەڵ ژینگەکەی دەورووبەریان. وەک زاراوە لە دوو وشەی یۆنانی oikos بە واتای (جێنشین یان ژینگە) logos بەواتای (زانست) دێت. یەکەمین جار لەساڵی ١٨٧٤لەلایەن زانای بایۆلۆژی ئەرنست هایکل بەکارهاتووە. بە واتای ژینگەناسی، ژینگەپارێزی بەکار دەهێنرێت.

٢ـ Feminizm

بوونیاد بنێین. لەژێر ڕوشنایی ئەم گریمانانەدا با لە نزیکەوە لێکۆڵینەوە لەسەر بەدەست هێنانی زانیاری و پێکهاتە پێشەنگەکان بکەین.

بە ڕەتکردنەوەی لایەنە سەرەکییەکانی بیری **"باکۆن و دیکارت"** دەست بە لێکۆلینەوەکەمان دەکەین. دوای ڕەتکردنەوەی دووڕیانی ئۆبژە ـ سوبژە و ڕۆح ـ جەستە، بە بنەماگرتنی مرۆڤ دەشێت لە هەموو ڕوویەکەوە گونجاوترین سەرەتا بێت. هەر وەکو چۆن باس لە دونیایەک ناکەین کە مرۆڤ ناوەندەکەیەتی، بە هەمان شێوە بابەتەکەمان لەسەر هەڵویستێکی هیومانستانە(مرۆڤ دۆستانە)ش نییە. بەڵکو لە بابەتەکەماندا کۆی هەموو ئەو ڕاستیانە دەکەینە ڕۆژەڤ کە لە مرۆڤدا کەڵەکە بووە.

١. گەردیلە کە بەردی بناخەی پێکهاتەی ماددەیە، چ وەک ژمارە چ وەک ڕیزبەندی، لە مرۆڤدا دەولەمەندترین هەبوون و مۆڵ بوونی هەیە.

٢. خاوەنی توانای باڵای نوێنەرایەتی کردنی تەواوی پێکهاتە ئاژەڵی و ڕووەکییەکانی جیهانی زیندەوەرانە.[1]

٣. پێشکەوتووترین شێوەی ژیانی بە کۆمەڵی خوڵقاندووە.

٤. نوێنەرایەتی جیهانێکی زهنی ئێجگار نەرم و ئازاد دەکات.

٥. دەتوانێت میتافیزیکیانە بژیت.

**ئاشکرایە نموونەیەکی وەها کە تێکهەڵکێش و یەک پارچە تەواوی ئەم تایبەتمەندیانەی لە یەک کاتدا تێدا بەرجەستە دەبێت، سەرچاوەیەکی زانستی بێ هاوتایە. لەناو یەک پارچەییدا تێگەیشتن لەم سەرچاوەیە (مرۆڤ) هاوتای تێگەیشتنە لەو گەردوونەی کە هەیە. بە لانی کەم بۆ تێگەیشتن بەهای سەرەتایەکی ڕاستی هەیە.**

**یەکەمیان، دەکرێت لە مرۆڤدا سەبارەت بە گەردیلە کە پێکهاتەی ماددەی لێ دروست دەبێت، پەیوەندی پێکهاتی گەرد و ناوکی**

---

[1] ـ Biology بەبنەچە گوتەیەکی یۆنانییە، وشەیBioبە واتای ژیان یان زیندوو دێت، وشەی logos بەواتای زانست دێت.

گەردیلەکان لەگەڵ زیندوویی بە باشترین شێوە ببینرێت. بە واتایەکی دیکە دەتوانرێت مرۆڤ وەک ریزبەندی ماددەی زیندوو وێنا بکرێت کە بیر دەکاتەوە. بێگومان ئەم وێنا کردنەمان هەروەکو چۆن مرۆڤ بە کۆی ماددەکان دانانێت، ماددەش وەکو پێکهاتەیەک ناگرێتە دەست کە بە تەواوی هەستی زیندوویی نییە. دروستکردنی پەیوەندی نێوان ماددەیەک کە بە گوێرەی خۆی هەستی زیندوویی هەیە لەگەڵ واتای مرۆڤێک کە کۆی ماددەکانی تێپەڕ کردووە، کێشەیەکی ئاڵۆز و دژواری واتایە. پێویستە هەر لەم تێگەیشتنەشدا بە دوای سەرچاوەی میتافیزیکدا بگەڕێین. کاتێک قاڵبوونەوەمان لەتێگەیشتندا نەرمایییەکی بێ سنووری هەبێت، دەتوانێت دووڕیانی ماددە ـ واتا تێپەڕ بکات. لەوانەیە ئامانجی هەموو شتێکی بە گیان و بێ گیان تێپەڕاندنی ئەم دووڕیانە بێت. ئامانجی ماددە واتادار بوونە، ئامانجی واتاش تێپەڕکردنی ماددەیە. دەشێت لاوازترین هەناسەی ئەشق لەم دووڕیانەدا بدۆزرێتەوە. لەوانەیە خودی پرەنسیپی **"پاڵنان ـ کێشکردن"** گوڕابێت بۆ ماددە ـ واتا. کاتێک دەڵێین ئەشق لە بناخەی گەردووندا هەیە، دەشێت مەبەست ئەم دوالیزمە بووبێت. وەها دیارە کە ئەم ئەشقە بە بەهێزترین بناخە لە مرۆڤدا جێگیر بووە.

دەخوازم ئەوە بڵێم کە: پێموایە لێکۆڵینەوەی ئەو ماددەیەی لە مرۆڤدا هەیە وەکو پەیڕەوێکی هەرە نزیک لە ڕاستییەوە دیارە. ئاستەمە و ناشێت لە تاقیگە کەنارگیرکراوەکانی مۆدێرنیتەدا بگەینە شرۆڤەیەکی نزیک لە ڕاستی سەبارەت بە ماددە. هەر وەک فیزیای کوانتەم[1] ئاشکرای کردووە پەیوەندی نێوان چاودێر و چاودێریکراو هەرگیز جێگا بە پێوانەکردن نادات. هەروەکو چۆن چاودێر ماددە دەگۆڕێت، چاودێریکراویش لە دۆخی تاقیگەدا دەتوانێت خۆی

---

١ـ کوانتەم لە لاتینیدا بە واتای شتێک یان بڕێکی دیاریکراو دێت. فیزیای کوانتەم ئەو زانستە نوێیەیە کە لە بڕێتی رەوشتەکانی ئەم جیهانەی دەوروبەرمان دەکۆڵێتەوە، بەڵکو یەکێکیشە لە بنچینە سەرەکییەکانی. لە لایەکی ترەوە دەبینین ئەم بڕێتییە گشتی نییە و لە هەموو کات و شوێنێکدا نابینرێت. ئەوەی لەمیش کەمتر سەرسوڕهێنەر نییە دوانێتی رەوشتەکانی ماددەیە. سروشتی دوانی ماددە لەوەدایە کە هەمان قەوارەی ئەن رەوشتی تەنۆکەیی و شەپۆلیشی هەیە.

لەبەر دەستی چاودێر رزگار بکات[1]. لە حاڵەتێکی بەم جۆرەدا تێگەیشتنێکی راست لە رێی خوێندنەوەی ناخی مرۆڤەوە بەدیدێت. خۆی لە خۆیدا هیچ تاقیگەیەک نییە لە مرۆڤ پێگەیشتووتر بێت. کاتێک دیموکلیتیس[2] لە رێگای ئەم پەیرەوەوە توانی گەردیلە بدۆزێتەوە، ئەوا پێشوەخت پەیڕەوی راستیشی دەستنیشان کرد. ناڵێین تاقیگەکان بەکەڵک نایەن. دەمانەوێت بڵێین جێگای پرەنیسپە بنەڕەتییەکان سەبارەت بە مرۆڤ لە دەروون بینی دایە.

دەتوانین پرەنسیپەکانمان زیاتر بەرەو پێشەوە ببەین. دەکرێت تەواوی یاساکانی فیزیا و کیمیا بەبێ کەموکوڕی لە مرۆڤدا ببینرێت. هیچ تاقیگەیەکی فیزیا و کیمیا بە ئاستی شانە دەوڵەمەنددکانی مرۆڤ ناگات. لە پێکهاتەی مرۆڤدا دەکرێت بەو یاسایانەی فیزیا و کیمیا بگەیت کە زیاتر نزیکی راستیین. هەرچی وەرچەرخانی ماددەیە بۆ ووزە یان دەوڵەمەندترین ئاوێتە کیمیاوییەکان لە بونیادی مرۆڤدا دەرکی پێدەکرێت. هەروەها دەوڵەمەندترین شێوەی خولقاندنی واتا لە پەیوەندی نێوان ووزە-ماددە دا لە مرۆڤدا هەیە. لە مێشکی مرۆڤدا یەکێتی **"ماددە - ووزە - هزر"** مان دەست دەکەوێت. هەبوونی ئەم یەکێتییە لە مرۆڤدا دەمان بات بەرەو پرسیارێکی گەورەی وەک **"ئایا دەشێت ئەمە تایبەتمەندییەکی گەردوونیش بێت؟"**

لێرەوە روون دەبێتەوە کە یەکەمین پرەنسیپمان بەوەی کە مرۆڤ بە بنەما دەگرێت تا دوا ڕادە خاوەنی پۆتانسیەلێکی دەوڵەمەندی تێگەیشتنە. هەربۆیە دەتوانرێت بە پرەنسیپێکی تەندروست دابنرێت سەبارەت بە چییەتی حەقیقەت و ڕێگای بنەڕەتی زانیاری (فێربوون) ببینرێت.

---

١- کاتێک ئەلەکترۆنێکی سەربەست لە تاقیگەدا دەخرێتە ژێر میکرۆسکۆبەوە بۆ چاودێری کردنی خێرایی جووڵەی ئەلەکترۆنەکە لە ئەنجامی ئەو رووناکییەوە کە بۆ بینینی دەخرێتە سەری ووزە وەردەگرێت و لەژێر میکرۆسکۆبەکەدا نامێنێت و دەڕوات بۆیە هەرگیز خێرایییەکەی بە شێوەیەکی ورد و تەواو ناپێورێت.

٢- Demokritos (٤٦٠-٣٧٠پ.ن):فەیلەسوفێکی یۆنانییە، لە بەناوبانگترین دامەزرێنەرانی رەوتی ئەتۆمە. لە رێگای ئەزموونەوە هەبوونی گەردیلەی زۆر بچووکی راگەیاند و بە ئەتۆمی ناوبرد کە بەزمانی یۆنانی کۆن بەواتای پارچە نەبوو دێت.

دووەمیان، دەکریت دەولەمەندترین نموونەی دوالیزمی زیندوو - بێ گیان لە مرۆڤدا ببینین. ئەو زیندووییەی لە مرۆڤدا هەیە لەناو ئەو بوونەودرانەی ددتوانین بیان بینین پیشکەوتووترین تایبەتمەندی لە خۆوە دەگریت. پیشکەوتنی زیندوویی لە مرۆڤدا گەیشتۆتە لووتکە. لە هەمان کاتدا بەشی ماددەش هاوتەریب و تیک هەلکیش لەگەل ئەم پیشکەوتنە زیندووییەدا لە پیشکەوتووترین ئاستدایە. سیستەمی ماددەی میشک و پیشکەوتوویی زیندوویتی تا ئیستاش پرە لە نهێنی. سەبارەت بە میشک زانست خاودن زانیارییەکی زور سنووردارە. پەیوەندی نیوان لیهاتوویی ماددە لەبواری ریکخستنی میشک و زیندووییەک کە توانای هزراندنی هەرە واتایی (ئەبستراکت) بەدەست هیناوە: کیشەیەکی گەورەی دوزینەوەیە لە بەردەمماندا. کاتیک دەلیین دەولەمەندی نموونە، مەبەستمان ئەم ئۆرگانە سەرسورهینەرەیە. هەرودها ئۆرگانەکانی دیکەی جەستە لە سەرووی هەمووشیانەوە دل هەر یەکە سەربەخو پەرجوویەکن. با یەکسەر ئاماژە بەوەش بکەم کە لیکۆلینەوە لە بارەی ئۆرگانەکانی مرۆڤ هیندە ئالۆزە ناتوانریت تەنیا بۆ بواری پزیشکی بەجێ بهیلریت. دەبیت لە میانەی کۆبوونەوەی گشت لقەکانی زانست بکریتە بابەتی لیتویژینەوەی واتادارتر. بەجیهیشتنی مرۆڤ وەک دوالیزمی جەستە - رۆح بۆ گۆرەپانەکانی دەروونناسی و پزیشکی گەورەترین نەزانییە و تاوانیکە لە ئاستی کوشتندا.

سەبارەت بە روونکردنەوەی پەیوەندی نیوان زیندوو - بێ گیان کە لە نموونەی مرۆڤدا پیویستە چاودیری بکەین، دەتوانین هەندیک گریمانە پیشکەش بکەین. بەر لە هەموو شتیک دەبیت ئەوە پەسەند بکەین، وەکو پۆتانسیل ماددە زیندووە. ئەگەر ئەم توانایە نەبوایە سیستەمی ماددە لە مرۆڤدا زیندوویتیەکی پیشکەوتووی خاوەن سۆز و هزری لەگەلدا نەدەبوو. لە میانەی تیگەیشتنیکی بەهیزترەوە چۆن بگەینە پۆتانسیلە زیندووەکەی ماددە؟ وەلامی یەکەم، پیویستە دووالیزمی **"کیش کردن - پالنان"** لە سەرووی

دەستەواژەی **"پۆتانسێلی زیندوویی"**دا جێگیر بکەین. شرۆڤە کردنی ئەم پرەنسیپە ڕەسەنە کە لە تەواوی گەردووندا بەدی دەکرێت، وەک پۆتانسێلی زیندوویی واتادارە. دووەمین وەڵام، گرێدراو بەم پرەنسیپەوە دەتوانین پێکهاتەی تەنۆلکەیی شەپۆل ڕوون بکەینەوە. دەکرێت دوالیزمی بۆشایی - تەن (بوون) کە وەک پرەنسیپێک لە گەردووندا هەیە لەسەر ئەمە زیاد بکەین. تەنێکی بێ بۆشایی، بۆشاییەکی بێ تەن، نابێت و بیری لێناکرێتەوە. ئەگەر سنوورەکانی فکرمان بشکێنین، لە ڕاستیدا کاتێک دوالیزمی تەن - بۆشایی بەلاوە بنرێت هەردووکیشیان لە ئارادا نامێنن. ئەو شتە نوێیەی دروست دەبێت، چ ناوێکی لێ دەنرێت؟ ئەمە دووەمین پرسیاری زەبەلاحە کە قوت دەبێتەوە. لەوانەیە هەندێک کەس وەک ئەوەی لەسەری ڕاهاتوون لە وەلامدا یەکسەر بڵێن **"خودا"**. لە کاتێکدا پەلە نەکردن لە وەلام دانەوەدا دەشێت بەردو هزری واتادارترمان ببات. لەوانەیە بە وەلام و واتای نهێنی ژیانمان بگەین.

هەر وەکو دەزانرێت بۆ پاڵنان و کێشکردن، پێویستی بە کارەکتەری تەنۆلکەیی شەپۆل هەیە. کارەکتەری تەنۆلکەیی (فۆتۆنی) کە لە هەر شەپۆلێکی تیشکی ڕووناکیدا هۆکاری هەبوونی خێراییەکی بەرزی وەک (٣٠٠،٠٠٠) کیلۆمەترە لە چرکەیەکدا. تێگەی **"کونی ڕەش"** کە ڕووناکی قووت دەدات، نهێنی مەتەڵەکە گەورەتر دەکات. دوای قووت دانی هێزی خێرایی تیشک ئەو ڕاستییەچییە کە بەدیدێت؟ ئەمە یەکێکە لەو پرسیارانەی وەلامدانەوەی زۆر زەحمەتە. ئەگەر کونە ڕەشەکان بە دوورگەی پێکهاتوو لە ووزەی پەتی بەناو بکەین، کەواتە چی بەو ووزەیە بڵێین کە لە دۆخی تیشکدایە؟ ئایا گەردوون بریتییە لە دوالیزمی مادده - کونێکی ڕەشی زەبەلاح؟ لەم ڕەوشەدا ئایا مادده کەوتنە ڕووی ئەو شتەیە کە مادده نییە؟ ئایا لە دۆخێکی وەهادا ناشێت بە چاوی (گیانلەبەر) زیندووێکی مەزن تەماشای گەردوون بکەین کە خۆی پیشان داوین؟ ئایا تەواوی دوالیزمەکانی ژیان ئەم دوالیزمە گەردوونییە دێننەوە یادمان؟ بۆ

نموونه دەشێت خۆشەویستی ـ نەفرەت، چاکە ـ خراپە، جوانی ـ دزێوی، ڕاست ـ چەوت ڕەنگدانەوەی دوالیزمی گەردوونی بن؟ دەکرێت تا ناکۆتا درێژە بە پرسیارەکان بدرێت. خەریک بوون بەو پرسیارانەوە کە لە نزیکەوە لێیان شارەزاین و زانستەکەیان دروست دەکەین ئەزموون بەخشترە.

سەلمێنراوە کە مادده کەڵەکەبوونی ووزەی چڕکراوەیە. هاوکێشە بەناوبانگەکەی ئەنشتاین دەزانرێت. لە جیاوازی کێشی نێوان مرۆڤێکی زیندوو و مردوودا باس لە قورسایی هەژدە گرام ووزە دەکرێت. ئایا لە دۆخێکی وەهادا زیندوویی سیستەمێکی تایبەتی لێشاوی ووزەیە؟ ئایا بەتاڵبوونەوەی ئەم ووزەیە دوای دەرچوونی هەبوونی خوی دەپارێزێت؟ کەواتە بەمە ئەو روحانییەتەی لە باوەڕی ئانیمیزمدا هەیە پشت ڕاست نابێتەوە؟ یاخود بەلانی کەم نابێتە باوەڕییەک کە دەبێت حیسابی بۆ بکرێت؟ کەواتە تێڕوانینی گەردوون پڕە لە ڕۆح، پێشخستنی هەڵسەنگاندنێکی وەک ژێری گەردوونی لە لایەن هیگڵەوە، لێکدانەوەی ووزە وەک ڕۆحی زیندووی مادده نابنە چەمک، تێگەیشتن و شرۆڤەیەک کە بەهەند وەربگیردرێن؟

دەکرێت ئەم جۆرە پرسیارانە زیاد بکەین. گرنگ ئەوەیە کە نە لە میانەی شرۆڤە میتافیزیکییەکانی دۆگماتیزمی چاخەکانی ناوین، نە لە ڕێگای جیاوازی روح ـ جەستە، ئۆبژە ـ سۆبژە لە لایەن مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە دەتوانرێت پەیوەندی زیندوویی ـ بێ گیان نزیک بە حەقیقەت هەڵسەنگێندرێت. نە پرەنسیپی هێزی خوڵقێنەر کە لە دەرەوە گیان دەبەخشێت، نە ئەو هەڵوێستانەی سەرچاوەیان دوالیزمی **"ڕۆح ـ مادده"**ی گەردوونە، دەتوانن دەوڵەمەندێتی ژیانمان روون بکەنەوە. ئەو پرسیار و نموونانەی خستمانە ڕوو، پێشانمان دەدەن کە چەندە دەرهەق بە دەوڵەمەندێتی ژیان لە مرۆڤدا قاڵ بینەوە، هێزی ووردبوونەوە پێش بخەین، شانسی تێگەیشتنمان لە تەواوی گۆڕانکارییەکان بە مەسەلە

پەرجووەکانیشەوە زیاد دەبێت.

پێویستە بڕوامان بەوە هەبێت کە پرەنسیپێکی دادپەروەری لە گەردووندا هەیە. هیچ پێکهاتەیەک بێ هەبوونی هەلومەرج و هۆکارێک لەدایک نابێت. سروشت لە دروستکردندا زۆر دادوەرترە لەوەی کە ئێمە مەزەندەی دەکەین. بەرپرسیار بینینی کۆمەڵگای شارستانی لەچەوت بینین، شێواندن و ونبوونی تواناکانی چاودێریمان هەڵسەنگاندنێکی لە جێگای خۆیدایە. دروستبوونی مرۆڤیش پێشکەوتنێکە کە دادپەروەرانە خوڵقێنراوە.دەکرێت بگووترێت تەواوی سیستەمی گەردوون، دونیای زیندەوەران و دام و دەزگا کۆمەڵایەتییەکان گشتیان لەژێر خزمەتی پێکهاتەی مرۆڤدایە. ئایا دادێکی لەمە گەورەتر هەیە؟ ئەگەر چەواشەکارییەکانی ناو دەوڵەت و پلەدارییە مەزنەکەی ناو کۆمەڵگا ئەم راستییەی پەردەپۆش کردبێت، دەبێت بە تایبەت هێزە چەواشەکارەکانی مرۆڤ بە بەرپرسیار ببینرێن. ئەو کاتە ئەرک دەکەوێتە ئەستۆی ئەو مرۆڤەی بە دوای دادپەروەریدا دەگەڕێت. ئەوەی دەتوانێت لەپێناو دادپەروەریدا هەموو جۆرە واتا و چالاکییەک ئەنجام بدات خودی مرۆڤە. هەڵبەتە ئەو مرۆڤانەی دەڵێن:**"لە دادپەروەری دەگەڕێم"** دەتوانن ئەم ئەرکە لەئەستۆ بگرن، هەر ئەوانیشن کە لە چوارچێوەی واتاداری و رێکخستن و چالاکیدا پێویستییەکانی جێبەجێ دەکەن و دەتوانن بەردەوامی پێ بدەن.

هەڵسەنگاندنی هەمەڕەنگییە شکۆدارەکەی دونیای زیندەوەران و هەنگاوەکانی وەرچەرخانی دەکەوێتە چوارچێوەی رێنماییە سەرەکییەکەمان و ئاسانیش بووە. لە سایەی ئاڵوگۆڕی نێوان گەردە زیندوو و بێ گیانەکاندا و گۆڕانیان بۆ یەکتری دەتوانین باشتر و ئاسانتر دەرک بە گۆڕان و ئاڵوگۆڕی نێوان جیهانی ئاژەڵ و رووەک بکەین. سەبارەت بەم بابەتانە زانست مەودایەکی باشی بڕیوە. سەربارى تەواوی کەم و کوڕییەکان و ئەو پرسیارانەی بێ وەڵام ماونەتەوە، بە دەوڵەمەندیەکی بایەخداری واتا گەیشتووین.

گەردوون (جیهان)ی رووەکەکان خوی بو خوی پەرجوویەکە. هەر لە قەوزەیەکی سەرەتاییەوە تا دارمیوەیەکی سەرسوورهێنەر، هەر لە شوینە بە چیمەن داپۆشراوەکانەوە تا کولیکی دڕکاوی هەبوونی جۆرەها رووەک هیزی تواناکارییەکانی زیندوویی پیشان دەدەن. بە تایبەتی گولیک کە بە ئەندازەی جوانییەکەی بۆ خۆ پاراستن دڕکاوی دەبیت، نەزانترین کەسیش لە شتیک ئاگادار دەکاتەوە. سەرنج راکیشترین لایەنی گەشەسەندن لە گەردووندا ئەوەیە کە قوناخی دواتر ئەوەی پیشتر لەخۆوە دەگریت، وەکو پارچە و ئەندامیکی دەولەمەندیتی دەیپاریزیت. بە جوریک کە دوایین رووەک پوختەی تەواوی رووەکەکانەو، وەک "**دایک**" دریژە بە هەبوونی خوی دەدات. واتا هەر وەکو مەزەندە دەکریت، گەشەسەندن لە ریگای لەناوبردنی یەکتر (داروینیزمی دوگماتیک) ەوە بەدینایەت، بەلکو لە ریی زیادبوونیکی دەولەمەند کراوەوە بەردەوام دەبیت. لە جوریکەوە بو جورە جیا جیاکان، لە قەوزەی سەرەتاییەوە بو هەمەرەنگییەکی بی کوتایی گەشەسەندن جیگای باسە. پیویستە هەمەرەنگی و زۆریتی وەکو زمان و ژیانی رووەکەکان ببینریت. ئەوانیش خیزان، خزم تەنانەت هەندیک جار دوژمنیشیان هەیە. بەلام هەر جۆریکیش بە گویرەی خۆی بەرگریکردن وەکو پرەنسیپیک پەیرەو دەکات. دەتوانین بلێین هیچ بوونەوەریک نییە بی بەرگری بیت.

تایبەتمەندییەکی دیکە کە پیویستە چاودیری بکریت، توخمە زۆربوون[1] و ناتوخمە زۆربوونە[2] . لە کاتیکدا ناتوخمە زۆربوون گوزارشت لە دۆخیکی زۆر سەرەتایی دەکات، بەلام توخمە زۆربوون بە واتایەکی تر زۆربوون لە ریی جووتبوونی نیوان رەگەزە جیاوازەکانی جۆریکەوە پرەنسیپیکی زاڵە. نیرینەیی و مێینەیی لە هەمان یەکینەدا لە قۆناخە راگوزارییەکانەوە بۆمان ماوەتەوە. بۆ

---

١. Sexual Reproduction

٢. Asexual Rreproduction

فەراهەم بوونی زیادبوون و جیابوونەوەی جۆردکان پێویستی بە هەبوونی نوێنەرانی هەر ردگەزێک لە یەکینە جیاوازەکاندا هەیە. تا بە هەبوونی نێرینە و مێینەوە دابەش بوون بۆ یەکینە جیاوازدکان دروست نەبێت هەمەڕەنگی فەراهەم نابێت. لێرەشدا رووبەڕووی سەمەرەیەکی تری سروشت دەبینەوە. زۆرجار پەیدابوونی جۆری ئیفلیج و سەقەت لە شێوازی هاوسەرگیری نێوان خزمانی نزیک (کە جۆرێکە لە جووت بوون بۆ بەردەوامی نێرینە و مێینەی هەمان یەکینە) پێویستییەکی گەشەسەندنە. دەتوانین جیابوونەوە بۆ نێرینە ـ مێینە بە پرەنسیپی گەشەکردنی تەواوی گەردوونەوە ببەستینەوە کە بریتییە لە ناکۆک بوون و جیاواز بوون لەسەر بنەمای ئەرێنی و دەکرێت دیالیکتیکی پوزەتیڤیشی پێ بگوترێت. زۆر ئاشکرایە کە سووربوون لەسەر مانەوەی **"هەمان دۆخ"** نکۆلی کردنە لە پەرەسەندن. دەبێت باش بزانین پرەنسیپی هاوتایی بوون کە لە هەموو جۆرە لێگەڕینێکی حەقیقەتی موتلەق (هزری میتافیزیکی)دا هەیە، توانای شرۆڤەکردنی گەردوونی نییە.

پرسیارێکی دیکەی پێویستە سەرنجی بدرێتێ، بۆچی گەردوون خوازیاری پێشکەوتنە؟ ڕاستتر بڵێین تایبەتمەندی گەشەکردنی گەردوون بۆ خۆی بەڵگەیەکی زیندوبوونی نییە؟ شتێک خاوەن توانای زیندوویێتی نەبێت گەشە دەکات؟ جیهانی بایۆلۆژی وەڵامی ئەم پرسیارە ئاسانتر دەکات. کێشەیەکی دیکەی گرنگ بۆ گەشەسەندنی بایۆلۆژی، دەرهەق بە ڕەوشی ریزپەڕ (شاز)ی هەسارەی **"زەوی"**یە. بانگەشە دەکرێت کە لە گەردوونی چاودێریکراودا تا ئێستا هەسارەیەکی دیکەی زیندوو نەدۆزراوەتەوە. ئەم هەڵوێستە پڕ لە گرفتە. بەر لە هەموو شتێک **"توانای حاڵیبوونی"**[1] مرۆڤ بۆ دەستنیشان کردنی تەواوی هەسارەکان زۆر سنووردارە. مێشوولە چەندە دەتوانێت دونیا شرۆڤە بکات، مرۆڤیش هێندە (بەڵکو؟) دەتوانێت گەردوون شرۆڤە بکات. تێڕوانینی: مرۆڤ

١ـ Capacity، بەهرە و توانای تێگەیشتن.

دەتوانێت هەموو شتێک بزانێت، وەهمێکی هزری میتافیزیکە. ئەمە هەڵوێستێکە لە داهێنانی خوداوەند دەچێت.

لەناو چەندایەتیەکەیدا خنکاندنی پێکهاتەیەک کە لە گەردووندا پەیدا بووە راستی روون ناکاتەوە. لە کاتێکدا ئێمە هێشتا لە سەرەتای تێگەیشتنی داناییەکانی دونیادایین. هێشتا نادیارە کە تێگەیشتن ئێمە بە چی دەگەیەنێت. چەمکی **"هەر زیندوەرێک گەردوونێکی خۆی هەیە"** کە زۆر دووپات دەکرێتەوە پێویستە پشتگوێ نەخرێت. دیسان بیرکردنەوە لە چەمکی گەردوونە هاوتەریبەکان[1] دەشێت واتایەکی هەبێت. ئەگەر نموونەیەکی بەم جورە بدەین چاکتر مەرامەکەمان روون دەبێتەوە: هەر خانەیەکی زیندووی لەشی مرۆڤ بە گوێرەی خۆی بوونەوەرێکە. تەنانەت هزر لە خانەکانی مێشکدا بەدیدێت. ئایا ئەم جۆرە خانانە دەتوانن بڵێن گەردوون هێندەیە کە بیری لێدەکەینەوە؟ لە لایەکی دیکەوە ئەم خانانە لە گەردوونە زەبەلاحەکەی مرۆڤ و دەردوە بێ ئاگان. بەڵام ئەم رەوشە هەبوونی مرۆڤ و گەردوونە میکرو و ماکرۆکانی دیکە لە گۆڕێ هەڵناگرێت. ئایا ناتوانین لەناو گەردوونی گەورەدا مرۆڤیش هێندەی ئەم خانانە بچووک بکەینەوە؟ ئەگەر بە ئاسانی بوێری ئەمەمان هەبێت، ئەوا دەتوانین حوکم لەسەر هەبوونی گەردوونە جیاوازەکانیش بدەین. مەبەستمان لە **"گەردوونی هاوتەریب"** ئەوەیە: ئەگەر هەر گەردوونێک گرێدراوی رەهەندێکی فەزا و شەپۆل بێت، یان وەها لێکبدرێتەوە، دەشێت گەردوونی بێ شومار

---

١ـ گریمانێکی زانستی هەبوونی گەردوونی ترە لە دەرەوەی ئەم گەردوونەی کە ئێمە تێیدا دەژین، کە سەرەداوی سەلماندنی کەوتونەتە دەست. ئەم گەردوونانە وەک گەردوونی ئێمە خاوەنی سێ دوورین (درێژی، پانی، بەرزی) و بە شێوەیەکی هاوتەریب لەگەڵ گەردوونی ئێمەدا کۆدەبنەوە و دوورییەکی چوارەم پێک دەهێنن. بێگومان وێناکردنی دووری چوارەم بۆ ئێمەیەک کە مێشکمان و ئەو جیهانەش کە تێیدا دەژین هەمووی خاوەنی سێ دوورییە کارێکی زەحمەتە، بەڵام بە پێی زانایان بەو واتایە نایەت کە گەردوونە هاوتەریبەکان و دووری چوارەم بوونیان نییە و خەیاڵن. بۆ نموونە ئەگەر گەردوونێک وێنا بکەین کە وەک کاغەز بێت و تەنها خاوەنی دوو دووری بێت (درێژی و پانی، یان پێشەوە و دواوە) ئەوانەی کە لەو گەردوونەدا دەژین بە وێنەی ئێمە کە ناتوانین دووری چوارەم وێنا بکەین، ئەوانیش دووری سێیەمیان پێ وێنا ناکرێت. لە کاتێکدا ئەگەر ئەو کاغەزانە بە وێنەی پەرتووکێک هاوتەریب بخەینە سەر یەک هەر سێ دوورییەکەمان دەست دەکەوێت. ئێستا هەبوونی کونە رەشەکان بە سەرەداوێک دادەنرێت بۆ راستی هەبوونی گەردوونە هاوتەریبەکان. بە پێی ئەنیشتاین کە یەکەم کەس بووە سەرنجی بۆ سەر هەبوونی شتێکی وەها راکێشاوە کونە ڕەشەکان ئەو تونێلانەن کە لە نێوان گەردوونی ئێمە و گەردوونەکانی تردایە.

بوونیان هەبێت. سیستەمی شەپۆل کە مرۆڤیشی خولقاندووە تەنیا یەکێک لەم گەردوونانەیە.

مەبەستمان لەم باسانە پێشخستنی قەبلاندنێک نییە. هەوڵدەدین تێڕوانینە تەسکەکان تێپەڕ بکەین. دەمانەوێت لە نەخۆشیەکانی پەیڕەو و تەڵەزگەکانی چەواشەکاری باوەڕی و زانین رزگار بین کە بە زۆری بەرهەمی فشارەکانی دەوڵەت و پلەدارین. زۆر زیاتر لەوەی مەزندە دەکرێت بونیادی هزریمان بەرهەمی میکانیزمی دەوڵەت و پلەدارییە کە ئەوانیش داینەمۆی درۆ و چەواشەکارین. هەروەها ئەمانە چەندین هزری راستیشیان لەناو بردووە.

جیهانی ئاژەڵان بۆ خۆی سیستەمێکە. لە سەرەتادا جۆرەیەک هەبووە کە بەیەکەوە نوێنەرایەتی خانە ئاژەڵی و رووەکییەکانی کردووە. تێڕوانینێکی وردبینانە پیشانی دەدات کە تا جیهانی رووەک نەبێت جیهانی ئاژەڵ پەیدا نابێت. ژیانی رووەکی هەلومەرجی لەپێشینەی دروستبوونی ژیانی ئاژەڵییە. گرنگتریش ئەوەیە: هەبوونی رووەکی پێشکەوتوو هەلومەرجی هەبوونی ئاژەڵێکی پێشکەوتووە. پۆتانسێلی زیندوویی لە جیهانی ئاژەڵاندا ریگای لە پێش بینین، بیستن، ئێش و ئازار، توورە بوون و هەست و سۆزی پێگەیشتووتر کردۆتەوە. بە دواکەوتن و گەڕانی بەردەوامی بۆ خواردەمەنی، وای لێدەکات لە نزیکەوە لێکۆڵینەوە لەسەر پێویستییەکانی خواردن پێش بخات. بە ئاسانی دەکرێت بڵێین برسێتی پەیوەندی بە بێبەری بوون لە ووزەوە هەیە. جارێکی دیکە پەیوەندی نێوان ووزە و زیندوویی رووبەڕوومان دەبێتەوە. رەواندنەوەی برسێتی، بە واتای عەمبارکردنی ئەو ووزەیە دێت کە پێویستێتی.

پێداویستی زایەندیش لە نزیکەوە پێویستی بە چاودێریی و لێوردبوونەوە هەیە. ئەم پێویستییە کە بە شێوەیەکی دژوار و تا دوا رادە ئارەزوودارانە خۆی پیشان دەدات، گوزارشت لە رۆڵی بەردەوامکردنی ژیانیش دەکات. چڕبوونەوەی ووزە لە پرۆسەی

زایەندیدا دیسان پەیوەندیەکەی بە ژیانەوە دەکاتە جێگای باس. بەڵام دەبێت زایەند وەکو تاکە فاکتەری درێژە پیدانی ژیان نەبینرێت و بەم جۆرە بیری لێنەکرێتەوە. لەوانەیە سەرەتاییترین دیاردەی درێژە پێدانی ژیان شێوازی زایەندی بێت. ئەم شێوازە لەسەر بنەمای درێژە پێدانی ژیانە.

هەمەڕەنگی و گەشەسەندن رێگا لە پێش شێوە دەوڵەمەندییەکانی ژیان دەکەنەوە. جگە لەمە جووتبوونی زایەندی تەنیا رەمەک و خولیای ژیان لەخۆوە ناگرێت، بەڵکو ترسی مردن و تەنانەت خودی مردنیش لە خۆیدا هەڵدەگرێت. هەر جووتبوونێکی زایەندی تاڕادەیەک مردنیشە. هەندێک ئاژەڵ دوای جووتبوون یەکسەر دەمرن. کەواتە وابەستەبوونێکی زۆر بە زایەندەوە مردن و دۆخی هەرە سەرەتایی ژیان دینێتەوە بیری مرۆڤ. مەحکومبوون بە زایەندەوە بژاری مردن بەهێز دەکات. چەندە زایەند بۆ خۆشەویستی و جوانی و هەستەکانی دیکە وەرچەرخێت و ژیان بکرێت بەو ئەندازەیە لە نەمری نزیک دەبێتەوە. ئەو نەمرییەی لە شاکارە هونەرییەکاندا هەیە ئەنجامی ئەم تێگەیشتنەیە. دەتوانین بەرهەم (وەچەخستنەوە) ی زایەندی وەکو شێوازێکی پاراستنیش شرۆڤە بکەین. چەندە بەرهەم بێنێت هەست دەکەی هەیت و هێندە دەتوانی بژیت و خۆت بپارێزیت.

زایەند و زاوزێ لە کۆمەڵگای مرۆڤدا قووڵتر گفتوگۆ دەکەین. ئەو خۆشی و چێژەی لە کاتی چالاکی زایەندیدا بەدیدێت هەڵسەنگاندنی وەکو **"ئەشق"** هەڵەیەکی گەورەیە. بە پێچەوانەوە حەز(خۆشەویستی)ێکی لەسەر بنەمای چالاکی زایەندی بێت نکۆڵی کردنە لە ئەشق. مۆدێرنیتەی سەرمایەداری وەکو شێرپەنجە پەرە بە زایەند پەرستی (سێکسخوازی) دەدات و لەژێر ناوی ئەشقدا کۆمەڵگا دەکوژێت. ئەشقی راست ئەو خۆشەویستییەیە کە لەزمانی پێکهاتنی گەردوونەوە دەیبیستین. گووتەی مەولانا: **" لە دونیادا چی هەبێت ئەشقە، ئەوی دیکە قسەی پڕ و پووچە"** دەشێت شرۆڤەیەکی

راستەقینەی ئەشق بێت. ئەشق پەیوەستە بە تێپەڕاندنی چێژ، راستتر پەیوەستە بە گەشەسەندنی ئاستی ئازادی هەردوو لایەنەکە لە ئەخلاقدا. شەهوەتی زایەندی پەیوەندی بە لە دەستدانی ئازادی و بێ جووڵەیی ماددیشەوە هەیە. نەک تەنیا لە نێوان ژن و پیاودا بەڵکو لە نێوان تەواوی فاکتەرەکانی گەردووندا بەستنەوەی ئەشق بە گونجاندنی پێکهاتەکەیانەوە هەڵوێستی هەرە راستە.

پەرەسەندنی هەست و سۆز بۆ خۆی پەڕجوویەکە. بۆ نموونە بینین چۆن شرۆڤە بکەین؟ ئەوە مسۆگەرە کە بینین پێشکەوتووترین ئۆرگانی بوونەوەرە. ئەوەش ئاشکرایە کە بەبێ بوونی رووناکی هیچ شتێک نابینرێت. بینین هزرێکە. بینینی تەواوی تایبەتمەندییەکانی زیندوویتی و لە سەررووی هەموویانەوە زایەندیتی وەک شێوەیەکی هزر زۆر بایەخدارە. بە واتایەک لە واتاکان خودی زیندوویی توانای فێربوونە. لەم روانگەیەوە گووتەکەی دیکارت راستە کە دەڵێت:**"بیردەکەمەوە، کەواتە من هەم"**. ئەگەر بە شێوەیەکی گشتگیر تاوتوێی بکەین، دەتوانین سووڕانەوە (جووڵە)ی گەردوون لە چوارچێوەی رێساکاندا وەکو فێربوون شرۆڤە بکەین. رێساکان فێربوونمان بە بیر دێنێتەوە، بەڵام دیسان فێربوون لە رێگای چاوەوە گەشەسەندنێکی سەرسووڕهێنەرە. ئەم گووتە دەرکی پێدەکرێت**"خوداوەند بۆ پیشاندانی خۆی گەردوونی خوڵقاند"** داوەری بە ماددە بوونی **" Geist = ژیری گەردوونی"** کە هیگڵ بۆ گەیشتن بە جیاوازی خود پێشیخست، پەیوەندی بە بینینەوە هەیە. لەوانەیە بینین و بینراوی یەکێک لە داخوازییە بنەڕەتییەکانی هەبوون بێت.

هەستەکانی چێژ و ئازار لە زیندوویی ئاژەڵانیشدا خۆیان پیشان دەدەن. هەردوو هەستیش دەرک کردن بە ژیان دیاری دەکەن. چەندەی چێژ وەربگیردرێت هێندە دەرک بە ژیان دەکرێت و پەسەند دەکرێت، چەندە هەست بە ئازار بکرێت بەو ئەندازەیە دەرک بە ژیان دەکرێت، بەڵام ئەم جارە پەسەند ناکرێت و ناخوازرێت بەردەوام

بێت. هەردووکیشیان قوتابخانەی لیبراوانەی فیربوونن. بەهای هۆشیاری و فێرکاری چێژ و ئازار بەرزە. چێژ فێری مەزنایەتیت دەکات، بەلام ڕێخۆشکەرە بۆ ئەوەش کە لەپیناویدا هەموو جۆرە سەرشێتیەک بکرێت. ئازاریش دیسان فێرکاریکی مەزنە، هەر بۆیە ڕێگا لە پێش زانینی بەهای ژیان دەکاتەوە. لە کاتیکدا کۆتایی چێژ زۆر لە ئازار نزیکە، ئازاریش لە کۆتاییدا شانسی بە دەست هێنانی ژیانێکی پڕ لە چێژی بەرزە. جۆرەکانی ژیان جیاوازی نێوان خۆیان لە ڕێگای بینینێکی باشتر، چێژ وەرگرتنێکی زیاتر و ئازار چەشتنەوە بۆ ئێمە دەخەنە ڕوو.

لەبەرئەوەی پەیوەندی نێوان ژیان و مردن تابلێی کارەکتەرێکی میتافیزیکی هەیە، تاوتوێکردنی لە کومەلگای مرۆڤدا هەلوێستێکی ڕاستترە. بابەتێکی گرنگ کە لە باسی ئاژەلاندا پێویستە ڕاوەستەی لەسەر بکرێت، مەسەلەی گۆشت خواردنە. تەواوی جیهانی ئاژەل (گیانلەبەر)ان لە ڕێگای خواردنی ڕووەکەوە دەتوانن درێژە بە ژیانی خۆیان بدەن. پێویستی گوشت خواردن ناچاریی نییە. بەلام گروپێکی مەزنی گۆشت خۆرەکان هەیە. کەواتە ئەمانە چۆن ڕوون بکەینەوە؟ لێرەدا هەڕەشەی زاوزێی زیادە لەسەر ژیان دەشێت بۆ شیکردنەوەی ئەمە فاکتەرێک بێت. لە کاتێکدا زاوزێ ڕێگایەکی گەرەنتی کردنی ژیانە، بەلام زیدەڕۆیی لێکردنی دەشێت دەرفەتەکانی ژیانی هەمەڕەنگ لەناوببات. بۆ نموونە خێرایی زۆربوونی مشک لەوانەیە ڕووەک لەناو ببات. ئاژەلی لە جۆری مەڕ، بزن و مانگاش دەشێت ڕووەک لەناوببەن. هەروەها لە جیهانی باڵندەکانیشدا زیادبوونی لاسەنگ هەیە. لە دۆخێکی بەم جۆرەدا کەوتنە گەڕی هەلۆ، شێر و مار تەنیا بە ئامانجی لەناوبردن نییە، بەلکو بۆ دروستکردنی دەرفەتی بەردەوامی جیهانی گیانلەبەران وەکو ناچارییەک دەردەکەون. بینینی دابەشبوونێکی بەم جۆرەی کار لە سروشتدا وەکو بێدادییەکی گەورە دەشێت مەترسیدار بێت. بەلام لێرەدا هاوسەنگییەکی ورد و هەستیار جێگای باسە. ئەگەر

ئەم هاوسەنگییە نەمێنێت و هەموو شوێنێک پڕ ببێت لە مار، شێر و هەڵۆ، زۆر کەم ئاژەڵی زیندوو دەمێنن. خۆ ڕێکخستنی سیستەمە سروشتییەکان شتێکی سەرسووڕهێنەرە.

بە شێوەیەکی تیروتەسەل گرنگی گەورەیی ڕێکخستنی بەرهەمهێنانی زایەندی لە کۆمەڵگای مرۆڤدا و پێگەی لە بەردەوامکردنی ژیان و پەیوەندی بە ئەخلاقەوە هەڵدەسەنگێنین. ئەگەر لەسەر بنەمای تاوتوێکردنی مرۆڤ وەکو بابەتی سەرەکی لێکوڵینەوە، دووبارە بگەڕێینەوە سەر پەیوەندی نێوان جیهانی بایۆلۆژی، لەوە دەچێت مرۆڤ پوختەی هەموو بەرهەمهێنراودکانی ئەم جیهانەی تێدا بێت. دەکرێت تەواوی تایبەتمەندییە زانراوەکانی جیهانی رووەک و ئاژەلان لە مرۆڤدا ببینرێت. بە واتایەک مرۆڤ هەم ئامانجی گەشەکردنی جیهانی رووەک و ئاژەلانە، هەم میراتگریەتی. بوونەوەرێکی سەرووی مرۆڤ (لە مرۆڤ باڵاتر) تەنیا وەکو گریمانەیەک دەتوانرێت بیری لێبکرێتەوە. هەڵبەتە هێزە نائاساییەکەی توانای بیرکردنەوەی مێشکی مرۆڤ لەوانەیە هەبوونی پێکهاتەیەکی دیکەی بیواتا بکات. وەک تایبەتمەندییەکی گشت گیانلەبەران پەرەسەندنی مێشک کە هێزی فێربوون و هزراندنە لە مرۆڤدا لە لووتکەدایە. گەردوون لە ڕێگای مرۆڤەوە خۆی دەناسێت. لەوانەیە ئایەتی **"بۆ نابینی خۆم مرۆڤم خوڵقاند"**ی پەرتووکی پیرۆز واتادار بێت.

بێگومان لە کاتێکدا مرۆڤ کۆی گشتی زیندوویێتی رووەک و ئاژەڵانە، پێچەوانەکەی ڕاست نابێت؛ واتا تەواوی رووەک و ئاژەڵان کۆبکەیتەوە ناکاتە مرۆڤێک. لێرەدا پێویستی تاوتوێکردنی مرۆڤ وەک جیهانێکی جیاواز دەردەکەوێتە پێش. مەبەستمان چەمکێکی گەردوون نییە کە **"مرۆڤ ناوەندێتی"**. باس لە پانتەییزم[١] ـ یەکێتی

١ـ Pantheism مەزهەبی ئەو کەسانەیە کە خودا و سروشت دەکەن بەیەک، بەگوێرەی ئەوان هەبوونی مادی و مرۆڤ تەنیا رووخساری خودان؛ ئەو راستی گشتیی و خودی جیهانە، شتەکانی دیکەش جگە لە سیما و دیمەن شتێکی دیکە نین. بەگوێرەی فەیلەسوفی ئەفلاتونگەرایی نوێ خودا یەکە جیهانیش وەک روناکی خۆر لێیەوە دەردەچێت؛ ئەو هەبوونانەی هەیە ئاستی جیاوازیان هەیە بەلام لەگەڵ خودا تەنیا یەک هەبوون پێکدێنن.

سروشت و خوداوەند ـ یش ناکەم. وەکو جورێکی تایبەت بە خۆی پێویستی روونکردنەوەی جیاوازی مروڤ دەبینم. مرۆڤ تا ئەو رادەیە گرنگە کە وەکو جیهانێکی جیاواز تاوتوێ بکرێت. سێیەمیان، وەکو جۆرێک کە کۆمەڵگایەکی تایبەت بە خوی ئاواکردووە، کردنی مرۆڤ بە بابەتی لێتوێژینەوە، سەبارەت بە لیگەڕین و رژێمی حەقیقەت و پەیڕەوێکی واتادار زور گرنگە.

دابڕانی مرۆڤ لە **"پریماتەکان"** و قوناخەکانی پەرەسەندنی جورەکەی سەبارەت بە بابەتەکەمان گرنگ نییە. ئانترۆپۆلۆژی تاوتوێ ناکەین. بێگومان تەنیا لە جیهانی ئاژەلاندا نا، بەڵکو لە جیهانی رووەکەکانیشدا زۆر نموونە دەبینین کە هاوشێوەی کۆمەل و جڤاتەکان بە یەکەوە دەژین. هەموو جورەیەک وەکو پێویستییەکی سروشتەکەی نزیک بە یەکتر، تەنانەت بە کومەل لەگەڵ یەکتر دەژیت. دار بە بێ دارستان، ماسی بە بێ رەوە نابێت. بەڵام هەر وەکو خودی مروڤ کومەڵگاکەشی چونایەتییەکی جیاوازی هەیە. خودی کومەڵگا لەوانەیە مرۆڤی سەروو (بالا) بێت. یاخود ئەو ئۆرگانیزاسیۆنەیە کە مرۆڤی بالای خولقاندووە یاخود دەخولقێنێت. ئەگەر مرۆڤ لەناو کۆمەڵگا بیگریت و فڕیی دەیتە ناو دارستانێک ـ بە مەرجێک راستەوخۆ دوای لەدایکبوون بێت و ژیانیشی زامن بکەیت ـ لەوەرچەرخان بۆ پریماتێک رزگاری نابێت. کاتێک چەند مرۆڤێکی هاوچەشنی ئەومان خستە پاڵی قۆناخێکی زۆر هاوشێوەی ئەو قۆناخە دێتە کایەوە کە لە پریماتەکانەوە دەستی پێکرد. هەمان شت بۆ کۆمەڵ (رەوە)کانی ئاژەلڕ لە جێگای خۆیدا نییە. تەنانەت ئەم رەوشەش بەها زۆر تایبەتەکەی مرۆڤ دەخاتە ڕوو. رۆڵی کۆمەڵگا بۆ مرۆڤ، رۆڵی مرۆڤ لە ئاواکردنی کۆمەڵگا بێ هاوتایە.

بێگومان بێ بوونی مرۆڤ کۆمەڵگا بوونی نابێت. بەڵام بینینی کۆمەڵگا وەک کۆی تاکەکانی مرۆڤ بە هەڵەداچوونێکی مەزنە. مرۆڤی بێ کۆمەڵگا لە بوون بە پریمات بەولاوە تێپەڕ ناکات. هەرچی مرۆڤی بە کۆمەڵگابووە دەتوانێت ببێتە هێزێکی سەرسووڕهێنەر.

بە هێزێکی مەزنی هزر دەگات. لەوانەیە بڕیاری مرۆڤێک - بۆ نموونە تەقاندنەوەی بۆمبی ئەتۆمی - تەواوی دونیا بکاتە بیابان و چۆڵەوانی. دەتوانێت بچێتە بۆشایی ئاسمان، دەتوانێت دۆزینەوە و داهێنانی بێ سنوور بکات. بۆ دیارکردنی هێزی بەکۆمەڵگابوون ئەم نموونانە دەهێنمەوە. هەرچەندە ئاواکردنی کومەڵگا بابەتی کۆمەڵناسی بێت، ئەو بابەتەی هەوڵی شیکردنەوەی دەدەین زۆر جیاوازە. ڕێگای گەیشتن بەزانیاری بونیادنانی رژێمی حەقیقەت ئاستەمە بە بێ کۆمەڵگا بێت. هەر شتێک کە لە تاکی مرۆڤدا بەدیدێت ناچارە کۆمەلایەتی بێت. لێرەدا باس لە مرۆڤێک ناکەین کە هەلگری میراسی گەردوون (جیهان)ی ڕووەک و ئاژەلان تەنانەت فیزیا و کیمیاشە. باس لەو مرۆڤە دەکەین کە لەناو کۆمەڵگا دروست بووە.

تەواو سیستەمەکانی شارستانی بەمۆدێرنیتەی سەرمایەداریشەوە دابڕاو لە مێژوو و کومەڵگا لێتوێژینەوەیان لەسەر مروڤ کرد. ڕاستتر ئەوەیە کە، تەواوی ئەو بونیاد و هزرانەی سەبارەت بە مرۆڤ هاتوونەتە کایەوە و گفتوگۆکراون دابڕاو لە مێژوو و کۆمەڵگا و تەنانەت وەکو شاکاری تاکەکانی سەرووی کۆمەڵگا خراونەتە ڕوو. لێرەوە پادشا رووت و پۆشراوەکان، خوداوەندە دەمامکدار و بێدەمامکەکان داهێنران. هەڵبەتە کاتێک چەمکمان (تێگەیشتنمان) سەبارەت بە کۆمەڵگا قووڵ دەکەینەوە، دەتوانین تەواوی ئەم پادشا و خوداوەندانە شیکار بکەین، ئەوەش ڕوونبکەینەوە کە زادەی کامە هزرن، سەرچاوەی خۆیان لە کامە بونیادی کۆمەڵگا وەرگرتووە، بەتایبەتیش ئەو سیستەمانەی کە زۆرداری و چەوسانەوە بەرهەم دێنن.

سەرەکیترین کێشە لە پەیڕەودا بە شێوەیەکی واتادار خستنەڕووی پەیوەندی نێوان **"مرۆڤ - کۆمەڵگا"**یە. دیکارت و هەردوو باکۆن (رۆجەر باکۆن و فرانسیس باکۆن) کە خۆیان بە زانستی دەبینن، کاتێک گفتوگۆ لە بارەی پەیڕەوەوە دەکەن، بێ

ئاگان لەو کۆمەڵگایەی لەناویدا دەجولێنەوە و هیچ پەیوەندییەکیان پێیەوە نییە. ئەمڕۆ زۆر باش بۆمان روون بۆتەوە، ئەو کۆمەڵگایەی پێی کاریگەربوون کۆمەڵگای ئەو ولاتانەن کە ئەمڕۆ ئینگلتەرا و هۆڵەندایان پێدەڵێن و بونیادنەرانی سەرمایەدارین وەکو سیستەمێکی جیهانی. ئەو پەیڕەوانەش کە دۆزیویانەتەوە ئەو هزرانەن کە تا دوایی دەرگایان بۆ وابەستەیی کۆمەڵگا بە سەرمایەدارییەوە ئاوالا کردووە.

لە دۆخێکی وەهادا کاتێک وەکو کاتاگۆرییەکی بنەڕەتی لێکۆڵینەوە لەسەر کۆمەڵگای مرۆڤ بکەین چیمان بەرچاو دەکەوێت؟

ا - کۆمەڵگا پێکهاتەیەکە لە لایەنی چۆنایەتییەوە مرۆڤ لە ئاژەڵ جیا دەکاتەوە. بە پێی پێویست ئەم بابەتەمان روون کردەوە.

ب - هەر وەکو چۆن کۆمەڵگا لە لایەن مرۆڤەوە ئاوا دەکرێت، کۆمەڵگاش تاکەکانی مروڤ بونیاد دەنێت، پێکدێنێت. لێرەدا خاڵێکی سەرەکی کە پێویستە دەرکی پێبکرێت، کومەڵگا یان جڤاتەکان بە دەستی مرۆڤ و تواناکانی ئاواکراون. کومەڵگاکان دەزگای سەرووی مرۆڤ نین. هەرچەندە بە هۆی قووڵی کاریگەرییان لەسەر یادگا مرۆڤ لە تەوتەمەکانەوە تا دەگاتە خوداوەند خۆیان وەکو ناسنامەیەک پێشان بدەن، بەلام ئاشکرایە کە ئەمانە لە بەرهەم و داهێنانێکی مرۆڤ بەولاوە هیچی تر نین. کاتێک مرۆڤ نەبێت، کۆمەڵگایەک لە ئارادا نابێت کە تەوتەم و خوداوەندەکان بەردەوامییان پێ بدەن.

ج - کۆمەڵگاکان لەژێر سنووردرابوونی مێژوویی و جوگرافیدان. بە واتایەکی دیکە کۆمەڵگاکان هەلومەرجێکی جوگرافی و زەمەنێکیان هەیە، کە تێیدا ئاواکراون. هیچ ئاواکردنێکی کۆمەڵگا نییە لە مێژوو و جوگرافیا دابڕاو بێت. یۆتۆپیای کۆمەڵگایەک کە ماوە و هەلومەرجی بۆ نییە خەیاڵێکی پووچە.

بابەتی مێژوو بە گشتی گوزارشتێکی زەمەنە کە زیندووەکان و بە تایبەتیش مرۆڤ وابەستە دەکات. لە سەرروویانەوە وەرزەکان،

زۆربەی ماوە و چەرخە زدمەنییەکان بو پێکهاتنی جۆرایەتی زیندەوەران پێویستییەکی دەست لێبەرنەدراون . هیچ بونیادێک نییە کە ماوەیەکی دیاری کراوی نەبێت. دەرک بەوە کراوە کە زاراوەی " **ئەزەلی - ئەبەدی**" تەنیا تایبەتن بە "**گۆڕان**". واتا تاکە شتێک کە ناگۆڕێت و بێ زەمەنە خودی گۆڕانە. پەیوەندی نێوان مێژوو و کۆمەڵگا پتەو و کورت خایەنترە. کاتێک بۆ گەردوون باس لە ملیۆنان ساڵ دەکرێت، بۆ کۆمەڵگاکان هەزاران ساڵ بە ماوەی درێژ دادەنرێت. ماوە بەکارهێنراو و باوەکان ماوەی وەکو رۆژانە، مانگانە، ساڵانە و سەد ساڵانەیە. شوێنی کۆمەڵگاکان بە شێوەیەکی بنەڕەتی گرێدراوی هەبوونی رووەک و ئاژەڵەکانە. لە شوێنەکانی هێڵی ئیستیوا و جەمسەرەکان تاک و تەرا کۆمەڵگا بوونیان هەیە. ددوڵەمەندترین پەردەی رووەک و جیهانی ئاژەڵ زەمینە بۆ بەرهەمدارترین کۆمەڵگا دەڕەخسێنێت.

چەندین پێکهاتەی ئایینی، قوتابخانەی هزری کە لەناو داب و نەریتی دەوڵەت و پلەداری پێکهاتووە و ئاوا کراوە سیستەمێکی دابڕاو لە شوێن و مێژووی کۆمەڵگا وەکو قەدەرێک بەسەر زهنی مرۆڤدا زاڵ دەکەن. بە گوێرەی ئەوان هەر وەکو چۆن هەندێک قارەمان مێژوویان دروست کردووە، بەردەوام هەندێک واعیزی ئایینی و هزریش کەوتوونەتە جموجۆڵەوە بۆ دروستکردنی سیستەمێکی هزری و ئایینی دابڕاو لە کۆمەڵگای مێژوویی. سەرباری ئەوەی هزری سەرمایەداری جێگایەکی زۆر بە زانست دەدات، کەچی لە تەوەرەی تاکدا هزراندن سەبارەت بە کۆمەڵگا زۆر بە گرنگ دەزانێت. بەردەوام ئەوە لە تاریکیدا دەهێڵدرێتەوە کە کامە شێوەگرتنی کۆمەڵگا، رێگای لە پێش کامە سیستەمی هزری فەلسەفی و ئایینی کردۆتەوە. بە پێی پێویست سەلمێنراوە، هەر وەک چۆن زەمەن (مێژوو) و شوێن (جوگرافیا)ی کۆمەڵگا تاکی بونیادناوە، تاکەکانیش بەو فۆرماسیۆنەی وەری دەگرن لە شێوە پێدانی ئاییندەدا رۆڵی ئاواکردن دەبینن. هەربۆیە لە تێگەیشتنی

حەقیقەت و کێشەکانی پەیڕەودا ڕەهەندی جوگرافی و مێژوویی لە سەرووی هەلومەرجە پێویستەکانەوە دێن.

د- خاڵێکی دیکەی گرنگ ئەوەیە کە ڕاستینەکانی کۆمەڵگا خاوەن کارەکتەری بونیادنراوین. بەهەڵەداچوونێکی دیکەی بەردەوام مرۆڤ تێی دەکەوێت، سپاردنی بونیاد و دام و دەزگا کۆمەڵایەتییەکانە بە خەسڵەتی ڕاستینەی سروشتی. ڕژێمی مەشروعیەتی سیستەمە کۆمەڵایەتییەکان خۆیان وەها پێشکەش دەکەن کە پیرۆزن و ناگۆڕین. بە شێوەیەکی سیستەماتیک وەعز دەدەن کە خاوەنی دام و دەزگای ئیلاهین و بەم جۆرەش دەستنیشان کراون. لە مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا هەولدەدرێت ئەوە لە هزردا بنەخشێنرێت کە دوا گووتە لە کۆمەڵگادا گووترا، دام و دەزگا لیبراڵەکان ئەڵتەرناتیفیان نییە و تەنانەت گەیشتووینەتە **"کۆتایی مێژوو"**. بەردەوام باس لەو دەستوورە بنچینەیی و ڕژێمە سیاسیانە دەکرێت کە نەگۆڕن و ناگۆڕدرێن. کەچی تەنیا لە میانەی کورتە مێژوویەکدا دەبینین کە تەمەنی ئەم بونیادانەی ناهەژێن و ناگۆڕین سەد سالیش نابێت. ئەوەی لێرەدا گرنگە ئەو گووتە ئایدیۆلۆژی و سیاسیانەن کە ڕۆژانە هزر و ئیرادەی مرۆڤ دەبەستنەوە. ئەم ڕەوانبێژییە سیاسی و ئایدیۆلۆژییە بە شێوەیەکی ژیانی بۆ ناوەند و چاوگەکانی دەسەڵات و قۆستنەوە پێویستە. بەبێ گەڕانەوە بۆ ڕەوانبێژییەکی سیاسی و ئایدیۆلۆژی بەهێز بەڕێوەبردنی کۆمەڵگای ڕۆژگاری ئەمڕۆمان زۆر زەحمەتە. هەر لەبەر ئەم هۆکارەیە کە دام و دەزگای میدیاکان بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەر پێشخراون. دیسان زۆرینەی دام و دەزگا هزری و زانستییەکان بە ناوەندەکانی دەسەڵات و قۆستنەوەوە بەستراونەتەوە.

چەندە لە ئاستی تێگەیشتنی ئەوەدا بین کە ڕاستینە کۆمەڵایەتییەکان ڕاستییەکن کە بەردەوام و یەک لەسەر یەک بونیاد نراون، بەو ئەندازەیە حوکمی ڕووخاندن و پێویستی سەرلەنوێ بونیادنانەوەیان دەدەین. هیچ ڕاستینەیەکی کۆمەڵایەتی نییە کە

نەڕووخێت و نەگۆڕێت. بە تایبەتی رووخان و تێپەڕاندنی دەزگا چەوسێنەر و زۆردارەکان پێویستییەکی دەست لێبەرنەدراوی ژیانی ئازادە. کاتێک دەڵێین راستی کۆمەڵگا مەبەستمان تەواوی دەزگا ماددی و ئایدیۆلۆژییەکانییەتی. لە تەواوی گۆڕەپانەکانی کۆمەڵگادا لە ئایینەوە تا زمان، لە میتۆلۆژیاوە تا زانست، لە ئابوورییەوە تا سیاسەت، لە حقوقەوە تا هونەر، لە ئەخلاقەوە تا دەگاتە فەلسەفە بەردەوام لە هەلومەرج و کاتی گونجاودا، دەڕووخێنرێن، رەستورە دەکرێن و دەزگای نوێ پێکدەهێنرێن.

هـ ـ گرنگە پەیوەندی نێوان کۆمەڵگا۔ تاک ئەبستراکت (مجرد) نەبینرێت. تاکەکان بەشداری ئەو بونیادە ئاواکراوانە دەکەن کە لە تەواوی گۆڕەپانە ژمێردراوەکانی کۆمەڵگادا هەن و نەریتێکی جێگیر و زمانیکی دیاریکراوی شێوەگرتووی مێژووییان هەیە. نەک بەو شێوەیەی کە خوازیاربوون، بەڵکو بە گوێرەی ئەو دەزگا و نەریتانەی کۆمەڵگا بەشدار دەبن کە زۆر پێشتر و بە تایبەت ئامادە کراون. کومەلایەتیبوونی تاک پێویستی بە هەوڵێکی سەرسووڕهێنەری پەروەردە هەیە. بە واتایەک دوای هەرسکردنی کلتوورەکەی کە گشت رابردووی کۆمەڵگایە، تاک دەبێتە ئەندام و مەنسووبێکی کۆمەڵگا. کۆمەڵگابوون بە هەوڵێکی بەردەوام بەدیدێت. هەر چالاکییەکی کۆمەڵگا لە هەمان کاتدا چالاکییەکی بە کۆمەڵگابوونە. هەر بۆیە تاکەکان لەوە رزگاریان نابێت کە بە پێی داخوازی کۆمەڵگاکان بونیاد بنرێن، نەک بە گوێرەی خواستی خۆیان. بێگومان لەبەرئەوەی کۆمەڵگاکانی پلەداری و چینایەتی کۆمەڵگای کراوەن بۆ فشار و چەوسانەوە، بەردەوام داخوازی تاک بۆ ئازادی و بەرخودان دەمێنێت. بە ڕەزامەندی خۆی (لەناخەوە) ئەو کۆمەڵگابوونانە پەسەند ناکات کە کۆیلایەتییان لێ لەدایک بووە. هەروەها بۆ نەبوونە یەک و نەتوانەوە لە کۆمەڵگا بیانی، جیاواز و چەوسێنەرەکاندا زیاتریش بەرخودان دەکات. بەڵام دیسان لە دەزگاکانی پەروەردە و فشاری کۆمەڵگاکاندا هەر هەوڵی

گۆڕین و تەنانەت لەناوبردنیشیان دەدرێت. چەرخەکانی کۆمەڵگا وەکو ئاش ئاش دەیان هاڕێت، ئارد و هەویرێکی بە گوێرەی خۆیی لێ دروست دەکات. چ ناکۆکی نێوان دەزگاکان، چ ئەو مرۆڤانەی بەرخودان دەکەن، بەردەوام لە چوارچێوەی هاوسەنگییەکاندا و پشت بەسازشکردن لەناو کۆمەڵگادا جێگایەک بەدەست دێنن. نەکۆمەڵگا هێزی رەهای توانەوەی تاکی هەیە، نەتاکیش شانسی دابڕانی تەواوی لە کۆمەڵگا هەیە.

بە کورتی رژێمەکانی حەقیقەت و کارکردنێکی بە پەیڕەو لەسەر نموونەی مرۆڤێک کە لە میانەی هەڵویستێکی نزیک بە ڕاستی، کۆمەڵگا بە بنەما دەگرێت، دەشێت ئەنجامی واتاداری لێبکەوێتەوە.

چوارەمیان، نەرمایی زهنییەتی مرۆڤ لە بەرزترین ئاستیدایە، ئەمەش هەرە زێدە کاریگەری لەسەر شانسی واتاداربوونی توێژینەوەکانمان دەکات. تا سروشتی زهنییەتی مرۆڤ نەناسرێت، بانگەشەکانی حەقیقەت و پەیڕەو جێگای خۆی ناگرێت و لە هەوادا دەمێنێتەوە.

کاتێک هەوڵی پێناسەکردنی زهنییەتی مرۆڤمان دا زەۆر جار باسی پێکهاتە دوو لایەنەکەمان کرد. بونیادی هزری مرۆڤ کە پێکهاتووە لە بەشی (لای ڕاستی مێشک) کە لەرووی گەشەسەندنەوە کۆنە و هزری سۆزداری تێدا پێگەیشتووە وە، بەشی (لای چەپی مێشک)یش کە زیاتر لە هزری ئەنالیتیک نزیکە و بەردەوام بۆ گەشەسەندن کراوەیە؛ بەهۆی ئەم تایبەتمەندییەوە نەرمایییەکی مەزنی داوەتی. لە جیهانی ئاژەڵاندا سۆز و هزر ئاستێکی نزیک بە یەکتریان هەیە، سۆزەکان لە میانەی ڕیفلێکسە بە مەرج و بێ مەرجەکانیانەوە وەڵامی ئەو شتانە دەدەنەوە کە فێربوون، واتا پێویستییەکان جێبەجێ دەکەن. ئەمانە پەرچە کرداری ساتە وەختین. هەمان ئەم پێکهاتانە لە مرۆڤیشدا هەن. بۆ نموونە جەستە یەکسەر وەڵامی ئاگر دەداتەوە. لێرەدا هزراندنی ئەنالیتیکانە پێویست ناکات. بەڵام بۆ دەرکەوتنە سەر لووتکەی بەرزایی ئێڤەرست پێویستی

بە ئەنالیزکردنی سەدان هەلومەرج هەیە. بۆ کەوتنە ڕێ تەنیا دوای ئەنالیزکردنی گشت هەلومەرجەکان ئینجا بڕیار دەدرێت. لە هزری سۆزداریدا جێگا بە بەشی خەڵەتان (بەهەڵەداچوون) نادرێت. هەستەکانی ناخ چۆن کاردانەوە پیشان بدات بەم جۆرە هەڵسوکەوت دەکرێت. هەرچی هزری ئەنالیتیکە سالآنێک دەخایەنێت. پەیرەو، کار و لێکۆڵینی حەقیقەت ناچارە پشت بە بونیادێکی بەم جۆرەی هزرمان ببەستێت. تا سیستەمی کارکردنی زهنی خۆمان نەناسین، زانیاریمان سەبارەت بە حەقیقەت و پەیڕەوی ڕاست لە هەڕەمەکیتی ڕزگار نابێت. لە دۆخێکی وەهادا بەر لە هەموو شتێک ناسینی خودی زهن پێویستە.

یەکەمین تایبەتمەندی زهنمان، ئەوەیە کە پێکهاتەیەکی ئێجگار نەرمی هەیە . دەتوانرێت بگووترێت کە لە دەردوەدی زهنی مرۆڤیش، لە تەواوی ئەو پێکهاتانەی گەردووندا کە دەیانزانین شانسی بژاری ئازادانە زور سنووردارە. لە ماوەی زۆر سنووورداردا بوار بۆ ئازادی هەیە. نازانین کە بژاری ئازاد لە تەنۆلکە سەرەتاییەکانی گەردیلە و پێکهاتەکانی گەردوونی مەزندا چۆن کار دەکات. بەڵام کاتێک سەیری هەمەڕەنگی ئێستای گەردوون دەکەین، لەو دەرئەنجامانەی کە کەوتوونەتەوە دەزانین توانای جموجۆڵی نەرمی تەنۆلکەکان و گەردوونی مەزن تەنیا لە میانەی بەهرەی بژاری ئازادەوە مەیسەر دەبێت. هەرچی لە مێشکی مرۆڤدایە ئەم کەلێنەی نەرمایی زۆر فراوان بووە. بەلانی کەم لە ئاستی پۆتانسێلدا خاوەن ئازادییەکی جموجۆڵی بێ سنوورین. هەڵبەتە لەبیرمان ناچێت کە تەنیا لە ڕێگای کۆمەڵگابوونەوە ئەم پۆتانسێلە دەکەوێتە دۆخێکی چالاکەوە.

دووەمین تایبەتمەندی: نەرمایی زهنییەتمان بە ئەندازەی کراوەیی بۆ تێگەیشتنە بەرفراوان و کەڵەکە بووەکانی ڕاستی، بۆ تێگەیشتنە چەوتەکانیش کراوەیە. لەسەر بنەمای ئەم تایبەتمەندییە هەموو کاتێک ئەگەری هەیە کە ئەم نەرماییە، لە میانەی نێچیرڤانی سۆز و فشارەوە لە ڕێ لابدرێت. هەربۆیە سیاسەتەکانی

شەکر(قامیش) لەمیانەی خەڵەتاندن و کردەوەی چەوت کە هەموو ساتێک بە شوێن ڕاوکردنی سۆزەکانەوەیە لەگەڵ میکانیزمەکانی ئەشکەنجە و فشار پێکەوە بەکاردەهێنرێت. بە تایبەتی سیستەمی دەوڵەت و پلەداری کە هەزاران ساڵە فشاری خستۆتە سەر زهنی مرۆڤ، کاریگەریەکی ئێجگار مەزنیان هەیە، تەنانەت بە گوێرەی خۆیان بونیادێکی زهنییان ئاوا کردووە. یەکێک لە تایبەتمەندییە ناسراوەکانیشیان ئەوەیە کە زۆرجار لە ڕێگای خەڵاتەوە زهنیان ڕاو کردووە. سەرباری ئەمە، بونیادی زهنیمان کە خاوەن تایبەتمەندی بەرخودانە، بۆ گرتنەبەری ڕێگای ڕاست و گەیشتن بە حەقیقەتی گەورە تایبەتمەندی بێ هاوتای هەیە. لەم سیفەتانەی مرۆڤە گەورەکاندا زهنیەتی سەربەخۆیان ڕولێکی دەستنیشانکەری هەیە. زۆرترین بژاری ئازاد لە کاتی سەربەخۆیی زهندا بەدیدێت. پەیوەندییەکی نزیک لە نێوان تێگەیشتنێکی دەولەمەند و سەربەخۆ بوون هەیە. مەبەستمان لە سەربەخۆیی زهن ئەوەیە کە زیاتر بە گوێرەی پێوانەکانی دادوەری هەلسوکەوت بکرێت.

گوتبوومان کە سیستەمی گەردوونی لە پشت پەیوەندی نێوان ڕاستی و دادوەریەوەیە، کەواتە دەتوانین بڵێین ئەو زهنەی دادپەروەرە، بە گوێرەی سیستەمی گەردوونی ڕاوەستەی زۆر بەکارهێنانی شانسی بژاری ئازادی بە دەست هێناوە. لەم پێناوەشدا مێژووی ئازادی وەکو بە تواناترین هێزی پەروەردە، لە میانەی پەروەردە کردنەوە (مێژووی کۆمەڵگاکان) زهنمان بۆ بژاری ڕاست ئامادە دەکات. هەڵوێستەکانی شرۆڤەی سایکۆلۆژی (Psikoanalitik) خوازیارە بە خێرایی قووڵایی زهنمان بپێوێت. وەکو گۆرەپانێکی نوێی زانیاری چەندەی دەچێت بایەخدار دەبێت. بەڵام شرۆڤەی سایکۆلۆژی سەربەخۆ و بە تەنیا بۆ گەیشتن بە زانیاری ڕاست و سوودمەند ناتەواوە. سەربەخۆ تاوتوێکردنی تاک (دابڕاو لەکۆمەڵگا) ڕۆڵێکی مەزنی لەمەدا هەیە. تاوتوێکردنی مرۆڤ دابڕاو لە کۆمەڵگا، دەشێت ڕێگا لە پێش زانیاری ئێجگار

ناتەواو و ناتەندروستانە بکاتەوە. پڕکردنەوەی ئەم کەموکوڕییە لە لایەن سۆسیۆسایکۆلۆژیەوە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بەرهەمدار نییە. کۆمەلناسی ڕاست بونیادنەنراوە تاکو سۆسیۆسایکۆلۆژی ئەنجامی ڕاست بدات بە دەستەوە. لە ڕێگای دەروون ناسییەوە زهنی ئاژەلان باش دەناسین. وەکو ئاژدلێکی سوپەر (ئاژەلێکی بالا) دەشێت لە ڕێگای دەروون ناسییەوە مرۆڤیش بناسین، بەلام وەکو ئاژەلێکی کومەلایەتی هێشتا لە سەرەتای ناسینی مرۆڤداین.

کاتێک دەست دەدەینە وێناکردنی سیستەمی زانیاری و پەیڕەو، باشتر دەرک بەو ڕاستییە دەکەین کە ئەگەر بە چاکی بونیادی زهنیمان نەناسین بە ددست هێنانی ئەنجامی سەرکەوتووانە ددبێتە ڕێکەوتێک. تەنیا کاتێک بە شێوەیەکی قوول پێناسەیەکی ڕاست بۆ زهن بکرێت و پۆزسیۆن (دۆخ)ی بژاری ئازاد فەراهەم بکرێت (واتا ئازادی کۆمەلگا)، ڕژێمی زانیاری و پەیڕەومان دەتوانێت بۆ تێگەیشتنی ڕاست وەلامی بەهێز بداتەوە. لەژێر هەلومەرجێکی وەهادا کارە پەیڕەودارەکانمان دەتوانێت بە کۆکردنەوەی ڕاستتری زانیاری شانسی بوونمان بە تاک و کۆمەلگایەکی ئازاد زیاد بکات.

پێنجەمیان تایبەتمەندی کارەکتەری میتافیزیکی مرۆڤ سەبارەت بە ئەبستمۆلۆژی نموونەیەکی بێ هاوتایە. لە میانەی شیکار کردنی تایبەتمەندییە میتافیزکییەکانی مرۆڤ دەشێت زانستی ئەبستمۆلۆژی[1] بەهێزتر بکرێت. بە تایبەتی لە خولقاندن و بونیادنانی میتافیزیکیانەدا تێگەیشتن لە مرۆڤ بابەتێکی گرنگی توێژینەوەیە. یەکێک لەو کێشە کۆمەلایەتیانەی کە زۆرکەم شیکاری لەسەر کراوە، بێ بەش بوونمانە لە ئاستی پێناسەکردنی مرۆڤی میتافیزیک. چۆن دەشێت مرۆڤ میتافیزیک بێت؟ ئەمە لە چ پێویستییەکەوە سەرچاوە دەگرێت؟ لایەنە ئەرێنی و نەرێنییەکانی چین؟ ئایا دەشێت بە بێ میتافیزیک بژین؟ تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی میتافیزیک کامانەن؟

---

١ـ Epistemology: زاراوەیەکی لێکدراوە لە دوو گوتە پێکدێت: یەکێکیان ئەبیستما کە بە مانای مەعریفە دێت، ئەویتر لۆگۆس ئەویش مانای تیۆری یان زانست دەبەخشێت. ئەپستمۆلۆژیا بەواتای تیۆری مەعریفە دێت.

ئایا میتافیزک تەنیا لە گۆرەپانی ئایینی و هزریدا جێگای باسە؟ پەیوەندی نێوان کۆمەڵگا و میتافیزیک چییە؟ ئایا وەکو مەزەندە دەکرێت میتافیزیک دژی دیالیکتیکە، دەشێت بەم دژایەتییە سنووردار بکرێت؟ دەشێت پرسیارەکان زیاتریش بکرێت.

مادام مرۆڤ سۆبژەی سەرەکی زانیارییەکانمانە، کەواتە تا هزری میتافیزیک و دەزگاکانی نەناسین کە یەکێکە لە خەسڵەتە سەرەکییەکانی ئەم سۆبژەیە، بانگەشەکانی وەرگرتنی زانیاری لەم سەرچاوەیەوە ناتەواو دەمینێت. باس لە گۆرەپان (بابەت) ێک دەکەین کە کۆمەڵناسی و دەروونناسی بە گرفتێکی خۆیان نەزانیوە. هەڵسەنگاندنی چەندین قوتابخانەی هزری لە سەرووی هەمووشیانەوە ئایین وەکو میتافیزیک، گرفتی میتافیزیک ئاڵۆزتر دەکات. هەڵوێستمان سەبارەت بە کیشەی میتافیزیک لەبەرئەوەیە تایبەتمەندییەکی سەرەکی مرۆڤی بەکۆمەڵگابووە. میتافیزیک راستینەیەکی ئاواکردنی کۆمەڵگایە کە مرۆڤی بە کۆمەڵگابوو بە بێ ئەو بۆی ناچێتە سەر. ئەگەر مرۆڤ لە میتافیزیک دابېرێن یان دەگۆرێت بۆ ئاژەڵێکی سوپەر (ئەم زاراوەیە کە نیچە بۆ ئەڵمانەکانی بەکارهێناوە، لە ئەڵمانیای **"فاشیزم ـ نازی"** دا سەلمێنراوە) یاخود بۆ کۆمپیوتەرێکی سوپەر. مرۆڤایەتی کە بەم رەوشە گەیشتبێت چەندە شانسی ژیانی دەبێت؟

با بێینە سەر ئەوەی مرۆڤی میتافیزیکی چییە؟

ا ـ ئەخلاق تایبەتمەندییەکی میتافیزیکیانەی مرۆڤە.

ب ـ ئایین تایبەتمەندییەکی گرنگی میتافیزیکە.

ج ـ هونەر بە هەموو لقەکانییەوە، دەشێت تەنیا وەکو میتافیزیک پێناسە بکرێت.

د ـ کۆمەڵگای بە دام و دەزگا، تەنانەت یەک پارچە کۆمەڵگا هەمووی لەگەڵ پێناسەی میتافیزیکدا زیاتر دەگونجێت. ئایا مرۆڤ لە میانەی ئەم تایبەتمەندیانەیەوە کە دەتوانین زیاتریشیان لێ ریز بکەین، بۆچی و چۆن دەبێتە میتافیزیک؟

یەکەمیان، بەهرە (Capacity)ی بیرکردنەوەیە. مرۆڤ وەک گەردوونێک کە بە جۆرێک لە جۆرەکان هەستی بە خۆی کردووە، بۆ ئەوەی ئەو سەرسوڕمانە (هەم ئێش، هەم خۆشی) بڕەوێنێتەوە، ناچارە خۆی لە سەرووی فیزیا ئاوا بکات. بەجۆرێکی دیکە دەرەقەتی خۆشی و ئێشە ماددییەکان نایەت. بۆ خۆڕاگری بەرامبەر بە شەڕ، مردن، شەهوەت، خولیا، جوانی و .. هتد هزری میتافیزیک و دەزگاکانی پێویستییەکن و زەحمەتە دەستبەرداریان بێت. خوداوەند نەبێت دادەهێنرێت، هونەر ئاوا دەکرێت و زانیاری پێشدەخرێت، تەنیا بەم جۆرە پێویستییەکان تێر دەکرێن.

لە ڕوانگەیەکی دیکەوە ئەگەر میتافیزیک وەک ئەولاتری فیزیا (جیهانی ماددی) بیری لێبکرێتەوە، نە پێویستی بە نکولیکردن نە بە پەسندان هەیە. بە ڕاستی مرۆڤ بوونەوەرێکە کە هەرە زۆر سنوورەکانی جیهانی ماددی (فیزیا) تەنگەتاو کردووە. ژیانێک لە سەرووی فیزیا کە وەکو میتافیزیایە، پێویستییەکی کارەکتەری ئۆنتۆلۆژی (بوونناسی)انەی مرۆڤە. تەنیا بەرگریکردن لە بوونی (مانەوەی) جەستەیی هیچ واتایەکی نییە. ڕاستتر مانەوەی جەستەیی (ماددی) تەنیا ڕێگا لە پێش پێناسەی مرۆڤی میکانیک دەکاتەوە. ئەمە هەڵوێستێکە کە لە مێژە **"دیکارت"** پێناسەی کردووە، بەڵام لە میانەی زاراوەی **"ڕۆح"**ەوە کە هیچ ڕوون کردنەوەیەکی زانستیانەی بۆ نییە هەوڵیدا خۆی لێ ڕزگار بکات .

دووەم، بەبێ بوونی ئەخلاق بەردەوامنەبوونی کۆمەڵگا، میتافیزیک بوون دەکاتە پێویستییەک. کۆمەڵگا تەنیا لە میانەی ئەخلاقەوە ڕێکدەخرێت کە وەک دادگایی کردنێکی ئازادە. هەڵوەشانەوەی ڕوسیای سۆڤییەت و میسری فیرعەونەکان سەربارى ڕاسیۆنالییان دەکرێت بۆ بێبەش بوونیان لە ئەخلاق بگەڕێنرێتەوە. ڕاسیۆنالبوون بە تەنیا ناتوانێت کۆمەڵگا بەڕێوەببات. لەوانەیە بیکات بەڕۆبۆت، بە دۆخی ئاژەڵە پێگەیشتووەکانی بگەیەنێت؛ بەڵام وەکو مرۆڤ نایهێڵێتەوە. با هەندێک لە سیفەتەکانی ئەخلاق بژمێرین: هێزی

بەرگەگرتنی ئێش و جێبەجێ کردنی پێویستییەکەی، سنووردانان بۆ شەهوەت و ئارەزوو و چێژ، لە جیاتی ڕێسا جەستەییەکان بەستنەوەی زاوزێ بە ڕێسا کۆمەڵایەتییەکانەوە. بڕیاردان دەرهەق بە بژاری پابەندبوون یان پابەند نەبوون بە یاساو ئایین و داب و نەریتەکانەوە. بۆ نموونە بەستنەوەی پەیوەندی زایەندی کە ڕێگا لە پێش زۆربوون دەکاتەوە، بە ڕێساکانەوە لە جۆری مرۆڤدا پێویستییەکی ناچارییە. تا ژمارەی دانیشتوان نەخرێتە ژێر کونترۆڵەوە بەردەوامی بە کۆمەڵگا نادرێت. تەنانەت ئەم بابەتە بە تەنیا پێویستی مەزنی میتافیزیکی ئەخلاق دەخاتە ڕوو.

سێیەم، مرۆڤ لە ڕێگای هونەرەوە گەردوونیکی تایبەت بە خۆی خولقاندووە. تەنیا لە میانەی داهێنانەکانی گۆڕەپانە سەرەکییەکانی لە جۆری دەنگ، وێنە، بیناسازی و.. هتد بەردەوامی بە کۆمەڵگا دەدرێت. ئایا دەشێت بیر لە کۆمەڵگایەکی بێ مۆسیقا، بێ وێژە و بێ بیناسازی بکرێتەوە؟ داهێنانەکانی سەرجەم ئەم گۆڕەپانانە بە واتای میتافیزیک دێت. ئەم داهێنانە بۆ بەردەوامکردنی کۆمەڵگا دەست لێبەرنەدراون. هونەر تەواو وەک وێناکردنێکی میتافیزیک پێویستی ئیستاتیکبوونی مرۆڤ جێبەجێ دەکات. چۆن مرۆڤ لە میانەی بژاری چاک ـ خراپ واتا دەداتە ڕەفتاری ئەخلاق، هەروەها بە داوەری جوان ـ قێزەون یش واتا دەداتە ڕەفتاری هونەریش.

چوارەم، گۆڕەپانی (بواری) رامیاری ـ بەڕێوەبەرایەتی پڕ لە داوەری میتافیزیکانەیە. خودی گۆڕەپانەکە بریتییە لە بەهێزترین بونیادنراوەکانی میتافیزیک. ناتوانین رامیاری لە ڕێگای یاساکانی فیزیاوە روون بکەینەوە. تەنانەت گەورەترین بەڕێوەبەرایەتی کە لە میانەی یاساکانی فیزیاوە پێودانگ بکرێت رۆبۆتیانە دەبێت. بە واتایەکی تر **"لەوەڕاندنی مێگەلە"** لە لایەن فاشیزمەوە. ئەگەر بڵێین گۆڕەپانی رامیاری واتای هەڵبژاردن و رەفتاری ئازادانەش لەخۆوە دەگرێت، دووبارە ڕووبەڕووی کارەکتەری میتافیزیکیانەی مرۆڤی سیاسی دەبینەوە. گووتەکەی ئەرستۆ کە دەڵێت: **"مرۆڤ ئاژەڵێکی**

**سیاسییە**" زیاتر ئەم واتایە دەگەیەنێت.

پێنجەم، بە گرنگییەوە دەبێت ئاماژە بەوە بکەین کە حقوق، فەلسەفە، ئایین، تەنانەت "**زانستگەرایی**"یش گۆڕەپانی بارگاوین بە میتافیزیک. لە مێژووی کۆمەڵگاکانەوە ئاگادارین کە تەواوی ئەم گۆڕەپانانە لە رووی چەندایەتی و چۆنایەتییەوە پڕن لە شاکاری میتافیزیکی و پێی بارگاوی کراون.

دوای ئەوەی قورسایی پێگەی میتافیزیکمان لە ژیانی تاک ـ کومەڵگا دەستنیشان کرد، دەتوانین هەڵوێستی واتادارتر لە بارەیەوە پێش بخەین.

١ـ لە مێژووی پێشکەوتنیدا هەلوێستە میتافیزیکەکان یان بە شێوەی شکۆدارکردنێکی تەواو وەکو حەقیقەتێکی سەرەکی خۆیان خستۆتە ڕوو، یاخود لە لایەن رکابەرەکانییەوە تەواو وەک گۆڕەپانێکی هەڵبەستراو، کەدوورە لە ڕاستی، تەنیا گووتە و ئامێریکن بو هەڵخەڵەتاندنی مروڤ، هەڵوێستێکی رەخنەگرانەی بەرامبەر پێشان دراوە. زۆر بە ئاسانی دەتوانرێت بگووترێت، کە لە هەردوو هەڵوێستیشدا سەبارەت بە تێگەیشتن لە مێژووی کۆمەڵگاکان یان بێ ئاگان یان زێدەڕۆییان تێدا کردووە. ئەو خاڵەی هەردوو هەڵوێستیش لێی ئاگادارنین ئەوەیە: میتافیزیا سەرچاوەی خۆی لە کام پێویستی و تایبەتمەندی کۆمەڵگا ـ تاک وەردەگرێت. ئەو بەشەی شکۆداری دەکات، پەیوەندی میتافیزیایی لەگەڵ جیهانی ماددی بەلاوە ناوە، بەهەڵەداچوونێکی وەکو ئازادی هەتا هەتایی لە خۆوە گرتووە. نکۆڵییان لە پەیوەندی هزر و رۆح لەگەڵ جیهانی ماددیدا کردووە یان دووچاری چەقبەستنیان کردووە، هەر بۆیە بە شێوەیەکی چڕ کەوتوونەتە ئەوپەڕگەری، سەبارەت بە سیستەمی خوداوەندە باڵاکان و تەنانەت گەیشتوونەتە سەپاندنی بیری بە خوداوەندکردنی مرۆڤەکانیش. بێگومان کاریگەری پلەداری و سیستەمی دەوڵەت لەم گۆڕانکاریانەدا مەزنە.

هەرچی ئەو بەشەیە کە نکۆڵی لە گرنگییەکەی دەکات، جیهانی

ماتریالیست، شارستانێتی ماددی، لە قۆناخەکانی دواییشدا راسیۆنالیزم و پۆزێتیڤیزمیان کردۆتە ئالا بۆ خۆیان و کەوتوونەتە هێرشەوە: هەر شتێک بۆنی میتافیزیای لێبێت نەخۆشییە، ئامرازی خەڵەتاندنە، پێویستە بە گشتی رەتبکرێتەوە. بەڵام دواتر دەرکی پێکراوە کە بە تایبەتی ئەو راسیۆنالیزم و پۆزێتیڤیزمەی کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری خاوەنیانە بەوەی ریگایان لە پێش دەستەواژەی (چەمکی) ژیانی **"مێکەلی فاشیست"**، **"مرۆڤی میکانیک ـ رۆبۆت"** و **"سیمولاسیۆن"** کردۆتەوە و ژینگەیان لەناو بردووە و بوونەتە مایەی رووخانی کۆمەلگای مێژوویی. وابەستە بوونێکی ئەوپەڕگەرانە بە یاساکانی فیزیاوە کۆمەڵگا لە ڕووخان و پەرتەوازەبوون رزگار ناکات. بەم جۆرەش دەسەلمێنرێت کە **"زانستگەرایی"** خراپترین میتافیزیکە. هەڵبەتە ئەگەر ژیانی کۆمەڵگا واتایەکی هەبێت! بە بایەخەوە ئاماژەی پێدەکەم **"زانستگەرایی"** تەسکترین ماتریالیزمە، باشترین پسپۆری پەروەردەکراوی دەسەلات و قۆستنەوەیە، هەربۆیە بە ئاگایی بێ یان بێ ئاگایی، هەرە زێدە خۆی دەخەڵەتێنێت و نوێنەرایەتی خڵتە (ژەنگگرتوو) ترین شێوەی میتافیزیک دەکات.

٢ـ گرووپێک کە جێگای خۆیان لە هیچ لایەنێکدا ناگرن و دەتوانین وەکو **"نهیلیستەکان"** هەڵیان سەنگێنین، بانگەشەی ئەوە دەکەن کە **"ناچار نین لە هەردوولاشدا جێگای خۆمان بگرین، پێویست بە لایەنگیری و دژایەتیکردنی میتافیزیک ناکات و دەتوانین تەواو سەربەخۆ بژین"** ئەم گروپەی لە رووخساردا گوایە بێ زیان وەستاوە، لە ناوەرۆکدا مەترسیدارترین تاقمە. هیچ نەبێت هەردوو لایەنەکەی تر نموونەی بالای خۆیان هەیە، دەرک بەو بەهایانە دەکەن کە نوێنەرایەتی دەکەن. لە شێوە پێدانی کۆمەڵگا و سەرلەنوێ بونیادنانەوەی تاکدا خاوەن بانگەشەن. هەرچی گرووپی تەواو سەربەخۆیە، سەرباری ئەوەی لە راستیدا لەناو کۆمەڵگا و بەهاکانیدا دەژین، لە میانەی هەڵوێستێکی نهیلیستانەوە

باوەڕیان بە ژیانێکە کە هیچ پەیوەندی بەوێوە نییە. نزیکترین توێژ لە میتافیزیکە "**زانستی**"یەکان. ئەم گروپە کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری وەکو قارچک ژمارەیانی زیاد کردووە لەو ئەندامانە پێکدێن کە رووخاون، کەوتوونەتە بۆشایی کۆمەڵگای هەڵوەشاوە، فڕێدراونەتە ژێرابەکانەوە و فاشیلن. دەتوانین بڵێین توێژێکی هەرە نزیکە لە بە ئاژەڵ بوونێکی پێچەوانەوە. هۆلیگانەکانی[1] تۆپی پێ نموونەی بەرچاوی ئەو کەسانەیە کە لەم توێژە زۆر نزیکن. گروپی بەم جۆرە بەخێرایی زیاد دەبن. لە میانەی ئەم نموونانەشەوە دەتوانرێت بسەلمێندرێت کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری شێرپەنجەی زیاد کردووە. هەردوو هەڵوێستی مێژوویی سەبارەت بە میتافیزیا لە دەرئەنجامدا لە چەمکی زانستپەرستی پۆزیتیڤیستی[2] مۆدێرنیتەدا بە یەک دەگەن. لە کاتێکدا ئایینەکەیان دەمامکی خۆی گۆڕیوە، پوزیتیڤیزمی بە ناوەڕۆک میتافیزیک بۆتە ئایینیان، خوداوەندەکەشیان دەوڵەت ـ نەتەوەیە. ئەو خوداوەندەی دەمامکی خۆی فڕێداوە بە تایبەت بە شێوەی دەوڵەت ـ نەتەوە لەناو تەواوی کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا لە میانەی مەراسیم و هێماکانیەوە پیرۆز دەکرێت.

٣. لەو بڕوایەدام کە پێشخستنی هەڵوێستێکی هاوسەنگانەتر هەم پێویستە هەم دەرفەتی هەیە. راستتر لە میانەی زانینی ئەو راستییەی کە میتافیزیا دام و دەزگای کۆمەڵگایە، پێشخستنی میتافیزیکێکی نزیک لە "**چاکی، جوانی، ئازادی و راستی**" لە هزر، سیاسەت، هونەر و ئەخلاقدا بە ئەرکی سەرەکی دادەنێم. بەبێ کەوتنە ناو هەڵوێستەکانی "**پەسەندکردنێکی سەرانسەر، یان رەتکردنەوە و چەنەبازیەکانی سەربەخۆیی**" ئەوانەی خۆیان بە زانا دادەنێن؛ هەر وەکو چۆن لە مێژووی کۆمەڵگاکاندا پەیڕەوکراوە، درێژەدان بە لێکەڕینەکانی "**چاکی، جوانی، ئازادی و راستی**" گەوهەری ژیانێکی فەزیلەتدارە. لەو بڕوایەدام ئەوەی لەناو کۆمەڵگادا دەرفەتی ژیانی

١ـ نەخۆشی وابەستەیی ئەوپەڕگەرانە بە یاری تۆپی پێوە.
٢ـ کەسێک کە پەیڕەوی رێبازی پۆزێتیڤیزم دەکات.

واتادار دەڕەخسێنێت ئەم هونەرەی ژیانی فەزیلەتدارە.

بێگومان مەحکومی میتافیزیا نین، بەڵام دەستبەرداری دۆزینەوە و پێشخستنی "**چاکترین، جوانترین، ئازادترین و ڕاستترین**" نابین. چەندە مەحکوم بوون بە خراپی، قێزەونی، کۆیلایەتی و چەوتی چارەنووسێکی نەگۆڕ نییە، شێوازێکی ژیانی ڕاست، ئازاد، جوان و چاکیش ئاستەم نییە. وەکو خراپترین بژاریش ناچاری ژیانێکی نهیلیزم نین، کە بێچارەیی و نابەرپرسیارێتی (لە سەرووی هەموویانەوە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری، تەواوی سیستەمە دەوڵەتی و پلەدارییەکان) ڕێگای لە پێش کردۆتەوە. سەبارەت بەم بابەتە پێکدادان هێندەی مێژوو کۆنە، لە سەردەمی دەستپێکی بونیادنانی کۆمەڵگاوە بەردەوامە. لەم بارەیەوە لایەنی تایبەتی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان ئەوەیە کە، لە قۆناخی هەڵوەشاندنەوەی سیستەمێکی وەکو مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا دەژین، هەروەها بۆ تێکۆشانە "**ڕاست، ئازاد، جوان، چاک**" دکەی ئەم قۆناخە دەرکەوتنی پێویستییەکانە بە هزری تایبەت، ڕاوەستەکانی چالاکی و سەرلەنوێ بونیادنانەوەی کۆمەڵگاکان. لەم لایەنەوە پێویستی بە هەوڵ و کۆششێکی بەرفراوان و خولیا و لێگەڕینە زانستییە (پەیڕەو و ڕژێمەکانی حەقیقەت) ئەشق ئاساکان هەیە.

ئەو بەڵگانەی تا ئێستا لەپێناو تێپەڕاندنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و وەڵامدانەوەی گرفتەکانی پێشخستن و بڵاوکردنەوەی مۆدێرنیتەی دیموکراتیدا هەوڵی ڕیزکردنیانم دا، دەبێت وەک کەرەستەی خاو کاری لەسەر بکرێت. لەم پێناوەشدا بە ئەندازەی ڕەخنەکردنی ئەو پەیڕەو و ڕژێمانەی زانیاری (ڕێی حەقیقەت) کە ڕێگایان لە پێش مۆدێرنیتەی فەرمی کردۆتەوە، پێویستە سیستەمی زانیاری و پەیڕەوی پۆست مۆدێرنیزمیش ڕۆشن بکەینەوە، کە ڕێگای بۆ سەردەمێکی تر خۆش کردووە. کەرەستەکەمان سەبارەت بەم لایەنەیە. وەکو پرسیارێکی کلیل ئاسا ڕوونمان کردەوە کە چۆن و بۆچی پێویستە سەبارەت بە مرۆڤ

قاڵبینەوە. پێناسەکردنی تێگەیشتنێکی راستی تاک ـ کۆمەڵگا گرنگی خۆی دەپارێزێت. هەوڵەکانی سۆسیۆلۆژی، پیسکۆسایکۆلۆژی و ئانترۆپۆلۆژی لەم لایەنەوە بەرهەمدار نییە چونکە لە تۆرەکانی دەسەڵات ـ زانیاری و شێواندنە جددییەکانی پۆست مۆدێرنیزم گیریان خواردووە. هەرچی هەوڵە بەهادارەکانی تاکە، بێ سیستەم و رێکخستنن. لەم بارەوە لە ئاستی قوتابخانەدا خاوەن رۆڵەکان لە سەرووی هەمووشیانەوە قوتابخانەی فرانکفۆرت، فرناند براودل[1]، بەرلەوانیش نیچە، دواتر میشێل فۆکۆ، والرشتاین[2] سەرباری ئەوەی هەڵوێستی زۆر بەهاداریان پیشاندا، بەڵام رژێمەکانی زانیاری و پەیڕەوی نوێی قۆناخ (مەبەستمان سەردەمی هەڵوەشاندنەوەی مۆدێرنیتە و دەرکەوتنی پۆست مۆدێرنیتەی تازەیە کە خوازیارین بە مۆدێرنیتەی دیموکراسی ناوی ببەین) دوورن لە بەسیستەم بوون. هەوڵەکان زۆر بەهادارن، بەڵام پارچە پارچەن. هۆکاری

١ـ Fernand BRAUDEL مێژوو ناسێکی فەرەنسیە لە نێوان ساڵانی (١٩٠٢ – ١٩٨٥) دا ژیاوە. سەردەمێک سەرنووسەری گۆڤاری "VI ème section" بووە کە بە ئامانجی نوێنەوەی پەیوەندی نێوان مێژوو و زانستە کۆمەڵایەتییەکانی تر دەرکراوە. گرنگترین بەرنووکەکانی "دەریای سپی و جیهانی دەریای سپی لە سەردەمی فلیپی دووەمدا، شارستانی ماددی و سەرمایەداری لە ١٤٠٠ – ١٨٠٠، ناسنامەی فەرەنسا (کە بەهۆی مردنییەوە تەواوی نەکردووە و دوای مردنی بڵاوکراوەتەوە)" سەرباری ئەوەی کە جوگرافی ناسێک بووە بەڵام لە بواری مێژوودا شۆڕشی بەرپا کردووە. بەرچاوترین لایەنی جیاوازی براودێل لەم پەرتووکانەیدا ئەوەیە کە هەوڵیداوە مێژوو بکاتە شوێن پەنجەی مرۆڤە سادەکان. هەروەها بە پێچەوانەی هەموو مێژوو ناسەکانی ئەو سەردەمەوە کاتی نیوتنی رەت کردۆتەوە و کاتی رێژەیی بەکارهێناوە. بە شێوەیەکی زۆر جیاواز لەنێو یەکێتی کات و شوێندا مێژووی لێکداوەتەوە.

٢ـ Emanuel WALLERSTEIN کۆمەڵناس و زانایەکی بواری کۆمەڵناسی مێژووییە و سیستەم ئانالیز دەکات، لە ساڵی ١٩٣٠ لە ئەمریکا لە دایک بووە و تا ئێستاش دەژی، رەخنە لە پێشینەکانی بۆ سەرمایەداری گلۆباڵ و پشتگیری کردنی بۆ بزوتنەوە دژبەرەکانی سیستەم هۆکاری سەرەکییەکانی جێگرتنێتی لەو تۆپۆزسیۆنیەدا کە بەرامبەر سیستەمی گلۆباڵ کەوتونەتە گەڕ. سەبارەت بە سیستمی جیهانی تیۆری جیهانی سێهەم رەت دەکاتەوە و پێداگری لەسەر ئەوە دەکات کە هەموو جیهان لە ناو تەوری چنراوی پەیوەندییە ئاڵوگۆڕکارییەکانی ئابووریدا بەیەکەوە بەستراوەتەوە. داکۆکی لەسەر ئەوە دەکات کە سیستەم لە رووی کلتووری و ئابووری و سیاسییەوە هۆمۆژێن (چونیەک) نییە، تەواو بە پێچەوانەوە لەسەر بنەمای جیاوازی بنەڕەتی وەک جیاوازی پێشکەوتنی شارستانیەتەکان و هەڵکشانی سەرمایە و هێزی سیاسی شێوەی گرتووە. بە پێچەوانەی تیۆرییەکانی مۆدێرنیتە و سەرمایەدارییەوە، ئەمانە بە نارێکییەک نازمێرێت کە لە رێی پێشکەوتنی یەکپارچەی سیستەمەوە بەلاوە بنرێن، بەڵکو دەیانگێرێتەوە بۆ تایبەتمەندی بۆ ماوەیی سیستەمی شارستانی کە جیهان و سیستەم لەسەر بنەمای ناوەند و دەوروبەر و نیوە دەوروبەر دابەش کردووە. لە کاتێکدا ناوەند (دەسەڵات) توانایەکی زۆری تەکنیکی بەدەستەوەیە و بەرهەمەکانی لە ئاستێکی بەرزدان، دەوروبەر (دەرەوەی دەسەڵات) رۆڵیان دابینکردنی کەرەستەی خاو، بەرهەمی کشتوکاڵی، هێزی کارکردنی هەرزانە بۆ نوێنەرانی سیستەم. هەرچی ئەوانەن کە نیو دەوروبەرن بۆ دەوروبەرەکان رۆڵی ناوەند و بۆ ناوەندیش رۆڵی دەوروبەر دەبینن. دەوڵەتی نەتەوەیی بە بەرهەمێکی سیستەمی سەرمایەداری دادەنێت، کە ئیتر سەردەمی بەسەر چووە. ئەمریکاش کە لە ساڵی ١٩٤٥ەوە تا ئێستا هێزی هەژموونگەری ئەم سیستەمە بووە لەمەو دوا ئەو تایبەتمەندییەی خۆی لە دەست دەدات و رووداوی ١١ ئەیلول و پێشکەوتنەکانی دوای ئەو بە بەرچاوترین دوا بەڵگەی ئەمە دەژمێرێت. گرنگترین بەرهەمەکانی "جیهان ـ سیستەمی مۆدێرن" و "سەرمایەداری مێژوویی".

سەرەکی ئەمەش هەر وەکو والرشتاین گووتویەتی و دانی پیدا ناوە، ژەهراویتی سیستەمی سەرمایەدارییە، هەر وەکو بلێی تەواوی ئەم هەولانە لەناو مەنگەنەی مۆدێرنیتەدا کزۆلەیانە و گرمۆلە بوون.

بۆ نموونە پوختەی گووتەکانی نیچە گرنگە کە دەلێت: **مۆدێرنیتە کۆمەلگای کردووە بە ژن، خەساندوویەتی و کردوویەتی بە مێروولە (گرگن).** هەر وەکو بلێی پەنجا سال دواتری بینیوە، گوزارشتی **"ئاژەلە سوپەرە قژ زەردەکە"** کە بۆ ئەلمانەکانی بەکارهێناوە ئاماژەیە بۆ مێگەلبوونی فاشیستانە. لە پەرتووکی **"وەهای فەرموو زەردشت"** کاتێک دەلێت: مۆدێرنیتە و دەولەت ـ نەتەوەکان زوو یان درەنگ مێگەلبوونی فاشیستانە دەخولقێنن، لە نموونەی **"نەتەوەی مێروولە"**شدا سەبارەت بە ژاپۆن ئاماژە بە کەوتنە گەڕی کۆمەلگا مێروولەییەکان دەکات، تیروانینێکی بەهێز دەدرکێنێت. هەر وەکو بلێی رۆلی پێغەمبەری سەردەمی سەرمایەداری دەبینێت.

ماکس ویبەر[1] کاتێک لە میانەی دەستەواژەی **"بەندکردنی کۆمەلگا لەناو قەفەسی ئاسنیندا"** مۆدێرنیتە هەلدەسەنگێنێت، دەستنیشان کردنێکی گرنگ پێش دەخات. هەروەها کاتێک دەلێت:**"راسیۆنالی هۆکاری لە دەستدانی تەلیسمی دونیایە"** جەخت لەسەر کارەکتەری ماددی شارستانی دەکاتەوە.

فرناند براودل بە شێوەیەکی زۆر توند ئەو کۆمەلناسییانە رەخنە دەکات کە لە رەهەندی مێژوو و شوێن دابڕاون. کاتێک ئەو باسانەی لە رەهەندی کات و شوێن رایان کردووە، وەک **"کۆی بوویەرە پووچەکان"** هەلدەسەنگێنێت، کۆمەکێکی مەزن بە کێشەی پەیڕەو دەکات. زاراوەکانی " کورت ماوە ـ مێژووی بوویەرەکان"، **"ماوەی هەنووکەیی = Konjonktures ـ ماوەی قەیرانی دەستاوردەست"** و

١ـ Max Weber کۆمەلناس، هزرمەند و شارەزایەکی بواری ئابووری سیاسی ئەلمانە، لە نێوان سالانی (١٨٦٤ — ١٩٢٠) دا ژیاوە. بە باوکی کۆمەلناسیی ئانتی پۆزیتیف دەژمێردرێت. لەجیاتی ئەو شیکردنەوانەی بنەمای چینایەتیان هەبووە زاراوەی ستاتۆی جێگیر کردووە. هەروەها بە لێکۆلینەوەکانی لەسەر کۆمەلناسی سیاسی و کۆمەلناسی پەروەردەیی و کارەکانی لەسەر بیرۆکراسیەت دەناسرێت. پێی وا بووە کە بەشێکی زۆری کێشە کۆمەلایەتییەکان لە رێی ئابوورییەوە دەبێت شیبکرێنەوە و چارەسەر بکرێن. لە شیکردنەوەی کێشە ئابوورییەکانیشدا پەیڕەوی ئامارییانەی بەکارهێناوە. گرنگترین بەرهەمی "رۆحی سەرمایەداری و ئەخلاقی پرۆتیستانی".

" **درێژماوە ـ ماوەی بونیادی**" کە بۆ مێژوو ئاماژەیان پێدەکات ئاسۆی مرۆڤ فراوان دەکەن.

ڕەخنەی قوتابخانەی فرانکفۆرت سەبارەت بە ڕۆشنگەری مۆدێرنیتە، ناوەڕۆکی سەرەتای سەردەمێکی نوێ لە خۆوە دەگرێت. هەڵسەنگاندنەکەی ئادۆرنۆ[1] بۆ ڕێخۆشکەریی شارستانی مۆدێرنیتە لە پێش سەربازگە (کامپ)کانی "**کۆکردنەوە**" کە دەڵێت: "**کۆتایی هاتنی سەردەمێک لە تاریکیدا**" زۆر بەهێزە. بە تایبەتیش گوزارشتی "**ژیانی چەوت، ڕاست ناژێنرێت**" زۆر بەناوبانگە. لەم ڕێگایەوە داننانی بە چەوت بونیادنانی مۆدێرنیتەدا لە ڕووی زانیاری و پەیڕەوەوە، دەریدەخات کە بە تێگەیشتنێکی مەزن گەیشتووە. ڕەخنەکانی سەبارەت بە ڕاسیۆنالیزم و ڕووناکبیری ئاسۆی مرۆڤ فراوان دەکەن.

کاتێک "**میشێل فۆکۆ**" لە سەردەمی مۆدێرنیتەدا مردنی مرۆڤیشی خستە سەر مردنی خوداوەندەکەی ئاسمان، بابەتێکی جێگای پەند و ئەزموون وەرگرتنە. بە تایبەتی ئەو لێکدانەوەیەی کە دەڵێت: دەسەڵاتی مۆدێرن بۆ ناوەوە و دەرەوەی کۆمەڵگا بە واتای شەڕی بەردەوام دێت، زۆر بەهێزە، بەڵام کاری پێنەکراوە. زنجیرە زاراوەکانی لە جۆری دەسەڵات ـ زانیاری ـ بەندیخانە ـ شێتخانە- قوتابخانە- نەخۆشخانە- سوپاخانە(سەربازگە)- کارگە و قەحپەخانە بە ئەندازەی کۆمەککردنیان بە پەیڕەوگەری، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆش نەبێت هەمان کۆمەک پێشکەش بە پێویستی چۆنییەتی ئاواکردنی سیستەمێکی ئازادی زانیاری دەکات. فۆکۆ لە شیکردنەوەی "**دەسەڵات ـ شەڕ ـ ئازادی**"دا کە بە هۆی مردنی پێشوەختیەوە نەیتوانی تەواوی بکات؛ هەر وەکو بڵێی خوازیارە

١ـ Theodor Adorno فەیلەسوف و کۆمەڵناس و موزیکۆلۆگ و نووسەرێکی ئەڵمانە لە نێوان ساڵانی ١٩٠٣ – ١٩٦٩ دا ژیاوە، باوکی یەهودییە. دامەزرێنەری فەلسەفەی بیرۆکەی ڕەخنەگرانەی قوتابخانەی فرانکفۆرتە. سەبارەت بە سەرمایەداری لە ڕووی ئابوورییەوە بۆچوونەکانی وەک مارکس بوون، بەڵام لە ڕووی کلتوورییەوە سەبارەت بە سەرمایەداری مۆدێرنیتە لە بۆچوونەکانی مارکس جیا دەبێتەوە و پێی وایە کە مۆدێرنیتە کۆمەڵگا بەرەو ڕەوتی ئەقڵگەرایی دەبات و لە کلتوور بێبەری دەکات. فەلسەفەکەی لەسەر ئەم بنەمایە کاردانەوەیەکە بەرامبەر بە ڕاستی ئەو کۆمەڵگایەی تێیدا ژیاوە و بە شێوەیەکی ڕادیکاڵ و سۆفیگەرایانە ئەم هەڵوێستانەیی پیشان داوە. گرنگترین بەرهەمەکانی "فەلسەفەی مۆسیقای نوێ ١٩٤٩"، "سێ لێکۆڵینەوە لەسەر هێگل ١٩٦٣".

پێمان بڵێت لەبەرئەوەی لە ناودوە و دەرەوەی کۆمەڵگا بەردەوام دۆخێکی شەڕ لە ئارادایە مۆدێرنیتە مرۆڤی کوشتووە. لێرەوە دەتوانین ئەو گریمانەیەی لێ ددربهێنین کە **هەرچی ئازادییشە ئەو شێوەیەی ژیانی کۆمەڵگایە کە توانیویەتی لە دەرەوەی شەڕ بمێنێتەوە.** لە حاڵەتێکی وەهادا تا ئیندوستریالیزمی بەرهەمهێنەری تەواوی ئامێرەکانی رووخان و یاسای قازانج کە سەرچاوە و ئامانجی ملیتاریزمە، لەگەڵ سوپا نیزامییەکان هەڵنەوەشێنینەوە، ژینگەپاریزی و بەرگری گەوهەریانەی کۆمەڵگا لە جێیان دانەنرێن ئازادی بەدینایەت.

والرشتاین لە دەرککردن سەبارەت بە **"جیهان - سیستەمی سەرمایەداری"** خاوەن بانگەشەیە. لە سەدەی شازدەهەمینەوە تا رۆژگاری ئەمرۆمان وێنەیەکی تەواوی مۆدێرنیتە دەکێشێت. بەڵام لە رووی هەڵسەنگاندنی سیستەم (ئەمیش وەک مارکس قۆناخی سەرمایەرداری بە پێویست دەزانێت، مەیلێکی بە پۆزیتیف دانانی سەرمایەداری هەیە) و بە رکابەریکردنی سیستەم و هەنگاونانی نوێ یەکلایی نەبۆتەوە. کاتێک هۆکاری ئەمە بۆ پەردەپۆش کردنی سیستەمی بۆرژوا دەگێڕێتەوە، وەکو ئەوە وایە دانی پێدا بنێت. کاتێک بە ئاگادارییەکی مەزنەوە دەڵێت: **"سیستەمی سۆسیالیستی لە سەرووی هەموویانەوە روسیای سۆڤییەت، نەک هەر مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییان بۆ تێپەڕ نەکراوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە هێزیان پێ بەخشیوە و هەڵوەشاندنەوەیان لیبرالیزمی سەرمایەداری لاوازکردووە، نەک بەهێز"** ئاماژە بە تێزێکی گرنگ دەکات. بەڵام هەمان شت سەبارەت بە هەڵوەشاندنەوەی سیستەم و پێهەڵگرتنێکی نوێ ئەنجام نادات. لەوانەیە لەو بارەیەوە ناهەق نەبێت کە هیچ پێشبینییەک ناکات سەبارەت بەوەی قەیرانی بونیادنانی دوای (۱۹۷۰)کانی مۆدێرنیتە کەی و چۆن ئەنجامگیر دەبێت، بەڵام زۆر بایەخدارە کە لە جیاتی ئەمە کاتێک دەڵێت: **دەستێوەردانێکی واتاداری بچووک لەوانەیە رێگا لە پێش ئەنجامی گەورە بکاتەوە.**

وا دیارە کە تارادەیەکی مەزن لە دیتێرمینیستی ووشک دوور کەوتۆتەوە. دەتوانین بڵێین لە بارەی پەیڕەو و سیستەمی زانیاری خاوەن تۆکمەترین هێزی هەڵسەنگاندنە.

بێگومان دەتوانین ناوی چەندین رووناکبیری دیکە باس بکەین. رەخنەکانی **"مورای بوکین"**[1] دەرهەق بە ژینگەپارێزی، رەخنەکانی **"فیرەبەند"**[2] سەبارەت بە پەیڕەو و لۆژیک ڕێگا لە پێش شێوە و پەیرەوێکی دیکە دەکاتەوە. ئەوەی لە تەواوی ئەم رووناکبیرانەدا کەمە، بە شێوەیەکی کارامە بە دەست نەهێنانی یەکێتی زانیاری - چالاکییە. بێگومان هێزی زەبەلاحی بەخۆوە گرێدانی مۆدێرنیتە لەمەدا بە کاریگەرە. سەرباری ئەوەی قوتابخانەی مارکسیستی بانگەشەی ئەوە دەکات کە زانستیترین و توندترین رەخنەگری سەرمایەداری بووە، بەڵام ئەوەی جێگای پێکەنینە سەبارەت بە بابەتی زانیاری - دەسەڵات نەیتوانیوە رێگری لە بوون بە سوودبەخشترین ئامرازی سیستەم بکات. لە بوون بە باڵی چەپی

---

١ـ Murray Bookchin نووسەر، وتاربێژ، فەلسەفەگەرێکی سیاسەت و سۆسیالیستێکی ئازادیخوازی ئەمریکییە و بە رەچەڵەک یەهوودییە. لە نێوان ساڵانی (١٩٢١ – ٢٠٠٦) دا ژیاوە. دامەزرێنەری بزوتنەوەی ئێکولۆژی کۆمەڵایەتییە. لایەنی سەرنج راکێشی سەنتێزکردنی نەریتی ئانارشیستی (رەت کردنەوەی هەموو جۆرە سیستمێکی دەسەڵات) و تێگەیشتنی هاوچەرخی ئێکولۆژییە. دژبەری سەرمایەدارییە و وەک شێرپەنجە و نەخۆشیەکی کۆمەڵگا وەسفی دەکات. تەنها بەمەوە ناوەستێت بەڵکو پێی وایە کە سەردەست بوونی مرۆڤ بەسەر مرۆڤەوە هاوتەریب لەگەڵ سەردەست بوونی مرۆڤ بەسەر سروشتەوە دەستی پێکردووە. ئەمەش بە یەکێک لە بنەماکانی پێچەوانە بوونەوەی ژیانی مرۆڤ لەگەڵ یاساکانی سروشتدا لەقەڵەم ئەدات. بۆ ڕزگار کردنی سروشت لە سەردەستی مرۆڤ بە پێویستی دەزانێت کە سەردەستی مرۆڤ بەسەر مرۆڤەوە نەمێنێت. بەم مەبەستەش رەت کردنەوە و هەڵگرتنی دەوڵەت وەک ئەو دەزگایەی بۆتە مایەی ئەم سەردەستییە بە پێویستیەکی دەست لێبەرنەدراو دەزانێت. بۆ ئەمەش دروستکردنی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی لە دەرەوەی دەوڵەت کە بە دەوڵەت بوون ناکەنە ئامانج سەرەکی دەبینێت. بۆکین لە بوارەکانی فەلسەفە، سیاسەت، مێژوو، ئیکۆلۆژی و کێشەکانی شاردا خاوەنی چەندین پەرتووکە. گرنگترین بەرهەمەکانی "ئانارشیزم دوای بێ دەرەتانییەکی زۆر" و "ئیکۆلۆژی ئازادی و "شۆڕشی سێهەم"

٢ـ P.K.Feyerabend ئانارشیستێکی زانیار، فەیلەسوف و فەلسەفەگەرێکی زانستە. نوستورالیە و لە ساڵانی نێوان (١٩٢٤ – ١٩٩٤) دا ژیاوە. یەکێکە لە فەیلەسوفە لە پێشەکانی سەدەی بیستەم و ناودارێکی بەناوبانگی بیرۆکەی زانیاریی ئانارشیستییە. دژبە ئەقڵگەرایی بووە لە فەلسەفەی زانستدا و هەستاوە بە پاک کردنەوەی لەمە. داکۆکی لە چەمکی ڕێژەیی کردووە لە زانستدا، بە واتایەکی تر بەرامبەر بە تێگەیشتنێکی دۆگمایی ئۆرتەدۆکسیانە لە زانستدا یاخی بووە. بۆیە لە بواری فەلسەفەی زانستدا وەک بیرۆکەیەکی ئانارشیستانە تەماشای دەکرێت. یەکێکە لەو بەناوبانگانەی کە گوتویانە "ماڵاوا بۆ ئەقڵ" لێرەدا فیرەبەند بەرامبەر بەوە یاخی دەبێت کە عەقڵ جۆنیەتیەکی یەکپارچەی تاقانەیە و لە پەیڕەویشدا تەنها یەک رێگا دەگرێتە بەر. هەروەها دژ بە جوداخوازییەکە کە گریمانە زانستییەکان و پەیڕەوەکەی بەرزتر رادەگرن لەوەکانی دیتر. فیرەبەند پێی وایە کە زانست و هونەر و ئایین هەر یەکەیان رێگای جیاوازی بەدەستهێنانی زانیارین، یەکێکیان لە سەروو یان لەپێشتر یان تایبەتتر نییە لەوەکەی تریان. بە ڕێگای جیاوازیان دادەنێت بۆ گەیشتن بە حەقیقەت. یەکێکیان بەوەکەی تریان ناپێورێت. یەکێکیان نابێتە هەڵگری یان بچووکراوەیەکی ئەوەکانی تر. گرنگترین بەرهەمەکانی "نا بۆ پەیڕەو" و "ماڵاوا بۆ ئەقڵ" و "چەند تێزێک لەسەر ئانارشیزم" و "زانست لە کۆمەڵگایەکی ئازاددا".

لیبرالیزم رزگاری نەبووە. ئەزموونی سەد و پەنجا ساڵ بە پێی پێویست ئەمەی سەلماندووە.

دەتوانین هۆکاری سەرەکی ئەمە، بگێڕینەوە بۆ بەستنەوەی پەیڕەو و تەواوی زانیارییەکانی بە چوارچێوەی **"چڕکردنەوەی لە ئابووریدا"**. سۆسیالیزمی زانستی کە کارەکتەری مێژوویی و میتافیزیکی کۆمەڵگای هەڕەمەکی سادەی تاوتوێ کرد، دیاردەی دەسەڵاتی بۆ کۆمیتەیەکی بچووکی حکومەت گۆڕی و ڕۆڵی تەلیسماویانەی دا بە شیکردنەوەی ئابووری - سیاسی، لە بوون بەکۆپیەیەکی نوێی پۆزیتیڤیزم رزگاری نەبوو. سەربارى ئەوەی لە سەرەتاوە بە ئەندازەی **"ئیمیلی دورکهایم[1] و ماکس ویبەر"** کۆمەڵناسی وەک خاوەن ڕۆڵی دامەزرێنەرانەی بینیوە، بەڵام سەبارەت بە بابەتی پەیڕەو و زانیاری ڕۆڵی ڕەوتی چەپی لیبرالیزمی تێپەڕ نەکردووە. جارێکی دیکە ئاشکرا دەبێت کە ئەوەی گرنگ و دیاریکەرە نیاز و داخوازی نییە، بەڵکو ناوەندەکانی هێزی تواندنەوە و پێوەلکاندنی سیستەمە (پەیڕەو، زانیاری - دەسەڵات، هێزی تەکنۆلۆژییە) کە حوکمداری کۆمەڵگان. سەربارى ئەوەی ئابووری هێزێکی گرنگە، تا لەگەڵ دەسەڵات و هێزە میتافیزیکیە سەرەکییەکاندا بە شیکارێکی ڕاستی کۆمەڵگا - مێژووییدا تێپەڕ نەکرێن، تێپەڕاندنی سیستەم (مۆدێرنیتەی سەرمایەداری) دۆزینەوەی کێشەکان، پێشنیازکردنی ڕێگاکانی چارەسەری و پراکتیزە کردنی لە پۆزیتیڤیزمێکی ڕەها بەولاوە ئەنجامێکی دیکەی

---

١ـ Emile Durkeim کۆمەڵناسێکی فەرەنسی بە ڕەچەڵەک یەهوودییە. لە نێوان ساڵانی (١٨٥٨ – ١٩١٧)دا ژیاوە. بە دامەزرێنەری سۆسیۆلۆژی مۆدێرن دەژمێردرێت. لە ڕێی بە نموونە وەرگرتنی شێوازی فیزیای کۆمتە و بایۆلۆژی هێربێرت سپێنسەر، هەوڵی داوە ڕووداوە کۆمەڵایەتییەکانی کۆڵیوەتەوە و پێی وایە کە دەبێت ڕووداوی کۆمەڵایەتی لە ڕێی ڕووداوی لە جۆری خۆیەوە لێی بکۆڵرێتەوە. ڕووداوی کۆمەڵایەتی بە قۆناخێک دادەنێت کە بە تاک دەست پێدەکات و هەر بەویش کۆتایی بێت. ڕووداوی کۆمەڵایەتی بە تێپەڕکاری تاک دەژمێرێت کە تاک ناچارە تێیدا بەشدار بێت. چونکە ڕووداوە کۆمەڵایەتییەکان بە کۆمەڵێک ڕووداوی گشتی دەست لێبەرنەدراوی لە جۆری ئایین، ئابووری، حقوق، ئەخلاق، سیاسەت، زانست و هونەر دەژمێرێت کە خودی تاک و پەیوەندی نێوان تاکەکان دەست نیشان دەکەن. بە تەواوی تاک لە کۆمەڵگادا ناتوێنێتەوە و نایکاتە قوربانی، بەڵکو داکۆکی لەوە دەکات کە مرۆڤ دەبێت تاکێتییەکی تایبەت بەخۆی و کۆمەڵایەتی بوونێکی تایبەت بە کۆمەڵگای هەبێت. لە لایەکی ترەوە کۆمەڵگا بە بناخە و مۆڵ بوونی هەموو ئەو دام و دەزگایانە دەژمێرێت کە سەبارەت بە مرۆڤن. و پێی وایە کە ئەم دام و دەزگایانە (نموونە خودا و ئایین) پەیوەستن بە کۆمەڵگاوە و لەگەڵ ئەودا دەگۆڕێن و پێشدەکەون. گرنگترین بەرهەمەکانی "ڕێساکانی پەیڕەوی کۆمەڵگا – زانست" و "شێوازە سەرەتاییەکانی ژیانی ئایینی".

لیناکەویتەوە. ئەو تیۆری - پراکتیکەی هەیە بەلگەی سەلمینەری ئەمەن.

رەوتە ئەنارشیستەکان کە وەکو رەخنەیەکی رادیکاڵ بەرامبەر مۆدێرنیتەی سەرمارییەداری دەرکەوتن سەبارەت بە پەیڕەو و تیۆری زانیاری بەهێزن. وەکو مارکسیستەکان باس لە پێشکەوتووخوازی سەرمایەداری ناکەن. توانیویانە لە چەندین خاڵی جیاوازەوە سەیری کۆمەڵگا بکەن: ئەم خاڵانە بە تەوەرە گرتنی ئابووری تێپەڕ کردووە. بە شێوەیەکی پێگەیشتوانە رۆڵی منداڵە **"یاخی"** یەکانی سیستەم دەبینن. سەرەڕای تەواوی نیازە باشەکانیان لە ئەنجامدا نەیانتوانیوە خۆیان لە بوون بەو تەریقەتانە رزگار بکەن کە تەنیا بە توندی خۆیان لە تاوان و گوناهەکانی سیستەم دەپارێزن. خاڵەکانی: بە شێوەیەکی راست پێناسە کردنی سیستەم و گرفتەکانی تێپەڕاندنی، کارامە بەکارهێنانی هێزی زانیاری - چالاکی و پەیڕەوی مۆدێرنیتەی دیموکراتی کە بۆ مارکسیزم ئاماژەم پێکرد بۆ ئەم رەوتەش جێگای باسە.

دەتوانین هەڵسەنگاندنی هاوشێوە بۆ تیۆری و پراکتیکی بزووتنەوە ژینگەیی، فیمینیستی و کلتوورییەکانیش بکەین. ئەم بزووتنەوانە لەو بەچکە کەوانە دەچن کە لە قەفەسی ئاسنینی مۆدێرنیتە رزگاریان بووە. بەردەوام لە نیگەرانیداین کە کەی و لە کوێ راودەکرێن. بەڵام دیسان بینینیان وەکو بزوتنەوەکانی هیوا گرنگە. کاتێک لێشاوی ئەڵتەرناتیڤی بنەڕەتی پەرەیسەند دەشێت کۆمەک و رۆڵێکی زۆریان هەبێت. بزووتنەوەکانی رزگاری نیشتمانی و سۆسیال - دیموکراتەکان هەر زوو لەگەڵ سیستەمی سەرمایەداری بوونە یەک و بوون بە هێزی درێژە پێدانی. رەوتی سەرەکی لیبرالیزم لە بوون بە دوو مەزهەبی بەهێز سەرکەوتنی بەدەست هێناوە.

لەو بڕوایەدام لە گەیشتن بەرەو ئەنجامدا بە شێوەیەکی کورت

ئاماژە بە هەڵویستی **"ئانتی ئۆریانتالیزم"**[١] انەی خۆم بکەم کۆمەک و سوود بە بابەتەکە دەبەخشێت. کاتێک لەبەرامبەر مۆدێرنیتەدا تەماشای خۆم دەکەم هەست دەکەم ناکۆکی مەزنم لە باردیەوە هەیە. سەبارەت بە هۆکاری ئەمە یەکسەر دەتوانم ئاماژە بە دوو خاڵ بکەم.

یەکەمیان؛ کاریگەری کلتووری رۆژهەلاتی ناوینی کلاسیکە. ئەم کلتوورە ناکۆکی قووڵ و کێشەی لەگەڵ مۆدێرنیتەی سەرمایەداری هەیە. بەر لە هەموو شتێک، لە بەخشینی رۆلی لە پێشینەیی بە کۆمەڵگا زۆر رادیکاڵە. لە کۆمەڵگادا بە ئاسانی روو بە تاکڕەویتی نادرێت. پێودانگی سەرەکی بو هەڵسەنگاندنی کەسایەتی پەیوەستبوونە بە کۆمەڵگاوە. پابەندبوون بە کۆمەڵگاکانیانەوە بە تەواوەتی شکۆدار کراوە. کاریگەری داب و نەریت و ئایین لەمەدا بەهێزە. دابڕان لە کۆمەڵگا بە نەزانی و بچووکی دادەنرێت، دەکرێتە بابەتی گاڵتە پێکردن. بە چاوێکی باش سەیری گۆڕینی کۆمەڵگا ناکرێت. بەڵام کاتێک بە پەیوەستبوونێکی چۆنایەتی گەیشت بە شکۆدارکردنەوە لێی نزیکدەبنەوە. بە بێزوو کردنەوە سەیری جێگرتن لە ئاستەکانی دەوڵەت و پلەداری دەکەن. کلتووری باو، پلەداری دەوڵەتی رۆژهەلاتی ناوین لەم تێگەیشتنەدا زۆر کاریگەرە. بەهۆی کاریگەری ئەم تایبەتمەندیانەوە لەسەر کۆمەڵگا، بە کلتووری مۆدێرنیتەشەوە بەئاسانی خۆی رادەستی هیچ کلتوورێک ناکات. راستتر ئەوەیە بە ئاستەمی لەناویاندا دەتوێنرێتەوە.

١. Orientalism ناوەکەی تری زانستی رۆژهەڵاتە. سەرچاوەکەی لاتینییە کە وشەی "ئۆریان" لە لاتینیدا بە واتای هەڵاتنی خۆر دێت و لە واتا جوگرافیەکەشدا ئاماژەیە بۆ رۆژهەڵات. ئۆریانتالیزم ناوێکی هاوبەشی هەموو ئەو بوارانەیە کە ناوەندەکەیان رۆژئاوایە و لە زمان، کلتوور و گەلانی رۆژهەڵاتی ناوین و دوور دەکۆڵنەوە. لە سەردەمی رێنسانسدا کۆمەڵێک رۆشنبیر پێویستی لێکۆڵینەوە لە کلتوور و باوەڕییەکانی گەلانی رۆژهەڵات وەک ئەوەی کە لە هی رۆژئاوا لە زۆر لایەنەوە لە پێشترن دەبینن. سەرباری ئەوەی ئۆریانتالیزم لە سەرەتادا لەمەوە سەرچاوەی گرتووە دواتر، دەبێتە ئامازەیەک بۆ لێکدانەوە پڕ پێشداوەری، نکوڵی کار، لە جێی هیچ دانەر و بە ئەوەکەی تر ژماردنی گەلانی رۆژهەڵات و رۆژهەڵاتی ناوین لە لایەن ئەوروپی و ئەمریکییەکانەوە. رۆژهەڵات بە بچووک و پاشکۆ و بونیادنراوی بەردەوام لە لایەن رۆژئاواوە لەقەڵەم دەدات. بۆیە دەبێتە ناوی ئەو نوسراو و لێکۆڵینەوانە لەسەر رۆژهەڵات کە شێوازێکی پڕ لە پێشداوەری ئایدیۆلۆژیان سەبارەت بە رۆژهەڵات پێوە دیارە. زۆرێک لە رۆشنبیران پێیان وایە وەک بیرۆکەیەک کۆمەکێکی باشی بە هەڵمەتە ئیمپریالییەکانی رۆژئاوا کردووە و هێندە سیمبۆل یان دسپلینێکی بێ تاوان نییە و بناخەی هزری ە زانستی و کلتووری دزەکردنی رۆژئاوای بۆ زۆرێک لە جوگرافیاکانی جیهان داناوە. ئانتی — ئۆریانتیلیزم یش واتای دژێتی ئەم بۆچوونە دەبەخشێت.

هەر بۆیە نابێت واقمان وڕبمێنێت کاتێک بە کوێردی دەوڵەت ـ نەتەوە کە یەکێکە لەڕەوتە هەرە بەهێزەکانی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان کلتووری **"ئوممەت"** هەڵدەبژێرێت کە داب و نەریتێکی بەهێزە. چونکە دەوڵەت ـ نەتەوە بەرهەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە؛ بیانییە. ئیسلامی سیاسی و دەوڵەت ـ نەتەوە کە لە ناوەڕۆکدا هەردووکیان میللیگەراییین، کاتێک بەراورد بکرێن، زۆرتر ئیسلامی سیاسی هەڵدەبژێردرێت کە خۆجێیی ترە. لە زۆرێک لە بوارەکانی شێوازی ژیاندا نەگونجانی لەگەڵ مۆدێرنیتە بەردەوامە. لە دەردوەدی ڕۆژهەڵاتی ناوین، لە هیچ شوێنێک لە گۆڕەپانی کلتووریدا بەرخودان بەرامبەر مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پێشنەخراوە. تەنانەت ئەگەر ئەنجامیش بدرێت لە قووتدران، توانەوە لەناویدا ڕزگاری نەبووە. تەنیا ئەم بەراوردکردنە بەسە بۆ سەلماندنی بەردەوامی مێژوویی و کۆمەڵایەتی بونیادە کلتوورییەکەی.

هۆکاری دووەم، سەرباری ئەوەی پەیوەندییەکی گەورەم بۆ بونیادی هزری ڕوژئاوا پیشانداوە، بەڵام بۆ ماوەیەکی درێژخایەن، نەکەوتوومەتە ناو ئەو نەخۆشییەی کە هەرجارە و گیرۆدەی ڕەوتێکی ببم. لە لێکۆڵینەوەکانم سەبارەت بە حەقیقەتدا هەرچەندە زۆر قووڵ و بە پەیڕەویش نەبووبێت، ئاگاداری کۆبوونەوەی ئەو زانیاری ـ زانست و پەیڕەوانەم کە ڕێگایان لە پێش مۆدێرنیتە کردۆتەوە. بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا بالابوونەکەی دەبینم. ئەو کاردانەوەیەی بەرامبەر کلتووری ڕۆژهەڵاتی ناوین هەمبوو، لە پیشاندانی بەرامبەر ئەم کلتوورە مۆدێرنەش درەنگ نەکەوتم. هەرچەندە درەنگیش بێت بەڵام زانیم کە لە دەزگاکانی هەمان شارستانیدا دەرکەوتوون. بە لێهاتووییەوە بینیم کە هەردوو کلتووریش سەرچاوەی بنەڕەتییان لە پێکهاتەی پێنج هەزار ساڵی پلەداری و دەوڵەتە. هەر بۆیە بە هەمان زیرەکییەوە بوێری ئەوەم پیشاندا کە لایەنە هاوبەشەکانی هەردوو کلتوورەکە بە پالاوتەی ڕەخنەدا تێپەڕ بکەم.

**لەم رەخنانەوە بە ئاسانی دەبینرێت کە تاکڕەویتی وەکو مشک کۆمەڵگا دەکڕێنێت. دەستنیشان کردنی ئەو راستییە ئاستەم نییە کە: لیبرالیزمی سەرمایەداری لە ئازادی تاک زیاتر هونەری کڕاندنەوەی کۆمەڵگای مرۆڤایەتییە، سەرچاوەی خۆشی لە کلتووری باوی بازرگانان وەردەگرێت.** هەرچی کلتووری بازرگانییە، دەکرێت بە هەر سێ ئایینە مەزنەکەی یەکتاپەرستیشەوە بە چەندین نەریتی کۆنەوە روون بکرێتەوە. کاڵابوون و ئاڵوگۆڕکردنی کاڵا کە بناخەی بازرگانی پێکدێنێت، رۆڵی سەرەکی بینیوە لە تێکچوون و هەڵوەشانەوەی کۆمەڵگا و جڤاتەکاندا کە بریتیین لە چالاکی - هەردودزی مرۆڤ. زهنییەتی بازرگانی نەریتیکی بەهێزی رۆژهەلاتی ناوینە. هەر لە دۆزینەوەی خوداوەند و پیرۆزکردنیەوە، تا گۆڕینی هونەری بەڕێوەبردنی دەوڵەت بۆ پیلانگێڕی و جێگیرکردنی درۆ و دووڕوویی لەناو پێکهاتەی ئەخلاقدا، رۆڵێکی یەکلاییکەرەوەی لە جێگرتنی چەندین هێما، ناسنامە، زمان و فاکتەری گوماناویدا هەیە. رۆڵ و کۆمەکی ئەورووپای رۆژئاوا لەوەدایە کە ئەم سیستەمە لە ڕۆژهەلاتی ناوینەوە دەبات و لەمیانەی بەکارهێنانی رۆشنگەری، رینسانس و ریفۆرمەوە دەیکات بە سیستەمی کۆمەڵگای زاڵ. کۆمەڵگاکانی رۆژهەلاتی ناوین بە چاوێکی باش تەماشای بازرگان و دەزگاکانی ناکەن و بە پلەی یەکەمیش شوێنی پێنادەن. به **پێچەوانەوە هەر بە گومانەوە سەیری دەکرێت. لە ئەورووپا ئەوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری سەرکەوتنی تێدا بە دەست هێناوە، سیستەمی کاڵای کردووە بە تاجی سەری کۆمەڵگا، تەواوی زانست، ئایین و هونەریشی خستۆتە خزمەتی ئەم کۆمەڵگا نوێیەوە. ئەوەی لە ڕۆهەلاتی ناویندا بێ بەهایە و لە پلەی دووەمدایە، لە ئەورووپا بوو بە پلەی یەک و گلێنەی چاو.**

**لە ڕۆژهەڵاتی ناوینی ئەمرۆماندا رەخنەکردنی مۆدێرنیتەی ئەورووپا، تەنانەت پشت ئەستوور بە توندوتیژی لە میانەی ئیسلامی سیاسی دژایەتیکردنی بووە بە مۆدێل. بەڵام بە گوێرەی**

من له **"ئەدوارد سەعید"**ەوه تا دەگاته حزبوڵلا ئەو ڕێکخستنانەی بە هەڵوێست و کردار خۆیان بە ئانتی ئۆریانتالیست و دوژمنی مۆدێرنیته دەزانن هەر وەکو نەریتی مارکسیستی پێکهاتەی ناو مۆدێرنیتەن، دەرئەنجام خزمەت بە سیستەم دەکەن. هەر وەکو چۆن دەرکەوتنیان لە سایەی مۆدێرنیتەدایە، سەرکەوتووبن یان ژێرکەوتوو، پێویستییەکی سروشتەکەیانە کە دیسان لە مۆدێرنیتە بپارێنەوە و بەرگری لێبکەن. تەنیا ریش هێشتنەوە و جل پۆشینەکەیان هی نەریتی باوە، رۆح و جەستەیان بە پاشماوە هەرە دواکەوتووەکانی مۆدێرنیتەوە پرکراوە.

لەو بڕوایەدام کە بە شێوەی هێڵی گشتی پەیڕەوی رەخنەکردن و شێوازی هەڵسەنگاندنی زانیاری خۆمم پێشکەش کرد. هەرچەندە سنووردداریش بێت، بەڵام بەلانی کەم رۆشنبوونەوەیەک سەبارەت بە پێناسەی ئەو زانست و پەیڕەوە فەراهەم بووە کە ڕێگایان لە پێش مۆدێرنیتەی سەرمایەداری کردەوە. هەرچەندە لە بارەی راستییەکەی زۆر دڵنیاش نەبین، ئەوا خاوەن شانسی **"پێشخستنی شێوازی زانست و پەیڕەوین لە پێناو قەڵەمبازی ئازادی و دیموکراتی"** کە لە سەردەمی کائیۆسی بونیادیانەی مۆدێرنیتەدا پێویستە بژارێک هەڵبژێردرێت. بە ئامانجی ئاسانکاری باسەکەمان بە شێوەی چەند سەرە دێڕێک ریز دەکەین:

**١. ئەو چەمکی زانست و پەیڕەو (پارادیگما)ەی کە رۆجەر باکۆن، فرانسیس باکۆن و دیکارت بناخەکەیان دانا، پەیوەندییەکەی لەگەڵ سەرمایەداری ببینرێت، لەسەر ئەم بنەمایەش رەخنە بکرێت.**

**٢. دەبێت ئەوە ببینرێت کە ئامانج لە قووڵکردنەوەی جیاوازی نێوان سۆبژێکتیڤیزم و ئۆبژێکتیڤیزم و رەنگدانەوەی لە چەندین دوالیزمی دیکەدا، ئەوەیە کە کۆمەڵگا (وەک ئۆبژە) بکرێتە سەرچاوەیەکی کراوە بۆ هەموو جۆرە قۆستنەوەیەک لە لایەن تاکڕەوێتییەوە (وەک سۆبژە).**

**٣. بەم جۆرە ڕێگا خۆش دەکرێت بۆ بە سروشتی بینینی**

جیاوازی بورژوا ـ پرولیتاریای کۆمەڵگا و بەکارهێنانی پرولیتاریا وەک **"ئۆبژە"**یەک.

٤ـ لە میانەی گووتەی: **"زانست هێزە"** بناخەی تیۆری زانست ـ دەسەڵات دادەنرێت و پێشوەخت یەکێتی زانست ـ دەسەڵات دەکرێتە چەکی سەردکی سیستەم.

٥ـ بە بیانووی چەقبەستی و گووتە ناماقووڵە ناسراوەکانی ئایین و میتافیزیکەوە، زانست لە شێوەی پۆزێتیڤیزمدا دەگۆڕدرێت بۆ ئایینێکی نوێ. لەژێر ناوی تێکۆشان بەرامبەر ئایین و میتافیزیا ئایینی خۆی پێکدێنێت و زاڵیدەکات.

٦ـ لیبرالیزم دەکاتە ئایدیۆلۆژیای فەرمی، لە لایەکەوە وەک سازشکارترین ئامراز، لە لایەکی دیکەشەوە وەک چەمکێک بەکاری دێنێت کە تەواوی ئایدیولوژییە رکابەرەکان بە خۆیەوە دەلکێنێت و دەیانتوێنێتەوە، بەمەش لە دۆخی **"دەستی نەبینراو، زەهنی نەبینراو"** گەورەترین هەژموونی ئایدیۆلوژی ئاوا دەکات.

٧ـ لە کاتێکدا لیبرالیزم و پۆزێتیڤیزم فەرمی دەکات، چەندین قوتابخانەی هزری و رەوتی ئایدیۆلۆژی لەبەرچاو دەخات، بە تایبەتیش تا رکابەرەکانی وەک پارچەیەک پێیەوە نەلکێن، ئەوا سوور دەبێت لەسەر ئەم هەوڵانەی.

٨ـ فەلسەفە و ئەخلاق لەبەرچاو دەخات. بەم جۆرە شانسی رێنمایی و هەڵوێست نواندن(بژاری ئازاد = ئەخلاق)ی رکابەرانی سیستەم کەم دەکاتەوە.

٩ـ گشتگیری ناواخنی زانست و هێزی واتاکەی لە رێگای ئەوپەڕگیری دیسپلینەکردنەوە (جیاکردنەوەی لقی جودا) پارچە دەکات. واتا فیل بە تاڵە مووەکانی روون دەکاتەوە، دارستانیش بە دارێک. ئەو زانستەی بە شێوەیەکی زێدەڕۆیی پارچە کراوە هەم بە ئاسانی بە دەسەڵاتەوە دەبەسترێتەوە، هەم بۆ تەکنۆلۆژیا دەگۆڕدرێت و دەکرێتە بوارێکی بەدەستهێنانی قازانج و داهات. چیتر ئامانجی زانست دۆزینەوەی واتای راستەقینەی ژیان نییە، بەڵکو کۆکردنەوەی پارەیە. لە رێبازی زانست ـ داناییەوە بۆ رێبازی زانست ـ هێز ـ پارە رۆیشتوون. زانست ـ دەسەڵات ـ سەرمایە رێکەوتننامە نوێ و پیرۆزەکەی مۆدێرنیتەیە.

١٠. له مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا لە پاڵ تەواوکردنی بە ژن کردنی (کردنی بە کویلەیەکی پێشکەوتوو) ئافرەت لە لایەن شارستانیەتەوە (شارستانی چینایەتی شار) و خەساندن و بە ژن کردنی پیاودا (لە سایەی هاوولاتیتی)، تەواوی کۆمەڵگا دەکرێت بە ژن و دەبەستریتەوە (بە گوێرەی هیتلەر کۆمەڵگا وەکو ژنە). کۆمەڵگا وەکو ژن و ئەسپی دەوڵەت ـ نەتەوەیە کە لێی سوار دەبێت.

١١. لە مودێرنیتەدا هەم لەناو خودی کۆمەڵگا هەم لەنێوان کۆمەڵگاکاندا (ئیتر جیاوازی دەوڵەت ـ کۆمەڵگا بێواتا کراوە) بەردەوام دەسەڵات واتای شەڕی پێدراوە. گووتەی: "**دۆخی شەڕکردنی هەمووان لەگەڵ یەکتری**" کە تۆماس هۆبز[١] بۆ کۆمەڵگای بەر لە سەرمایەداری گووتبووی بە شێوەیەکی بنەڕەتی لە سایەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا گەیشتۆتە توانادارترین دۆخی خۆی. کۆمەڵکوژییەکان لووتکەی ئەم شەڕانەن.

١٢. لە سیستەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا تەواوبوونی قۆناخی پەلهاویشتنی ناوەند ـ دەوروبەر (کەنار) ، گەیشتنی ژینگە- سروشت بە ئاستێک کە ناتوانێت بەردەوام بێت، داڕووخاندنی کۆمەڵگای ئیلاهی، هەژموونگەرایی فینانسی گلۆباڵ کە لە بەرهەمهێنان دابڕاوە و مشەخۆرترین توێژی سەرمایەیە، لە بەرامبەر هەموو ئەمانەدا و لە هەموو گۆڕەپانێکدا پەرەسەندنی تۆڕەکانی بەرخودان قەیرانێکی بونیادی دێننە ئاراوە.

**١٣. قۆناخەکانی قەیرانی بونیادی سەردەمێک لەخۆوە دەگرێت کە هەم هەنگاوی شۆڕش و دژە شۆڕش، هەم قەڵەمبازی دیموکراتی ـ ئازادیخوازی و کودەتا تۆتالیتار- فاشیستەکانی تێدایە. ئەوانەی بە باشترین شێوە سیستەمی زانست و پەیڕەوی خۆیان پێشدەخەن و دەیکەنە بنەمای چالاکییەکانیان لە ئاواکردنی سیستەمی نوێی کۆمەڵگادا کەسانێکی هەرە**

١ـ Tomas Hobbes فەیلەسوفێکی ئینگلیزە لە نێوان ساڵانی (١٥٨٨ – ١٦٧٩) دا ژیاوە. بە پەرتووکەکەی بەناوی "لیڤی ئەتهان (١٦٥١)" ڕێگای سیاسەتی ئەورووپای نەخشاندووە. هەرچەندە ئەمڕۆ وەک فەیلەسوفێکی سیاسی دەناسرێت بەڵام لە زۆر بواری تری وەک مێژوو، پێوان، ئەخلاق و فەلسەفەی گشتیشەوە سەرقاڵ بووە. هەموو شتێکی هەیبێ بە ماددە و جووڵەی ماددەوە بەستۆتەوە. جیهانی وەک کوتلەیەکی ئەو ماددانە وەسف کردووە کە لە لایەن یاساکانی جووڵەوە بەڕێوە دەبرێن. مرۆڤ و زیندەوەرانی تریش بە پارچەیەکی ئەم کوتلەیە دادەنێت کە ژیانی رۆحی و فیزیۆلۆژیان لە لایەن یاسا میکانیکیەکانەوە بەڕێوە دەبرێت، بۆیە گوتوویەتی کە شتێک بە ناوی رۆح و فریشتە و خوداوە لەم جیهانەدا بوونیان نییە و هەموویان بەرهەمی سیمبۆلیزەکردنن. بە پێی هۆبس جەوهەری گەردوون کە بەتۆز دەژمێردرێت تەنها و تەنها ماددەیە، ئەوەی لەم ماددەیەوە شێوە دەگرێت تەنێکە و بە چاو دەبینرێت و دەکرێت تاقیکردنەوەی لەسەر بکرێت. رۆح و خوداش بە شتێکی لە دەرەوەی ماددە دەژمێرێت کە تایبەت بە تیۆلۆژین.

بە شانسن.

١٤- بزووتنەوە دیموکراسیخواز، ژینگەپارێز، ئازادیخواز و یەکسانیخوازەکان لەقەیرانی بونیادیی و ناوبەرەکانی کائیۆس دەتوانن لە میانەی ددست پێکردنی هەڵمەتە تۆکمە و بچووکەکانیان لە ماوەیەکی کورت خایەندا ئەو پێکهاتانە فەراهەم بکەن کە ئاییندەی دوور دیار دەکەن. هەر بۆیە:

١٥- دەکرێت کۆمەڵناسی لە رووی رەهەندی مێژوویی و جوگرافییەوە وەک کەتەلۆکێکی چالاکیەکان ببینرێت.

١٦- پێویستە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری وەک بونیادێکی شێرپەنجەیی هەڵسەنگێنرێت کە لە زۆربەی گۆرەپانەکان تەشەنەی ددرەوەی کردووە. لەسەر بنەمای هەر(١٤) ماددەی ئاماژە پێکراو لە دژی بوەستین و چارەسەری لە دەرەوەی سیستەم پێش بخرێت.

١٧- لە بواری ئایدیۆلۆژیدا تەواوی دوالیزمە قەبەکانی (ئایدیالیزم - ماتریالیزم، دیالیکتیک - میتافیزیک، لیبرالیزم - سۆسیالیزم، خوداوەندگەرایی[1] - کافرگەرایی[2] ..هتد) کە پشت بە جیاوازی سۆبژێکتیڤ - ئۆبژێکتیڤ دەبەستن تێپەڕ بکرێن، واتاگەرایی (هونەری شرۆڤە) یەک بە بنەما بگیرێت کە تەواوی دەستکەوتە زانستییەکان بە بناخە دەگرێت.

١٨- میتافیزیایەکی مرۆیی پاڵپشت بە چاکە، جوانی، ئازادی و راستی کە هەم رەخنەیی بێت، هەم لە هەڵمەتی نوێی بونیادنان بێبەری نەکرێت.

١٩- گووتەی سیاسەتی دیموکراتیانە بە بنەما بگیرێت.

٢٠- لە میانەی گووتەی سیاسەتی دیموکراتیانەوە لە هەر گۆرەپانێکدا کە دەسەلات و قەیران بوونی هەیە هەزاران رێکخراوی کۆمەڵگای مەدەنی (رێکخراوی چالاک و بە سوود و پێویستی پێکهاتوو لە سێ کەسەوە تا دەچێتە هەزاران کەس) ئاوا بکرێت.

٢١- نەتەوەی ئەو کۆمەڵگا نوێیەی بونیاد دەنرێت، وەکو نەتەوەی دیموکرات ئاوا بکرێت. هەر وەکو چۆن دەشێت لە نەتەوە - دەوڵەت جیاواز

---

١- Deism مەزهەب یان رەوتێکە هەبوونی خودا لەرێگای بەڵگەی عەقلانی دەسەلمێنێت، بانگەشەی باوەڕهێنان بە ئایینێکی سروشتی دەکەن کە لەسەر بنەمای ئەقڵ بێت نەک سرووش. جەخت لەسەر لایەنی ئەخلاقی دەکەنەوە.

٢- Atheism

بێت، راستینەی بە یەکەوە بوون تەنانەت شێمانەی بە ناویەکداچوونیش نابێت پشتگوێ بخرێت.

٢٢. ئەگەر لە رێی رێزبەندیەکی زانراوەوە بەرێوەبەرایەتی سیاسی نەتەوەی دیموکرات روون بکەینەوە، ئەوا پێویستە لەسەر بنەمای شێوەی کۆمینالی دیموکراتی خۆجێیی، نەتەوەدیی ـ نیشتمانی، هەرێمی و جیهانی پێشبخرێت. هەروەک چۆن چەندین نەتەوەی جیاواز دەتوانن خۆیان وەک یەک نەتەوەی دیموکرات رێک بخەن، هەمان نەتەوەش دەکرێت وەکو نەتەوەی دیموکرات و نەتەوەی ـ دەوڵەتی خۆی رێکبخات. کۆنفیدرالیزمە دیموکراتییە هەرێمییەکان و کۆنفیدرالیزمی نەتەوە دیموکراتەکانی جیهان بە گوێرەی نەتەوە یەکگرتووەکانی ئەمرۆمان تا دوارادە پێویستە و لە چارەسەرکردنی کێشە جیهانی و گرفتە خۆجێیی ـ نەتەوەدییەکان دەتوانێت بە کاریگەر بێت.

٢٣. لە بەرامبەر ئیندوستریالیزمدا کە پاشماوەی مۆدێرنیتە و یەکێک لە بێچکە بەهێزەکانیتی (مۆدێرنیتە پشت بە سێ کوڵەکە دەبەستێت: ا ـ بەرهەمهێنانی سەرمایەداری، ب ـ ئیندوستریالیزم، ج ـ دەوڵەت ـ نەتەوە) کۆمەڵگای دیموکراتی پێشبخرێت. ئابووری و تەکنۆلۆژیا لەچوارچێوەی ژینگەپارێزیدا بێت.

٢٤. دابینکردنی ئاسایشی کۆمەڵگا لە لایەن بەرگری میللی گەلەوە.

٢٥. لە جیاتی سیستەمی پیاوسالاری کە بناخەیەکی بەهێزی دەوڵەتگەرایی و پلەداری هەیە، سیستەمێکی نوێی خێزان بونیاد بنرێت کە لە جیاتی کۆیلایەتی قووڵی ژنان پشت بە یەکسانی و ئازادییەکی قووڵ ببەستێت.

ئەم سەرە دێرانەی دەتوانین ژمارەیان زیادبکەین و ئاماژە بە وردەکارییەکانی بکەین بەسن بۆ گوزارشتکردن لە روانگەی پارادیگماکەمان. دەزانین کە سەردەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری هەمان ئەو سەردەمانەیە کە یۆتۆپیاکانی ئازادی و یەکسانی تێکۆشانی مەزنیان تێدا بەڕێوەبرد. هەوڵ و کۆششێکی مەزنیان دا. بە قەدەر دەریایەک خوێن رژا. ئەشکەنجەی بێ شومار و ئێش و ئازاری بێ سنوور چەشترا. ناکرێت بڵێین ئەمانە بە فیڕۆ چوون. بە پێچەوانەوە دەبێت تەواوی ئەو کێشانەی

هەوڵی چارەسەرکردنیان دەدەین بە شرۆڤەیەکی مێژوویی ڕاست بگەیەنین، پێش خۆمان ڕوشن بکەینەوە و ژیانمان لەگەڵ یۆتۆپیاکانمانەوە بکەین بە یەک و سەرلەنوێ هەنگاو بۆ ئەو ژیانە بهاوێژین کە بە ئەشقی تەلیسماوی ڕەنگین کراوە. هەنگاونان بۆ ژیانێکی خاوەن یۆتۆپیا و هیوای مەزن و بەهێز پێویستی بەهەوڵ و کۆششی دژوار و زەحمەت هەیە.

لەناو ڕەوشێکی وەهادا نیم، سنووری خۆم نەناسم و بڵێم سیستەماتیکی زانست و پەیڕەو سەرلەنوێ لە ئێمەوە دەست پێدەکات. بەڵام لە تەواوی ئەو بابەتانەی هەوڵی باسکردنیانم دا هەوڵمدا ئەوە پیشانبدەم کە هەندێک شت بە چەوتی سەری ڕێیان گرتۆتە بەر، لە بنەڕەتدا ئەمەش پەیوەندی بە (پارادیگما) جیهانبینییەوە هەیە. بە بایەخەوە ئاماژەی پێدەکەم کە شرۆڤە و هەوڵەکانی داومە نابێت وەک ئاواکردنی سیستەم لە ڕەگەوە، یان ڕەتکردنەوەی هەموو ئەوانەی کە ڕەخنەم کردوون، ببینرێن. لە کۆتاییدا گرنگە ئەو مۆدێرنیتە سەرمایەدارییە ڕەخنە بکرێت کە ڕێگای لە پێش ملیۆنان تراژیدیا و ڕووداوی هاوشێوەی ڕەوشی من کردەوە، بە تایبەتی لە کاتێکدا ئەو گەل و ناوچەیەی (کورد و ڕۆژهەڵاتی ناوین) منیش یەکێکم لەوان بە قۆناخێکی هەرە تراژیدی و دڕندانەی مێژوودا تێپەڕ دەبێت، بە شێوەیەکی شایستە شرۆڤەکردنی هەموو ئەو فاکتەرانەی بەرپرسیارن لەمە، سەرەتاترین مەرجی ڕۆشنبیر بوونە. شانبەشانی ئەوەش کاتێک وەکو سەرۆکی بەرفراوانترین و بە کاریگەرترین ڕێکخستن دادگایی دەکرێم، سروشتییە کە ئەرکی سەرەکیم بریتی بێت لە پرسیار و وەڵامی چوارچێوەی ئەو بابەتانەی ئاماژەم پێکرد. ئەگەر لە کات و شوێنێکدا فشار، قۆستنەوە، تواندنەوە و بنبەستبوون قووڵ بێت، ژیان تەواو لەناو ڕەوشێکی خراپتر لە بێ ئابڕوویی دا بەڕێوەبچێت، جگە لە هەڵوێستێکی پارادیگمایی ڕیشەیی هیچ چارەیەکی دیکەمان نییە. لەمەو بەدوا لە میانەی ئەم هەڵوێستەوە بەرەو سبەینێ دەڕۆیین.

ئەم بەشە هەوڵێکە بۆ شرۆڤە کردنی ڕەهەندە مێژوویی ـ جوگرافییەکانی ئەو هۆکارە سەرەکیانەی ڕێگایان لە پێش شارستانی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان کردۆتەوە. ئیتر باش دەزانین کە ڕێگای ناسینی کۆمەڵگایەک پەیوەندی بە ناسینی هەلومەرجە جوگرافی و مێژووییەکەیەوە هەیە.

لە سەردەمی دابڕان لە پریماتەکانەوە تا دەگاتە شۆڕشی کشتوکاڵی مێژووەکەی (تەمەنەکەی) نزیکەی دەگاتە حەوت ملیۆن ساڵ. شوێن هێڵی **"ریف"**[1] ی ڕۆژهەڵاتی ئەفریقیایە. چ پاشماوە شوێنەوارییەکان، چ تا ئێستا لەم جوگرافیایەدا بە شێوەیەکی بەرفراوان هەبوونی ئەو جۆرە ئاژەڵانەی لە مرۆڤەوە نزیکن، ئەم تێزە پشت ڕاست دەکەنەوە. هەرچەندە تەواو نازانرێت کە دابڕانی

١ـ بە عەرەبی (الوادي ألتصدع الكبير، الاخدود الكبير)ی پێدەڵێن. یەکێک لە ڕووخسارە دیارەکانی جوگرافیای کیشوەری ئەفریقیایە. ئەم دۆڵە لە ڕۆژهەڵاتی ناوین لە سوریا دەست پێدەکات، بۆ باشور درێژ دەبێتەوە بە درێژایی دەریای سوور بەردەوام دەبێت، لە نزمایییەکانی عەفار لە کەنارەکانی تەنزانیا و جیبۆتی دەگاتە ئەفریقیا. مرۆڤایەتی لەم دۆڵە لەدایک بووە و قۆناخەکانی گەشەی سروشتی بەخۆوە بینیوە. جڤاتەکانی مرۆڤ لەوێوە بۆ بنارەکانی زاگرۆس ـ تۆرۆس هاتوون و لەوێوە بە جیهاندا بڵاوبوونەتەوە.

مرۆڤ لە پریماتەکان لە ئاکامی پەرەسەندنێکی لەناکاو بووە یاخود پەرەسەندنێکی ئاسایی، بەڵام ئەم مەسەلەیە بۆ بابەتەکەمان هێندە گرنگ نییە. گونجاویی پێکهاتەی قورگ بۆ دەرخستنی دەنگی هەمەجۆر، گەورەیی قەبارەی مێشک ئەوەنتاژی جۆرە نوێیەکەمانە. لەیەک کاتدا هەبوونی چۆڵەوانی و دارستان لەگەڵ گۆلەکانی ئاودا لە دەشتایی (ریف)ی رۆژهەڵاتی ئەفریقیا سەبارەت بە ئاسایشی جۆر دەیکاتە شوێنێکی ستراتیژیی. بە تایبەتی بەردەوام لە دەرئەنجامی کەوتنە ناو گۆلەکانی ئاوەوە تووکی ئاژەڵانەیان قۆناخ بە قۆناخ هەڵوەرییوە، تا لەدۆخی مرۆڤی مووداری ئەمرۆمان نزیک بوونەتەوە. کەش و هەواش تا دوا ڕادە لەبارە. ئەوەنتاژێکی دیکەی دەشتەکەی (ریف) ئەوەیە لە میانەی بەدواداچوونی هەمان دۆڵ و کەنارەکانەوە تا دەگاتە چیاکانی تورۆس وەکو ڕێگایەکی سروشتی وایە. لە هەمان کاتدا هەم هێڵی یەکبوون و جیابوونەوەی دوو کیشوەر (ئاسیا و ئەفریقیا) هەم هێڵی شکانەوە پێکدێنێت. مەزەندە دەکرێت بە ملیۆنان ساڵ بە شێوەی کلان (تیرەی سەرەتایی) لەـ ریف ـ دا ژیابن. دەتوانرێت باس لەوە بکرێت بەردەوام بۆ ناوەوەی ئەفریقیا لە رەوشی کۆچەریدا بوون. لە میانەی چەندین پاشماوە و پێدراوەوە سەلمێنراوە کە بڵاوبوونەوەی سەرەکییان بۆ جیهان لەسەر هێڵی باکووری ـ ریف ـ دا ئەنجام دراوە. مەزەندە دەکرێت کە چەندین جۆر تا دەگاتە جۆری هۆمۆ ساپیانس[1] بە ئاراستەی هەمان ڕێگا بڵاوبووبێتنەوە. تا ئێستا لە هیچ شوێنێکی دیکەی جیهان پێکهاتەی ئەو جۆرانە نەبینراوە کە نزیکی مرۆڤن. سەرجەم ئەو جۆرانەی کە دۆزراونەتەوە ریشەیان دەچێتەوە سەر ڕۆژهەڵاتی ئەفریقیا.

لە شوێنە جیاوازەکانی دیکەی جیهاندا بە شێوەیەکی بەربڵاو پاشماوەی بە بەرد بووی یەک ملیۆن ساڵ لەمەوبەریان لێدۆزراوەتەوە. بۆیە بۆچوونی پەسەندکراو ئەوەیە کە تا قۆناخی

١. Homo sapiens ئەو مرۆڤەی کە بیر دەکاتەوە و قسە دەکات؛ مرۆڤی نوێشی پێدەڵێن.

بەر لە سەردەمی سەهۆڵبەندانی چوارەم تەواوی جۆرەکان لە جیهاندا بڵاوبوونەتەوە.

گریمانەکان وەها پیشانی دەدەن کە بە درێژایی ئەم سەردەمە جۆرەکانی مرۆڤ بە شێوەی کۆمەڵی بیست - سی کەسی لە ڕێگای ڕاوکردن و کۆکردنەوەی خواردەمەنی گوزەرانیان دەکرد. هەردوو کرداریش وەکو دوو فاکتەری دروستبوون و پێکهاتنی دەست و پێیەکان پەسەند دەکرێن. پاشماوە بە بەردبووەکان پیشانمان دەدەن کە لە ئەشکەوت، دوورگە و پارچە وشکانیەکانی ناو ئاودا زیاتر لەناو ئاسایشدا ژیاون. قۆناخێکە کە موڵکایەتی و خێزان ئاوا نەبووە، تەنیا خودی کۆمەڵ بۆ خۆی خێزان بووە. شیمانە دەکرێت خاوەن زمانی ئیشارەت کردن (زمانی جەستە و دەنگ دەرخستن) بووبن، هێشتا دەنگیان نەکردووە بە هێما. بە هێما کردنی زمان (دەنگ) پێویستی بە پرۆسەیەکی کرداری درێژخایەن هەیە.

لێکۆڵینەوەکان ئەو ئەنجامانەمان پیشاندەدەن کە نزیکەی سەد و پەنجا- دووسەد هەزار ساڵ پێش ئێستا هۆمۆساپیانس لە گەیشتن بە زمانی هێمادار نزیک بۆتەوە. دیسان هەر لە هەمان هێڵی **"ریف"**ەوە لە جیاتی زمانی ئیشارەتکردن بۆ یەکەمین جار لە یەکتر تێگەیشتن لە ڕێی هێما دەنگییەکانەوە بە ئاراستەی باکوور لە تەواوی جیهاندا بڵاودەبێتەوە، ئەمەش بە بنەچەی زمانە مۆدێرنەکان دادەنرێت. تێگەیشتن بە زمانی هێماکانی دەنگ ئەوەنتاژێکی گەورە دەداتە دەست. ئەو گروپانەی باشتر لە یەکدی گەیشتوون و جوڵاونەتەوە دەشێت لەوانەی دیکە لەپێشتر بووبن. بە خێرایی نەمانی جۆرەکانی دیکە لەسەر شانۆی مێژوو دەشێت پەیوەندی بەم پەرەسەندنەوە هەبووبێت. هاوکات سەردەم چوارەمین چاخی سەهۆڵبەندانە. شیمانەیەکی دیکەش ئەوەیە کە یەکتربڕینی هەردوو پەرەسەندنەکە کۆتایی بە نیاندرتاڵ[1] هێناوە کە تا ئەو قۆناخە جۆرێکی بەربڵاوبووە.

---

١. Neanderthal مرۆڤی نیاندرتاڵ جۆرێکی کورتە بالایە، خاوەن جمجمەیەکی گەورە بووە کە دووسەد سانتیمەتر دووجا لە جمجمەی مرۆڤی ئەم سەردەمە گەورەتر بووە. بۆ جاری یەکەم ئێسکەکانی لەشاری لاتۆلی تەنزانیا لەساڵی ١٨٥٦دۆزرایەوە، هەروەها لەساڵی ١٨٥٧لە ناوچەی نیاندرتاڵی نزیک شاری دۆسلدۆرفی ئەڵمانیا دۆزرایەوە، بنەچەکەی بۆ

ئەفەندی (خاوەن)ە نوێکەی جیهان بەهەموو گەوردیی خویەوە لەسەر شانۆیە: هۆمۆساپیانس. لە سەرەتادا جیابوونەوەی زمان و نەژادەکان نابینرێت. مەزەندە دەکرێت کە بە شێوەی جڤاتی گەورەتر بە شێوازێکی بەرنامەرێژ نێچیریان کردبێت، ئەشکەوتیان وەکو ماڵ و پەرستگا بەکارهێناوە. ژن لە کۆکردنەوەی بەرووبوومی رووەک و درەختەکاندا، پیاویش لە نێچیروانیدا شارەزایی پەیدا دەکات. هەندێک دۆزینەوەی شوێنەوارناسی دەیسەلمێنن کە ئەو جۆرەی قسە دەکات لەسەر ئەو بنەمایە تا بڵێی گەشەی کردووە. وێنە و هێلکارییە دۆزراوەکانی ناوچەکانی نێوان فەرەنسا و ئیسپانیا و هەندێک لە ئەشکەوتەکانی ناوچەی هەکاری ئێجگار بەهێزن و بۆ ئەو سەردەمە دەگەڕێنەوە. هەردوو ناوچەکەش بەهۆی هەڵکەوتە جوگرافییەکەیان، کە دەکەونە رۆژهەڵات و رۆژئاوای ئەفریقیا و دوو شوێنی لە بارن، لەگەڵ تیۆری گشتی پەلهاویشتن و بڵاوبوونەوەش دەگونجێن.

---

ئەفریقیادەگەڕێتەوە.

### ١- مرۆڤایەتی لە چیدا قەرزداری کەوانەی زاگرۆس - تۆرۆسە؟

ئەو بەڵگە و هۆکارانە زۆرن کە کەوانەی زاگرۆس ـ تۆرۆس وەکو دەروازەی تەوەرەیی کۆکردنەوەی پێهەلگرتنەکانی دەشتایی (ریف) ی ئەفریقیای رۆژهەڵات و ناوەندی بڵاوکردنەوە و پەلهاوێشتنی بۆ جیهان پیشاندەدات. یەکەمیان کۆتایی رێگا سروشتییەکەی ریفە. بە شێوەی شەپۆڵە یەک بە دوای یەکەکان تا ئەوێ دێن. داخستنی دەرگای رۆژهەڵات و رۆژئاوا لە لایەن بیابانی مەزن و بیابانی عەرەبستان، کەناری سوێس و رۆژهەڵاتی دەریای سپی دەکەن بە رێگایەکی سروشتی پەلهاوێشتن. کەنارەکانی باشووری دەریای سپی، لە رێگای گەرووی جەبەلتاریقەوە دووەمین رێگای گرنگە کە بەرەو ئیسپانیا و ئەوروپا دەچێت. بەهۆی پێکهاتە و هەلومەرجە جوگرافییەکەیەوە هێندەی رۆژهەڵاتی دەریایی سپی بە پیت نییە. بەربەستی گەورە و گرفتی خۆراک لە ئارادایە. نموونەییترین رێگا

بە کەوانەی زنجیرە چیای زاگروس ـ توروسدا تیپەڕ دەبیت. کە بە هیلالی بە پیتیش ناودەبرێت و دەکەوێتە رۆژهەلاتی دەریای سپییەوە. ئەم ناوچەیە هێندە لەبارە ناشێت کە تییدا نەمینن و بەرەو کۆمەڵگابوونێکی پێگەیشتوو وەرچەرخان نەکەن.

لێرەدا دەتوانین دووەمین تایبەتمەندی هەڵێنجین: ناوچەیەک کە بۆ جڤاتەکانی مرۆڤ کەش و هەواکەی لەباربیت، خاوەن رووەک، میوەی زۆر و کێڵگەی سروشتی بێت، ئاژەڵی هەمەڕەنگی راوکردنی تێدا هەبیت، بۆ ئاسایش خاوەن ئەشکەوتی گونجاو بیت و رووبار و کانیاوی بێ ژماری لیبیت، هێندە لەبارە کە دواتر لە یادەوەری مرۆڤدا ریگا لە پێش زاراوەی **"بەهەشت"** دەکاتەوە. بە بەراوردکردنی ئەم شوێنە لەبارە لەگەڵ ناوچە بیابانییە نزیکەکانی دەوروبەری ئەوکاتە دەرک بەو راستینە دەکرێت کە دووالیزمی بەهەشت ـ دۆزەخ یەکێک لەو دەستەواژە بنەڕەتیانەیە کە لێرەوە لە بیری مرۆڤدا جیگیر بووە. بەهۆی ئەم تایبەتمەندیانەوە بە ئاسانی دەتوانین شیمانە بکەین کە دوای دەشتە (ریف) کانی ئەفریقیای رۆژهەڵات دووەمین شوێنی کۆبوونەوەی جۆری مرۆڤ بووە. لە مێژووی مرۆڤایەتیدا ئەگەر بۆ پەرەسەندنی ژیار بە **"شوێنی کرکەوتن"** بە ناو بکریت زێدەڕۆیی نییە. هەروەها دەتوانرێت وەکو شوێنی نووسینی چیرۆکی داستانی مرۆڤایەتی، راستتر وەکو شوێنی دەست پێکردنی پیرۆز بکرێت. شۆڕشە مەزنەکانی دواتر دەبنە بەرهەمی ئەم داستانەی پیرۆزی.

سێیەمیان، گردبوونەوە ـ کەڵەبوونەکانی نزیکەی پەنجا هەزار ساڵ بەر لە ئێستا لەسەر بنەمای گەشەکردنی زمانی هێما پەرە دەسەنێت. لە ئامرازێکی سەرەتایی تێگەیشتنەوە کە زۆر لە زمانی ئیشارەت دەچێت پەڕینەوە بۆ تێگەیشتن لە میانەی زمانی هێما پۆتانسیلی گەشەکردنێکی مەزن لەخۆوە دەگرێت. هاتنەدی گۆڕەپانێکی (ناوچەیەکی)بەرفراوانی زمان دەرفەتێکی گەورەی کۆمەڵگابوون، پاراستن، بە دەست هێنانی خۆراک پێشکەش بە

جۆری مرۆڤ دەکات. لەوانەیە ئەمە گەورەترین شۆڕشی مێژوو بێت کە تا ئێستا نەدۆزراوەتەوە و ناوی بۆ دانەنراوە. بە ناوکردنی یەکەمین شۆڕشی گەورە بە **"شۆڕشی زمان"** دەشێت لە جێی خۆیدا بێت. چونکە هیچ شۆڕشێک بە ئەندازەی ئەم شۆڕشە لەم جوگرافیایەدا خزمەتی بە کۆمەڵگابوونی نەکردووە. ڕۆژانە زاراوەی پیرۆز دادەهێنرێت (ئەو رووەک و ئاژەڵانەی دەدۆزرێنەوە) هەنگاو بۆ جێنشینی لە شێوەی خانوو دەهاوێژرێت (بۆ یەکەمین جار ژیان لە هێلانە پڕ ئاسایشەکاندا) و لە هەر چوار وەرزەکەدا بە باشترین شێوە دەژین. کاتێک تەواوی ئەم قۆناخانە دەرکی پێکراو هەر یەکە و ناوی تایبەتی خۆی بۆ دانرا، زمانی هاوبەشی جڤاتە بەرفراوانەکان و بۆ یەکەمین جار **"ناسنامە"** یەک کە جیایان دەکاتەوە لە یەکدی دەردەکەوێت.

چەندە خەمناک و بە ئازارە ئەو گۆڕەپانەی یەکەمین ئەتنیکە خاوەن ناسنامەکانی تێدا ئاوا بووە، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا جینۆسایدێکی درندانەی ناسنامەی تێدا بەڕێوەدەچێت. ئەو پرۆسەیەی بە پێشکەوتنێکی گەورەی کۆمەڵگابوون ناومان برد، لەمیانەی ئەم دیاردە و زاراوە دەوڵەمەندانەوە بەدیدێت، ڕاستتر بڵێین ئاوادەکرێت. پێشکەوتنی زاراوەکانیش ڕێگا لە پێش پەرەسەندنی هزری دەکاتەوە. ئەگەرێکی بەهێز ئەوەیە، کە ئیتر ئەو مرۆڤانەی لە ڕێگای زاراوەکان لە یەکتری تێدەگەن و دەبنە یەک، لە دۆخی کۆمەڵگای تەسکی تیرەی سەرەتایی (کلان)دا نامێننەوە، چونکە بۆ گەیشتن بە کۆمەڵگابوونێکی لە پێشتر دینامیزمێکی گەورەیان بە دەست هێناوە. لەو بڕوایەدام کە ئەم بابەتە یەکێک لەو بوارە سەرەکیانەیە کە پێویستە لە ڕووی ئانترۆپۆلۆژی و چاخەکانی بەر لە مێژووەوە توێژینەوەی لە بارەوە بکرێت. دەبێت مێژووناس

و شوێنەوارناسی مەزن گۆردۆن شیلد[1] بە هەستیکی بەم جورە گەیشتبێت هەر بۆیە ناوی **"لە مێژوودا چی روویدا؟"**ی لە گرنگترین شاکاری ناود کە ڕووداوەکانی ئەو قۆناخەی ئەم جوگرافیایە (هەرچەندە سەبارەت بە پێشکەوتنەکانی قۆناخی دواتریش بن، بەلام دەکرێت هەمان شت بۆ قۆناخەکەی پێش ئەویش بگوترێت)ی تیدا تاوتوێ کردووە. راشکاوانە ئاماژە بەو خاڵەش دەکەم کە تەنیا لە میانەی پەیڕەوی ئاسەوارناسییەوە ناتوانرێت رابردووی ناوچەکە رۆشن بکریتەوە و شیکار بکرێت: کاتێک لە بایۆلۆژیەوە تا فیلولوژی، لە جوگرافیا(بە تایبەت جوگرافیای کەش و هەوا) تا سۆسیولوژی، لە ئانتروپۆلۆژییەوە وە تا دەگاتە تیولوژی، پێدراوەکانی چەندین لقی زانست بکرێت بە یەک، دەشێت پێشکەوتنی گرنگ لە بارەی رۆشنکردنەوەی مێژووی چاخەکانی یەکەمین (کۆن - دێرین) بە دەست بهێنرێت. ئەوەی لەم بەرگرینامەیەدا دەیکەین، تەنیا سەرنج راکێشان و بانگەوازییە بۆ جێبەجێکردنی ئەرک.

زانستی جیۆلۆجی ئەو بەڵگانەمان پیشان دەدات کە نزیکەی بیست هەزار ساڵ بەر لە ئێستا چوارەمین قۆناخی سەهۆڵبەندان کۆتایی پێهاتووە. کاتێک لە ڕێگای پێدراوی زانستەکانی دیکەوە پاڵپشتی بکرێت، دەبینرێت کە پێشکەوتنێکی نزیک لە ڕاستییە. لەمیانەی بەڵگەکانەوە سەلمێنراوە کە دە هەزار ساڵ بەر لە ئێستا چۆلەوانی عەرەبستان و بیابانی گەورە شینایی و بارانێکی زۆری هەبووە. ئەم هەلومەرجە لەبارەش هاوکاتی قۆناخی پێشکەوتنی کلتووری شوانکارییە. لەگەڵ ئەمەشدا پێشکەوتنێکی دیکەی گرنگ، دەرکەوتنی گروپە زمانی سامییەکانە کە لە پێکهاتە زمانییە سەرەتاییەکانی ئەفریقیا لە پێشتر بوون. کلتووری سامییەکان لە ناوەڕۆکدا کلتووری شوانکارییە. بۆ نموونە شوانکاری هێندە بایەخدار بووە، کە تا ئێستا

---

١. Gordon Childe زانایەکی شوێنەوارناسییە لەساڵی ١٨٩٢ لە ئەمسا لەدایک بووە. ئەو کەسە بوو کە مۆرکی مارکسی لە شوێنەوارناسی دا. لە میانەی تێڕوانینێکی مێژوویی سەرتاپاگیری هەوڵی راڤەکردنی دراوە شوێنەوارناسیەکانی داوە. دەسکەوتەکانی لە فراوانکردنی ئاسۆی سۆسیالیزمدا بارمەتیدەر بووە. لە لێکۆڵینە شوێنەوارناسیەکانی میزۆپۆتامیا و ئێراق کاری کردووە، لە ئاکامدا بە ئەنجام و چەسپاندنی زۆر گرنگ گەیشت و لەژێر ناوی "چی لە مێژوو روویداوە؟" کۆیکردەوە.

کەڵەکەبوونی کلتووری ئاژەڵداری لە جۆری حوشتر، مەڕ و بزن بەردەوامە. لەسەر ئەم بنەمایەش ئەتنیکەکان پێکهاتوون و بوونەتە خاوەن ناسنامە. تا ئێستاش بە شێوەیەکی بەهێز بەردەوامبوونی کلتووری ئەتنیک ـ عەشیرەت ـ بەڵگەی سەلمێنەری ئەم راستییەن. لە چەندین گووتەکانی شارستانی سۆمەر و میسر کاریگەرییەکانی ئەم کلتوورە بە شێوەیەکی بەرچاو دەبینرێت. کلتووری سیمیتیک (سامی) نزیکەی شەش هەزار ساڵ بەر لە ئێستا، شانبەشانی شیاوی کەشی ناوچەکە، بۆ جاری یەکەم لە مێژوودا مۆرکی خۆی لە گۆڕەپانێکی فراوان دەدات کە هەر لە چۆڵەوانی بیابانی گەورەوە تا عەرەبستانی رۆژهەلات و هەر لەوێوە تا سنووری زەوی و زارە گونجاوەکان بۆ کشتوکاڵ لە باکوور دەگرێتەوە. گۆڕەپانی کلتووری سیمیتیک درێژکراوەیەکی کلتووری ریفی رۆژهەڵاتی ئەفریقیایە، تەنانەت بریتییە لە قۆناخێکی پێشکەوتووتری هەمان کلتوور. ئەم نەوەیە دواتر لە ڕێگای ئاواکردنی ئایینە تاکخوداییەکان تایبەتمەندی خۆیان تۆکمە دەکەن.

بەڵام بە بایەخەوە دەبێت ئاماژەی پێبکرێت کە لە پێکهاتنی شارستانی میسر و سۆمەردا لەوە زیاتر کە ئەم کلتوورە دیاریکەر بێت، بەناوەکانی ئارامیت و ئابیرۆکان (مرۆڤە تۆزاوی و پیسەکانی لە رۆژهەڵات و رۆژئاواوە هاتوون) وەکو دوو هۆزی داگیرکەر لە هەردوو گۆڕەپانی شارستانیدا هەڵدەسەنگێندرێن. دەتوانین بڵێین لە بەرەبەیانی مێژوودا سیمیتیکەکان پێکهاتەیەکی زۆر گرنگ بوونە، تەنانەت هەنگاونانەکانی پێیان دەنگی داوەتەوە. هەرچی هۆکاری تێپەڕنەکردنی خاکە بە پیتەکانی باکوورە کە بۆ کشتوکاڵ لەبار بوون، لەوانەیە بۆ ئەو کلتوورە بگەڕێتەوە کە لە هی ئەوان پێشکەوتووتربووە. دەشێت ناونانی ئەو کلتوورە راگوزارییەی هەنگاو هەنگاو بەرەو کلتووری کشتوکاڵی چووە بە **"کلتووری کێڵگە"** گونجاوتر بێت. ئەم پەرەسەندنە کۆمەڵایەتییەی لە مێژوودا وەکو **"ئاریانەکان"** ناوبراوە، دەتوانین وەکو کێڵگەوانان، خاکییەکان

(ئاری خاوەنی یەکەمین ناسنامەی کلتووری خاکانەن، کە لە زمانی کوردیدا بە واتای "**خاک، عەرد و کێڵگە**" دێت ناویان بینین. ئەو ئاریانیانەی بۆ یەکەمین جار باکووری سامییەکانیان، واتا کەوانەی زاگرۆس ـ تورۆسیان بۆ پەرەسەندنی کشتوکاڵ کردەوە، دەشێت وەکو داهێنەرانی کشتوکاڵیش هەڵسەنگێنرێن.

لەم گەشەکردنەدا پێکهاتەی خاک و ئاو و هەوا، باگراوەندی رووەک و ئاژەڵداری رۆڵی دیاریکەر دەبینن. لە کاتێکدا گۆرەپانی سامییەکان بە مێرگەکان سنووردارە و لە رێی جۆرێکی ئێجگار کەمی وەکو خورماوە کشتوکاڵ ئەنجام دەدرێت، کەوانە (هیلالی بەپیت) هەموو شوێنێکی بۆ کێڵگە لەبارە، تا دوا رادە بۆ پێگەیاندنی زەیتوون، چەرەسات ( فستق و .. هتد)، بەڕوو، گوێژ(میوەجاتەکان)، تری(رەز و باخ)، گەنم(دانەوێڵە) لەبارە. دیسان گۆڕەپانێکە کە چەندین جۆری ئاژەڵی گونجاوی ماڵیکردنی لە جۆری بزنەکێوی، مانگا، بەراز، سەگ و پشیلەی تێدا زۆرە و بە شێوەی رەوە و مێگەل تێیدا دەسوڕێنەوە. لە بناری شاخەکاندا دارستانی بەرفراوان هەیە. بە گونجاوترین رەوشیەوە هەر چوار وەرزەکەی ساڵ دەگوزەرێنێت. باران بارین هەر وەکو ئاودێرییەکی سیستەماتیکە. کەنارەکانی چەندین رووبار و کانیاوەکان بۆ نیشتەجێبوون لەبارن. لەژێر سایەی تەواوی ئەم هەلومەرجە لەبارانەدا "**هەڵهاتنی بەرەبەیانی مێژوو**" پێشکەوتنێکی چاوەڕوان کراوە.

تۆمارەکانی چاخی دێرین و جیۆلۆجی پیشانی دەدەن کە تا پانزدە هەزار ساڵ بەر لە ئێستا لەم ناوچەیەدا سەهۆڵبەندانەکان بەرەو ناوچە شاخاوییە بەرزەکانەوە پاشەکشێی کردووە. دوای ئەوەی بە سەدان هەزار ساڵ بوو بە گۆڕەپانی گرنگترین چڕی نیشتەجێبوون، بە شێوەیەکی بەرفراوان شۆڕشی زمانی بە خۆیەوە بینی. شیمانەی ئەوە دەکرێت ناوچەکە دوای چاخێکی مەزۆلیتیک (چاخی بەردینی ناوین نزیکەی ۱۵۰۰۰ ـ ۱۰۰۰۰پ.ز) کە لە ئاکامی سەپاندنەکانی کلتووری سیمیتیکەوە کورت خایەن بووە، بۆ

چاخی نیولیتیک (چاخی بەردینی نوێ) پەڕیوەتەوە. ئەشکەوتەکانی هەکاری سەرەداوەکانی ژیانی مەزۆلیتیک و قۆناخەکانی پێشتر بە دەستەوە دەدات. بەردە داتاشراوەکانیش بەڵگەیەکی زۆر پێشکەش دەکەن. چەندین بەڵگە هەیە دەیسەلمێنێت کە تەقینەوەی راستەقینە لە ناوچەکەدا لە میانەی چاخی بەردینی نوێوە دەستی پێکردووە و نزیکەی دوازدە هەزار ساڵ بەر لە ئێستا هەنگاو بۆ ئەم کلتوورە نراوە. ئەم چاخەی دەتوانین وەکو شۆڕشی گوند، کێڵگە و کشتوکاڵ ناوی ببەین، هەلومەرجی لەپێشینەی مێژووی مرۆڤایەتی و بە مانا تەسکەکەشی هەلومەرجی مێژووی شارستانی (مێژووی نووسراوە)یە. سەربەخۆ چاخێکی مەزن و زەبەلاحی کلتوورە. ئەم کلتوورەی تا ئێستا بە شێوەیەکی شایستە دەرک بە گرنگییەکەی نەکراوە و لە مێژوودا جێگای خۆی پێنەدراوە: چەندە راوەستەی لە بارەوە بکرێت لە جێگای خۆیدایە. گۆردن شیلد کاتێک دەڵێت چاخی کلتووری ئەم ناوچەیە (گۆڕەپانە) لە کلتووری چوارسەد ساڵی ئەورووپای رۆژئاوا کەم بایەختر نییە لە راستی نزیک بۆتەوە. هێندە داهێنان کراوە کە لە ژماردن نایەت. لە تەواوی بوارەکانی کشتوکاڵ، پیشەکاری، هاتووچۆ، پەناگە، هونەر، بەڕێوەبەرایەتی و ئاییندا پێشکەوتنی بە وێنەی شۆڕش بەدیهاتوون. لە هەر بوارێکدا هەزاران داردە دۆزراوەتەوە و ناویان لێنراوە.

بەم جۆرە لە دوای سیمیتیکەوە **"گرووپی زمانی ئاریانی"** وەک گەنجینەیەکی بەرفراوان، کە زۆر لە سەروو زمانی بەرتەسکی شوانکارە سامیەکانەوە بوو، شێوەی گرت. ئەمە لە دانانی بناخەی یادگای ون نەبوونی مرۆڤایەتی دەچێت. بڵاوبوونەوەی ئەم گرووپەی زمان لە میانەی ئەو کلتوورەی لە هیندستانەوە تا کەنارەکانی ئەورووپا بۆ گۆڕەپانێکی بەرفراوان تەشەنەی کرد، جارێکی دیکە راستی ئەم شیکارەمان پیشاندەدات. بە پێچەوانەی مەزەندەکانەوە شوێنی سەرهەڵدانی گرووپی زمانی ئاریانی ناوچەی پەڕینەوەی نێوان هیندستان و ئەورووپا (باکووری دەریای رەش،

میرگەکانی روسیا، هەوارەکانی ئێران) نییە، بەڵکو ناوچەی ناوکی هیلالی بە پیتە. چ شیکاری ئەتیمۆلۆژییانەی وشەی **"ئاریان"** و چ پەیوەست بە پێکهاتەی ئەتنیکییەوە لێکدانەوەی وشەکان لە تەواوی گروپەکانی زمانە هیندۆ ئەوروپییەکاندا، ئەم راستییە دەسەلمێنن. بایەخدارتریش ئەوەیە کاتێک ئەو ناوچەیەی دەبێتە کاکڵ و ناوکی ئەم کلتوورە ئەم گۆڕەپانە بێت، بە شێوەیەکی سروشتی پێویستە پێکهاتەی زمان و وشەکانیش لەم هەرێمەدا بونیاد نرابن. پێکهاتە کلتووری ـ ئەتنیکییەکانی تا ئێستا هەن و بەڵگە مێژووییەکانی دیکە بە زیادەوە ئەم راستییە دەسەلمێنن.

لە دۆخێکی وەهادا هەبوونی دووەمین نەوەی کلتوور و زمانێکی هەرە گەورە، مێژوو و پەلهاوێشتنی، بۆ تێگەیشتن لە پەرەسەندنی کۆمەڵگا، قۆناخی پێکهاتەی شارستانی (پێکهاتەی شار) گرنگییەکی مێژوویی هەیە. دەشێت بڵێین کە تەواوی چینەکانی پێشووتر لەناو ئەم دوو گروپەی زمان و کلتووردا تواونەتەوە. لە دوای تەواوبوونی هەمان قۆناخی سەهۆلبەندان تەنیا لە بنارەکانی باشووری سیبریا (یاقوتستان[1] و هاوشێوەکانی) دەتوانرێت باس لە سێیەمین گروپی زمان ـ کلتوور بکرێت. ئەو کلتوورەی نزیکەی نۆ هەزار ساڵ پ.ز بەرەو باشوور بڵاوبۆتەوە شیمانە دەکرێت وڵاتی دایکی چین بێت. دەتوانین بڵێین ئەم کلتوورەی لای رۆژئاوای تا فینییەکان درێژ دەبێتەوە لە سەرووی هەموویانەوە تورک، مەغۆل، تەتەر[2]، کۆریەکان، ڤێتنامی و ژاپۆنییەکانە کە لە باکوورەوە فراوانترین نەوەی سێیەمین پێکدێت. بەڵگەی بەهێزی شوێنەوارناسی، ئەتیمۆلۆژی و ئەتنۆلۆژی هەن دەیسەلمێنن کە کلتووری بەڕیشە هیندیە سوورەکانی کیشوەری ئەمریکا لە رێگای

---

١. یاقوتستان، یاقوتیا یان کوماری ساخای پێدەڵێن: یەکێک لە پێکهاتە فیدراڵیەکانی روسیایە، گەورەترین ناوچەی ئۆتۆنۆمی جیهانە؛ دەکەوێتە باشووری سیبیریا.

٢. ووشەی تەتەر بەوڵاتای دانیشتوانی دۆزەخ دێت، ناوی گەلێکی تێکەڵەی تورک — مەغۆلە، دەکەونە ناوەڕاستی ئاسیا نزیک دەریاچەی قەزوین پایتەختەکەیان قەراقورمە.

گەرووی بێرینگ[1] ەوە ئەنجامی پەلهاویشتنی هەمان قۆناخە. دەتوانین ئەسکیمۆنەکانیش بخەینە ناو ئەم گروپەوە. چەندین کلتووری ئەفریقیا کە تا ئێستاش هەر ماون سەرباری پاراستنی تایبەتمەندییە سەدان هەزار ساڵەکانیان، گروپە سیمیتیکەکان زۆر کاریگەریان لێکردوون. دەشێت لە قووڵایی دارستان، شاخ، چۆلەوانییەکاندا ئەو کلانانە بدۆزینەوە کە لە سەردەمی ملیۆنان ساڵ بەر لە ئێستادا دەژین.

بە گوێرەی ئەم تابلۆیە لە باشوور ـ ناوەڕاست ـ باکووری گۆی زەوی شەش هەزار ساڵ بەر لە ئێستا، سێ گروپی سەرەکی زمان و کلتوور هەبوون کە هەنگاو بەرەو شارستانی بهاوێژن. سروشتییە کە ئاڵوگۆڕ و تێکەڵ بوونێکی بەردەوام لە نێوان ئەم کلتوورانەدا هەبووبێت. تەنانەت لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا دەبینرێت کە لەژێر کاریگەری مێژوو و جوگرافیادا جیاوازی لە نێوانیاندا هەیە.

ئەو خاڵەی سەبارەت بە بابەتەکەمان بایەخدارە، کاتێک لێکۆڵینەوە سەبارەت بە سەرچاوەکانی شارستانی هیند ـ ئەورووپا دەکەین، بە شێوەیەکی ڕاست دەستنیشان کردنی سەرچاوەی بنەڕەتی ـ دایکی ـ یە. زانستی مێژوو، گرنگی لەپێشینە دەداتە **"پێناسەی کلتووری ناوک"** کە لەژێر کاریگەری کات ـ شوێن (جوگرافیا ـ مێژوو) دایە. لە ڕۆژی ئەمڕۆماندا بە شێوەیەکی زۆر روون دەبینرێت کە تەنانەت سەبارەت بە کلتووری سەرمایەداریش پەلهاوێشتنێکی تیژی پێکهاتەی ناوک جێگای باسە. چەمکی مێژووی خەیاڵی و بێ ریشە و هەڵبەستراو کە بێ سەرچاوەیە زەبری کوشندە لە هزرمان دەدات. ئەوانەی هۆشیاری مێژووییان بە شرۆڤەی ژیانی نەگەیەنن، ناتوانن بە شێوەیەکی واتادار شرۆڤەی رۆژگاری ئەمڕۆشمان بکەن. ناشێت دەرک بە کۆمەڵگایەکی بێ مێژوو بکەیت و لەگەڵیدا بژیت.

لە بەرگرینامەکەی پێشووترم کە بە ناوی **"بەرگرینامەی**

---

[1] ـ ئەو گەرووەی ئاسیا و ئەمریکای باکور بەیەکتر دەگەیەنێت.

**مرۆڤی ئازاد"** پێشکەشم کردبوو، کاتێک سەرچاوەی ژیارم هەڵسەنگاندووە، لە بارەی گەڕاندنەوەی هەموو شتێک بۆ یادگای حەوزی دیجلە ـ فورات و شارستانی سۆمەر هەندێک رەخنەم ئاراستە کرابوو. لەگەڵ رەچاوکردنی ئەو رەخنانە، جارێکی دیکە دووبارەی دەکەمەوە کە گیرۆدەی تیزی بچووک کردنەوەی نموونە گەورەکان لە شتێکدا نیم، بەڵام سەرچاوەی بنەڕەتی ـ دایک ـ بۆ من گرنگە. ئەگەر لێشاوی مێژوو بە رووبارێک بچوێنین (ئەمە سەبارەت بە بونیادی ئۆنتۆلۆژیانەی پێشکەوتنی کۆمەڵگا دەست لێبەرنەدراوە)، بە مەبەستی سەرنج راکێشان بۆ سەر مەسەلەی کلتووری بنەڕەتی (دایک) و لقەکانی ئەم گەلاڵەنامە هزریانە پێشکەش دەکەم. هەر وەکو چۆن شارستانی باڵادەستی رۆژگاری ئەمڕۆمان (مۆدێرنیتەی سەرمایەداری) پشت بە کۆڵەکەی شارستانی هیند ـ ئەورووپا دەبەستێت، کلتووری هیند ـ ئەورووپاش پشت بە سەرچاوەی کلتووری ئاریان و لقەکانی میسر و سۆمەر دەبەستێت.

ئەگەر بە شێوەیەکی راست پرسی رووباری سەرەکی و لقەکانی شارستانی مرۆڤایەتی شیکار نەکەین، ناتوانین رۆژگاری ئەمڕۆشمان هەڵسەنگێنین و واتای پێبدەین. هەندێک لق بە لێشاوێکی بەهێز و بەردەوام دەڕژێنە ناو رووبارە سەرەکیەکە، هەندێکیشیان وشک دەبن. هەروەها ئەو سەرچاوەیەی رووبارە سەرەکیەکەی لێ هەڵدەقوڵێت رۆڵ و واتای یەکلایی کەرەوەی هەیە. ئەگەر خوازیارین پەرەسەندنی کۆمەڵگا لە میانەی رەهەندە جوگرافی و مێژووییەکانەوە بە واتایەکی تۆکمە بگەیەنین، دەبێت پێویستییەکانی پەیڕەو لە چارەسەرکردنی کێشەکاندا تاقی بکرێتەوە.

### ٢ ـ گرفتەکانی پەلهاویشتنی کلتوور و زمانی ئاریان

ئەو هەڵویستانە لە مێژوودا سنووردارن کە کلتوور و ژیار بە بنەما دەگرن. ئەوانەی هەشن خاوەن تێڕوانین و روانگەی جیاوازن. ئەو پرسانەی لێرە هەوڵی چارەسەرکردنیان دەدەین لەسەر بنەمای کلتوور و ژیار نایخەینە ڕوو. لە پەرەسەندنی کۆمەڵگادا، شانبەشانی رۆڵی یەکلاکەرەوەی بە ئەندازەی کۆمەکەکەی کات و شوێنی کلتوور و ژیار هەڵدەسەنگێنین. لە رەوشێکی پێچەوانەدا ئەو مێژووەی لەبەر دەستدایە لە **"گردبوونەوەی رووداوەکان"** بەولاوە هیچ واتایەکی دیکەی نابێت. نەک تایبەتمەندێتی فێرکاری، بەڵکو ئەو گەوهەرەی زانستی مێژوو کە پێش فێربوونی هیچ

شتێک پەراوێزت دەکات، لەنزیکەوە سەرچاوەی خوی لەم خاڵە وەردەگرێت. ئەو مێژووەی بریتییە لە رۆکردنی ژمارەییانەی دیاردەکانی لەجۆری ئایین، خانەدان، پادشا، شەڕ، قەوم و .. هتد و لە جیاتی ئەوەی چۆنێتی پێشکەوتنی کۆمەڵگا فێری مروڤ بکات، پەردەیەکە بەمەبەستی بەربەست کردنی فێربوون داهێنراوە، ئەو هەوڵە ئایدیۆلۆژیانەیە کە زهن و یادگای کۆمەڵگا بۆ خاوەنەکانی دەسەلات و قۆستنەوە ئامادە دەکات. ئەم جۆر و تەرزانەی باسکردن ئامرازێکی کۆن و بەسەرچووی پڕوپاگەندە کردنە کە لە ئاستێکی بەرزی یەکلایی کردنەوە و لەسەر بنەمای ئایدیۆلۆژییەوە ئامانجی مەشروعییەت بە دەست هێنانە.

گرێدراو بەو روون کردنەوەیەی لە بارەی پەیڕەو و سیستەمی زانیاری کردمان دەتوانین شیکارەکەمان فرە رەهەندتر بکەین. رەخنەیەکیش دەرهەق بە زاراوەی **"گروپی زمان - کلتووری ئاریان"**: گوایە هیتلەریش ئەم زاراوەیەی بەکارهیناوە بۆیە لەوانەیە بونی **"نەژادپەرستی"** لیبیت. دەبیت پییان بلێن: وشەی **"سۆسیالیزم"** لەنێو ناوی پارتەکەی هیتلەردا هەبوو، ئەو کاتە لەبەرئەوەی بۆنی نەژادپەرستی لیدێت دەبیت دەست لە سۆسیالیزمیش بەربدەن؟ کەچی فاشیزم بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە زاراوە ئایدیۆلۆژی و زانستییە جیاوازەکان بەکاردێنێت، واتا لە هەوڵە **"دیماگۆجییەکانی"**دا تا دوا ڕادە سەرکەوتووە. بە هەرحاڵ خۆ لەبەر خاتری ئەمە دەستبەرداری زانست و ئایدیۆلۆژیا نابین. هەر وەکو چۆن پێشخستنی میللیگەرایی پشت ئەستوور بە کلتوور - زمانی ئاریان بە فکریشماندا تێپەڕ نەبوو، بە سەربەرزی و شانازییەوە دەڵێم یەکێک لەوانەی بەرامبەر بە میللیگەرایی خاوەن واتادارترین شرۆڤەیە، منم. تەنانەت ئەگەر ئەمڕۆش خوازیاری تێگەیشتنی ئەو کارەساتەی ئێراق بین، بەر لە هەموو شتێک دەبێت ئەو راستییە پەسەند بکەین کە ئەو زانستی مێژوو و کۆمەڵناسییەی تا ئێستا هەبووە ئیفلاسیان کردووە. دوای ئەوە مافی رەخنەکردن و پێشنیازکردنی کۆمەڵناسی

ـ مێژووی نوێمان دەبێت. ئەوەی هەوڵی ئەنجامدانیشی دەدەین کۆمەکێکی بچووکە، بۆ کۆتاییهاتنی ئەم تراژیدیایەی مرۆڤایەتی پێشکەشی دەکەین. ئەو بابەتەی لە **"بەرگرینامەی مرۆڤی ئازاد"** بە درێژی هەوڵی باسکردنیم دا، لێرە بە هێڵە گشتییەکانی ئاماژەی پێدەکەم:

١ـ بوونی گرووپی زمان ـ کلتووری ئاریانی بە بناخە لە پێکهاتنی زمان و کلتووری ریشەداردا، بۆ هەلومەرجی جوگرافی و مێژوویی دەگەڕێتەوە. ماوەی نێوان سالانی ١٠٠٠٠ ـ ٤٠٠٠پ.ز گوزارشت لەو **"قۆناخە درێژخایەن"**ە دەکات کە ئەم زمان و کلتوورە بە باشی تێیدا بە دەزگابوو. هەموو جۆرێکی گلکاری، گاسن و ئاژەلی جووتکردن، چەرخ (رەوڕەوە)، رستن، دەستاڕ دۆزراوەتەوە، هونەر و ئایین بە دەزگابوون. لیستی درێژی بەرهەمە بە پیتەکانی رووەک و ئاژەڵ، لە زیادبوونی لە رادە بەدەری ژمارەی دانیشتواندا خۆی سەلماندووە. لە بەردە نوێ و پتەوە داتاشراوەکان تەنیا تەور، چەقۆ، دەستاڕ، رەوڕەوە، شوێنەوارە ئایینی، هونەری و (بیناسازییە)کان دروست ناکرێت. لەو قۆناخەی بەکالکۆلیتیک[1] ناوی دەبەین، بەرهەمی رەنگینتر لە بەردە کانزاییەکان دروست دەکرێت. لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا زۆر لە نموونەکانیان دەبینین. لە ناوچەی برادۆستی بناری زاگرۆس کە یەکێکە لە ناوەندەکانی هەڵکۆڵین، لە چایۆنۆ، هەرە دواییش لە گردی گۆبەکلی ناوەندی هەڵکۆڵینەکانی نزیک بە ئورفا چەندین نموونەی سەرسوڕهێنەری ئامرازەکانی بەردی کانزایی و نموونەی ئاسەواری بیناسازی ماڵ و پەرستگای ئایینی لە بەردی داتاشراو دۆزراوەتەوە کە بۆ دە هەزار ساڵ بەر لە ئێستا دەگەڕێتەوە.

تا رۆژی ئەمڕۆشمان لە لایەن خەڵکی خۆجێیی ناوچەکەوە بەکارهێنانی ئەم ئامرازە کلتووریانە و و ئەو گرووپە وشانەی

---

١ـ وشەیەکی فەرەنسیە، بە ولتای ئەو سەردەمە دێت کە مسی تێدا دۆزراوەتەوە، چەک و ئامرازی جیاوازیان لێی دروست کردووە.

گوزارشتیان لێدەکات، رۆشنایی دەخاتە سەر ناسنامەی ناوەندبوون (چەق ـ ناوک) ی گۆڕەپانەکە. چەندین وشەی لە جۆری جێ (شوێن)، عەرد (خاک، کێڵگە)، ژین (ژن، ژیان)، رۆژ (خور)، برا، مردن (مەرگ)، سۆل (پێڵاو)، نوو (نوێ)، گامێش (چێل)، گران (گەورە، قورس)، مەش (رۆیشتن)، گودا (خودا) کە دەتوانین چەندینی دیکەی بژمێرین ئەمڕۆ بەکارهێنانیان لەناو چەندین زمانی ئەورووپیدا روشنایی دەخاتە سەر مەسەلەی سەرچاوە. ئەو وشانەی کە تاکو ئێستا لە ڕیشەی (بناخەی) زمانی گەلە ناسراو و دێرینەکانی کورد، فارس، ئەفغان و بەلوجەکاندا هەیە ئەوە دەسەلمێنێت کە گروپی زمان ـ کلتووری ئاری سەرچاوەکەی ئەورووپا و هیند نییە، بەلکو پێچەوانەکەیەتی. لەم سەردەمە کلتوورییەدا کە دەتوانین لە میانەی تاتە بەردە نووسراوەکانی سۆمەر و ناوەندی چەندین بەڵگەی شوێنەوارناسییەوە بەلانی کەم ریشەکەی بۆ دوازدە هەزار ساڵ پێش ئێستا بگەڕێنینەوە، ئەورووپا لە قۆناخی **"چاخی بەردینی کۆن"**دا ژیاوە، هیندستانیش لە قۆناخی **"پیگماکان"**[1] دا بووە. زۆر بە ئاسانی دەتوانین ئەوە پیشان بدەین کە کلتوور ـ زمانی ئاریان لەو **"ماوە درێژە"**ی مێژوودا نزیکەی نیوەی ئەو ئامرازانەی دۆزیوەتەوە کە ئەمڕۆ مرۆڤایەتی لە رێی بەکارهێنانیانەوە ژیانی دەگوزەرێنێت. جگە لەو ناوەندانەی وەکو نموونە ئاماژەمان پێکرد، هەندێکیشیان تا ئێستا لەژێر خاکدا چاوەڕێی لێکۆڵینەوەن. هەروەها ئەو گروپ و گەلانەی لە سەردەمی دێرینەوە تا ئەمڕۆ هەبوونی خۆیان پاراستووە، هەریەکە و ناوەندێکی زیندووی شوێنەوارناسییە. بەلانی کەم بەر لە شەش هەزار ساڵ وەکو ناسنامە (جیاوازی ئەتنیکی) هەبوونی ئەم گەلانە بینراوە، سەلمێنراوە. دەبێت جارێکی دیکە ئاماژەی پێبکەم، تا رووداوەکانی ناوەندی کلتووری ناوک (هیلالی بە پیت) بە تەواوی لایەنەکانییەوە وەک واتا گوزارشتیان

---

۱ـ جۆرێک مرۆڤی کورتە باڵابوون لە ئەفریقیا کە هێشتا لە قۆناخی گەشە سەندندا بوون، نەبوونەتە مرۆڤی پێگەیشتوو و بە شێوەیەکی زۆر سەرەتایی ژیاون.

لێنەکرێت ئەوا زانستی مێژوو (مێژووناسی) ناتەواوی و کەم و کوڕی مەزن لەخۆوە دەگرێت.

ب . وەکو لقێکی کەنار ناتوانین شوێنگەی کلتوور و زمانی سیمیتیک (سامی) پشتگوێ بخەین. ئەم پێکهاتە زمان ـ کلتوورییەی کە لە رووی مێژووییەوە لە هەمان قۆناخدا جیاوازی خۆی پێشخست هیچ گومانێک لە دەولەمەندێتییەکەی ناکرێت. سەبارەت بە کلتووری هۆز و شوانکاری لەوانەیە دەولەمەندتر بێت. لەم لایەنەوە دەشێت لە گرووپی زمان ـ کلتووری ئاریان پێشکەوتوو تر بێت. لەدەقە سۆمەرییەکاندا شوێنەواری ئەمە دەبینرێت. بە شێوەی چیرۆک و داستان باس لە پێکدادان و کێبڕکێی نێوان دوو گرووپی سەرەکی کێلگە و شوانکاری دەکات. چەندە لە ئیراقی رۆژگاری ئەمڕۆمان دەچێت! پێکهاتەی داستان لە زمان و کلتوورەکەیدا لەپێشە. لەبەرئەوەی تایبەتمەندی یەک رەنگی بیابان وا دەکات هەموو شوێنەکان لە یەکتر بچن، پێکهاتنی خوداوەندی ئاسمان **"ئەل، ئەللا"** هاوکاتی ئەم قۆناخانەیە. ناسنامەی کۆمەڵگای عەشیرەت (خێڵایەتی) کە بۆ یەکەمجار بە شێوەیەکی نائاسایی جیا دەبێتەوە هاوشێوەی ئاسمان بەرز دەکرێتەوە (شکۆدار دەکرێت)، دەشێت بە زاراوەیەکی پیرۆزی لە جۆری **"ئەل، ئەللا"** گەیشتبێت. دەشێت پێناسەی ئیمیلی دورکهایم بۆ زاراوەی خوداوەند کە وەکو **"ناسنامەی کۆمەلایەتی"** شرۆڤەی دەکات، وەکو بەڵگەیەکی بەهێز لەمیانەی نموونەی **"ئەل، ئەللا"** پشتگیری بکرێت. وەکو دیارە هەر زوو زاراوە و دەزگاکانی **"شێخ، سەید"** لە کلتووری سامییەکاندا پێشکەوتووە. لە سەردەمی شارستانیدا ئەمانە بۆ دەزگاکانی **"پێغەمبەر، میر"** گۆڕاوە.

سەربارى ئەوەی شارستانی فیرعەونەکانی میسر لە گۆڕەپانی سیمیتیکدا جێگای خۆی گرتووە، رۆڵ و کۆمەکی کلتووری سامی تێدا نابینرێت. لە بواری ماددی، زاراوە و دام و دەزگاکانەوە هیچ نیشانە و ناوەڕۆکێک نابینرێت کە کلتووری شوانکاری لە سالانی ٤٠٠٠پ.ز رێگای لە پێش کلتووری شارستانییەکی شاری

وەها کردبێتەوە. هەڵبەتە بەڵگەکانی میسریش هەست دەکەن ئەم کلتوورە نامۆیە پێیان. لە پێکهاتەی زمانیشدا لیکچوون لە ئارادا نییە. کلتووری سامی وەکو قۆناخی یەکەم لە میانەی ناسنامەکانی ئەکەد، بابل، ئاشوور، کەنعان و ئیسرائیلەوە لە سالآنی ٢٥٠٠پ.ز جیگای خۆیان لە میژووی نووسراودا گرت. هەرچی ناسنامەی عەرەبە زۆر دواتر واتا لە سالآنی ٥٠٠پ.ز وەکو ناو دیار دەکریت. ئارامی، ئارامیتەکان، ئابیرۆکان زیاتر ناولینانەکانی سۆمەر و میسرن.

شرۆڤەیەکی بەهیزی بەم جۆرەش هەیە کە فینقییەکان، فەلەستینی و تەنانەت ئیسرائیلییەکانیش زۆر دواتر بە وینەی کلتووری میسری فیرعەونی لەناو زمان و کلتووری سامییەکاندا تواونەتەوە. خاڵەکانی دەست پیکردنیان دەریا و تیکهەڵکیشییە لەگەڵ کلتووری ئاریان. ئەو بەڵگانە لە بەردەستدا هەن کە لەناو شەپۆلی بەردەوامی کۆچبەری سامییەکاندا دۆخی سروشتی سەرەتای خۆیان لە دەستداوە.

هەندیک پاشماوەی کۆن کە تا رۆژی ئەمرۆمان هەن، تۆمارە شوینەوار ناسییەکان و سەرچاوەکانی سۆمەر کەرەستەیەکی زۆرمان وەک بەڵگە پیشکەش دەکەن کە شەپۆڵ بە شەپۆل یان هیرشیان کردۆتە سەر گۆرەپانی زمان و کلتووری ئاریان یاخود بەرەو ئەوێ کۆچیان کردووە. دەشیت ئەم هیرش و داگیرکاریانەیان بۆ سالآنی ٥٠٠٠پ.ز دریژ بکەینەوە. بە تایبەتی بە نۆرە ئەکاد، بابل، ئاشوور، ئارامی و عەرەبەکان بە شیوەی چین بە چین شوێن پەنجەی داگیرکەری خۆیان لەمیزۆپۆتامیای سەروودا بەجیهیشتووە. کاریگەری ئاشووری و عەرەبەکان بەهیزترە. بە هاتنی ئیسلامییەتیش توانەوەیەکی بەرفراوانیان لەگەڵ خۆیاندا هینا. ئیسلامی بوون و بە عەرەب کردن تیکەڵ بەیەکتر دەبن. بەرامبەر ئەم داگیرکاری، کۆلۆنیکردن و تواندنەوەیە، زمان و کلتووری ئاریان بەرخودانی مەزنی پیشانداوە، هەندیک جاریش توانیویەتی بەسەر دەست بەسەرداگرتن، کۆلۆنی، تواندنەوە و هیرشەکانی بەرامبەردا سەرکەویت. دەتوانین دامەزرینەرە یەکەمینەکانی شارستانی

سۆمەر، پێشەنگەکانی شارستانی میسر، هیکسۆس و عیبرانییەکان وەکو نموونە ناسراوەکانی مێژوو پێشکەش بکەین. ماقوولترین شرۆڤە ئەوەیە: پێشەنگە یەکەمینەکانی سۆمەر لە قۆناخی تەل حەلەف[١] (٦٠٠٠ـ٤٠٠٠پ.ز) دا کە سەردەمی پێگەیشتوویی چەکەرەی کلتووری ئاریانە لە میزۆپۆتامیای سەروو لە ڕێگای کۆچەوە بۆ میزۆپۆتامیای خواروو ئەم کلتوورە دەگوازنەوە، لەوێشدا بە ئاستێکی لەپێشتری دەگەیەنن. زۆر باش دەزانرێت کە دواتر کاریگەرییەکانی ئەکاد، بابل و ئاشوور کەوتنە ناو پێکهاتەی زمان و کلتووری سۆمەری.

لە جیاتی هەڵسەنگاندنی سۆمەر وەکو ئەو گروپانەی کۆچیان کردووە، ناوبردنی بە پەلهاوێشتن و بڵاوبوونەوەی کلتووری چاخی تەل حەلەف، کۆمەکێکی زیاتر بە شرۆڤەیەکی ڕاستی مێژوو دەکات. دەشێت هەندێک گروپ لە گۆڕەپانی کلتووری ئاریانەکان کۆچیان کردبێت، بەڵام فاکتەری هەرە سەرەکی کاریگەر، بڵاوبوونەوەی ئەو کلتوورەیە کە لە قۆناخی هەرە بەهێزی خۆیدا بوو. وەک بانگەشەکان گەڕان بە دوای کاریگەرییەکانی ئاسیای ناوین یاخود قەفقاسیا بێواتایە. چونکە لە سەردەمی ئاواکردنی سۆمەر (٥٠٠٠پ.ز) ئەم گۆڕەپانانە لە چاخی بەردینی کۆندا دەژیان، تازە بە تازە ئاشنای کلتووری ئاریان دەبوون. نە لە لایەنی ناوەڕۆک نە شێوەوە ئەو فاکتەرانە لەخۆوە دەگرێت کە کلتوورێکی هێندە پێشکەوتووی وەکو کلتووری سۆمەر تێر بکات. هێزی هێرش کردنیان هێندە پێش نەکەوتووە کە بتوانن پشتێنەی زمان ـ کلتووری ئاریان تێپەڕ بکەن. لەبەرئەوەی دانانی کلتوورەکان بە کلتوورێکی ساف (زەلال) ڕاست نییە و بەناویەکداچوونی کلتوورەکان شیمانەیەکی مەزنە، دەشێت هەندێک ئەندامانی گروپەکانی قەفقاسیا و ئاسیای ناوین بەرەو پشتێنەی سۆمەر و هیلالی بە پیت کۆچیان کردبێت کە

---

١ـ تل حلف: ماوەیەکی زەمەنی مێژووی میزۆپۆتامیایە، ناوی خۆی لەو جێگە شوێنەوارناسییە وەردەگرێت کە دەکەوێتە پارێزگای حەسەکەی باکووری ڕۆژهەڵاتی سوریا.

ئەوروپا و ئەمریکای سەردەمی خۆی بوو. هەر وەک لەرۆژی ئەمڕۆشدا چەندین گروپی کلتووری جیاواز کە زوربەشیان هەژارن لە گۆڕەپانە جیاوازەکانی جیهان رووی خۆیان لە ئەوروپا دەکەن، بۆ ئەوێ کۆچ دەکەن و نیشتەجێ دەبن. هەر وەکو چون کلتووری ئەوروپای رۆژگاری ئەمڕۆمان بۆ هەر چوار لای جیهان دەگوازێتەوە، زمان و کلتووری ئاریانیش (بە تایبەتی دوای تەقینەوەی ژمارەی دانیشتوان ـ بە تایبەتی لەسەردەمی تەل حەلەف: ٦٠٠٠ ـ ٤٠٠٠پ.ز) دەرفەتێکی هاوشێوە دەڕەخسێنێت. کۆچەکانی خوشیان دەشێت بە کۆچی ئێستای رەنجدەران بۆ ئەوروپا بچوێنین.

ج ـ وەکو گۆرەپانێکی گرنگی کلتووری شرۆڤەکردنێکی راست دەرهەق بە دۆڵی نیل جێگای بایەخ پێدانە. پێشخستنی کلتووری چاندن (کشتوکاڵ) لەم دۆڵەدا و گواستنەوەی بۆ شارستانی فیرعەونەکانی میسر، کاری پێکهاتەی زمان و کلتووری سامی نییە، بەلکو لێی نامۆیە. ناوەڕۆکی کلتووری سامی لەم بەهرەیە بێبەش دیارە. پێکهاتەی زمانی میسری خەسڵەتەکانی زمانی سامی لەخۆوە ناگرێت، بەم جۆرەش جیاوازی خۆی خستۆتە ڕوو. کلتووری سودان و ئەسیوبیای باشووری ئەفریقیا و گۆڕەپانەکانی دیکەش چاخی بەردینی کۆنیان تێپەڕ نەکردووە. هەر بۆیە لە لایەنی تیۆرییەوە ناشێت رێگایان لە پێش کلتووری میسر کردبێتەوە. دیسان لە بواری تیۆرییەوە بیر لەوە ناکرێتەوە کە ئەمە لە ئەنجامی پێشکەوتنی ماوە درێژی تیرە کۆچەرەکانی ئەفریقیاوە لە دۆڵی نیلدا بەدیهاتبێت. چونکە بۆ شۆڕشی کشتوکاڵی پێویستییان بە ئامراز و بەرهەمەکانی هەیە. ئاسەواری هیچ یەکێک لە رووەک و دانەوێڵەکانی کشتوکاڵی هیلالی بە پیت لە دۆڵی نیل نەبینراوە کە بە شێوەیەکی خۆڕسک رووابێت. لەناو گیانلەبەرانیشدا جگە لە کەری میسری هیچ نموونەیەکی دیکەی ئاژەڵ نابینرێت.

گریمانە تیۆرییەکان پێیان وایە کە کلتووری ئاریان یەکێک لە لقەکانی پەلهاوێشتنی لە جیهاندا هاوکات لە هەمان قۆناخدا

گەیشتووەتە ئەم ناوچەیە. دەبێت لە بیر نەکەین کە دۆڵی ریفی رۆژهەڵاتی ئەفریقیا نزیک بە رووباری نیلە، بە ئەندازەی لە باشوورەوە بۆ باکوور، بە هەمان شێوە لە باکووریشەوە بۆ باشوور دەرفەت بە تەوژمی کۆچی مرۆڤ دەدات و شتێکی چاوەڕوانکراویشە. کلتوورە لەپێشترەکان بەردەوام لە میانەی ئەم ڕێگا کۆنانەوە کاریگەریان بۆ سەر بەرامبەرەکانیان گواستۆتەوە. هاوکاتی شارستانی میسر بۆ ساڵانی ٤٠٠٠پ.ز، دەشێت لەسەر بنەمای ئەو پەلهاوێشتنە کلتوورییەی سۆمەر بێت کە لە ساڵانی ٥٠٠٠پ.ز لە ئاکامی تەقینەوەی ژمارەی دانیشتوانی هیلالی بە پیت هاتە ئاراوە. ناوەڕۆک، شێوە و دەرفەتەکانی گەیاندن بۆ ئەمە لەبارە. کەچی خۆی لە خۆیدا لە سەرەتاکانی ساڵانی ٢٠٠٠پ.ز هیکسۆسەکان، دواتر لە ساڵانی ١٧٠٠پ.ز عیبرانییەکان لەسەر هەمان ڕێگاوە کۆلۆنییان لە میسر ئاوا کرد، تەنانەت گەیشتنیان بە پێگەی بەڕێوەبەرایەتی نموونەیەکن راستی بۆچوونەکەمان دەسەلمێنێت. هەرچەندە لە میانەی بەسەرچوونی کات هێزی پەلهاوێشتنی کلتووری گۆڕەپانی ئاریان کەم بووبێتەوە، بەڵام دیسان تەوژمی خۆی بەرەو گۆڕەپانە هاوشێوەکانی سیمیتیک دواتریش درێژەی پێدەدات.

د ـ دوای ئەوەی لە هیلالی بە پیت هەبوونی خۆی سەلماند و گەیشتە بە دەزگابوونێکی تۆکمە، ئەمجارە بەرەو رۆژهەڵات بۆ ئێران، ئەفغانستان، پاکستان و هیندستان بڵاوبۆوە، پەلهاوێشتنەکەشی یەکجار بەهێز بوو. دیسان جەختی لەسەر دەکەمەوە، ئەوەی گوازراوەتەوە لە گرووپی مرۆڤەکان زیاتر کلتوورە. جەستەیی نییە بەڵکو کاریگەری کلتوورییە. ئەو گواستنەوە کلتوورییەی لە ساڵانی ٧٠٠٠پ.ز یەکەمین نیشانەکانی لە کوێستانەکانی ئێران بینراوە، لە ساڵانی ٤٠٠٠پ.ز لە هیندستان بە کاریگەر دەبێت. لە ساڵانی ٥٠٠٠ پ.زدا ئەم کاریگەریانە دەگاتە کوێستانەکانی تورکمانستان. تێڕوانینێکی بەم جۆرە هەیە کە چینە کلتوورییەکانی پێشووتر لە

بنەچەی کۆنی ئەفریقیاوە دێن و تاکو ئێستاش لە چاخی بەردینی کۆن بە هەڵواسراوەیی ماونەتەوە. پاشماوە کلتووری و بونیادە جەستەییەکانی هەندێ لەم گروپانە ـ بەتایبەتی لە هیندستان ـ ئەم تێزە بەهێز دەکات. هیچ بەڵگەیەکی تیۆری و کرداری لەئارادانییە بیسەلمێنێت کە لەوێ پەرەسەندنێکی کلتووری کە بەرهەمی گەشەسەندنێکی خۆجێیی بێت، روویدابێت، هەروەک ئەودی لە سۆمەر و میسر هەبووە.

هەرچەندە هەندێک رەخنە ئەم شێوازەی هزراندن بە زێدەڕۆیی (میتۆدی بچووک کردنەوە) لەقەڵەم بدات، بەڵام بە گرنگییەوە دەبێت بە بیرمان بێتەوە کە شۆڕشە کلتوورییەکان بە شێوەیەکی زۆر سنووردار و بە زەحمەتی لە مێژوودا روودەدەن. بیر لە کلتووری ئەوروپا بکەینەوە لە شوێنێکی دیکە نموونەکەی نییە. سەبارەت بە هیلالی بە پیتیش پێشخستنی بۆچوونێکی هاوشێوە کە بە گوێرەی سەردەمی خۆی بێت تا دوا ڕادە داهێنەرانەیە. چاوەڕوانیکردن و شایستە بینینی شۆڕشی گەورەی کلتووری بەو گروپانەی لەناو خوو و راهاتنەکانی سەد هەزار ساڵە بە هەڵواسراوی ماونەتەوە و لە ڕۆخی لەناوچووندان، لە میانەی هزری تیۆری و پاشماوە کلتوورییەکانەوە پاڵپشتی لێناکرێت. پەلهاوێشتنی کلتووری بە گوێرەی رۆژهەڵات لە ساڵانی ٣٠٠٠پ.ز لە ڕۆژئاوای ئێران، ناوچەی ئیلام[1] بۆ شارستانی شار هەنگاوی ناوە، ناوەندەکەی سوس بووە و ئەمەش زیاتر کۆلۆنی سۆمەر بە بیری مرۆڤ دێنێتەوە. مسۆگەر لەژێر کاریگەری سۆمەردا بووە. دەزگاکانی شاری هاراپا و

---

١ـ شارستانی ئیلام، لە یەکەمین شارستانیەکانی ئەوپەڕی رۆژئاوا و باشووری رۆژئاوای ئێرانی ئەمڕۆمانە، لەنێوان ساڵانی ٢٧٠٠ـ ٥٣٩ پ.ز بەردەوام بوو. شاری سوس ناوەندەکەی بوو،بەزمانی یەهودی وشەی ئیلام بەواتای خاکە بەرزەکان دێت. گەلی ئیلام یەکەمین شارستانی ناسراوی مێژوویان ئاوڵکردووە. زانا شوێنەوارناسە فەرەنسیەکان هەندێک ئاسەواری مرۆڤیان لەم ناوچەیە دۆزیوەتەوە کە بۆ بیست هەزار ساڵ دەگەڕێتەوە. کلتووری شارستانیەکەی بۆ ٤٥٠٠ پ. ز دەگەڕێتەوە. خەڵکەکەی پەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ میزۆبۆتامیا هەبووە.

موهانجەدرۆ[٢] کە دەکەونە کەناری رووباری پێنجاڤ[٣] کە دەکەوێتە پاکستان هاوکاتی سالانی (٢٥٠٠پ.ز)ە ئاشکرایە کە ئەمانە لەسەر شوێن پێی ئاسەواری سۆمەرییەکان ئاوا کراون. لە میانەی تیوری ناچارییەوە لەقەڵەمدانی پێکهاتەی کلتووردکانی تر بە دامەزراندنە رەسەنەکە لەبەر هەمان هۆکار راست نییە. ئەو چینە کلتوورییەی بە رەسەنەکە ناوددبرێت لە ئاستی **"پیگماکان"** دایە، بۆیە بۆچوونی ئاواکردنی شارستانی رەسەنی شار لە ریگای ئەمانەوە، هەر وەکو ئەوەیە کە گوێدرێژ بە ئەسپ بچوێنی. کاتێک ئەوە بە بیرخومان بێنینەوە کە **"سەرباری ئەوەی بە هەزاران گروپ لە هەلومەرجی جوگرافی پێگەیشتووتردا بە ملیۆنان ساڵ ژیاون و لە هەمان ئاستدا بوون بۆچی شۆرشی گەورەی کلتووری و شارستانییان ئەنجام نەداوە؟"** سەبارەت بە راست تێگەیشتنی بوچوونەکەمان ئەزموون بەخشە.

بێگومان ئەم گورەپانانە رول و کومەکیان هەبووە. چەندین سەنتێز[١] پێشکەوتووە. پەلهاوێشتن و خوجێیی بوون لەناو یەکتردان و زیاتریش دلخوازانەیە. ئەوەی بڵاوبۆتەوە گروپە چەوسێنەردکان نین، بەها ماددی و مەعنەوییەکانی بەرهەمهێنانن کە رۆڵی پەرەپێدان دەبینن. کلتووره پەلهاوێژەکانی لەم لایەنەوە خۆیان سەلماندووە بەردەوام وەکو **"پەرجووە پیرۆزەکانی خوداوەند"** لە قەلەمدراون. گرنگە کە ئەو پەلهاوێشتنە کلتووریانەی لە بواری ماددی و مەعنەوییەوە بەهای ژیانیان بەرز کردۆتەوە لەگەل داگیرکاری، زەوتکردن و توانەوەی زۆرەملێیانە تێکەڵ نەکرێت. زۆر کەم پەلهاوێشتنە کلتوورییەکان بە شێوەی پەلاماری هۆڤانە، داگیرکاری و توانەوەی زۆره ملێیانە بەرێوەچووە. بەشی هەرە

٢. دەکەونە کەناری رۆژئاوای رووباری سند (هندوس)،لەساڵی ١٩٢٤شوێنەواری شارێکی کۆنی لێدۆزرایەوە کە لە چەندین شاری ناسراوی ئەو سەردەمە کۆنترە، کاتێک خۆفۆ ئەهرامە گەورەکەی بونیادناوە ئەم شارە لەلووتکەی خۆیدابووە. پەیوەندی بازرگانی، ئایینی و هونەرییان لەگەڵ سۆمەر و بابلدا هەبووە.٢٠٠٠ساڵ بەردەوامبووە.

٣. دەکەوێتە باشووری هیند، بەواتای خاکی پێنج رووبارەکە دێت. بە هەردوو شاری لاهور و شەملای نزیک شاخی هیمالایا تێپەردەبێت.

١. یان کۆنتێز کە لە ئەنجامی ململانێ و کێبەرکێ و تێکەڵ بوونی تێز و دژە تێزەوە دێتە کایەوە.

زۆری لە دەرئەنجامی سەلماندنی بالابوونی چوونییەتی کوالیتی ژیان بە جۆش و خرۆشەوە پەسەندکراوە. هەلویستە تەسکەکانی میللیگەرایی سەبارەت بە میژوو مەسەلەی تیگەیشتنی پەلهاویشتنی کلتووری بە دۆخیکی بنبەست بوو گەیاندووە. نەکەوتنە ناو تەلەزگەکانی میللیگەرایی کە لیشاوە راستەقینەکانی میژووی شیواندووە، داپۆشیوە، نکولی لیکردووە و زیدەرۆیی تیدا کردووە، سەبارەت بە سیستەمی زانیاری و پەیرەو بایەخیکی زۆری هەیە.

هـ - بەراوردکردنی کلتووری ئاریان و بنەرەتی کلتوورە چینییەکان، دەشیت بابەتیکی سەیری لیکۆلینەوە بیت. سەلمینراوە کە چین لە سالانی ٤٠٠٠پ.ز دا لە رووی کلتوورییەوە بە قوناخی لەپیشینەی نیولیتیک گەیشتووە. ئەگەر بیر لەوە بکەینەوە کە لە هەمان میژوودا کلتووری ئاریان لە ئەوروپاوە تا هیندستان گوازراوەتەوە، بە ئاسانی دەتوانین بلیین بۆ چینیش گواستراوەتەوە، ئەمە تیزیکی بەهیزە. شیمانەیەکی بەهیز ئەوەیە کە کلتووری چین لە ریگای کلتووری ئاریانەوە تیرخۆراک کراوە، بەلام بە تایبەتی داخراوبوونی جوگرافیاکەی (کەنارەکانی رووباری زەرد) و هەلومەرجە میژووییەکەی و پیکهاتەی تایبەت بە خۆی رۆلی پیشەنگی بە پەرەسەندنی خۆجییەتی داوە. مسۆگەر کاریگەری کلتووری ئاریان جیگای باسە. بەلام تایبەتمەندی کلتووری خۆجییی ریگای لە پیش شۆرشیکی **"نیولیتیک"**ی بە گویرەی خۆی کردۆتەوە. هەر وەکو چینی رۆژگاری ئەمرۆمانە. هەر وەکو چۆن پیکەوەیی پەرەسەندنیکی گەورەی میژوویی و هەلومەرجی جوگرافی و دیموگرافی ریگای لە پیش **"کۆمۆنیزم"**یکی بە گویرەی خۆی کردۆتەوە، ریگای لە پیش سەرمایەدارییەکی بە گویرەی خۆیشی کردۆتەوە. تا کۆمۆنیزم و سەرمایەداری لەگەل کارەکتەری چین ئاویتە نەبیت، نابیتە کۆمۆنیزم و سەرمایەداری چین. لە لایەک بەرخودانی بەهیز بەرامبەر دەرەوە، لە لایەکی ترەوە کاتیک لەمەدا سەرکەوتن بە دەست نەهینن، بە شیوەیەکی تۆکمە و خیرا کلتووری دژ پەسەند دەکەن، ئەمە تایبەتمەندی بنەرەتی قەومە سەردکییەکان (ژاپۆنیەکان، کۆرییەکان، تورکەکان، مەغولیەکان، ڤیتنامیەکان .. هتد)ی

کلتووری بنچینەیی چینە. شانبەشانی لایەنی بەرخودانە بەهێزەکانیان، بەهرەکانی لاسایی کردنەوە و پەسەندکردنیشیان لەپێشە. لەوانەیە ئەمە تایبەتمەندییەکی قووڵ و هاوبەشی کلتوورەکەیان بێت.

کلتووری نیولیتیک و قۆناخی دواتری شارستانێتی(ژیار) لە ڕێگای چینەوە بۆ ئەندامەکانی دیکەی گرووپەکە گوازراوەتەوە. لەناو گرووپەکەی خۆیدا بینینی چین وەکو عەرەبەکانی ناو سامییەکان دەشێت ڕۆشنکەرەوەتر بێت. هەر وەکو کلتووری سامییەکان گرووپی کلتووری چینیش هاوشێوەی کلتووری ئاریانی تایبەتمەندی گەردوونیبوونی پیشان نەداوە. لەم بارەوە بە پلەی یەکەم ئاریانەکان، دووەمین سامییەکان و دواتر چین دێت.

و - ڕۆشنکردنەوەی پەیوەندی نێوان گرووپی زمان - کلتووری ئاریان و گرووپی زمان - کلتووری هیندو - ئەورووپی زۆر گرنگە، لەوانەیە یەکێک لە پرسە سەرەکییەکانی مێژووناسی بێت. ئەم خاڵە ئەلقەیەکی ئاڵوزە کە قەبلاندنی زۆری لەسەر کراوە، بەڵام شرۆڤەیەکی هاوبەشی بۆ نەدۆزراوەتەوە. لە سەدەی نۆزدەهەم کاتێک دەرک بە هاوبەشێتی گرووپە زمانی هیندو - ئەورووپی کرا لێکۆڵینەوەی مەزن لەم بارەیەوە ئەنجامدران. سەبارەت بە سەرچاوەی بنەڕەتی گرووپەکانی **"زمان و کلتووری باپیرەیان(بنەچەیان)"** شرۆڤەی ناکۆک پێشخران. لە گفتوگۆکاندا سەبارەت بە بنەچە (ڕەچەڵەک) هەندێکیان بۆ کلتووری یۆنانیان گەڕاندەوە، هەندێکی دیکە بۆ هیند، تەنانەت بۆ کلتووری باکووری ئەورووپا، بۆ ئەڵمانەکانیان گەڕاندەوە. بەڵام کاتێک دابڕان لە پریماتەکانی ڕیفی ڕۆژهەڵاتی ئەفریقیا و شۆڕشی کشتوکاڵ - نیولیتیکی هیلالی بە پیت بە بەڵگەوە سەلمێنران، تەواوی ئەو ئەگەرانەی ئاماژەمان پێکرد پووچەڵ بوونەوە. ئەم دوو چاوگە بنەڕەتییەی مێژووی مرۆڤایەتی گرنگییەکی گەورەیان هەبوو. پێشتر هەوڵی پێشکەشکردنی پوختەکەیم دابوو.

گفتوگۆکانی داخۆ کامە گرووپی زمان و کلتووری هیلالی بە پیت لەوانی دیکە دێرینترە، بۆتە جێگای بایەخ. بەو شێوەیەی شرۆڤەمان کرد گرووپەکانی پرۆتۆ کورد، فارس، ئەفغان و بەلوجی لەوانەی

دیکە لەپێشتر بوون. بە تایبەتی کاتێک دەرک بە پێکهاتەی زمانی هورییەکان کرا کە کوردەکانی سەرەتان، دێرینی زمان ـ کلتووری ئاریان یەکلابوودوە. ئەو تێزەی من خۆشم راستی دەبینم ئەوەیە: تەنیا گۆڕەپانی جەرگەی شۆڕشی نیولیتیک دەتوانێت ئەم زمان و کلتوورە بخولقێنێت. بەم جورە یەکلابۆتەوە کە ناوچەی ناوک ئەو کەوانەیەیە کە سیستەمی چیاکانی زاگرۆس ـ تۆرۆس دروستی دەکەن، هەر ئەم ناوچەیە کە بە **"هیلالی بە پیت"**یش بەناوکراوە ناوەندی زمان و کلتووری ئاریان پێکدێنێت. دوا هەڵکۆڵینە شوێنەوار ناسییەکان و کۆششەکانی ئەتیمۆلۆژی و بەراوردکارییەکانی ئەتنۆلۆژی رۆژ لە دوای رۆژ ئەم تیزە بەهیزتر دەکەن. بەم جورە تاڕادەیەکی مەزن پرسی پێشەنگایەتی لەناو گروپەکانی زمان و کلتووری هیندۆ ـ ئەورووپی چارەسەر بووە.

لەبەرئەوەی **"ماوە"** زۆر درێژخایەن و جوگرافیاش ئێجگار بەرفراوانە، وەکو چون روویداوە ناتوانرێت نەخشەی بڵاوبوونەوەی زمان ـ کلتووری ئاریان بکیشرێت. بەڵام زۆر بە ئاسانی ددتوانین راڤەی بکەین کە هاوشێوەی پەلهاوێشتنەکانی بەرەو باشوور و رۆژهەڵات، بە ئاراستەی باکوور و رۆژئاوا و بەرەو ئەورووپا بڵاوبۆتەوە. بۆچوونی پەسەندکراو ئەوەیە کە ئەو پەلهاوێشتنەی شەپۆلەکانی لە ساڵانی ٥٠٠٠پ.ز دەستی پێکرد، لە ساڵانی ٤٠٠٠پ.ز ئەورووپای رۆژهەڵات، لە ساڵانی ٢٠٠٠پ.ز یشدا بە تەواوی لە رۆژئاوای ئەورووپا جێگیر بوو. مێژووناسە گرنگەکان لە سەرووی هەمووشیانەوە **"گۆردن شیلد"** مێژووی ئەورووپا بۆ ئەم ساڵانە دەگەڕێننەوە. قۆناخی بەرلەوەش چاخی بەردینی کونە. لە شوێنی نێوان باشووری فەرەنسا و ئیسپانیا کە سی هەزار ساڵ بەر لە ئێستا هۆمۆ ساپیانس تێیدا بوو بە جۆرێکی زاڵ، لەئەنجامی پەلهاوێشتنێک کە لە باکووری ئەفریقیاوە سەرچاوەی دەگرت مەزەندە دەکرێت کە بە درێژخایەنترین چاخی مەزۆلیتیک (چاخی بەردینی ناوین)دا تێپەڕ بووە.

لە رەوشێکی وەهادا نین شۆڕشی کشتوکاڵ و نیولیتیکی ئەورووپا بخەینە بەر توێژینەوە. بەڵام لەو بڕوایەدام کە بەهۆی گرنگییەکەی

کێشەی سەرچاوە ڕوشن کرایەوە. دیسان شیمانە ددکەم کە بڵاوبوونەوە و پەلهاوێشتن بۆ ئەوروپا لەسەر بنەمای جەستەیی و کۆلۆنیکردن نەبوود، بەڵکو بڵاوبوونەوەیەکی کلتووری بووە. تایبەتبوونی ئەوروپا لێرەدایە: بە هەموو لایەنە خوڵقکارییەکانییەوە چاخی نیولیتیکی بە ئامادەیی وەرگرتووە. کەڵەکەبوونەکانی دە هەزار ساڵی بە جارێک یاخود لە ماوەیەکی کورتخایەندا هەرس کردووە. دەتوانرێت بگووترێت هەر وەکو چۆن چوارسەد ساڵە ئەوروپا تەواوی جیهانی کردۆتە گۆرەپانی پەلهاوێشتنی کلتوورەکەی، خۆشی وەکو گۆرەپانی بڵاوبوونەوەی نیولیتیک، دواتر شارستانی ڕۆما، دواتریش شۆرشی ڕۆح - واتای مەسیحیەت دەبینێت. هەر سێ شۆرشی مەزنیش لەسەر بنەمای کلتووری لە ئەوروپادا بڵاوبوونەتەوە. جگە لە شەرە سنووردارەکانی ئیمپراتوریەتی ڕۆما هیچ بڵاوبوونەوەیەک لەسەر بنەمای داگیرکاری، کۆلۆنیکردن و تواندنەوەی زۆرەملییانە نەبوود. بڵاوبوونەوەی کلتوورە باڵاکان لە میانەی پەسەندکردنی **"نیعمەتی خوداوەند"** ئەنجامدراوە. کاتێک بەئاسانییەکی بەم جۆرە کەڵەکەبوونی کلتووری نزیکەی دە هەزار ساڵەی مرۆڤایەتی بە دەست هاتووە، بناخەی شۆرشە گەورەکانی دواتری ئەوروپا داتراوە (ڕینسانس، ڕیفۆرم، ڕوشنگەری، شۆرشەسیاسی، پیشەسازی و زانستیەکان) ئەوروپا لە میانەی بەهرە تایبەتەکانی خۆیەوە ئەم شۆرشە گەورانەی ئەنجام نەداوە. بە شێوەیەک کە ڕووباری دایک و لقەکانی مێژوو ڕێرەویان ئامادە کردووە، کاتێک هەموویان بە یەکەوە لێشاو و تەوژم دێنن ئەم بناخە ئامادە کراوە. بێگومان کوتایی هاتنی **"سەردەمی سەهۆڵبەندان"** کە هاوکاتی ئەو قۆناخە بوو، لە سایەی ئەو کەشە ئێجگار لە بار و دارستانە تازە و زەوییە لیتاوییە بە پیتانەی بەهۆی ئەمەوە هاتنە کایەوە، ئەوروپا لە ئاکامی سەنتێزی تەواوی ئەم هەلومەرجانە قەڵەمبازە مەزنەکەی شارستانی ئەنجامدا کە مۆرکی خۆی لە ڕۆژگاری ئەمرۆشمان داوە. کە شوێنی هات لە نزیکەوە چاودێری وردەکارییەکانی ئەم داستانە دەکەین.

## ٣ـ شرۆڤە کردنێکی راست بۆ ژیان و پەرەسەندنی کۆمەڵگای هیلالی بەپیت

ئەو خاڵەی بە بایەخەوە لەژێر ئەم سەرە دێردا هەوڵی روونکردنەوەی دەدەم کاریگەری ڕەهەندێکی دیاریکراوی کات و شوێنی کومەڵگایە کە لەسەر شێوازێکی ژیانی دەستنیشان کراوە. ئەو بابەتەی لە مەسەلەی پەیڕەویشدا بە درێژی هەوڵی تاوتوێ کردنیمدا ئەوەیە: راستینە کۆمەڵایەتییەکان **"راستییەکن بە دەستی مرۆڤ ئاواکراون"**. ئەم بابەتە هێندە گرنگە، تا تەواو واتاکەی نەدۆزرێتەوە، هەر هەوڵێکی هۆشیاربوونەوە لەوانەیە **"فێربوون"** و **"واتا"** بۆ بابەتی نەزانی و بێ واتایی بگۆڕێت. لەو بڕوایەدام کە نەزانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەو نەزانییەی **"ئەبو جەهل"** زۆر گەورەترە کە لە سەردەمی دەرکەوتنی ئایینە مەزنەکان ڕەخنە کراوە. هۆکاری سەرەکی ئەمەش پۆزیتیڤیزم[1] ە کە بەرتەسکترین هەنگاوی ماتریالیزمییە و لە سەردەمی مۆدێرنیتەدا بووە بە ئایین. ئەم ئایینەی دەتوانین وەک **"دیاردەگەرایی"**[2] ناوزەدی بکەین،

---

١ـ مەزرێکی فەلسەفییە لەلایەن ئۆگست کۆنتەوە پێشخراوە، چەمکێکی زانستییە تێڕامانی تیۆلۆژی و میتافیزیکی ڕەت دەکاتەوە. پشت بە راستییە فیزیاییی یان مادیەکان دەبەستێت. هەرشتێک بە ئەقڵ؛ بیستن، بینین و بەرکەوتن نەسەلمێنرێت بەگوێرەی ئەو پووچە و بوونی نییە. پشت بە واقعیەت و ئەزموونگەرایی دەبەستێت.بە گوێرەی ئەو زانستە ئەزموونگەراییەکان دەتوانن راستی و ناراستی شتەکان یەکلا بکەنەوە. بە عەرەبی (الوضعية)ی پێدەڵێن.

٢ـ Phenomenalism یان Phenomenology تیۆرییەکە نکوڵی لە واتای ناوەڕۆک دەکات، هەبوونی راستی لە

بە تايبەتی لەبەرئەوەی بەرهەمی زهنی مرۆڤە، واتا بەهۆی ئەم کارەکتەرەیەوە میتافیزیکە.

لە بەشی تایبەت بە پەیڕەو بە درێژی باسی زهنییەتی مرۆڤم کرد، کە خاوەن پێکهاتەیەکی کارەکتەری میتافیزیکە. پۆزیتیڤیزم ئاگاداری نییە کە ئەم دیاردەگەرایییە رووکەشانەترین **"بتگەرایی"** سەردەمی کۆنە. بە بایەخەوە بانگەشە و بۆچوونی: **"دیاردەگەرایی= بتپەرستی"** دەخەمە ڕوو. دیاردەگەرایی شێوەی شرۆڤەکردنی راستییەک نییە. هەرچەندە بانگەشەی بۆ بکات بەلام فەلسەفەیەکی زانستی پاڵپشت بە دیاردەکانیش نییە. چونکە فەلسەفەیەکی بەم جۆرە نابێت. هەر دیمەن و دەنگێک کە گوێ بلەرینێتەوە و بەرچاو بکەوێت دیاردەیە. تەنانەت هەر هەست کردنێکیش دیاردەیە. کامە شێت یان نەزان دەتوانێت بڵێت کە راستی گەردوون تەنیا بریتییە لەمانە؟ بە گوێرەی بۆچوونی ئەفلاتوون دیاردە تەنانەت بە دیمەنیش لە قەڵەم نادرێت. مەگەر وەک نیچە دەڵێت هەستی سادە بن. دەشێت هەڵوەستە لەسەر پەیوەندی نێوان هەست ـ دیاردە بکرێت. هەر وەکو چۆن راوەستەمان لەسەر ئۆبژە ـ سۆبژە کرد.

بەداخەوە مۆدێرنیتە وێنەی ژیانێکە کە لەسەر بنەمای دیاردەگەرایی ئاواکراوە. بە ئەنقەست وشەی **"وێنەیەتی"** بەکاردێنم، چونکە مۆدێرنیتە پەیوەندی بە ڕووخسار و رووکەشی ژیانەوە هەیە نەک ناوەڕۆکەکەی. گووتەی **"ژیانی چەوت، بە ڕاست ناژێنرێت"** کە ئەدۆرنۆ ئاماژەی پێکردووە، بەلام شینەکردۆتەوە، ئەنجامی ئەو نائومێدییەیە کە لە ئاکامی کۆمەڵکوژی جولەکەکان تووشی هات. لە راستیدا ئەم گووتەیە رۆڵی کلیل دەبینێت، بەلام بێ روون کردنەوەیە. پرسیارەکانی لە جۆری ، چەوتی بنەڕەتی ژیان لە کوێدایە؟ کێ بەرپرسیارە؟ چۆن ئاوا کراوە؟ پەیوەندی بە سیستەمی کۆمەڵگای دەسەلاتدارەوە چییە؟ ئەم پرسیارانە بێ وەلامن. تەنیا بەوەوە راوەستاون کە ریشەکەیان بۆ قۆناخی

---

دیاردەکاننادەبینێت.

راسیۆنالی و رۆشنگەری گەڕاندۆتەوە. بابەتەکە، واتا شێوەی ژیانی چەوت بە ئالۆزی و تەمومژاوی ماوەتەوە.

هەوڵێکی هاوشێوە لای میشێل فۆکۆش جێگای باسە. فوکو دەڵێت: **"مۆدێرنیتە مردنی مرۆڤە"** و بەم جۆرە بەجێی دێلێت. فەیلەسوفێکی هێندە بە ناوبانگ چۆن دەبێت بە یەک رستە باس لە بابەتێکی ژیانیی وەکو مردنی مرۆڤ بکات و دەستبەرداری بێت؟ ئەگەر بگوترێت لە کاتی روون کردنەوەیدا مردنی پێشوەخت رێگر بوو، هیچ واتایەکی نییە. تەنانەت لە دوا هەناسەشدا بێت راستی و شرۆڤەیەکی گرنگ پێویستی بە روون کردنەوەیە. کۆپەرنیک[1] تەنانەت لەسەر دۆشەکی مردنیش بڵاوکردنەوەی شاکارەکەی لە بارەی روونکردنەوەی **"زەوی بە دەوری خۆردا دەسوڕێتەوە"** پشتگوێ ناخات. هاوشێوەی ئەمە چەندین شرۆڤەکاری راستی لە رۆژئاوا و رۆژهەلاتیشدا هەن. هەرچی رەخنەگرانی پۆست مۆدێرنیزمن لەبەرئەوەی کەوتوونەتە ناو تاوانەکانی مۆدێرنیتە، کەمێک بە شەرمەوە، وەک ژنان ئاماژە بە راستییەکان دەکەن. واتا شێوازی هاوبەشی ئەو کەسانەیە کە لە کۆیلایەتی و دەسەلاتەوە گلاون، لە شەربەتی سیستەمی زانیارییەکەیان خواردۆتەوە. کەمێکیش شێوازی **"ئەزۆپ"**[2] انەیە!

دووبارەی بکەینەوە ئەو بابەتەی هەوڵی رۆشنکردنەوەی دەدەین وێناکردنە راست و چەوتەکانی ژیانە. نەک تەنیا ئەوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری، تەنانەت ئەو ژیانەی شارستانییە کۆنەکانیش سەپاندوویانە ئایا دەشێت راست وێنا کرابێت؟ لە راهیبەکانی سۆمەرەوە تا دەگاتە پادشا خوداوەندەکانی، لەپادشا خوداوەندەکانی میسر تادەگاتە کیسرای ئێران، لە ئەسکەندەرەوە

---

١ـ نیکۆلای کۆپەرنیکس Kopernik فەلەکناسێکی پۆلەندی و راهیبێکی مەسیحی پشتیوانی بزووتنەوەی مرۆڤدۆستییە. لەساڵی ١٤٧٣ لەدایک بووە. یاسا و پزیشکی لە ئیتالیا خوێندووە، لە دامەزرێنەرانی ئەستێرەناسی نوێیە. لە تەمەنی حەفتا ساڵی گریمانەیی خۆی بڵاوکردەوە کە لەجیاتی زەوی خۆر بە سەنتەری گەردوون دادەنێت و باسی سوڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆی و بە دەوری خۆردا دەکات، ئەم سیستەمەش بە خۆر سەنتەری ناو دەبرێت. ئەمەش پێچەوانەی بانگەشەکانی کەنیسەیە. لەساڵی ١٥٤٣ کۆچی دوایی کردووە.

٢ـ شێوازی خیتابەت و قسە کردنی کۆیلەکانی سەردەمی رۆمایە.

تا ئیمپراتۆرییەتی روما، لە سولتانەکانی ئیسلامەوە تا دەگاتە مۆنارشییەکانی ئەوروپا ئەو سیستەمانەی بە فەرمی ژیانیان بناخە ریژکرد، ئایا بەلانی کەم هێندەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە چەوت دانانی بناخەی ژیان بەرپرسیار نین؟ ئایا لە میانەی ئەوەی ئەم ئەلقە یەک بەدوای یەکانەیان وەک زنجیریک لە ملی پەرەسەندنی کۆمەلگا کردووە، هەنگاو بە هەنگاو بناخەی ژیانی چەوتیان دانەناوە؟ تەنیا بەرپرسیار بینینی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری، سیستەمی شەر و کۆمەلکوژییەکەی بەرامبەر بە شێوازی چەوتی ژیان تێر ناکات. هێندەی ریشەی پرسیاردکە وەلامەکەشی قووڵە. کاتێک شۆرشی مەزنی کلتووری هیلالی بەپیت و ئەو شێوازەی ژیانمان تاوتوێ کرد کە شۆرشی ئاماژە پێکراو ریگای لە پیش کردەوە، هەولماندا بۆ سەرچاوەی تەواوی ئەم کێشانە شۆر بینەوە.

بێگومان تەنیا لە ریگای کلتووردوە ناتوانین بە تەواوی کۆمەلگا روون بکەینەوە. پێویستە چەندین لایەنی دیکەشی بخریتە سەر. بەلام ناتوانریت نکۆلی لەوەش بکریت کە کلتوور بناخەکەی پێکدێنێت. مادام جیگای هاتووە دەشێت ئەوەش روون بکەینەوە کە چ واتایەک بە زاراوەی "کلتوور" دەدەین. لەمەشدا مەبەستمان مێژوو **"درێژ ماوە"** و جوگرافیایە کە لە ژیانی کۆمەلگادا تایبەتمەندییەکی دەست لێبەرنەدراوی هەیە. لەمیانەی ئەم مێژوو و جوگرافیاوە لە سفرەوە، یاخود سەرلەنوێ واتا بە کۆمەلگا نابەخشین. تەنیا خوازیارین ئاماژە بەو راستییە بکەین کە لە بونیادنانی شێوەگرتنی ژیانی کۆمەلگاکاندا رۆلیکی سەرەکییان بینیوە. کۆمەلگاکان لە ئەلقەکانی ئەو ژیانە پێکدێن کە لەمیانەی شوێن و کات (جوگرافیا و مێژوو) دوە تۆمار کراون، هەر ئەلقەیەکیش بە ئەندازەی پەیوەستبوونی بەوەکانی تردوە جیاوازییەکی تایبەت بە خۆشی هەیە.

جیاوازی ژیانی کۆمەلگاکانی چین و سامییەکان کە پشت بە بنەماکانی دە هەزار ساڵ بەر لە ئیستا دەبەستێت، تارادەیەکی مەزن ژیانی رۆژگاری ئەمرۆیان واتادار دەکات. دەتوانرێت هەمان شت

بۆ کلتووری ژیانی ئاریانیش بگووترێت. لەڕێگای "زانستی واتا" دەتوانین بەو دەرئەنجامە بگەین کە: لە چوارچێوەی پلەداری و دەوڵەت، ئینجا چی لە میانەی پەیڕەوەکانی خوداوەندە دەمامکدار و بێدەمامکەکان یان پادشا رووت و داپۆشراوەکان بێت، ئەم کلتوورەی ژیان (بنەڕەتییەکە) بۆ خۆیان فەرمی دەکەن و دووچاری شێواندن و چەقبەستنی دەکەن، بەم جۆرە بۆ هەموو جۆرە خراپەکاری، شەڕ و کۆمەڵکوژییەکی ئاوالا دەکەن. لە بواری ستوونی ژیانی فەرمی - نافەرمی، لە بواری ئاسۆییش ژیانی لە شێوەی ئەڵقەی جیاواز جێگای باسە. دیسان ئەو ژیانە کۆمەڵایەتیەی سەرچاوەی بنەرەتی(دایک)یە، تەواوی شێوەکانی ژیانی ئەم ئەڵقانە دەستنیشان دەکات.

با کەمێکی دیکەش ناوەڕۆکی زاراوەی کلتوور روون کەینەوە. بێگومان کۆمەڵگای کلان یش خاوەن کلتوورێکە، واتا خاوەنی ژیانێکە. کۆمەڵگای کلان کە لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا نیشانەی تایبەتمەندی گەردوونییە، تێیدا واتای ژیان هاوشێوەیە. پێکهاتەی هزر و زمانەکەی بە ئیشارەتکردن بەڕێوەدەبرێت. مەودای لەگەڵ پریماتەکان، واتا لەگەڵ ئاژەڵەکاندا هێندە نەکراوەتەوە. باسکردنی ژیانی کلانێک وەکو ئەوەیە کە باسی ژیانی سەرجەم کلانەکان بکەیت. پێداویستییە ژیانییەکان، ئاسایش و زۆربوون: ئەو سێکوچکەیەیە کە تەواوی زیندەوەرانی بەستۆتەوە. پەیوەندی ئەمەمان بە سنووورداری زهنەوە شرۆڤە کرد. پێشکەوتنی جیاوازی لە ژیاندا بە واتای گەشەکردنی نەرمایی زهن، لە زمانیشدا هەنگاونان بۆ باسکردن لە رێی هێماکانی دەنگەوە و گەیشتنە بەو پێکهاتە ماددیانەی رێگا بەم پێشکەوتنە دەدەن.

لە دۆخێکی وەهادا گەشەکردنی کلتووری گوزارشت لە کۆی ئەو ئۆبژە مادییانە دەکات کە لەگەڵ پەردسەندنی نەرمایی زهن و زمانی هێماکردندا زیادیان کردووە. بە واتا تەسکەکەی کلتوور گوزارشت لە زهنییەت، قاڵبەکانی هزر و زمانی کۆمەڵگا دەکات،

به واتا بەرفراوانەکەشی گوزارشت لەوە دەکات کە کەڵەکەبوونە ماددییەکان (تەواوی ئامرازەکانی پێداویستییەکان پێکدێنێت، کۆی ئامرازەکانی بەرهەمهێنانی خۆراک، شاردنەوە، شێوەکانی گۆڕین، گەیشتن، بەرگری، پەرستن، جوانکاری)یشی لەسەر زیاد بووە. لێکچوون و جیاوازییەکانی زهنییەتی کلتوور و ئامرازەکانی، جیاوازی و نایەکسانیان لە رووی هەژاریی و دەوڵەمەندییەو ئاستی ژیانە لێکچوو و جیاوازەکان دیاری دەکات.

دیسان دووبارەی دەکەینەوە کەڵەکەبوونە ماددی و زهنییەکان بە تایبەتی لە میانەی توانا و بەهرەکانی مرۆڤەوە ئاواکراون، بەم جۆرەش بە شێوەی راستی کۆمەڵایەتی بە گوزارشتی خویان گەیشتوون. لە ڕەوشێکی وەهادا کاتێک بڵێین ژیانی کۆمەڵگای کلانی چاخی بەردینی کۆن کە ملیۆنان ساڵ بەردەوام بووە لێکدەچن و جیاوازییەکی تایبەت لە نێوانیاندا نییە رێگا لە پێش لە دەستدانی واتا ناکاتەوە. بەهاو واتایەکی زۆرمان بە دەرکەوتنی نەوە (پشتینە) ی کلتووری گەورە دا. چونکە هەر پشتینەیەکی مەزنی کلتووری بە واتای نەشونماکردنی ژیانێکی مەزن و جیاوازە. هەر بۆیە دەتوانرێت پەرەسەندنی کۆمەڵگا و گەشەکردنی کلتوور هاوواتا ببینرێت. ئەگەر فۆرمولەی بکەین بەم جۆرەیە: چەندە نەرمایی و ئازادی زهنی هەبێت، بەو ئەندازەیە زمانی هێماکردن و واتادان و دەوڵەمەندێتی هزر پێشدەکەوێت، ئەمەش بە واتای بە دەست هێنانی ئامرازی ماددی کلتووری زیاتر و پێشکەوتنی ژیانی کۆمەڵگا دێت.

گریمانەی سەرەکی ئەم بەشە: وەک راستینەیەکی بونیادنراو کۆمەڵگابوون، لە بنەڕەتدا بە واتای داهێناندنی مرۆڤە. بێگومان چەندایەتی ماددە و گەشەکردنی زیندەوەرزانی پشتگوێ ناخرێت. ئاگادارین کە ئەمانە وەکو راستییەکانی فیزیا، کیمیا و زیندەوەرزانی لێکۆڵینەوەیان لەبارەوەکراوە. هەروەها سایکۆلۆژی و ئانترۆپۆلۆژیش کە لە بواری زهنی و جۆرەوە لێکۆڵینەوە سەبارەت بە مرۆڤ دەکات

لە گۆڕەپانەکانی خۆیاندا واتا دەدۆزنەوە. هەرچەندە رەخنەشمان هەبێت، بەڵام دیسان شتگەلێک لە دوخی پارچەکراوی زانستیش فێردەبین. بەردەوام ئاماژەکردن بەو خالەی کە راستینەی کۆمەڵگا ئاستێکی جیاوازی پەیبردنە، بۆ تێگەیشتنی جیاوازییەکەیەتی لەگەڵ زانستەکانی دیکەدا. تا ئەم جیاوازیە بە باشی دەستنیشان نەکەین، ئەوا هەر دەکەوینە هەمان ئەو هەڵە گەورەیەی کە پۆزێتیڤستەکان تێیکەوتوون، لە نەخۆشی **"زانستگەرایی"**رزگارمان نابێت. ئەنجامی ئەمەش ئەو کۆمەڵکوژیەیە کە مۆدێرنیتە ئەنجامی ددات. جارێکی دیکە جەختی لەسەر دەکەمەوە ئەوەی ئەدۆرنۆی تۆقاندووە کۆمەڵکوژییە کە پشت بە بونیادی چەوتی ژیان دەبەستێت و گەورەترین تاوانە و هیچ هەڵوێستێکی مرۆیی و ئیلاهی ناتوانێت روونی بکاتەوە، هزرەکەشی سووتاندنی گشت پەرتووکەکان بە کارێکی ئاسایی دەبینێت. دەستنیشان کردن و بۆچوونێکی گرنگە کە قوربانیانی پاکتاوی نەژادی جگە لەم شێوازە بە واتایەکی دیکە یادیان ناکرێتەوە. ژیانی مۆدێرنیتە و پۆزێتیڤیزم لە پەسەند نەکردنی ئەم راستییە خۆراگری دەکات. لەو بڕوایەدایە دیسان سەرباری پاکتاوی نەژادی (جینۆساید) دەشێت ژیانی کۆمەلگا بەردەوام بێت: یاخود بوێری ئەوە دەکات کە بەبێ بنبڕکردنی ئەم تاوانە و کۆڵەکە سەرەکییەکانی، دەتوانێت لەگەڵ چەواشەکارییەکانی زهن و بەها مادیيەکانی شارستانییدا کە رێخۆشکەری ئەمە بوون بژی. بەهۆی ئەم بوێریەوەیە کە پێویستە لە هیچ پەرتووک و زهنێکدا جێگای نەبێت، ئەدۆرنۆ دەتۆقێت، خۆی لەباریەکدەنێت و دەمرێت.

ئەوەی من هەوڵی ئەنجامدانی دەدەم: سەرچاوەکانی ئەم **"بوێری"**یە و شێوەکانی تێپەڕاندنی وەکو پرسیارێک تاوتوێ دەکەم، بەهرە و تواناکانی وەڵام دانەوەمان دەخەمە ڕوو و بە واتا و چالاکی (کردار) دەگەیەنم. هیچ کاتێک ئەوە پشتگوێ ناخەین کە ئەو مۆدێرنیتەیەی درێژە بە ڕێڕەوی خۆی دەدات پێبەپێ ڕێگا لە پێش ناوەندەکانی پاکتاوی رەگەزی دەکاتەوە. راستینەی

ئیراق کە ئەمرو لەبەر چاوانە، بە شیوەیەکی ئاشکرا یان پەردە پوشکراو بیت سامناکانە گەوهەری کومەلکوژی تەواوی رژیمەکانی روژهەلاتی ناوین و هاوبەشیتییان لە تاواندا نەک تەنیا بو ئەوانەی لەناویدا دەسووتین، بەلکو پیشانی ئەوانەشی دەدات کە لە دەرەوە چاودیری دەکەن و هەستی پیدەکەن. بەلام لە لایەکی دیکەشەوە لیکەرینیکی واتاداری ژیانی ئازادیش جیگای باسە. یان ژیانی ئازاد، یان کومەلکوژی، هەرگیز دوالیزمیک نییە، بەیەکەوە بژین. هەرگیز لە میانەی ژیانیکی بەم جورەوە نابینە هاوبەشی ئەم تاوانە. چون ئەم میژوو و خاکەی ریگای لە پیش دەولەمەندترین واتای ژیان کردەوە، بەم رەوشە کەیشت؟ لە لایەکەوە شەری ئەو ئەتنیکانەی ریگایان لە پیش یەکەمین واتاکانی ژیان کردەوە، لە لایەکی دیکەشەوە شەرەکانی لەژیر سەرکیشی دواترین گەورە خوداوەندی مودیرنیتە بەریوە دەبریت؟ کەواتە باسکردنی بابەتەکە وەلام دانەوە و پیشخستنی چالاکییەکەی دەکاتە ناچاری(ژیانی).

با توزیکیش بە زمانی ئەدەبی باسی تامی ژیانی هیلالی بەپیت بکەم. گوتنەکانم بە تیبینییەکی **"برادوای"** دەست پیدەکەم کە هەلکولینەکانی ناوچەی (چایئونو)ی دیاربەکری دەست پیکرد. گوتوویەتی: **"لە هیچ شوینیکی دونیا ژیان هیندەی بناری کەوانەکانی زنجیرە چیاکانی زاگروس - توروس واتادار نابیت"**. ئەو مروڤە کە لەناو کلتووریکی زور دوور لیرە پیگەیشتووە ئەم گوتەیەی چی بە مروڤ دەلیت؟ وەکو شوینەوارناس و میژووناسیک باش ئاگاداری شارستانییە. بوچی واتادارترین ژیانی لەم گورەپانە کلتوورییەدا بینی؟ لە کاتیکدا کە ئەوانەی ئەمرو لەم ناوچەیەدا دەژین تەنانەت چل تەقلە بو کەمترین کریی ئەورووپا لیدەدەن، هەر وەکو بلیی لە دەرد و بەلا رادەکەن ئەم خاکانە بەجیدیلن. هەر وەک بلیی هیچ پیروزی و بەهای جوانییان نەمابیت و جاریکی دیکە بەدەست ناکەویت وەکو قەدەریک پیشوازی لە کوچ دەکەن؟

دەبیت دانی پیدا بنیم کە منیش لە قوناخیکدا تووشی نەخوشی

مودیرنیته هاتم، به دایک و باوکیشمەوە، دەمویست لە هەموو شتێک رابکەم. بەردەوام لەبەرامبەر خۆمدا دانی پێدا دەنێم کە ئەمە لە ژیاندا گەورەترین بە هەڵەداچوونی من بووە. بەلام باش دەزانم کە لە تێبینییەکەی برادوای دانەبرام: وەک رۆڵەیەکی ئەم بنارانە، لووتکەی شاخەکانم وەک تەختی خوداوەندەکان بینی، بنارەکانیشم وەکو پارچەکانی بەهەشت بینی کە (خوداوەندەکان) خولقاندوویانە: بەردەوام خوازیاری سورانەوە و گەرانیم دەکرد. کاتێک هێشتا مندال بووم ناوم وەکو **"شەیدای چیا"** دەرکردبوو. دواتر زانیم کە ئەم ژیانە زیاتر تایبەت بە خوداوەند دیونیسۆس[1] بووە. کاتێک دەگەرێت گروپێکی کچانی ئازاد و هونەرمەند بەناوی **"بەخا"**[2] لەگەڵیدان. بە یەکەوە دەیان خوارد، دەیان خواردەوە و کاتیان بەسەر دەبرد. ئەم ژیانە ئیلاهییەم خۆشویستبوو. نیچەی فەیلەسوفیش لە جیاتی زیۆس[3] ئەم خوداوەندەی هەلبژاردبوو. تەنانەت ناونیشانی **"شاگردەکەی دیۆنیسیس"**ی لەژێر چەندین کورتە گوتارەکانی خۆیدا نووسیوە. کاتێک لە گوند بووم، هەرچەندە بە گوێرەی پێویستییەکانی ئایینیش نەبێت، لە گەمەکانی چاوشارکێ و خوازبینی کچان زیاتر، حەزم دەکرد بە یەکەوە لەگەڵ کچان یاری بکەم. بە گوێرەی من سروشتییەکەشی دەبێت بەم جۆرە بێت. هەرگیز بە سنگ فراوانییەوە تەماشای داپۆشینی ژنانم نەکرد کە لە لایەن کلتووری دەسەلاتدارەوە دەکرێت. ئەو یاسایەم نەناسی کە نامووسی پێدەڵێن. تا ئێستاش بۆ گفتوگۆی ئازادانەی بێ سنوور، یاری کردن و هاوبەشیتی کردنی تەواوی پیرۆزییەکانی ژیان لەگەڵ ژن دەلێم **"بەڵێ"**هەم، بەلام بۆ ئەو پەیوەندییانەی لەسەر بنەمای

---

١. لە دوا قۆناخەکانی ژیانی بوو بە یەکێک لە دوازدە خوداوەندەکەی ئۆلۆمپیۆس، چونکە لەسەرەتا یەکێک لە خوداوەندەکانی تراکیا (فیریگیا) بوو. لە وڵاتی خۆی خوداوەندی شەرابی جۆ بوو، کاتێک هاتە وڵاتی یۆنان بوو بە خوداوەندی شەراب. یەکێک لە سێ خوداوەندە گەورەکەی هێزی یۆنانە. کوری زیۆس و سیمێلایە. پشتگیری مەدەنیەت و ئاشقی ئاشتییە. پێچەوانەی پەنتاتۆنی هێلین هەڵوەستەی کردووە. لە تەواوی ئەفسانەکانیدا رەوتی بەرخۆدان و کاردانەوە جێگای باسن. لە نێوان هەردوو جەمسەری خۆشی و ئازاردا بەردەوام هاتووە و چووە. خۆشەویستترین خوداوەند بووە لای گەل.

٢. Bacchaes یان Bakha

٣. خوداوەندی ئاسمان و برووسک، گەورەترین خوداوەندی ئۆلیمپۆس بووە.

هێزە و بۆنی موڵکایەتی لێدێت، چی ناوێکی لێبنرێت و لەژێر هەر بیانوویەکیش بێت، بەم پەیوەندییە دەڵێم **نەخێـر**.

لەم شاخانە بەردەوام بە ئیلهامی خوداوەندە ژن سڵاوم ئاراستەی گرووپی ژنە ئازادەکان دەکرد، هەوڵمدا بەم جۆرە واتاداریان بکەم. بەردەوام کاتێک رستەی **"لۆری یان تراکتۆرێکی پڕ لە ژنانی باشووری رۆژئاوا (باکووری کوردستان) کە بە ئامانجی کارکەری وەرزی دەچوونە ئەنادۆڵ لە فڵان شوێن لە ئاکامی رووداوی هاتووچۆ مردن"** لە هەواڵەکاندا بەر گوێم دەکەوێت ئەو رق و نەفرەتەی لام، دژی بەناو خانەوادەکانی ژنان (پیاو، خێزان، پلەداری، دەوڵەت) دروست دەبێت، دەتوانم بڵێم سەبارەت بە هیچ رووداوێکی دیکە لام دروست نەبووە. چۆن دەبێت رەچەڵەکی خوداوەندە ژن تا ئەم رادەیە دووچاری رووخان هاتبێت؟ هەرگیز ئەقڵ و رۆحم ئەم رووخانەی پەسەند نەکردووە، لەبەرئەوەی هەرگیز دەرخواردی زهنیشمم نەدا. بە گوێرەی من ژن یان لە پیرۆزی خوداوەندیدا دەبێت یاخود هیچ نابێت. بەردەوام بیرم لە ڕاستی و ناڕاستی ئەم گووتەیە کردۆتەوە " **ئاستی ژیانی ژنانی کۆمەڵگایەک، پێوەدانگی سەرەکی ناسینی ئەو کۆمەڵگایەیە**". گووتەی **"پاشماوەی کلتووری خوداوەندە دایکی نیولیتیک"**م بۆ دایکم بەکارهێنابوو. وەکو ئەوان قەڵەو بوو. بونیادی ساختەی مۆدێرنیتە سەبارەت بە دایک، نەیدەهێشت پیرۆزییەکەی دایکم ببینم. سەرباری ئەوەی ئازاری زۆر گەورەم لە ژیانمدا چەشتووە، بەڵام لە هیچ رووداوێکدا بە جددی نەگریاوم. بەڵام دوای ئەوەی قاڵبەکانی مۆدێرنیتەم رووخاند، کاتێک دایکم، یان لە کەسایەتی ئەودا تەواوی دایکانی رۆژهەڵاتی ناوینم بە بیر دێتەوە دڵپەست دەبم و چاوەکانم پڕ لە فرمێسک دەبێت. بژاردەترین و خەمناکترین یادەوەرییەکانم: واتای ئەو ئاوەیە کە دایکم بە زەحمەتییەکی زۆرەوە بە سەتڵ لەسەر بیر دەیهێنایەوە، لە نیوەی رێگادا بۆ منی دادەنا سەر زەوی و قومم لێدەدا و دەمخواردەوە. پێشنیازی من بۆ هەر کەسێک

ئەوەیە دوای نەهێشتنی قاڵبەکانی مۆدێرنیتە، سەرلەنوێ تەماشای پەیوەندییەکانیان لەگەڵ دایک و باوکیان بکەنەوە. خوازیارم بە هەمان روانگە تەماشای تەواوی **"پەیوەندییەکانی گوند"**یش بکەن، کە لە نیولیتیکەوە ماونەتەوە. **گەورەترین سەرکەوتنی مۆدێرنیتە لەوەدایە: تێڕوانینی کلتووریمانی رووخاندووە کە لە میانەی پانزدە هەزار ساڵ ئاوا کراوە و کردوویەتی بە هیچ. ئاشکرایە کە تێڕوانینێکی ئازاد و رەسەنانە، خولیای بەرخودان و ژیان لەو تاک و جڤاتانە چاوەڕوان ناکرێت کە تا ئەو رادەیە رووخێنراون و کراون بە هیچ.**

هەر رووەک و ئاژەڵ (گیانلەبەر)ێکی بناری چیاکانی هیلالی زێڕین بۆ من ئۆبژەیەکی خولیایی بوون. وەها سەیرم دەکردن هەر وەکو بڵێی واتایەکی پیرۆزیان هەیە. هاوڕێ بووین، ئەوان بۆ من، منیش بۆ ئەوان خولقابووم. بە ئەشقەوە بە دوایانەوە رامدەکرد. ئەشقی من تۆزێک بەم جۆرە بوو. ئەو رەفتارەی تا ئێستا لە بارەیەوە لەخۆم خۆش نابم، بێڕەحمانە لێکردنەوەی سەری ئەو چۆلەکانە بوو کە دەمگرتن. هیچ باسێک هێندەی ئەم رووداوە مەترسییە قووڵەکەی ژێر چەمکی ئۆبژە ـ سۆبژەیان پیشان نەدام. بژاری ژینگەپارێزیم لە نزیکەوە پەیوەندی بەو خولیایەی منداڵی و داننان بەم تاوانەوە هەیە. تەنیا لە میانەی داماڵینی دەمامکی راوچییەکانی وەک **"چەوسێنەری بەهێز، پیاوی دەسەڵاتدار"** دەوە کە هونەرەکەیان دەسەڵات و شەڕە، دەتوانم ئەم مەترسییە رۆحییە گەورەیە تێپەڕ بکەم کە پاشماوەی کلتووری نێچیرڤانییە. تا لە زمانی رووەک و زیندەوەران تێنەگەین، نە دەتوانین لە خۆمان بگەین، نە دەتوانین ببین بە کۆمەڵگایەکی ژینگە (سرووشت)پارێز. دەبوو بەم جۆرە واتا بە یادەوەری ئەو رووەک و زیندەوەرانەم بدەم کە دەستبەردارم نەبوون.

کاتێک ئامادەکاری بەرهەم، کۆکردنەوەی خەرمان و دانە بە دانەی دانەوێڵەکانم لە دەشتاییەکانی بناری شاخەکاندا، هەر لە سەرەتای

وەرزی بەهارەوە تا کۆتاییەکەی سەبارەت بە جووتیاری باوکم بیر دەکەویتەوە، بە زەحمەتییەوە سۆزە پڕ لیشاوەکانم کۆنترۆل دەکەم، سۆزێکن هیچ رۆمانێک پێی نەبەخشیوم. ئاخێکی زۆر هەڵدەکێشم، بۆچی ئەو ریبوارە خوداوەندیانەم بە تەواوی نەناسی و نەبووین بە هاوڕێ؟ گەرچی تەواوی پەیوەندییەکانم لە چوارچێوەی هەڤاڵیتیدا بوو، بەڵام بەهۆی پەیوەندییە ترسناکەکانی مۆدێرنیتەوە، تاکو ئێستاش لە خۆم نابوورم کە پرسەیەکی گەورەمان بۆ مەرگی دانەنا. لەوانەیە لەناو باوکەکاندا هی هەرە لاواز بووبێت، بەڵام یەکێک لە بەندە سادە و پاکەکانی خودا بوو. بەڵام بە گوێرەی من باوکە جووتیارەکان باوکی هەرە بەهادارن.

بە گوێرەی من تەواوی پەیوەندییەکانی گوند کاتی خۆی تەواو کردبوو، وەکو هەوڵی قۆناخێک وا بوو کە بەرەو کۆتایی دەچێت. هەر وەکو بڵێی لە گوند رام کرد، پەنام بۆ شار برد، ئەمەش وەکو تاوانێک دەبینم. هیچ گومانێکم لەوەدا نییە کە ژیانی نموونەیی مرۆڤ لە پێکهاتەی شێرپەنجەیی شارەکان بەدینایەت، بەڵکو لە گوندە ئیکۆلۆژییەکاندا فەراهەم دەبێت. تەنیا کاتێک شار لەگەڵ گوندە ئیکۆلۆژییەکان گونجاو بێت مۆڵەت بە ژیانێکی بەم جۆرە دەدات.

ئەو گەلانەی لەژێر زنجیرە چیاکانی زاگرۆس ـ تۆرۆسدا دەژیان و ئێستاش لێی دەژین، وەکو رێبوارە پیرۆزەکانی ئەو خوداوەندە ژن و پیاوانە هەڵدەسەنگێنم کە لە لووتکەی شاخەکان لەسەر تەختەکانیان دانیشتوون. ئیتر مسۆگەر بڕوام وایە؛ پێچەوانەی ئەو تاوانە راستە کە مۆدێرنیتە دەیخاتە پاڵیان و دەڵێت **"دواکەوتوو"**یە. پێشکەوتووخواز- دواکەوتوو حوکمێکی ئایدۆلۆژییە، زهنییەتی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری تەنیا دواکەوتوو نییە، بەڵکو دوژمنی مرۆڤایەتیشە، کاتێک ئەم زهنیەتە بە چاکی شیکار بکرێت، واتای شۆڕبوونەوەیە بۆ ریشەی راستەقینەی مرۆڤایەتی، لەم رێگایەشەوە گەڕانەوەیەکی مەزن بۆ ئازادی بەدیدێت. لەگەڵ رزگاربوون لە

دۆزدخی مۆدێرنیتە کە بریتییە لە لۆژیکی قازانج، پیشەسازی و نەتەوە ـ دەوڵەت، باشتر دەرک بە هەموو شتێک دەکرێت و ڕێگا لە پێش دەوڵەمەندێتی واتای ژیان دەکاتەوە. ئەو پەیوەندی و خولیایەی بۆ تەپۆلکەیەکی پاشماوەی نیولیتیک پێشانی دەدەم بە نێوێۆرکی ناگۆڕمەوە. شار کە هیچ واتایەک لە ناواخنیدا هەڵناگرێت، تەواوی دەرگاکانی بۆ **"ژیانی قازانج"** و پەلکێش کردنی مرۆڤ بۆ ناو **"قەفەسی ئاسنین"** و **" جانەواری ئیندوستریالیزم"** بکوژی ژیان کردۆتەوە: جگە لە کۆپییەیەکی بێ واتاتری **"بابلی خاوەن ٧٢ زمان"** کە هیچ کەس لە یەکتری تێناگات، هیچ واتایەکی نییە. رزگاری مرۆڤایەتی بە رووخاندنی پێکهاتەی شێرپەنجەی شاردا تێپەڕ دەبێت، هیچ گومانێکم لەمەدا نییە.

ئەم کورتە چیرۆکەم بە ئامانجی ئاماژەکردن بەو کلتوورەی ژیان گێڕایەوە کە لێیەوە هاتووین. تاوەکو بە شێوەیەکی باش لەم شێوازەی ژیان تێنەگەین کە بەرهەمێکی راستینەی کۆمەڵگای بونیادنراوە، لە بینینی رۆڵی **"کێڵەکانی مۆدێرنیتە"** رزگارمان نابێت. تا لە ژیانی مۆدێرنیتەی شێرپەنجەیی رزگارمان نەبێت کە بە شوانەکانی شاخیشەوە هەموو کەسێکی دیل کردووە و لە ناوەڕۆکدا بە واتای کۆتاییهاتنی ژیان دێت و لە زاری بەهرەدارترین فەیلەسوفەوە ئاماژەمان پێکرد و لە هەمووان زیاتر منیش هیچ گومانێکم لەم راستییەی نییە؛ ناتوانین بەزهنییەت و ئیرادە (هزر ـ رێکخستن ـ چالاکی)ی خۆمان، ژیانی ئازاد و سەرچاوەکانی بەدەست بێنین و لەناو تەواوی دەوڵەمەندییەکەیدا بژین. زوو یان درەنگ تێدەگەین کە **"ناتوانین بە راستی ئەو ژیانە بژین کە بە چەوتی تێۆریزە کراوە"**.

با بە زمانی زانستیش تۆزێک باسی چیرۆکەکەمان بکەین. ئەو راستینە کۆمەڵایەتیانەی لە هیلالی بە پیت ئاواکراوە، بە هێڵە گشتییەکانییەوە لە ڕێڕەوی ژیانی ئەمڕۆشماندا درێژە بە هەبوونی خۆیان دەدەن. چ فاکتەرە زهنییەکان، چ فاکتەرەکانی کلتووری

ماددی سەرەڕای هەندێک گۆڕانکاری چەندایەتی و چۆنایەتی لە ناوەڕۆکدا لێکدەچن. زمان لە پێکهاتی بناخەدا هاوبەشە. شێوەکانی هزراندن بە پۆلێنکراوی لە گۆرەپانەکانی زانستی، ئاییني و هونەری بەردەوام دەبێت. شەڕەکانی بەرگری و پەلاماردان هەر وەکو رابردوو لە رۆژگاری ئەمڕۆشماندا هەیە. خێزان وەک دەزگایەکی بنەڕەتی درێژە بە راستینەی خۆی دەدات.

ئەو جیاوازیانەی لە ئارادایە پاڵپشت بە گەورەبوونی دەزگای دەوڵەت پێشکەوتووە. دەوڵەت کە بەردەوام لەسەر حیسابی کۆمەڵگا گۆرەپانی خۆی فراوان دەکات، لەسەر بنەمای پێویستییەکان زهنیەتی کۆمەڵگا و کەڵەکەبوونی کلتووری ماددی دەخاتە ژێر مولکایەتی خۆی و دووچاری گۆڕانکاری چەندایەتی و چۆنایەتی کردووە، بە پێچەوانەی مەزندەکان پەرەسەندنی کۆمەڵگا لە دەرەوەی داخوازییەکانی دەوڵەت بەردەوام بووە. هەوڵ دەدەین لە دەوڵەتی راهیبی سۆمەرەوە تا دەگاتە دەوڵەت ـ نەتەوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری، ئەنجامە کۆمەڵایەتییەکانی پێکهاتەکانی دەوڵەت و رۆڵی سەرەکی کلتووری شار روون بکەینەوە کە بە شارستانی ناوزەد دەکرێت و ئەم پێکهاتانە رێگیان لە پێش کردۆتەوە. بەم جۆرە دەبینین چینایەتی دەوڵەتی پێش نەخستووە، بەڵکو دەوڵەت جیابوونەوەی چینایەتی پێشخستووە و بڵاوی کردۆتەوە.

لەو بڕوایەدام کە بە گوێرەی پێویست رۆڵی زاراوەی "**ماوە**"ی فرناند براودلی دەرهەق بە پەرەسەندنی کۆمەڵگا دەرکی پێنەکراوە. بە تایبەتیش دەستەواژەکانی لە جۆری ماوە ـ کلتوور، ماوە ـ شارستانی و شێوەکانی کۆمەڵگا ـ ماوە پێویستییان بە روونکردنەوە هەیە. کۆمەکێکی مەزنە پێشکەشی مێژوو کراوە. بەڵام بە شێوەیەکی کارامە لەسەر مێژووناسی پەیڕەو ناکرێت. لەم شیکردنەوەیەدا بە بوێرییەوە ئەم زاراوە روون دەکەمەوە و هەوڵی بەکارهێنانی دەدەم.

ا- زاراوەی "**درێژترین ماوە**" بۆ کۆمەڵگای هیلالی بە پیت کە

دوای قۆناخی سەهۆلبەندانی چوارەم رووباری سەرەکی شۆڕشی نیولیتیکی پێکهێنا، تا ئەو کاتەی بە هوی هاتنە کایەی قۆناخێکی تری سەهۆڵبەندان، یان کارەساتیکی ئەتومی، یان نەخۆشییەک کە ریگری لێنەکرێت، یاخود هەر هۆکاریکی ترەوە لەمانە نەتوانێت درێژە بە هەبوونی فیزیۆلۆژیانەی خۆی بدات؛ هەبوونی خۆی هەر دەپارێزێت. ئەو کلتوورانەی ریشەکەیان بۆ چین و سامییەکان دەگەرێتەوە هەر یەکەو وەک لقیک جیگای خۆیان لەناو ئەم کۆمەلگا **"درێژ ماوە"**یەدا دەگرن. لقە کلتوورییە بچووکەکانی دیکە بۆ رووباری دایک هەر یەکە و کانییەکن. پێویستە باش دەرک بە پێکهاتەی ناوەوەی ئەم تێزە بکرێت. ئەو کۆمەڵگایەی بونیادنراوە زهن و فاکتەرە کلتوورییە ماددییەکانی هێندە بەهێزن، هیچ هۆکارێکی ناوخۆیی کۆمەلایەتی لەو ماوەیەدا ناتوانێت بیڕووخێنێت. دەتوانین دەستەواژەی **"کۆمەلگای کلتووری بنەڕەتی"** لە جیاتی ئەم ماوەیە بەکاربێنین. هەرچەندە دووبارە بێت، بەلام هۆکاری بەردەوام باسکردنی قالب، ناوەڕۆک و تواناکانی؛ بۆ گەیشتنە بە پێناسەی **"کۆمەلگای کلتووری بنەڕەتی"** کە هاوواتای زاراوەی **"درێژترین ماوە"**یە. چونکە زاراوەکانی کۆمەڵگا و ماوە، بەم ناوەڕۆکە نوێیانەیانەوە کۆمەک بە کۆمەڵناسی دەکەن. کۆمەڵناسە لیبراڵەکان هەر لە ئێستاوە خوازیارن لە میانەی زاراوەی **"کۆتایی مێژوو"** و لە ڕێگای میتافیزیکێکی ساختەوە تێگەیشتنەکانی خۆیان سەبارەت بە کۆمەڵگا بکەن بە ئەبەدی و تا هەتایە درێژەی پێبدەن. مارکسیست و هەڵوێستە **"مەحشەر"**یەکانی دیکە دابڕاو لە رەهەندی کات ـ شوێن بەڵێنی **"چاخی بەختیاری سەرمەد"**ی دەدەن. هەرچی رەشبینەکانن بە خەیاڵی چەمکی **"چاخی زێڕین"** تامی بێواتایی **"چاخی تەنەکە"**ی رۆژگاری ئەمڕۆمان دەکەن.

بە گوێرەی ئەو تیۆرییە کۆمەلایەتییانەی جێگای باسن زاراوەی درێژترین ماوە زانستیترە. بە ئەندازەی هەلومەرجی بەرجەستە، بەڵگەی قابیل بە تێگەیشتن لە بارەی سەرەتا و کۆتایی سیستەمی

کۆمەڵایەتییەوە پێشکەش دەکات. نە مێژوو لەناو خستنە سەر یەک(کەڵەکە کردن)ی رووداوەکاندا دەخنکێنێت، نە دەکەوێتە ناو سادەیی کاتی شێوە تەسکەکانی کۆمەڵگاوە. نە ڕووداوە ساتە وەختەکان، نە شێوەکانی کۆمەڵگاش بەهرە و توانای شرۆڤەیەکی بەرفراوانی واتا (ناوەڕۆک)ی ژیانیان هەیە. دەتوانن لە هەندێک باسی ڕێژەییدا سەرکەوتووبن.

لە چوارچێوەی درێژترین ماوە و کۆمەڵگای کلتووری بنەڕەتیدا جێگای هەموو جۆرە ئایین، دەوڵەت، هونەر، حقوق، ئابووری، رامیاری و دەزگا سەرەکییەکانی دیکە دەبێتەوە. لە رووی چەندایەتی و چۆنایەتییەوە بەردەوام لەناو گۆڕاندان. هەندێکیان زۆر بچووک دەبنەوە، بەرامبەرەکەیان گەورە دەبێت. لە کاتێکدا کەمێکیان لەناودەچن، یان لەناو ئەوانەی دیکە یاخود هی نوێتردا درێژە بە ڕۆڵیان دەدەن. لە میانەی چەمکێکی گشتگیرەوە دەتوانین بڵێین پەیوەندییەکی دیالیکتیکی خولقێنەرانە لە نێوان تەواوی زاراوە و دەزگاکاندا هەیە. تاقانەیی کۆمەڵگای کلتووری دایک، لە هاوبەشی بەهێز و پێکهاتەی ناوخۆیی نوێ بێبەشی ناکات.

لێرەوە دەتوانین لە ململانێی نێوان لایەنگرانی"**خولقاندن**" و لایەنگرانی "**پەرەسەندن**" تێبگەین. خولقگەراکان ئاگاداری زاراوەی "**درێژترین ماوە**"ن. هێزە سەرەکییەکەیان لێرەوە وەردەگرن. دەتوانرێت لە ڕێگای چەمکی کلتوورییەوە ئایەتەکانی دەرهەق بە ماوەی خولقاندنی گەردوون لە لایەن خوداوەند و کۆتایی گەردوون روون بکرێتەوە. ئەگەر لە میانەی کۆمەڵناسییەوە راڤەی بکەین، خاوەنەکانی تێڕوانینی خوڵقێنەر ئاگاداری تایبەتمەندی پیرۆزی، شکۆداری و سەرسامکاری کۆمەڵگای بونیادنراون. هەڵبەتە هەرسێ پەرتووکی پیرۆز (تەورات، ئینجیل، قورئان)یش شرۆڤەیەکن هەوڵی روونکردنەوەی ژیانی پیرۆز و ئەفسوناوی هیلالی بە پیت دەدەن. مەنسووبییەتی زۆرینەی گەورەی مرۆڤایەتی بۆ ئەم سێ ئایینە، بۆ ناوەڕۆکی ئەو شرۆڤانە دەگەڕێتەوە کە کردوویانە. بانگەشەی تا

ئەبەد بەردەوامبوونی ئەو ژیانە کلتوورییە نوێیەی کە بە شێوەیەکی پەرجووانەـ سەیر نییە کە بە لای مرۆڤی ئەو قۆناخەوە بە پەرجوویی زانرابێت ـ خولقێنراوە، کردنی بە باوەڕییەکی بنەڕەتی، هێزی کاریگەری ئەم کلتوورە پیشاندەدات. با بیری لێبکەینەوە: گرووپی ئەو مرۆڤانەی کە بە ملیۆنان ساڵ لە ڕەوشی کلان و جۆرێک لە پریماتەکان ڕزگاریان نەبووە، لە ڕێگای شۆڕشەکەی هیلالی بە پیتەوە ڕووبەڕووی بونیادنانی کۆمەڵگایەکی نائاسایی دەبنەوە کە تەنیا دەتوانێت لە میانەی وشەی پەرجوو ڕوون بکرێتەوە. ئایا دەتوانن بە شێوەی پیرۆز، شکۆدار، ئیلاهی و جەژن پێشوازی نەکەن؟

با یەکسەر ئەوە بە بیر خۆمان بێنینەوە کە کۆمەڵناسەکانی وەکو دۆرکهایم و زانایانی بوارەکانی دیکە، کۆمەڵگا بە گرووپی ئەو مرۆڤانە دادەنێن کە لە مۆڵبوونی ڕووداو و دەزگاکان پێکهاتوون، لەمە زیاتر مەودایان نەبڕیوە. باسەکانی لە جۆری جیابوونەوەی چینایەتی، دەوڵەت، ئابووری، حقوق، ڕامیاری، فەلسەفە و ئایین لۆژیکی دەزگا و ڕووداو تێپەڕ ناکات. بەڵام بە هیچ جۆرێک ناخوازن تێبگەن بۆچی ئەم هەڵوێستانە هێندەی کتێبی پیرۆز لای خەڵک بەهادار نەبوون و جێگای خۆیان نەگرتووە. گرنگترین لاوازی باسەکان (نووسراوەکان)یان، لە تێنەگەیشتنی گرنگی کۆمەڵگای درێژترین ماوەدا شاراوەیە. دیسان بە بایەخەوە ئاماژەی پێ بکەم: مرۆڤایەتی خاوەن یادەوەری قووڵی چیرۆکەکانی خۆیەتی، بە ئاسانیش دەستبەرداری نابێت. بە پێچەوانەی تەواوی مەزەندەکانەوە، پەیوەستبوونی مرۆڤایەتی بە پەرتووکە پیرۆزەکانی ئایینەوە بەهۆی خودایەکی نابەرجەستە (ئەبستراکت) و هەندێک ڕێوڕەسمی ئایینی نییە، بەڵام لەبەرئەوەی هەست بە شوێن پەنجە و واتای چیرۆکی ژیانی خۆیان دەکەن، ڕێزێکی گەورەی لە بەرامبەردا پیشان دەدەن. لەبەرئەوەی بە جۆرێک لە جۆرەکان ڕۆڵی یادەوەری زیندووی کۆمەڵگا دەبینن دەستبەرداریان

لێناکرێت. راستی و نا ڕاستی ئەو ڕووداو و زاراوانەی لە نێوان هەردوو توێیاندا هاتووە وردەکارییەکن دەکەونە پلەی دووەمەوە. فرناند براودل کاتێک دەڵێت" **پێویستە مێژوو بکرێت بە کۆمەڵناسی، کۆمەڵناسی بکرێت بە مێژوو**" سەرنج رادەکێشێتە سەر هەڵەیەکی سەردکی زانست و پەیڕەو. تا بە شێوەیەکی واتادار پەیوەندی نێوان ماوە ـ کۆمەڵگای مێژوویی دەستنیشان نەکرێت، باسە جیاجیاکانی مێژوو و کۆمەڵناسی، لە ونکردنی واتا و بریندارکردنی راستینەی کۆمەڵگا رزگایان نابێت. چەندەی دەخوازی بەڵگە و ڕووداوەکان لەسەر یەک کۆبکەرەوە، لێکۆڵینەوە سەبارەت بە ڕێسا و دەزگاکانی کۆمەڵگا بکە، دەستنیشانیان بکەو بە بەڵگەوە رایان بگەیەنە، بەڵام تا وەڵامی پرسیارەکانی "**لەکوێ؟ کەی؟ بەکامە ناوەڕۆک؟ ئەوانەی دەژین چی دەڵێن؟**" نەدرێتەوە، کۆمەکی مێژوو و کۆمەڵناسی بۆ زانستی واتا لە کەرەستەیەکی قەبا بەولاوە تێپەڕ ناکات.

سەرباری ئەوەی لایەنگرانی پەرەسەندن بە شێوەیەکی باشتر بوویەر و دیاردەکانیان دەستنیشان کردووە، بەڵام لەبەرئەوەی لە واتای زاراوەی ماوەی کۆمەڵگا بێبەشن لە ڕەخنەکردن رزگاریان نابێت. یادگای کۆمەڵگا لە پەرەسەندنی ڕووداو و دیاردەکان گرنگترە. زانستی واتا بۆ مرۆڤ لەپێشترە لە تۆماری دیاردەکان. چونکە لەوێ تەوژمی ڕووبار ئاسای ژیان جێگای باسە. دەستبەردار نەبوونیان لە خوداوەند بۆ هێزی یادگای کۆمەڵگا دەگەڕێتەوە. هەر وەکو دواتر دەتوانین بە شێوەیەکی بەرفراوانتر شرۆڤەی بکەین، کۆمەڵگا زاراوەی خوداوەند بە هاوشێوەی یادگای رابردووی خۆی دەزانێت. دیاردەگەرایی نەخۆشییەکی مۆدێرنیتەیە، چەندە دژی یادگای کۆمەڵگا، واتا دژی میتافیزیکی کۆمەڵگا بوەستێت لە ڕەخنەکردن رزگاری نابێت. هەر وەکو چۆن مرۆڤی بێ یادگا لە ژیاندا ڕووبەڕووی ناسۆری مەزن دەبێتەوە و وەکو منداڵی لێدێت، ئەو کۆمەڵگایانەی یادگای خۆیان لە دەستداوە، خۆیان لە بیر دەچێتەوە، ڕووبەڕووی مەترسی ونبوون دەبنەوە. ئەو کۆمەڵگایانەی یادگای

خۆیان لە دەستداوە بە ئاسانی لە چەوسانەوە، داگیرکردن و تواندنەوە رزگاریان نابێت.

دیاردەگەرا پۆزێتیڤیستەکان سەرباری ئەوەی بانگەشەی ناسینی زانستیانەی کۆمەڵگا دەکەن، قوتابخانەیەکی هزرییە کە هەرە کەم لێشاوی راستەقینەی کۆمەڵگا دەناسێت. کۆمەڵگا وەکو گردبوونەوەیەکی بێ مێژوو و ماتریالیستی قەبە(ردها) شرۆڤە دەکەن، بەم جۆرە لە میانەی پێناسەیەکی نا تەواو و شێوێندراوەوە ریگا لەبەردەم مەترسیدارترین ئۆپەراسیۆنی کۆمەڵگا ئاوالا دەکەن. زاراوەی ئەندازیاری کۆمەڵگا گرێدراوی پۆزێتیڤیزمە. لەو بڕوایەدان لە رێگای دەستێوەردانی دەرەوە دەتوانن شێوەی خوازراو بە کۆمەڵگا بدەن. ئەم هەڵوێستانە کە چەمکی فەرمی مۆدێرنیتەن، بیانووی رەوایی پێدانی ئەو شەرانەی قۆستنەوە و دەسەلاتە کە لە ناوەوە و دەرەوەی کۆمەڵگا بەڕێوەدەبرێت.

ب ـ لە پەرەسەندنی کۆمەڵگادا دەتوانین زاراوەی ماوەی بونیادی لەگەڵ وەرچەرخانی دەزگا سەرەکییەکان بگونجێنین. پێناسەکردنی ماوەی بونیادنان و رووخانی پێکهاتە سەرەکییەکان دەشێت کۆمەک بە واتادارکردنی راستینەی کۆمەڵگا بکات. کاتێک پەیڕەوکردنی فشار و قۆستنەوە لەسەر مرۆڤ بکرێتە جێگای باس، دەشێت جیاوازی کۆمەڵگاکانی کۆیلەداری، دەرەبەگایەتی، سەرمایەداری و سۆسیالیستی ببێتە بابەتی شرۆڤەی واتادار. بەستنەوەی ماوەی بونیادی بە شێوەکانی ئەم کۆمەڵگایانەوە رێگای لە پێش ئەژێندایەکی گرنگ کردۆتەوە. بەڵام لەبەرئەوەی بە شێوەیەکی واتادار پەیوەندی لەگەڵ زاراوەی ماوەی هەرە درێژخایەن و کورتخایەن دانەنراوە، هێندە بەرهەمدار نابێت، دەکەوێتە ناو کێشە دووبارەکانی واتاوە.

دەشێت کۆمەڵگای نیولیتیک هەم لەگەڵ ماوەی بونیادی، هەم لەگەڵ ماوەی کلتووری بنەڕەتی لەناویەکدا شرۆڤە بکرێت. هەر وەکو چۆن دەشێت بونیادی دەزگا تایبەتەکان لە میانەی **"ماوەی بونیادی"** روون بکرێتەوە کە کەڵەکەبوونی ژیانی ماددی و زهنییەتە،

بەهۆی بەردەوامکردنی ئەو کاریگەرییە کلتووریانەی تا لەناوچوونی جەستەیی یان رووخان شیمانەی درێژەکێشانیان هەیە، دەشێت لە میانەی زاراوەی "**درێژخایەنترین ماوە**"ش روون بکرێتەوە. بە شێوەیەکی بنەڕەتی زانست، هونەر، زمان، خێزان، ئەتنیک ـ قەوم بابەتی ماوەکانی کۆمەڵگای کلتووری بنەڕەتی پێکدێنن، هەرچەندە تا کۆتایی ماوەکە بە هەندێک گۆڕانکاریدا تێپەڕبێت، شیمانەی بەهێز ئەوەیە کە ئەوانەی لەسەرپێیان دەمێننەوە شێوەکانی زهنییەت و گروپە بەرفراوانەکانی مرۆڤن. هەروەها ئیکولۆژی کە گرێدراو بە دەرئەنجامی تەواوی لقەکانی زانستەوە، دەکرێت لەم قۆناخەدا وەکو زانستی بە دەزگابوونی ئابووری لە سەرووی هەمووانەوە جێگیر بکرێت. سیاسەتی دیموکراتیش هەم وەکو زانست، هەم وەکو دەزگا لەو بابەتانەیە کە پێویستە بەردەوام زیندوو بێت.

شانبەشانی ئەوەی دامەزراوەکانی دەوڵەت و ژیانەکەیان دەزگای سەرەکی ماوەی بونیادییە، پلەداری و چینەکانیش کە لەگەڵ دەوڵەت سەریان هەڵدا، هەروەها مولک، خاک و نیشتمان کە سنووری دەوڵەت پیشان دەدات، شێوەکانی دەوڵەت، دەوڵەتی راهیبەکان، دەوڵەتی بنەماڵە، کۆمار و دەوڵەت ـ نەتەوە هەموویان لە بابەتە گرنگەکانییەتی. شێوەکانی ئایینیش بابەتێکی گرنگە. ئەو بابەتانەی کۆمەڵگایان وەک شێوازی بەرهەم هێنانی نیولیتیک، کۆیلەداری، دەرەبەگایەتی، سەرمایەداری، سۆسیالیستی جیاکردۆتەوە بابەتی ماوەی بونیادییە. بابەتی هەرەس هێنانی دەزگاکانیش دەکەوێتە ناو چوارچێوەی ماوەی بونیادییەوە. لقی خوارەوەی کۆمەڵناسی کە لێکۆڵینەوە دەرهەق بە بابەتەکانی بونیاد (پێکهاتە)یی دەکات ناوبردنی بە "**کۆمەڵناسی بونیادیی**" دەشێت ناولێنانێکی گونجاو بێت. ئەوانەی لە بابەتەکانی درێژترین ماوە دەکۆڵنەوە ناوبردنیان بە "**کۆمەڵناسی کلتووری بنەڕەتی**" بەهۆی چوارچێوە یەکپارچەییەکەی لە جێگای خۆیدا دەبێت.

ج ـ بابەتەکانی کورت ماوە و ناوین ماوە هەم لە بواری چەندایەتی،

هەم لەبواری چۆنایەتی دیاردە و ڕووداوی هەمەلایەنە دەکەنە بابەتی خۆیان. ماوە ناوین و کورتخایەنەکان تەواوی ڕووداوەکانی وەرچەرخان و گۆڕانکاری بونیادیی و کلتووری لە ناواخنی خۆیان دەگرن. بابەتەکانی قۆناخی ناوین ئەو گۆڕانکارییانە لەخۆوە دەگرێت کە کەمێک تەمەن درێژترن، بەڵام لەناو هەمان دەزگا بونیادییەکان ڕوویانداوە. بۆ نموونە دەشێت قەیرانە ئابوورییەکان، گۆڕانکاری ڕژێمە سیاسیەکان و هەموو جۆرە دامەزراوەیەکی ڕێکخستنی ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی و کردەیی لەم چوارچێوەیەدا ببینین. تەواوی چالاکیە کۆمەڵایەتی و تایبەتەکانی بە کۆمەڵگابوونی تاک لە سەرووی بابەتەکانی ماوەی کورتخایەنەوە دێت. میدیا زیاتر دیاردە و ڕووداوە کورتخایەنەکان بە بنەما دەگرێت. ڕووداوە ڕۆژانەییەکانی هەر دەزگایەکی بونیادیی جێگای خۆی لە گۆشەی سەرەوەی ماوەی کورتخایەندا دەگرێت.

لەبەرئەوەی ڕووداوەکانی ناو کورت ماوە لەخۆوە دەگرێت، ناوبردنی بە کۆمەڵناسی ئۆگۆست کۆنت لە جێگای خۆیدا دەبێت. بە گووتەیەکی دیکە ناوزەدکردنی بە **"کۆمەڵناسی پۆزەتیف"** دەشێت گونجاو بێت ـ بە پشتگوێ نەخستنی ڕەخنە بنەڕەتییەکان ـ لە ڕاستیدا پێویستە کۆمەڵناسی بەشێکی تایبەتی بە لێکۆڵینەوەی ڕووداوەکان هەبێت. بە تایبەتی لە قۆناخەکانی کائیوسدا ڕووداوەکان قورسایی و ڕۆڵی دیاریکەریان دەبێت. کۆمەڵناسی کلتووری بنەڕەتی، کۆمەڵناسی بونیادیی کاتێک لەگەڵ کۆمەڵناسی پۆزەتیف بکرێتە یەک کە لە ڕووداوەکان دەکۆڵێتەوە، ئەو کاتە ناوەڕۆکی کۆمەڵناسی بەرکەماڵ دەبێت.

هەروەها تەواوی پێکهاتە و ڕووداوە گەردوونییەکان بە ڕووداوەکانی کۆمەڵگاشەوە، پێویستی بە زەمینەیەک هەیە کە بە کوانتەمی و کائیۆس ناوی دەبەین. زەمینەکانی کائیۆس و کوانتەمی ناوەندێکی ئافراندن و ژیاندنەوەن. هەرچەندە تاکو ئێستا لە قوڵاییەکانیان نەکۆڵیوەتەوە، بەڵام هەبوونیان مسۆگەرە.

یەکێک لەو بابەتە سەرەکیانەی کە پێ بە پێ زانست زیاتر پێیەوە پەیوەندیدار دەبێت: تەواوی پێکهاتەکانی کورت ماوە، ماوەی ناوین و درێژماوە لە لایەن ئەو "**رووداوانەوە**" کە هەم "**هەموو ساتێک**"و هەم لە"**ناوبەری کورت**"دا دێتە ئاراوە لەسەرپێیان ددهێلدرێنەوە. ئەم "**ساتی ئافراندن**"ە پشتگوێ ناخرێت کە دەتوانین بە "ساتی کوانتەمی" و "**ناوبەری کائیۆس**" ناوی ببەین. ئەگەری ئازادی لە گەردووندا لەم "سات"ەدا روودەدات. خودی ئازادی پەیوەندی بە "**ساتی ئافراندن**"وە هەیە. تەواوی بونیاد و پێکهاتەکانی سروشت و کۆمەڵگا، هەم لە رووی دروستبوونەوە، هەم لە رووی لەسەرپێمانەوە و ماوەکانی ژیانیانەوە هەرچەندە ناوەڕۆکی جیاوازیشیان هەبێت، پێویستییان بە "**ساتەکانی ئافراندن**"هەیە.

لە حاڵەتێکی وەهادا بیرکردنەوە لە ناوێک بۆ ئەو کۆمەڵناسییەی لە روانگەی کۆمەڵایەتییەوە بابەتەکانی ئافراندن لە کورتترین ماوەکانی کورتخایەنیدا تاوتوێ دەکات لە جێگای خۆیدا دەبێت. پێشنیازی شەخسی من ئەوەیە ئەو کۆمەڵناسییەی رووداوە کۆمەڵایەتییەکانی "**ساتی ئافراندن**" تاوتوێ دەکات بە "**کۆمەڵناسی ئازادی**" ناوببرێت. لەوەش گرنگتر، ئەو نەرمایییە سەرسوڕهێنەرەی زهنی مرۆڤ کە لە رێی کۆمەڵگابوونەوە بە توانایەکی بێ هاوتا گەیشتووە، هەروەها بەهۆی ئەو خولقکارییەی رێگای لە پێش کردۆتەوە لەو بڕوایەدام کە کۆمەڵناسی ئازادی لقێکی پێویستە و دەتوانین بە جۆرێک لە جۆرەکان کۆمەڵناسی زهنییەتیشی پێ بڵێین. لێکۆڵینەوەی ئیرادە و هزری ئازادی دەبێت لە سەرووی هەموو بابەتەکانەوە بێت. خۆی لە خۆیدا بە گوێرەی ئەوەی پێشکەوتنەکانی ساتی ئافراندن لایەنی ئازادی هەیە، ئەم ساتەی کورتترین ماوە "**ساتی کوانتەمی**" و "**ناوبەری کائیۆس**" کە بە واتایەکی تر دەتوانین کۆمەڵناسی "**ئافراندن**"یشی پێ بڵێین، لەبەرئەوەی زۆرترین گۆڕەپانی کۆمەڵگا دەگرێتەوە و کۆمەڵگا پەیوەندیدار دەکات، کۆمەڵناسی ئازادی لە سەرووی بابەتەکانی کۆمەڵناسییەوە دێت کە پێویستە پێشبخرێت.

هەروەها پێویستە باسی **"ماوەی ئەسترۆنۆمی"**(گەردوونناسی) بکەین کە پەیوەندی بە بابەتەکەمانەوە نییە، بەڵام بۆ هزری گشتی پێویستە. تا ئێستا بابەتەکانی ئەم ماوەیە دیاری نەکراوە. بەڵام وەکو هێڵی گشتی دەتوانین پێکهاتن و هەرەس هێنانەکانی **"خۆر"** و **"دوورگەکانی ئاسمان"** کارەکتەری شیمانەکراوی **"فراوانبوون"** و **"تەسکبوونەوە"**ی گەردوون، گرێدراو بەمەش هێزەکانی **"کێش کردن"** و **"پاڵنان"** بخەینە چوارچێوەی بابەت و زاراوەکانی **"ماوەی گەردوونناسی"** ، گفتوگۆ کردن لەسەر تەمەنی گەردوونیش لە سەرووی ئەم بابەتانەوە دێت.

لە کات و شوێنی خۆیدا ئەم بۆچوونانەی لە بارەی پەیڕەوی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵناسی ئاماژەمان پێکرد لە بابەتە پەیوەندیدارەکان هەم روونی دەکەینەوە، هەم هەوڵی پراکتیزەکردنی دەدەین. نابێت لە بیر بکرێت کە ئەم هەوڵانەم تاقیکردنەوەیەکە. سروشتییە کە وەکو کەلالەیەک بێت.

با جارێکیش لە ڕێگای ئەم تیروانینە کومەڵناسییەوە پێشکەوتنەکانی کۆمەڵگای هیلالی بە پیت تاوتوێ بکەین و لێی بکۆڵینەوە:

کۆمەڵناسی ئازادی لە قۆناخی شۆڕشی نیولیتیک لەناوچەکەدا بە پیتترین ناوبەری کائیۆسی مێژووی کۆمەڵگای بە خۆیەوە بینیوە. راوچییە گەڕۆکەکان و ئەو گروپانەی لە میانەی کۆکردنەوەی بەرهەم گوزەرانیان دەکرد، لەگەڵ کشانەوەی سەهۆڵبەندان بۆ لووتکەی شاخەکان، بەهۆی ئەزموونی قۆناخی رابردوویان، پێکهاتەی کۆمەڵگای خۆیان شیکردەوە، کەوتنە ناو لێگەڕینی ژیانێکی جێنشین و گوزەرانێکی پشت بەستوو بە کشتوکاڵ. جۆاتە تەمەن سەد هەزار ساڵییەکەی کلان (تیرەی سەرەتایی) رووبەرووی بەجێهێشتنی جێگایانن بۆ پێکهاتەی بەرفراوانتر. لە قۆناخێکدایین کە وەرچەرخان و تەقینەوەیەکی تەواوی زهنی تێدا ئەنجامدرا. لەجیاتی پێکهاتەی زمانی دانەبڕاو لە زمانی ئیشارەت و زهنییەتی

کۆنی کلان، هەنگاونان بۆ زهنییەتی ئەتنیک و خەڵکی گوندی بەرفراوان جێگای باسە. سیستەمی زمانی هێمایی دەنگ بە خێرایی پەرە دەسەنێت. ماددە بێ سنوورەکانی خواردەمەنی، گەیاندن، رستن، دیزە، هاڕین، خانوو دروستکردن، بابەتە هونەرییەکان دەرکەوتوون، هەمووشیان پێویستییان بە سیستەمی ناوی نوێ و قاڵبی زهنی هەیە.

لە کاتێکدا کۆمەڵگای نوێ بە زۆری پشت بە ژیانی گوند دەبەستێت، پەیوەستبوونی کلان بۆ پەیوەندی ئەتنیکی دەگۆڕێت. ئەگەر چوارچێوەی زهنییەتێکی واتادار نەبێت شێوە نوێکانی ئەم پێکهاتە ماددیانە بەڕێوە ناچێت، تەنانەت دەست پێناکات. لەگەڵ ئەوەی ناسنامەی کۆمەڵگای کۆن کلان **"تەوتەم"** بەردەوام دەبێت، ئەوا شێوە سیمبۆلی نوێی کۆمەڵگای نیولیتیک کە**"دایکە ـ خوداوەند"**ە بەرجەستە دەبێت، ئەمەش وەرچەرخان و زمانی زهنییەتی نوێیە. لە کاتێکدا شێودی تەوتەم پێ بە پێ کەم دەبێتەوە، وێنە و شێوەی دایکە ـ خوداوەند دەورووبەردەتەنێتەوە. ئەمەش هێمایە بۆ بەرزبوونەوەی رۆڵی دایکە ـ ژن. ئەمە لە لایەنی ئایینیەوە قۆناخێکی لەپێشترە، زاراوەگەلێکی زۆر دەوڵەمەند لەگەڵ خۆیدا دێنێت. لە زماندا پێشگر و پاشگری مێینە دەردەکەوێتە پێش. بۆ ماوەیەکی درێژخایەن رۆڵی سەرکێشی و لەپێشینەیی مێینە لە پێشگر و پاشگری زمانی هێما دەنگییەکاندا بەردەوام دەبێت. تەنانەت لە رۆژگاری ئەمرۆشماندا ئەم تایبەتمەندییە لە زۆر زماندا دەبینرێت. لەگەڵ دایکە خوداوەند کۆمەڵگابوون بە پیرۆزییەکی قووڵ دەگات. کۆمەڵگای نوێ، بە واتای زاراوە و ناولێنانی نوێ دێت. ئەو پرۆسە (قۆناخ)یەی بە شۆڕشی زهنی ناومان برد لەبەرئەوەی پێویستی بە خوڵقکارییە، پێویستە بیخەینە ناو کۆمەڵناسی ئازادییەوە. بابەتێک کە مێژووناسە لەپێشینەکان لە بارەیەوە کۆکن: زۆر دووبارە بوونەوەی ئەم پرۆسەیەیە. ئەمەش بە واتای هەزاران دیاردە، هەزاران شۆڕشی هزری و ناو دێت. ئەمە زۆر لە شۆڕشە

زهنییەکەی ئەوروپا فراوانترە، تەقینەوەیەکی تێدایە کە هەوڵێکی ڕاستەقینە و خولقکارانە دەخوازێت. لە لایەن مێژووەوە ئەو ڕاستییە دەستنیشان کراوە کە تەواوی ئەو زاراوە و دۆزینەوانەی ئەمڕۆ بەکاریان دێنین زۆربەیان لەو قۆناخەدا خولقێنراون.

ئەگەر پۆلێنکارییەکی قەبا بکەین دەبینین قۆناخێکی خولقکاری کۆمەڵگا جێگای باسە کە لە نیوە کەمتر نییە. لیستەی ئایین، هونەر، زانست، گەیاندن، بیناسازی، دەغڵ، میوە،ماڵیکردنی ڕەشەوڵاخ و مەڕ و ماڵات، ڕستن، گڵکاری، هاڕین، مەتبەخ، جەژن، خێزان، پلەداری، بەڕێوەبەرایەتی، بەرگری و هێرش کردن، دیاری، ئامرازی کشتوکاڵ و چەندینی دیکەی دەتوانرێت ڕیز بکرێن، کە لە میانەی تێپەڕبوون بە گۆڕانکاری چەندایەتی و چۆنایەتیدا ئەمڕۆش لیستەی سەرەکی ژیانی کۆمەڵگان. کاتێک سەیری پێکهاتەی خێزان و گوندەکانی پاشماوەی نیولیتیک بکرێت دەبینین، ئەخلاقی کۆمەڵگاکە ڕەسەنە و هێز بە کۆمەڵگا دەبەخشێت و ژیان واتادار دەکات: لە سەرووی هەمووانەوە لە ڕووی ڕێز، خۆشەویستی، دراوسێتی و هاوکارییەوە لە داوەرییە بەهاییەکانی - یاخود بێ ئەخلاقی - مۆدێرنیتەی سەرمایەداری زۆر باڵاترە. قاڵبە زهنیە بنەڕەتییەکانی کۆمەڵگا کە هیچ کاتێک کۆن نابێت لە بنەڕەتدا مۆرکی ئەم قۆناخەی پێوەیە.

بە گوێرەی کۆمەڵناسی پۆزێتیڤیش بێت، ژیانی ڕووداوەکانی ناوچەکە بە گوێرەی قۆناخی خۆی زۆر دەوڵەمەندە. بە بەراورد لەگەڵ ژیانی یەک شێوەی ڕاوکردن و بەرگری و کۆکردنەوەی بەرهەم لە کۆمەڵگای کلاندا، ڕووداو و دیاردە نوێکانی هیلالی بە پیت تەواو لە دۆخی تەقینەوەدایە. دیاردە و ڕووداوە لە ژمار نەهاتووەکانی کە بە ناوێکی نوێ گەیشتوون، بە دەوڵەمەندترین شێوە دەنگ و چالاکی مرۆڤ پیشان دەدات. ئەو واتا ڕیشەییەی لە زهنی مرۆڤی سەردەمی خۆیدا نەخشاندوویەتی، هەر وەک دواتر لە باسەکانی پەرتووکە پیرۆزەکانیشدا دەیبینین ڕێگای لە پێش

زاراوەی بەهەشت کردۆتەوە. لەوانەیە ئەمە یەکێک لە ساتە هەرە پڕ شانسەکانی کۆمەڵناسی پۆزەتیڤ بێت لەبەردەمماندا. چونکە پێشکەوتنێکی لە وێنەی ئەستێرە باران کردنی مرۆڤایەتی جێگای باسە، کە بەسەر هەر چوار لای جیهاندا رۆشنایی ئەستێرە و تیشکی ئەم رووداو و دیاردانە دەباریێت تا خەیاڵی بەهەشتی پێشکەوتنی کۆمەڵگا بەدیبێنێت، تەنانەت ساتەکانی بەدیهاتنیشی دەچێنێت، و دەیکات بە کلتوور.

بە گوێرەی کۆمەڵناسی بونیادیی دەشێت شوێن پەنجەی رێکخستنی تەواوی ئەو دەزگایانەی مۆرکی خۆیان لە پێشکەوتنی کۆمەڵگا داوە لە هیلالی بە پیت ببینرێت. بە تایبەتی قۆناخی نێوان سالآنی ٦٠٠٠ ـ ٤٠٠٠پ.ز تەواو قۆناخێکی بە دەزگابوونە. هەر وەکو بڵێی قۆناخێکە تەواوی بونیاد و پێکهاتەکانی شوێنەکانی نیشتەجێبوونیان لە شار و گوندەکاندا دەستنیشان کردووە، بەرەو جێنشینی چوون، پلەداری لەدایک بووە، ئایین بە دەزگا بووە، یەکەمین پەرستگا پەیدا بوون، ئەتنیک سەری هەڵداوە، پێکهاتەکانی زمان یەکلایی بوونەتەوە، نەریتەکانی دراوسێتی جێگیر بووە، ئەخلاق و بەڕێوەبەرایەتی بەهێزترین قۆناخی خۆی بونیادناوە. بە واتایەکی تر کۆمەڵگای نیولیتیک، واتا شۆڕشی کشتوکاڵ و گوند بووە بە هەمیشەیی، بە دەزگابوونەکەی مسۆگەر بووە. بونیاد و پێکهاتەکانی کۆمەڵگا کە بابەتی بنەڕەتی کۆمەڵناسی بونیادیین بۆ یەکەمین جار لە هیلالی بە پیتدا پێکهاتەیەکی هێندە دەوڵەمەندی پیشانداوە. لەمرۆشدا دەکرێت زۆر شت لە راستینەی ئەم بونیادانەوە فێرببین کە وەک بە دەزگابوونێکی رەسەن پێویستە لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکرێت. چەندە لێکۆڵینەوە لە بارەی ئەم بونیادانەوە بکەین کە وەکو یەکەمین بەها بە دەزگا بووەکانی مرۆڤایەتیین، دەرهەق بە دامەزراندنی کۆمەڵناسی بونیادیی هێندە بە ئەنجامی تۆکمە و تەندروستانە دەگەین. دەبێت باش بزانرێت کە کۆمەڵناسی بونیادیی رۆژگاری ئەمرۆمان لەناو بێبەشبوونێکی جددی **"واتاناسی"**دایە.

ئەگەر وەکو پارچەیەکی کۆمەڵناسی گشتی چاوێک بە خۆیدا بخشێنێتەوە، دەشێت ببێتە گوزارشتێکی بەهێزی زانستی واتا.

وەکو بابەتێکی کۆمەڵناسی کلتووری بنەڕەتی، ئەو زمان و کلتوورەی کە بناخەکەی لە هیلالی بە پیتدا دانراوە بەهای رەسەنێتی هەیە. ئەو کۆمەڵگایەی لە ناوچەکەدا ئاواکراوە، درێژخایەنترینیانە. هەر وەکو پێشتریش ئاماژەمان پێکرد، تا لە ئاکامی کارەساتێکی خۆڕسک یان کۆمەڵایەتی ژیانی مرۆڤ تارادەیەکی مەزن لەناو نەبردرێت - بۆ نموونە تا نەگەڕێتەوە سەردەمی کڵان - پشتێنەی ژیار و کلتووری کۆمەڵایەتی کە پشت ئەستوور بە هیلالی بە پیت سەری هەڵدا، هێزی بەردەوامکردنی پێشەنگایەتی هەیە. بە هەژموون بوونی شارستانیەتێک کە کلتووری چینی و سامییەکان سەرچاوەی بێت، هەرچەندە لە رووی تیۆرییەوە مەحاڵ نەبێت، بەلام لە رووی کردارییەوە زۆر ئاستەمە. سەرباری پەلامار و هێرشە گەورەکانی ئیسلام و مەغولەکان هیچ کاتێک کلتووری هیندۆ - ئەورووپی (کلتووری بنەڕەتی، زمان و کلتووری ئاریان) کارەکتەری هەژموونیانەی خۆی لە دەست نەدا. لە داهاتوودا لەوانەیە چین هێرشێکی نوێ بکات. بەڵام داگیرکردن، دەست بەسەرداگرتن، چەوساندنەوە و کۆلۆنیکردنی کلتووری هیندۆ - ئەورووپی کە لە سەرتاسەری جیهان بە شێوەیەکی واتادار جێگیر بووە، ئەگەر یارمەتییەکی پەرجوویی - بۆ نموونە کارەساتی سروشتی یان کۆمەڵایەتی لە دەرەوەی گۆڕەپانی چین - فاکتەرەکانی دەرەوە نەبێت ئەگەرێکی زۆر لاوازە.

دەتوانین کۆمەڵناسی کلتووری بنەڕەتی هاوشێوەی کۆمەڵناسی گشتی ببینین. لە ڕەوشێکی وەهادا دەکرێت گۆڕانکاری و وەرچەرخانی شێوەکانی زهنییەت، هەبوونەکانی وەک دەزگای خێزان و قەوم - ئەتنیک - لە سەرووی هەموویانەوە ئەوانەی پشت بە سێ کلتوورە مەزنەکە دەبەستن و ئەوانەی دەکەونە ناو تەواوی کلتوورەکان بکرێنە بابەتی کۆمەڵناسی گشتی. لەوەش گرنگتر

دەشێت **"زەمینەکانی کائیوس و ڕزین"** وەک کوڵەکە و ئەنجام و خاڵی یەکتربڕینی کۆمەڵناسی ئازادی و کۆمەڵناسی بونیادیی لە چوارچێوەی کۆمەڵناسی گشتیدا لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت.

دووەمین قۆناخی مەزنی کۆمەڵگای هەڵکشاوی هیلالی بە پێت کە بە **"دەوڵەتی راهیبی سۆمەر"** دەستی پێدەکات قۆناخی **"کۆمەڵگای شارستانی"**ە. کۆمەڵگای شارستانی لە بنەڕەتدا پێهەڵگرتنێکی بە ڕیشە پلەداری - خانەدانە کە پشت بە کلتووری هیلالی بە پیت کراوە. کاتێک دەرفەتەکانی ئەو جیابوونەوە چینایەتییەی دەگەڕایەوە بۆ زۆری و هەمەڕەنگی خۆراک و شێوازی بەرهەم هێنان، لەگەڵ شارستانیبوون (ئاوا کردنی شار) بوو بە یەک، هەر گروپێکی پلەداری - خانەدان دەتوانێت بە خستنەگەڕی تواناکانی **"پیاوی بەهێز"**ی جاران، بەرەو رێکخستنی **"دەوڵەت"** هەنگاو بهاوێژێت. لە هیلالی بە پیتدا نەک تەنیا لە میزۆپۆتامیای خواروو بەڵکو لە میزوپوتامیای ناوین و سەرووشدا چەندین هەنگاوی لەمجۆرە دەبینرێت. سەرباری ئەوەی هەندێکیان بوون بە هەمیشەیی، هەندێکیشیان بەهۆی هەلومەرجەوە بەرگە ناگرن، لەسەر پێیان نامێننەوە. لە پەرتووکی پیرۆزدا دەوڵەت وەکو لیڤی ئەتهان شرۆڤە دەکرێت. کاروانی خوێناوی، ئیستیغلال و هەندێ جاریش کۆمەڵکوژانەی ئەم درندەیە لەسەر پێشکەوتنی کۆمەڵگا، لێکۆڵینەوەی بە کۆیلەکردن و چەوساندنەوەی جۆر بە جۆری مرۆڤ لەژێر بەڕێوەبەرایەتی پادشا رووت و داپۆشراوەکان، دەمامکدار و بێدەمامکەکاندا و ئەو چەواشەکاریانەی مەشروعییەتی پێدەدات بە یەکەوە دەبنە بابەتی بەشەکانی دیکە.

گەورەترین کاولکاری ئایدیۆلۆژی فەرمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری واتا پۆزیتیڤیزم، لە گۆڕەپانی زانستی کۆمەڵگا (کۆمەڵناسی)دا بووە. هەر وەکو چۆن لەژێر ناوی زانستیبووندا لەبواری فیزیا چەمکی میتۆدی بچووککردنەوەیان پەیڕەو کردووە، لە ڕێی هەمان چەمکەوە کردنی بابەتە کۆمەڵایەتییەکانیش بە ئۆبژە، کێشەی ئێجگار سەختی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. کاتێک لەژێر ناوی **"سۆسیالیزمی زانستی"** لە میانەی هەمان پەیڕەوەوە هەوڵدانیان بۆ لێکۆڵینەوە لە گۆڕەپانی کۆمەڵگا (کۆمەڵایەتی) بەتایبەتیش لێکۆڵینەوەیان لە بارەی ئابووری بەو ناوەوە کردووە گوایە گۆڕەپانی ڕاستەقینەی سۆسیالیزمە، مەسەلەی واتایان خستۆتە نێو ئالۆزییەکەوە ڕزگاربوون لێی زەحمەتە. زهنییەتی هەڵوێستی فیزیایی کە زۆر لە زیندەوەرزانی دواکەوتوو ترە، هێزێکی ئەوتۆی

داوەتە دەست سەرمایەداری کە هیچ چەکێک پێی دابین ناکرێت. لەبەشی تایبەت بە پەیڕەو هەوڵماندا پیشانی بدەین کە ئەم پەیڕەوە سەرەکیترین پارادیگمای سەرمایەدارییە. ئەگەر بەردەوام پەنجەی نەخرێتە سەر ئەوا پێشکەوتن بەدینایەت. وەک ئۆبژەیەک لێکۆڵینەوە لە کۆمەڵگا و کراوەیی زهنی بۆ ئەم جۆرە تاوتوێکردنە بە پێچەوانەی بانگەشەکانیانەوە بە تایبەتیش ئەوانەی لەژێر ناوی **"سۆسیالیزمی زانستی"**دا دەجولێنەوە، ئاگادارنین کە بەم جۆرە هەر لە سەرەتاوە پرۆلیتاریا و هەژارانیان چەک کردووە. وێناکردنی کۆمەڵگا وەکو دیاردەی سروشتێکی فیزیایی یان سروشتێکی بایۆلۆژی بۆخۆی بە واتای تەسلیمبوون بە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دێت.

لەناو ئێش و ئازار و تووڕەییەکی مەزنەوە دەبێت ئامāژەی پێبکەم: لە سەرەتاوە تا کۆتایی بەڕێوەبردنی تێکۆشانێکی ڕەسەنی دووسەد ساڵەی **"سۆسیالیزمی زانستی"** لەلایەن پۆزێتیڤیزمێکی ماددەخوازی قەبەی مەحکوم بە مایەپووچی بێ شانسییەکی گەورەیە. بێگومان لە پشت ئەم ڕاوەستەیەوە هەڵویستی **"بە ناوی جیاوازی چینایەتییەوە"** شاراوەیە کە لە بەرامبەریدا زۆر تێکۆشاون. بەڵام هەر وەکو مەزەندەی دەکەن ئەم چینە ئەو کارکەر و ڕەنجدەرانە نین کە لە بەرامبەر بوون بە پرۆلیتاریایەکی کۆیلەدا بەرخودان دەکەن، بەڵکو چینی **"وردە بۆرژوا"**یە کە لە مێژە لەناو مۆدێرنیتەی سەرمایەداری تواوەتەوە و تەسلیم بووە. پۆزێتیڤیزم ئایدیۆلۆژیای تێڕوانینی کوێرانە و کاردانەوە پووچەکەی ئەم چینەیە بەرامبەر بە سەرمایەداری. ئەم چینە ڕەسەنەی پیشەکارانی شار کە لە چۆنییەتی پێکهاتنی ژیانی کۆمەڵگا بێئاگایە و بەردەوام بۆتە زەمینەی تەریقەتە نەزۆکەکان، ئەو توێژە کۆمەڵایەتییەی کۆمەڵگایە کە بە ئاسانی لەلایەن سیستەمی فەرمی زاڵەوە دەستیان بەسەردا دەگیرێت.

کاتێک هەڵوێستی کۆمەڵایەتی ببێتە جێگای باس دیاردەگەرایی (پۆزێتیڤیزم) جۆرێک لە بتگەرایی هاوچەرخە. بتگەرایی چوارچێوە

بۆشەکەی ئیلاهیبوونە کە ناوەڕۆکەکەی خۆی لەدەستداوە. لە سەردەمێکدا ئیلاهیبوون زاراوەیەکی کارای ئەفسوونی و پیرۆزی کۆمەڵگا بوو، کاتێک ئەم ڕۆڵەی خۆی لەدەستدا، ئەوەی دەمێنێتەوە دۆخی بتبوونە. بێگومان پەرستنی بتەکان لەلایەن بێبەشبووان لە زانستی واتا ڕەوشێک نییە مایەی تێگەیشتن نەبێت. هەروەکو چۆن نازانن کە بت سەرچاوەی خۆی لەو ڕۆڵە وەردەگرێت کە ئەوان دەیدەنێ، بە پێچەوانەوە لەو بڕوایەدان کە بتگەرایی واتا (ناوەڕۆک) دەخوڵقێنێت، بە شکۆداری و پیرۆزی جاران دەگاتەوە، یاخود کەوتوونەتە خەفڵەتێکی بەم جۆرەوە. لەم بوارەوە شیکارکردنی ئایینەکانی دژە ـ بت ڕۆشنکەرەوە دەبێت. هیچ گومانێکم لە بتگەرایی هاوچەرخی پۆزیتیڤیستە مەحکومەکانی دیاردەگەرایی نییە. ئەم بتپەرستە مۆدێرنانەی دەتوانین بە بتگەرا هاوچەرخەکانیش ناویان ببەین، فەیلەسووفەکانی گۆڕەپانی مۆدێرنیزم خۆیان زور بە باشی گووتویانە کە " **بە وێنەی باوەش کردن بە بتێکدا خۆیان لە ئۆبژەکانی بەکارهێنان پێچاوە**".

مارکس و قوتابخانەکەی لەو بڕوایەدا بوون کە لە میانەی شیکارکردنی ئابوورییەوە دەتوانن کۆمەڵگا، مێژوو، هونەر، حقوق و تەنانەت ئایینیش ڕۆشن بکەنەوە. بێگومان تەواوی دەزگاکانی کۆمەڵگا هەر وەکو شانەکانی جەستە کاریگەری لەیەکتری دەکەن. بەڵام کاتێک گۆڕەپانەکەمان کۆمەڵگابوون بێ هەموو شتێک دەگۆڕێت. ئەو دامەزراوانەی زهنی مرۆڤ خوڵقاندوونی، واتە دەزگاکانی کۆمەڵگا شانەکانی زیندەوەر نییە، تەنانەت شانەکانی جەستەی مرۆڤیش نییە. زهنی مرۆڤ وەکو شاخێکی گڕکانییە کە لە گۆڕەپانی کۆمەڵگادا بەردەوام دەتەقێتەوە، ئیرادە و واتا بەرهەم دێنێت. نموونەکەی لەناو جۆرەکانی دیکەی زیندەوەراندا نییە. دەشێت لە ڕووداوەکانی فیزیاشدا هەندێک لایەنی هاوبەشی لەگەڵ جیهانی کوانتەمدا هەبێت. نابێت لەبیری بکەین کە خودی زهنی مرۆڤ بە گوێرەی سیستەمی کوانتەم کاردەکات. هەرچی

جیهانی ماددییه (بەبونیادی ئابووری کۆمەڵگاشەوە) گوزارشت له بەستن و تونێکڵ بوونی میکانیزمی کوانتەمی دەکات. راستییەکی حاشا هەڵنەگرە کە ئەوەی کۆمەڵگا بەڕێوە دەبات زهنه. بابەتێکی سەلمێنراوە کە ئابووری کۆمەڵگاش لەلایەن کردارەکانی زهنەوە بەڕێوە دەبرێت.

هەرچەندە دووبارەش بێت دیسان جەختی لەسەر ددکەمەوە، بە مێژووکردنی کۆمەڵناسی و بە کۆمەڵناسی کردنی مێژوو مەرجی سەرەکی پێشکەوتنی زانستی واتایە. ئەوەنتاژێکی دیکەی ئەم پەیڕەوە ئەوەیە زیاتر لەو راڤەیە نزیکە کە مێژوو وەکو ڕێڕەوی خۆی شرۆڤە دەکات. نکۆڵی لە گرنگی هزری قەبلاندن ناکەم. بەپێچەوانەوە بۆ ئەوەی ئەم شێوازەی هزراندن سوودبەخش بێت، دەبێت بتوانێت لێشاوی پەرەسەندنەکانی مێژوو وەکو خۆی بەدەست بێنێت. چەندە لەم ڕێگایەوە بەپێی گوتەی **"ژێرخان مێژوو دەستنیشان دەکات"** یان بەپێی پێچەوانەکەی **"مێژوو بریتییە لە کردەکانی دەوڵەت"** ڕووداو ڕیز بکرێت و شیبکرێتەوە، سەبارەت بە واتاناسی مێژوو جگە لە چەقبەستن و شێواندن هیچ ئەنجامێکی دیکەی نابێت. ئاشکرایە کە بەم پەیڕەوە ناتوانرێت باسی مێژوو و کۆمەڵگا بکرێت. ئەوەی لێرەدا باس دەکرێت مێژوو نییە، بەڵکو فیسیۆلۆژیای کۆمەڵگایە. مسۆگەر باسکردنی چۆنییەتی کاریگەری دەزگاکانی کۆمەڵگا (لەجەستەدا شانە) لەسەر یەکدی و دەستنیشان کردنی یەکتریان باسکردنی مێژوو نییە. ئەمە دیاردەگەراییەکی قەبە (ڕەها)یە.

بۆ ئەوەی بتوانین باسی مێژوویێکی واتادار بکەین، ئەو مەسەلەیەی ڕۆڵی کلیل دەبینێت ئەوەیە کە، هێزی لێشاوەکەی(مێژوو) لە ساتی ڕەوتکردنیدا چۆن دروست بووە. کامە خەباتی ئیرادە و زهن لەو ساتەدا بە کاریگەر بێت، بەدەست گرتنی ئەم زهن و ئیرادەیە، مێژووی راستەقینە، یان شرۆڤەکردنەکەیەتی. هەر وەکو چۆن دەبێت هەڵمەتێکی ئابووری بێت، دەشێت کردەیەکی ئایینیش

بێت. **گرنگ چەکەکە نییە، بەڵکو ساتی پەلەپیتکە تەقاندن و ئەو دەستەیە کە دەیتەقێنێت.** چەندەی خوازیاری هەوڵی شیکارکردنی بەهای ئابووری، هونەری، سیاسی و سەربازی چەکەکە بدەیت، لەوانەیە وەکو بەهاراتی باسەکە واتایەکیان هەبێت، بەڵام نامانەوێت بەردەوام دووبارەی بکەینەوە، کاتێک دەڵێین لێشاوی مێژوویی ئەوەی پێویستە دەرکی پێبکرێت: بەردەوام بەکارهێنانێتی لەلایەن ئەو دەستەی خاوەنی پەلەپیتکەکەیە. لەوانەیە بگووترێت **"بۆ بەکارهێنان و دروستکردنی چەک پێویستی بە شارەزاییەکی باش و خەباتێکی ئابووری هەیە"** بەڵێ دەکرێ وابێت. بەڵام ئەم هەڵوێستە لە گوزارشت کردنی مێژوو نازانێت، تێناگات. نابێت لەبیر **بکرێت مێژوو چەکێکە بەردەوام کار دەکات. چەکێکی کارای پڕ لە فیشەکە کە بەردەوام پەنجەیەک لەسەر پەلەپیتکەکەیەتی.** ئەوەی بەرپرسیارێتی بەڕێوەبەرایەتی ستراتیژی مێژووی هەیە، ئەمە باش دەزانێت. یەکێک لە ئیمپراتۆرەکانی روما وابزانم (ڤالنتیانۆس)ە، وەکو هاوبەشێکی ئیمپراتورییەتەکەی براکەی خۆی هەڵدەبژێرێت، دوای ماوەیەکی کورت ئەوانەی هەڵیانبژاردووە پەشیمان دەبنەوە، دەڵێن نامانەوێت. هەرچی (ڤالنتیانۆس[1])ە بەگووتەی **"جارێک هەڵتان بژاردووە، بەم جۆرە مافی نارەزایەتیتان لەدەستداوە"** روونی دەکاتەوە کە مێژوو چییە.

گرنگی ئەم باسەی پەیڕەو دەرهەق بە واتای مێژووی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە بەشی پەیوەندیداردا باس دەکەین.

بۆ سەرەتای مێژووی شارستانی نابێت پرسی پەیڕەو پشتگوێ بخەین تا لەو سۆنگەیەوە کۆمەکێک بە واتاناسی بکەین. بەهای شرۆڤەیەک بە ئەندازەی ئەوەی توانایەتی بۆ روونکردنەوەی مێژوو، شیانیشیتی بۆ بەکارهێنانی لەلایەن ئەو کەسانەوە کە بەردەوام لەژێر حوکمی مێژوودا دەژین، بەڵام بەردەوامیش

١. Valentinianus ڤالنتیانۆس یان ڤالنتیانی یەکەم: ئیمپراتۆرێکی رۆمایی یە (٣٢١-٣٧٥) لەسربیا لەدایک بووە، حوکمڕانی ئیمپراتۆریەتی رۆژئاوا (پایتەختەکەی میلان)ی کردووە،بە رەزامەندی ئەنجوومەنی پیران براکەی (ڤالینس)بە حوکمڕانی ئیمپاتۆریەتی رۆژهەلات دانا.

دەتوانن دەستپێشخەری بکەن. شرۆڤەی راستەقینەی مێژوویی بۆ ئەوانەی لە مێژوودا رۆڵی قوربانیان پێ براوە، ئەو هێزەیە کە هۆشیاری و ئیرادەیان دەداتێ بۆ رزگاربوون لە رۆڵی قوربانی و بەدیهێنانی ئازادییان. شرۆڤەیەکی مێژوویی ـ کۆمەڵایەتی ئەوتۆ، کە قوربانییەکان مەحکومی دەستی ئەو کەسانە بکات کە دەیکەن بە قوربانی، بە گووتەی **"لەم نزیکەدا رزگارتان دەبێت"** بیانخاتە رەوشی خافڵاندنەوە، چەندە بانگەشەی زانستیبوون بکات، هەروەها چەندە باسی ئەوەش بکات کە دەتوانێت بەناوی قوربانییەکان شرۆڤە بکات، ئەگەر ئەمانە کەسانێکی نیاز خراپ و چەواشەکار نەبن، خەفڵەتکارێکی مەزنن. واعیزی باسی بتەکانی مێژوون.

## ١ ـ چۆن کۆمەڵگای سۆمەر شرۆڤە بکەین؟

لەبەرئەوەی بابەتەکەمان وەک پێشەکییەکە بۆ کۆمەڵناسی بونیادیی، گرێدراو بەو ئامانجەوە جێگا بە سۆمەرییەکان دەددین. مێژووی شارستانی نانووسینەوە، بەلام پێویستە شرۆڤەکانم بە کومەکێک بزانرێت بۆ ئەم بابەتە. لە وەلامی ئەم پرسیارە دەگەڕێم: کاتێک شرۆڤەی مێژوو دەکەین نموونەی سۆمەر چۆن بنرخێنین؟ دەبێت وەلامەکەی هەم لەرووی پەیڕەودوە روون بێت، هەم بۆ چوونە ناو مێژووەوە کۆمەک بەخش بێت. لە زۆر لایەنەوە تاوتوێکردنی ئەم نموونەیە سوودمەند دەبێت.

ا. هەر وەکو دەزانرێت ئەو شارستانییەی لە زەوییە گونجاو و لیتاوییەکانی شوێنی بەیەک گەیشتن و لێک نزیکبوونەوەی هەردوو رووباری دیجلە ـ فورات لە میزۆپۆتامیای خواروو ئاواکران، لە ئەنجامی هەمەرەنگی و زۆری خۆراکی چاخی بە دەزگابوونی نیولیتیک هاتۆتە ئاراوە کە لە میزۆپۆتامیای سەروودا بووە و بە قۆناخی تەل حلف (٦٠٠٠ ـ ٤٠٠٠پ.ز)یش ناودەبرێت. ئەوەی رێگای لە پێش کردۆتەوە، هێندەی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان، کۆمەڵگای گوندە کە رێگای لە پێش زهنی دۆزینەوەی ئەم ئامرازانە کردۆتەوە. نیشتەجێبوون بەواتای کێڵگە دێت؛ ئەوەی لەگەڵیدا کاریان لە یەکترکردووە و گەشەی سەندووە بە دەزگابوونی کۆمەڵگایە. بە واتایەک لە واتاکان بە دەزگابوون رێکخستنی زهنییەتی کۆمەڵگایە، کۆمەڵکاری (هەرەوەزی)یە. لەباری وەرزەکان، هەبوونی بارانی پێویست، ئاودێری ناکاتە پێویستییەکی لەپێشینە. بەلام گرنگی و

بایەخی ئاودێری دەركی پێدەكرێت. لە میانەی دەیان نموونەی هەڵكۆڵینی شوێنەوارناسی لەم گۆڕەپانەدا دەیسەلمێنێت كە لە سالانی نزیك بە (٣٠٠٠پ.ز) چەندین گوندی نیشتەجێی میزۆپۆتامیا بە ئاستی شار گەیشتبوون.

یەكێك لە نیشانە یەكلاكەرەوەكانی هەبوونی شار هەبوونی دیوارە لە دەورووبەریدا، لە چەندین گردۆڵكەدا ئەمە دۆزراوەتەوە. بەڵام سنووورداری ئاودێری و بە بنەما گرتنی كشتوكاڵی دێمی، گەورەبوونی زیاتر و زۆربوونی ژمارە ئاستەم دەكات. (دیجلە ـ فورات)ی خواروو بۆ ئاودێری زۆر لەبارە، هەرچی زەوییە زۆرە و بەپیتە. لە میانەی بەڵگەكانەوە سەلمێنراوە كە لە سالانی (٥٠٠٠ پ.ز)دا یەكەمین نیشتەجێبوونەكانی گوند لە ڕێگای كلتووری تەل حەلەفەوە لە باكوورەوە بۆ ئەوێ گواستراوەتەوە. چونكە لەم قۆناخەدا لەچاو قۆناخی پێش خۆیدا بەهۆی زیادبوونی ژمارەی دانیشتوانەوە جموجۆڵی بەردەوام زەحمەتە. ئەو گوندانەی گەورە و زیاد بوونە بۆ بڵاوبوونەوە بە هەر چوار لادا لە ئامادەباشیدان. لە میانەی هێڵە گشتییەكانەوە هەوڵی باسكردنی ئەم قۆناخەمان دابوو. چەندە بەرەو باشوور بچیت باران كەم دەبێتەوە، مسۆگەر پێویستی ئاودێری لەگەڵ خۆی دێنێت، ئەمەش پێویستی بە ڕێكخستنێكی بەرفراوان هەیە. هەر وەكو ئاگادارین ڕێكخستنی نموونەییش لە دەوروبەری ئەو پەرستگایانە پێكدێت كە زیگۆرات (زەقورە)ی پێدەڵێن.

هەرسێ ڕۆڵی بەناویەكداچووی زیگۆرات بۆ شیكاركردنی تەواوی كۆمەڵگای سۆمەر ڕۆڵی كلیل دەبینێت. یەكەمین ڕۆڵ: ئەوانەی لە نهۆمی خواروو و لەژێر موڵكایەتی زەقورەكاندا كاردەكەن خەباتكارەكانی خاك (كێڵگە)ن. دروستكەران (وەستا) ی ئامرازەكانیش لێرە دەمێننەوە. دووەمین ڕۆڵ: ئەركی بەڕێوەبەرایەتییە، لەلایەن ئەو ڕاهیبانەوە جێبەجێ دەكرێت كە لە نهۆمی دووەم دەمێنن. ڕاهیب بۆ ئەوەی ئەنجامی كارەكانی

بەرهەمهێنان بژمێرێت و بە شێوەیەکی بە کۆمەڵ خەباتکاران بخاتە ناو کارەوە پێویستە مەشروعییەت (هێزی ئیقناع کردن) ئاوابکات. واتا دەبێت کاری دین و دونیا بە یەکەوە بەڕێوەببات. ڕۆڵی سێیەم: لەلایەن هەبوونە ئیلاهییەکانەوە (نموونەی یەکەم پانتائۆن: ئەنجوومەنی خوداوەندەکان)[1] جێبەجێ دەکرێت، کە لەنهۆمی سێیەمینن! ئەمە کاریگەری مەعنەوییە. هەر وەکو لە "**بەرگرینامەی مرۆڤی ئازاد**"یشدا ئاماژەم پێکردبوو، زیگۆرات (زەقورە) وەکو هێلکاری (نموونە)ی کۆمەڵگاکانی شارستانی دواترە. دامەزراویکی نموونەیی بەرکەماڵی وەهایە مۆدێلی بنەڕەتی خوڵقاندنی کۆمەڵگای ئەو شارانەی ئەمڕۆیە کە ژمارەیان سەدان هەزاری تێپەڕ کردووە و بە ملیۆنان دانیشتوانیان تێدایە. تەنانەت گوتبووم: منداڵدانی ڕێکخستنی جۆری دەوڵەتە کە لە کۆمەڵگای شاردا بە دەزگابووە. لە سەردەمی خۆشیدا زەقورە تەنیا ناوەندی شار نییە، خودی شارە. شارەکانیش بۆ سێ بەشی سەرەکی جیادەکرێنەوە. بەشی بەدەستهێنانی مەشروعییەت: پەرستگا (ماڵ و شوێنی خودا)، بەشی دانیشتنی بەڕێوەبەرانی شار کە کەمێک فراوانترە، فراوانترین بەشیش گەڕەکەکانە کە خەباتکاران تێیدا نیشتەجێن. زەقوورەکان هەرسێ ئەرک بەیەکەوە جێبەجێ دەکەن. بە تایبەتیش وەکو یەکەمین نموونەی دامەزراوەیی لە جیهاندا.

کاتێک لە نزیکەوە تەماشا بکەین دەبینین کە راهیب یەکەمین دەستپێشخەرە. بە گوێرەی سەردەمی خۆی سەرمایەدار ـ بە ئامانجی باشتر تێگەیشتن ئاماژەی پێدەکەم، ئەگەر نا سەرمایەداری مۆدێرنیتە گۆڕاوە ـ خاوەن کارە و ئاغایە. کاری مێژوویی هەیە دەبێت ئەنجامی بدات. بەر لە هەموو شتێک دامەزرێنەری شارە کە مۆری خۆی لە کۆمەڵگایەکی نوێ دەدات. نەک گوندێکی سادە بەڵکو شارێک لە دەوروبەریدا شێوە دەگرێت. ئەگەر ئەمە بێنینە بەرچاوان کە تەنانەت لە ڕۆژی ئەمڕۆمان کارێکی چەندە سەختە،

---

١ـ لای سۆمەرییەکان پەرستگایەکی پەرستنی هەموو خوداوەندەکانە؛ وشەی پانتائۆن بەولاتای گۆڕستانی پیاوە شکۆدارەکان دێت.

ئەو کاتە گەورەیی ئەرکەکەی راهیب باشتر دەرکی پێدەکرێت. ئەو شارەی ئاوادەکرێت پێویستی بە ژمارەیەکی زۆری خەباتکاران هەیە. ئەمانە لە کوێ پەیدا دەکات؟ وەرگرتنی (دابڕینی) مرۆڤ لە کلان و ئەتنیک زۆر ئاستەمە. وەک ئەمڕۆ بێکاری بە دەزگا نەبووە. دابڕاوە تاک و تەراکان بەس نین. هێشتا بۆ قۆناخی بە کۆیلەکردنی زۆرەملێیی مرۆڤ هەنگاو نەنراوە. شێمانە دەکرێت گشت ئەوەنتاژی راهیب بەکارهێنانی چەکی خوداوەند بێت. بەڵێ لێرەدا یەکێک لە رۆڵە سەرسوڕهێنەرەکانی راهیب دەکەوێتە گەڕ: **ئەرکی خولقاندنی خوداوەند**. بابەتەکە زۆر گرنگە. ئەگەر سەرکەوتوو نەبێت، شاری نوێ و کۆمەڵگاکەی، لەم سۆنگەیەشەوە بەرهەمی زۆر فەراهەم نابێت. ئەم نموونەیە زۆر بە باشی روونی دەکاتەوە کە بۆچی یەکەمین بەڕێوەبەرانی دەوڵەت راهیبەکان بوون. زەقورە تەنیا شار، بەرهەمی زور و کۆمەڵگای نوێ ئاوا ناکات، بەڵکو لەگەڵ ئەمانەشدا، بە خوداوەندیشەوە جیهانی تەواوی زاراوەکانی، ژمیریاری، ئەفسوون، زانست، هونەر، خێزان، تەنانەت یەکەمین ئالوگۆڕیش دادەهێنێت، پیلاننامەی هەموویان دادەنێت، پڕۆژەیان بۆ پێشدەخات و بونیادیان دەنێت. یەکەمین ئەندازیاری کۆمەڵگایە. یەکەمین بیناسازە. یەکەمین نموونەی پێغەمبەرایەتییە. یەکەمین ئابووریزانە. یەکەمین کارسازە. یەکەمین وەستایە. یەکەمین پادشایە.

با وردەکاری کارە سەرەکییەکانی راهیبەکان ببینین:

ب ـ خولقاندنی خوداوەند و ئایینێکی نوێ لە سەرووی کارە گرنگەکانی راهیبەوە دێن. بە گوێرەی شرۆڤەی من ناوەڕۆکی دۆزینەوەی ئایین لەلایەن راهیبەکانی سۆمەرەوە ئەڵقەی پەڕینەوەی نێوان پەرستنی **"تەوتەم"** و ئایینە ئیبراهیمییەکان پێکدێنێت چونکە ئەم قۆناخەی نێوانیان وەک دابڕانێک دەبینرێت. تێکەڵەیەکی زاراوەی هێزی رێکخەری ئاسمان و ئایینی تەوتەمی دەست نیشانکەری ناسنامەی کۆمەڵگایە. شرۆڤەیەکی گشتی پەسەندکراوە کە تەوتەم

گوزارشت لە ناسنامەی کلان و دۆخە فراوان بووەکەی (تیرە) دەکات. هەر ئۆبژەیەک لە ژیانی کلاندا جێگای گرنگی و بایەخ پێدان بێت دەشێت ببێتە تەوتەم. زیاتر ئەو هەبوونانە بە بنەما دەگرن کە گوزارشت لە هێز دەکەن. ناوی هۆزەکانی لە جۆری شێر، هەڵۆ، مار، گورگ، خۆر، با، باران، ناوی رووەک و درەختە گرنگەکان لەو سەردەمەوە بۆمان ماوەتەوە. رەوشی پیرۆزی لە دەوروبەری **"ژن ـ دایک"** ی هێزی بزوێنەری نیولیتیک، کردەی پیاوە راهیبەکان دێنێتەوە بیری مرۆڤ. سیمبولەکانی بەرەکەتی تەوتەم و خوداوەندی ئاسمان بە شێوەی دایکە ـ خوداوەند بایەخدار دەبێت.

دواتر دایکە ـ خوداوەند لەگەڵ خوداوەندەکانی راهیبی سۆمەر دەکەوێتە ناو شەڕێکی مەزنەوە. بە تایبەتی کێشمەکێشی نێوان خوداوەندە پیاوی فێڵباز **"ئەنکی"** و **"ئینانا"**ی نوێنەری خوداوەندی ژن بابەتی سەرەکی داستانەکانی سۆمەرە. پێکدادانی کۆمەڵگای گوندی نیولیتیک کە لە دەوروبەری گوندەکانی حەوزی دیجلە ـ فورات ی میزۆپۆتامیای سەروو کۆبوونەتەوە و رێگا بە چەوسانەوە نادات، لەگەڵ کۆمەڵگای شار کە لەلایەن راهیبەکان ئاواکراوە و بۆ یەکەمین جار بۆ چەوسانەوە کراوەیە، لە پشتیەوە جیاوازی بەرژەوەندی شاراوەیە. بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا **"کێشەی کۆمەلایەتی"** جددی سەرهەڵدەدەن. بێگومان کێشەی کۆمەلایەتی سەرچاوەی شەڕی نێوان هێزە ئاراستەکارەکانی هەردوو کۆمەڵگاکەیە. بەلام هەر وەکو لە مێژوودا بینیمان زمان و زاراوەکانی ئەم شەڕە لەلایەن شێوەکانی زهنییەتی ئەو سەردەمەوە دەستنیشان دەکرێت. چونکە ئەو شێوە زهنییانەی ئەمڕۆ لە ئارادان ئەوکاتە بوونیان نەبووە. خودی کۆمەڵگا تەنیا لە میانەی ناسنامەیەکی نیمچە ـ خوداوەندی گوزارشتی لێدەکرێت. زهنی مرۆڤ لە چەمکی ناسنامەیەکی ئەبستراکتی نابەرجەستانە ئێجگار دوورە.

لەو قۆناخەدا زهنی مرۆڤ سروشت بە زیندوو دەزانێت. سروشت پڕە لە خوداوەند و رۆح. (بە گوێرەی رۆژی ئەمڕۆمان

دواکەتوو نییە، بە گوێرەی من شرۆڤەیەکی پێشکەوتوو و نزیک لە راستییە). دەست لێدانیان دەشێت ئەنجامی مەترسیداری لێبکەوێتەوە. هەریەکە و پیرۆزی خۆی هەیە. پێویستە بەرێز و هەستیارییەکی زۆرەوە لێیان نزیک بیتەوە. بێ ڕێزییەکی هەرە بچووک دەشێت کارەساتی لێبکەوێتەوە. لەم سۆنگەیەوە بۆ دامرکانەوە و توورە نەبوونیان پێویستە خێر و قوربانی پێشکەش بکرێت. رازیکردنی خوداوەند و پیرۆزییەکان لە ڕێگای پێشکەشکردنی قوربانییەوە ئەوەندە بایەخدار بووە، بۆ ماوەیەکی درێژخایەن قوربانی کردنی منداڵان، کچان و کوڕان دەبێتە نەریتێک. نەریتێکی ترسناکە، بەڵام لەو بڕوایەدان کە کۆمەڵگای لەسەر پێیان ڕاگرتووە. بۆ ماوەیەکی درێژ ئەم نەریتە لای راهیبە ژن و پیاوەکان چەواشە دەکرێت. بەڵام مسۆگەرە ناوەڕۆکەکەی سەبارەت بە پیرۆزی و پاراستنە. هەموو جۆرە پەیوەندییەکی نێوان جڤاتە (کۆمەڵگا)کانی مرۆڤ وەکو پەیوەندی و ناکۆکی نێوان ئەم پیرۆزیانە و خوداوەندەکان گوزارشتیان لێدەکرێت. بەم جۆرە هزر و زمان ئاواکراون. **"زمانی زانستی پۆزەتیڤ"**ی ئەمڕۆمان لەو کاتانەدا نەبووە. ئەم دووسەد ساڵەی دوایی مرۆڤایەتی ئاشنای ئەم زانستە پۆزەتیفە نوێیەی زمان ـ راستتر ئەم ئایینە ـ بوو. کاتێک هەوڵی راڤە کردنی مێژوو دەدەین هەرگیز نابێت ئەم راستییە لەبیربکەین.

لەم سۆنگەیەوە شەڕی نێوان ئینانا و ئەنکی پێکدادانێکی کۆمەڵایەتی دژوارە. بێگومان ئەم شەڕە بناخەی ماددی خۆی هەیە. لەو شەڕ و پێکدادانەی کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا لە تورکیا ڕوودەدات راستی ئەم شرۆڤەمان دەبینین. لە ململانێی نێوان (CHP = پارتی گەلی کۆماری) کە خۆی بە زانستی و پۆزێتیڤیست دەزانێت، لەگەڵ (AKP = پارتی داد و گەشەپێدان) کە خۆی بە گرێدراوی ئایینی ئیسلام و میتافیزیک دەبینێت، جارێکی دیکە لە نزیکەوە دەبینین کە دیالیکتیکی مێژوو چۆن کاری کردووە. دەبێت باش لە فکرماندا تۆماری بکەین کە هیچ ململانێیەکی ئابووری،

سیاسی و سەربازی نییە ئایینی تێکەڵ بە ململانێی کۆمەڵایەتی نەکردبێت. لە دۆخێکی پێچەوانەدا دەکەوینە ڕەوشی **"سۆسیالیزمی بونیادنراو"**.

**"ئەن"**[١]ی خوداوەندی ئاسمان و **"ئەنکی"** خوداوەندی سەرزەوی کە هەردووکیان زادەی ڕاهیبی سۆمەرن خاوەن کارەکتەری پیاوانەن. ئەم ڕاستینە هێزی پیاو پیشاندەدات کە لە کۆمەڵگای شاری سۆمەردا دەرکەوتۆتە پێش، واتا پیرۆزی دەکات و سیفەتی ئیلاهی پێدەبەخشێت. جۆرە پیرۆزاندنێکە کە پیاوی ڕێبەر و شکۆدارە تازەکە، خودی کۆمەڵگایە کە **"لە سەر زەوییەوە تا دەگاتە ئاسمان پیرۆزی و ئیلاهیبوون"**ی بەدەستهێناوە. کەمێکی دیکە ژێر ئەم کارە بکۆڵین باشتر دەرکی پێدەکەین کە ئەوەی شکۆدار کراوە **"چینی ڕاهیبە"**. هەر وەک چۆن ئەگەر بنی باوەڕی ئینانا بکۆڵین هێزی کۆمەڵایەتی ژن ـ دایک دەبینین کە هێزی ئاراستەکار و خولقێنەری نیولیتیکن.

هەرچەندە ئەم ململانێیە لە کۆمەڵگای سۆمەردا هاوسەنگییەکەی دژی ژن تێک بچێت، بەڵام تا ساڵانی ٢٠٠٠پ.ز هاوسەنگ بەڕێوەچووە. لێکۆڵینەوەی ململانێی جیاوازی ژن ـ پیاو کە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان هاتووە لەناو هەمەڕەنگییە مێژووییەکەی ئەزموون بەخشتر دەبێت. هەوڵی ئەنجامدانی دەدەین.

لە کاتێکدا ڕاهیب نهۆمی هەرە سەروو بەو خوداوەندانە دەدات کە پێ بە پێ ژمارەیان کەم دەبێتەوە، تا دوا ڕادە ئەم نهۆمە بە نهێنی دەهێڵێتەوە. جگە لە خۆی (سەرۆکی ڕاهیبەکان) قەدەخەکردنی چوونی هەموو کەسێک دەخاتە ژێر تۆمارەوە (دەیکات بە ڕێسا). ئەم تەکتیکە بۆ پێشکەوتنی ئایینێکی نوێ گرنگە. هەم ڕێز و مەراقی مرۆڤ، هەم وابەستەبوونی پێشدەخات. سەرۆکی ڕاهیبەکان لەناو کۆمەڵگا بڵاوی دەکاتەوە کە لەو شوێنە چاوی بە خوداوەند

---

١ـ En یان An: خوداوەندی ئاسمانە لای سۆمەرییەکان، هێماکەی قۆچ بووە، بەگەورەترین خوداوەندی خوداوەندەکانی سۆمەر دادەنرێت. بەبۆچوونی ئەوان ئاسمان نێر، زەویش مێ (کی)یە، هەربۆیە وێنەی هەردووکیانیان بە یەکتر لکاوییەوە دەنەخشاند.

دەکەوێت، قسەی لەگەڵ دەکات. ئەوەی خوازیاری بیستنی فەرموودەی خوداوەند بێت، دەبێت گوێ ڕایەڵی **"گووتەی"** سەرۆکی ڕاهیبان بێت. چونکە ئەو تاکە گووتە بێژی ڕێ پێدراوی خوداوەندە. ئەم نەریتە وەکو خۆی بۆ ئایینە ئیبراهیمییەکان گواستراوەتەوە. حەزرەتی موسا لە شاخی توری ـ سینا لەگەڵ خودا دواوە و **"دە فەرمان"**ەکەی وەرگرتووە. حەزرەتی عیساش ناوەکەی دیکەی گووتەبێژی خوداوەندە. چەندین جار حەزرەتی عیساش هەوڵی گفتوگۆکردنی لەگەڵ خوداوەند داوە، کەچی شەیتان بەربەرستی کردووە. بەلام لە دواییدا سەردەکەوێت. هەلکشانی حەزرەتی محەمەد بۆ میعراج نیشانەی بەردەوامکردنی هەمان نەریتە لە ئیسلامدا. نهۆمی سەرەوە لە ئایینی گریک ـ ڕۆما وەکو پانتائۆن بە شێوەیەکی شکۆدار ڕێکدەخرێت. هەرچی لە ئایینە ئیبراهیمیەکانە بە شێوەی حەورا، کلێسا و مزگەوت شکۆدارانەتر سەرلەنوێ ڕێکدەخرێتەوە. زیادبوونی ڕۆڵی چینی ئاییندار لە ناو کۆمەلگادا زۆر روون و ئاشکرایە.

سەرۆکی ڕاهیبەکان ئەو کەسەیە کە لە نهۆمی ـ ماڵی خوداوەند چڕبوونەوەی هزری بە دەست هێناوە. بۆ ئەوەی سیستەمی کۆمەڵگای نوێ بە کاریگەر بێت، تا دواڕادە گرنگە بە گوێرەی ئەو گووتانە بێ کە لە دیالۆگەکەی لەگەڵ خوداوەند جێگای باس بووە. بۆ نوێنەرایەتی کردنی خوداوەندەکان بۆ یەکەمین جار هەندێک پەیکەر لەم نهۆمە جێگیر دەکەن. ئەم داهێنانە (دۆزینەوە) مەراقی مرۆڤ زیاتر دەکات. بتی سیمبۆلی و وێنەی خوداوەندی باسکراو پێویست دەبینرێن. چونکە یادگای مرۆڤی ئەم قۆناخە زیاتر لەوەی لە میانەی ئەم جۆرە زاراوە نابەرجەستانەوە بیر بکاتەوە، لە ڕێگای وێنە و هێڵکارییەوە بۆ وەرگرتنی زهنی لەبارە. ئەو هزرەی بەرجەستە نەبێت، واتا زارەکی و ئەبستراکت بێت تێگەیشتنی زۆر ئاستەمە. جڤاتەکانی مرۆڤ بە بەرفراوانی لەژێر کاریگەری زمانی ئیشارەت (جۆرێک لە زمانی جەستە و وێنە)دا دەژین. هەربۆیە خوداوەندی

له شێوەی بت و وێنه دەرکی پیدەکرێت. وێنه زۆرەکانی ژنی قەڵەو که له سەردەمی دایکه ـ خوداوەند ماودەتەوە، خاکی (دڵنزم)ترن، نوێنەرایەتی **"دایک ـ ژن"**ی بەپیت ـ بەرهەم هێنەر دەکات.

بوونی نهۆمی سەرەوەی زەقوره به یەکەمین نموونەی ماڵی خودا، پەنتائۆن، کڵێسا، حەورا، مزگەوت و زانکۆ تا دواڕادە ئەزموون بەخشە. ئەم پێکهاتە مێژووییانەی هاوشێوەی ئەڵقەکانی زنجیر به یەکترەوە گرێدراون به واتای ناسنامه و یادگای پیرۆزی کۆمەڵگاش دێن. تیۆلۆژی ئەم یادگایه دەکاته فەلسەفه و خەڵکی فێر دەکات: به شێوەیەکی نابەرجەسته (ئەبستراکت) و دابڕاو له نموونەی یەکەمی. گەورەترین سەر لی شێواندن له مێژوودا له گۆڕەپانی تیۆلۆژیدا ئەنجام دەدرێت. بێگومان نکۆڵی له رۆڵی تیۆلۆژی ناکرێت له پێشخستنی زانست و فەلسەفەدا. بەڵام لەبەرئەوەی سەرچاوه کۆمەڵایەتییەکەی دەستنیشان ناکەن و له میانەی پەنابردنه بەر بتی (گەورەی) بتەکان و ئەبستراکتی نابەرجەستەکانەوە بەرێوەی دەبەن، بەو به کۆمەڵگابوونەی لەم رێیەوە ئاوایدەکەن، به شێوەیەکی سەرەکی دەبنه بەرپرسیاری سەرەکی شارستانیەت، بەتایبەتیش شارستانی ئەمڕۆمان.

بێگومان ئەو شرۆڤانەی تیۆلۆژی که بۆ سەرچاوه رەسەن و راستەقینەکان شۆڕ دەبێتەوە کۆمەکێکی مەزن پێشکەش به واتاناسی دەکات، بەڵام زۆر گرنگه دەرک بەوە بکرێت که لەبەرئەوەی به زۆری وەک پێگەیەک جێگای خۆیان له تەواوی رێکخستنەکانی پلەداری و فەرمی دەوڵەتدا گرتووە، به شێوەیەکی به ئاگا بێت یان خۆڕسکانه(لەخۆوە) گەورەترین شێواندنی واتایان بەڕێوەبردووە. بۆ ئەوەی له رۆژهەڵاتی ناوینی ئەمڕۆمان تێبگەین، له میانەی شیکارکردنی ئەو شێوانەی له قۆناخه گرنگەکاندا بەدەستیان هێناوه هەوڵی روونکردنەوەی ئەم بابەتانه دەدەین.

ج ـ دووەمین کاری گرنگی راهیب ئەندازیاری کۆمەڵگایه. هەم نەخشەدانەر و بونیادنەری کۆمەڵگای نوێیه، هەم بۆ خۆشی

بەڕێودی دەبات. ئەم ئەرکەش بە تایبەتی لە نهۆمی دووەمی زەقورە بەڕێوەددبرێت کە شوێنی راهیبەکانە. وەکو بریکاری خوداوەند لەژێر بەرپرسیارێتی سەرۆکی راهیبەکان تا دەبن بە چینێکی پیرۆز ژمارەیان زیاد ددبێت. وەکو کەمینەی بەڕێوەبەرایەتی هەر شارێک، یەکەمین چینی پلەداری (بەڕێوەبەرایەتی پیرۆز) پێکدێنن. لەخۆڕا نەمان گووت راهیبەکان یەکەمین گەلالەنامەی پرۆفیسۆرین. لە کاتێکدا بەرهەمهێنانی بەهای ماددی بە پیاوەکانی نهۆمی یەکەم - سەرەتای کۆیلایەتی - جێبەجێ دەکەن، خۆشیان لەگەڵ خوداوەند بە شێوەیەکی سەردکی خەریکی زانست و چۆنییەتی ڕێکخستنەکەی دەبن. بناخەی نووسین، بیرکاری، ئەسترۆنۆمی، پزیشکی، ئەددب و تیۆلۆژی لە ژووردکانی نهۆمی راهیب دادەنرێت. نهۆمی ناوین لە هەمان کاتدا یەکەمین نموونەی خوێندنگا - زانکۆیە. نهۆمی خوداوەند نموونەی یەکەمین پەرستگایە، نهۆمی راهیبیش نموونەی یەکەمین خوێندنگاکانە. بێگومان بەڕێوەبردنی کاروباری کۆمەڵگای شاری گەشەکردوو هۆکاری سەرەکی ئەم کرداردیە. ددبێت باش دەرک بەم راستییە بکرێت کە هیچ کاتێک وەک مارکس دەڵێت لە میانەی "**رەنجدەرە ئازادەکان**"ەوە، کردە (چالاکی)ی ماددی بە تەنیا بەڕێوەنەبراوە. بە قۆناخی سەرمایەداریشەوە لە هیچ کۆمەڵگایەکی چینایەتیدا، خاوەنەکانی موڵکی تایبەت یان هاوبەش رەنجدەری ئازادیان نابێت. هەر مرۆڤێک لە ڕێگای فشار و مەشروعییەتەوە نەکرابێت بەکۆیلە ئازادانە لە موڵکی یەکێکی دیکەدا کار ناکات! لە شوێنی خۆیدا ئەم بابەتانە زیاتر راڤە دەکەین.

تارادەیەکی مەزن راهیبەکان لە ڕێگای مەشروعییەت (ئیقناع و رازی کردن)ەوە کارەکانیان رادەپەڕێنن. گەورەترین بەهرە و داناییان لەمەدا گووتەی خوداوەند و پاوانکردنی زانستە. گووتەی خوداوەند و داهێنانە زانستییەکان هێزێکی مەزنی بەڕێوەبەرایەتییان پێدەبەخشێت. نابێت لەبیر بکەین تەنانەت لە سەرمایەداریشدا زانست هێزە. ئەوە بە بیر خۆمان بێنینەوە کە لە کۆمەڵگای

نیولیتیک به تایبەتی لە قۆناخی تەل حەلەفدا بناخەی ئەم زانستە دانراوە. کۆمەک و رۆڵی خوداوەندەکانی ژن ـ دایک لەم قۆناخەدا یەکلاکەرەوەدیە. دەبێت لە تەواوی بابەتەکانی رووەک، ئاژەڵی ماڵی، گڵکاری، رستن، ئاش (دەستاڕ)، خانوو(ماڵ) و ماڵی پیرۆزدا باش لە رۆڵی دایک ـ ژن وەک یەکەمین مامۆستا تێبگەین . بانگەشەی ئینانای دایکە ـ خوداوەند لە ململانێکەیدا لەگەڵ خوداوەندی پیاو ئەنکی کە دەڵێت: **"خۆم داهێنەری (١٠٤) بەها ـ ME ـ گەورەکەم، بەلام لێم دزراوە"** باش ببینرێت. واتا زۆربەی داهێنانەکان لەلایەن دایک ـ ژنەوە دۆزراوەتەوە. پیاوە بەڕێوەبەرەکان ئەمانەیان لە ژنەکان دزی. قۆناخی شارستانی تاڕادەیەک لەسەر ئەم بنەمایە بونیادنراوە.

رۆڵ و کۆمەکی راهیبەکانیش بچووک ناکرێتەوە. ئەو نووسین، ئەسترۆنۆمی، بیرکاری، پزیشکی و تیۆلۆژیەی دۆزیویانەتەوە رۆلێکی مسۆگەریان لە بناخەی زانستی شارستانیدا هەیە. راهیبەکانی سۆمەر پێگەی پێشەنگایەتییان لە قۆناخی دەست پێکردنی زانستدا هەیە.

هەر وەکو دەزانرێت ناوبردنی یەکەمین پادشاکانی سۆمەر بە پادشا ـ راهیبەکان بۆ ئەو راستییە دەگەڕێتەوە کە لێرەدا باسمان کرد. پادشا ـ راهیبەکان یەکەمین پادشای کۆمەڵگای شارن. هەر شارێک بەر لە هەموو شتێک پادشا ـ راهیبێکی هەیە. ئەو مەشروعییەتەی لەسەر بنەمای تیۆلۆژی و زانست بەدەستیان هێناوە هۆکاری بنەڕەتی بەڕێوەبەرایەتی پادشاییە. ئەم رەوشە لە هەمان کاتدا لایەنی لاوازی راهیبەکانە. دوای قۆناخێکی دیار سەردەمی خانەدانە(بنەماڵە)کان دەست پێدەکات. رێککەوتنی نێوان سەرۆکی خانەدان و **"پیاوی بەهێز"** ـ پیاوی بەهێز داروودەستەی سەربازی لە دەوروبەر کۆبۆتەوە ـ رۆڵی سەرەکی لەمەدا دەبینێت. توندوتیژی بەسەر **"گەمەی راهیب"** دا سەردەکەوێت. دواتر باسی ئەم بابەتە دەکەین.

د- نهۆمی هەرە ژێرەوەی زەقورە شوێنی خەباتکارانە. لەو سۆنگەیەوە کە بەردی بناخەی یەکەمین کۆیلە، رەنجدەر و کرێکاریان داناوە، دەبێت باش دەرک بە **"خەباتکارانی نهۆمی یەکەم"** بکەین. لەکوێ و چۆن کۆکراونەتەوە؟ ئایا زۆرەملێ و ئیقناع کردن چ رۆڵێکیان لەمەدا گێڕاوە؟ لە چ کۆمەڵگایەکەوە و بە چ بەرامبەرێک هێناویانن؟ ئایا لەناویاندا ژن هەبووە؟ رۆڵی ژن و خێزان چییە؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە رۆشن بوونەوەیەکی بایەخدار لەگەڵ خۆیدا دێنێت.

شیمانە دەکرێت لە پێکەوەنانی یەکەمین گروپەکانی کارکردندا، هێزی ئیقناعکارانەی راهیبەکان رۆڵی سەرەکی هەبووبێت. دەشێت لە یەکەمین سیستەمی بەرهەمهێناندا، ئەو خۆراکەی لە میانەی ئاودێرییەوە زیادی کرد بە گوێرەی ئەو شوێنەی لێیەوە هاتوون خەباتکارانی باشتر تێر کردبێت. دەشێت ئەوانەی لە ئەنجامی زیادبوونی ژمارە و کۆچبەری و دەرئەنجامی پێکدادانی نێوان تیرەکان، لەگەڵ هۆزەکانیان نەگونجاون، پەرستگایان وەکو رێگایەکی چارەسەری ببینیبێت. هۆکارێکی دیکە، دەشێت پیرۆزی کارکردن لە ئاواکردنی پەرستگا و بەرهەمەکانیدا رۆڵێکی گرنگتر ببینێت. ناردنی منداڵان بۆ خزمەتکردنی پەرستگا لە نەریتی رۆژهەڵاتی ناویندا باوە. بێگاری کردن بۆ پەرستگا تێڕوانینێکی پەسەند کراوە لای هەمووان. تەنانەت بەشێک لە سەربەرزیشی پێدەبەخشێت. خەباتکارانی پەرستگا، وەکو کەسانی شەرەفمەند لەناو کۆمەڵگادا پێشوازییان لێدەکرێت. بە جۆرێک لە جۆرەکان لە دێری کرستیانەکان دەچێت. لایەنی هاوبەشیان لەگەڵ تەریقەتگەراییدا هەیە. کارکردن لەناو موڵکی شێخدا خێر و شەرەفمەندی پێدەبەخشێت.

لەبەرئەوەی زەقورەکان یەکەمین نموونەی روون و پەتی کاری هاوبەشن جێگای سەرنجن. بۆ نموونە هەندێک کۆمەڵناسی وەکو ماکس ویبەر ئەمە وەکو **"سۆسیالیزمی فیرعەونی"** دەنرخێنن. ئاشکرایە کە یەکەمین نموونەی جێبەجێکردنی کردەی کۆمۆنیستییە.

جڤاتی پیشەکارانیش لەناو گروپی خەباتکاراندان. هەموویان بە یەکەوە بەرهەمی کارگەیەک دێننەوە بیری مروڤ. زێدە بەرهەم دەکرێتە عەمبارەوە. ئاشکرایە کە بەرامبەر بە برسێتی و نەبوونی سیستەمێکی باشە. ئەم شێوە کارکردنە بە شێوەیەکی نائاسایی هێزی راهیبەکان زیاد دەکات. هیچ خێزان یان هۆزێک بەم توانایە ناگات. جڤات و هێزێک جێگای باسە کە تەواوی خێزان و تیرەکان تێپەڕدەکات. هیچ نموونەیەک وەکو زەقورەکان رەوشی کۆرپەلە (جەنین)یی کۆمەڵگا و دەوڵەتی نوێ بە روونی پیشان نادات.

هـ - شوێنگەی ژن و خێزان لە سیستەمی زەقورەدا چی بەسەر هات؟ پرسیارێکی گرنگە.رکابەرایەتی ئایینی دایکە- خوداوەند بەرامبەر ئایینی راهیبی زەقورەکان، لە دەقە سومەرییەکاندا زەق و بەرچاوە. ئەم ئۆپۆزسیۆنە شێوەی جیاواز بە خۆیەوە دەبینێت. راهیبە ژنەکان لەژێر سایەی خۆیاندا پەرستگا ئاوادەکەن. تەنانەت هەر شارێک خوداوەندە ژنێکی دامەزرینەریان هەیە. نموونەی بەرچاو ماجەڕاکانی خوداوەندی ئوروک[1] ئینانایە. ئوروک - دەشێت ناوی ئێراقی ئەمڕۆ لە **"ئوروک"** ەوە هاتبێت - وەکو یەکەمین دەوڵەتشاری سومەرییەکان کە جێگای خۆی لە مێژوودا گرتووە، نموونەیەکی شایستەی لێکۆڵینەوەیە. لەبەرئەوەی شاری یەکەمین پادشا - پیاو گلگامێشە بەناوبانگە. شیمانە دەکرێت ئوروک یەکەمین نموونەی دەوڵەتشار بێت. ساڵانی ٣٨٠٠ - ٣٠٠٠پ.ز لە مێژوودا وەکو سەردەمی ئوروک باس دەکرێت. دامەزراندنی شارەکە لەلایەن ئینانای خوداوەندە ژنەوە، ئەوە پشت راست دەکاتەوە کە دێرینە و رۆڵی ژن - دایک تا ئەو کاتەش پێشەنگە. تێکۆشانی ئوروک بەرامبەر بە ئەریدۆ[2] - کە شاری خوداوەند ئەنکییە و لەوانەیە

---

١- ئوروک، ئورک یان ئەرک: شارێکە ٣٥ میل لە شاری ئور دوورە، لە ئێراقی ئەمڕۆ وەرکا ی پێدەڵێن. کۆنترین شاری مێژووی مرۆڤایەتییە، شارستانی بەر لە مێژوو تێیدا سەریهەڵداوە، بۆ یەکەمین جار نووسینی بزماری لێ دۆزراوەتەوە. لە ئەفسانەی گلگامێش دا رۆڵێکی گرنگی هەبووە.

٢- شارێکی دێرۆکی ئێراقە، دەکەوێتە باشوری رۆژئاوای شاری ئور و ٧میل لێی دوورە. لە یەکەمین شاری سۆمەرییەکانە، وشەی ئەریدۆ بەزمانی سۆمەری واتای شوێنی مەزن دەبەخشێت. ناوەندی خوداوەند ئەنکی بووە.

یەکەمین دەوڵەتی راهیبی بێت ـ کراوە بە داستان. بە ئەندازەی ئەوەی لە کەسایەتی ئینانا و ئەنکیدا نموونەی بەرجەستەی ململانێی نێوان ژن ـ پیاو پیشاندەدات، لایەنە داستانییەکەشی دەخاتە روو. لەگەڵ بەسەرچوونی کاتدا وێنەی خوداوەندە ژن کاڵ دەبێتەوە. وەکو دیارە لە قۆناخی بابلدا دووچاری دۆرانێکی مسۆگەر دێت. بە رادەیەک دەبێتە کۆیلە کە ئیتر سۆزانییەکی فەرمی تایبەت و گشتییە.

هەر وەکو دەزانرێت لە بەشێکی زەقورەکاندا ژن وەکو ئۆبژەیەکی ئەشق رۆلی بینیوە. بە تایبەتی رۆلی ئۆبژەی ئەشق بۆ کچانی خێزانە باشەکان جێگای سەربەرزییە. کچە هەڵبژاردە و تایبەتەکان دەبرێنە ئەوێ. لە سیستەمی راهیبەکاندا پیشکەشکردنی ئافرەت سەرسوڕهێنەرە. لە زەقورەکاندا هاوشێوەی سیستەمی کۆشکەکان بە هەموو جۆرە پەروەردەیەکی جوانکاریدا تێپەڕ دەبن. لە هەندیک بەهرد (هونەر، مۆسیقا)دا دەبن بە پسپۆڕ. پیشکەشی رەزامەندی پیاوە بژاردەکانی ناوچەکانی دەوروبەر دەکرێن. کاتێک لەگەڵ هەندێکیان رێکدەکەون، هاوسەرگیری دەکەن. بەم شێوازە هەم داهات، هەم چالاکی پەرستگا تا بڵێی زیاد دەکات. هێنانی ژنێکی پەرستگا تەنیا بەشی پیاوانی بنەماڵە رەسەنەکانە.. هەروەها لەبەرئەوەی پەروەردەی پەرستگایان بینیوە، لەناو تیرە نوێیەکان نوێنەرایەتی چالاکی (مەراسیم) پەرستگا دەکەن و بە کۆمەڵگا ـ دەوڵەتی نوێیانەوە دەبەستنەوە. ژنان بە جۆرێک لە جۆرەکان کاراترین ـ بەرهەمدارترین سیخوڕەکانی کۆمەڵگا ـ دەوڵەتە نوێکەی راهیبن. ئەمە پەیڕەوێکە کە بە شێوەیەکی شارەزایانە تا رۆژی ئەمڕۆمان دەوڵەتەکان لە سەرووی هەمووشیانەوە ئیسرائیل بەکاری دەهێنن. بەم جۆرە بە کۆمەڵ بەکارهێنانی ژن، نموونەی سەرەتایی هونەری **"ماڵی گشتی"** (سۆزانیخانە)یە. **چەندەی ئافرەت دەکەوێت (دەڕووخێنرێت) لە خوداوەندی رەسەن و ژنانی ئەشقی پەرستگاکانەوە بۆ "کرێکارە" بێ چارەکەی سۆزانیخانە دەگۆڕێت**

**که خۆی هەراج دەکات. لەم لایەنەشەوە کۆمەڵگای سۆمەری خاوەنی یەکەمین شەڕەف یاخود بێ شەڕەفییە.**

بەلام بە بێ ئاماژەکردن بەمە تێپەڕ نابم: ئەگەر ئەم پەیڕەوە ئیستیغلال نەکرابایە و بە ئاستێکی شەڕەفمەندانە بگەیەنرایە نموونەیی دەبوو. لەو سیستەمانەی کە دایک - ژن نموونەکەی پێکدێنن یان ئەوانەی باوک - پیاو پێشەنگایەتی دەکات، گەشە کردنێکی تەندروستانەی کچان زەحمەتە. نە زانیاری، نە توانا ماددییەکان دەرفەت بەمە نادەن. گەورە کردن (بەخێوکردن) ی کچان پێویستی بە شارەزایی و ماددیات هەیە. لەوانەیە وەکو گۆڕەپانی گونجاو بیر لە پەرستگاکانی ئافرەتان بکرایەتەوە. بەلام کۆمەڵگای پیاوسالاری لە ڕێگای فشار و قۆستنەوەوە ئەم دەزگایە دادەڕووخێنێت. نموونەی سۆمەرییەکان لەبەرچاوە. دەزگایەک جێگای باسە کە کۆمەڵگا بێزووی پێوە دەکات و بۆ ناردنی کچەکانیان کەوتوونەتە پێشبڕکێوە. بە گوێرەی من بەو دۆخەشیەوە یەکەمین نموونەی خۆی پێشکەش دەکات کە تا ئێستاش پێی نەگەیشتوون. لەم پەرستگایانە (دەشێت بە پەیمانگاکانی ئەمڕۆی تایبەت بە کچان بچوێنرێت) کچان دەرفەتێکی گەورەی پێشکەوتن بەدەست دێنن. ئامانجە سەرەکییەکەشیان هەڵبژاردنی مێرد نییە، بەڵکو پێشەنگایەتی کردنی کۆمەڵگا - دەوڵەتی نوێیە. کۆمەکێکی دەست لێبەرنەدراو پێشکەش بە ژیانێکی کۆمەلایەتی رەسەنتر و پڕ لە ئەشق دەکەن. لە کۆمەڵگایەکی نموونەییدا پەروەردەکردنی کچە بچووکەکان لەناو خانە و سیستەمی قوتابخانەیەکی پیرۆز و شکۆدار ناچارییە. بە تایبەتی پەروەردەی کچان لەناو خێزانی ناوک (باوان و مندالان) و خێزانی فراوان زۆر دواکەوتووە و لە موتوربەکردنیان بە کۆیلایەتی کۆمەڵگای گشتی - کۆمەڵگای پیاو - بەولاوە هیچ ئامانجێکی دیکەی نییە. دەشێت **"پەیمانگای ژنی ئازاد"** ڕۆڵی پەرستگای هاوچەرخ ببینێت. لە کۆمەڵناسی ئازادیدا هەوڵی تاوتوێکردنی ئەم بابەتە دەدەم. وەک بابەتێکی یەکپارچە لەگەڵ

ئەمەدا باسی خێزانیش دەکەم!

ئاشکرایە ڕێکخستنی ژنان لەلایەن زەقورەکانەوە لە چوارچێوەی خزمەتی کۆمەڵگا ـ دەوڵەتی نوێدا پێشخراوە. لە ڕاستیدا ڕاهیبەکان هەم ئەفسوونییانە بیریان کردۆتەوە، هەم کومەڵگا ـ دەوڵەتی نوێیان نزیک بە نموونەیی ڕێکخستووە.

ڕۆڵی زەقورەکان لە **"بازرگانی"** دا زۆر ئاشکرایە کە وەکو کردەیەکی کۆمەڵایەتی تازە گەشەی کردووە. هەرچەندە لە دەقەکاندا باسیش نەکرابێت، مەزەندە دەکەم لە هەمان کاتدا ڕۆڵی خانەیەکی بازرگانییان بینیوە. دەشێت زێدە بەرهەم و ئامرازی بەرهەم هێنانی پیشەکاران ببنە بابەتی بازرگانی. مێژوو ساڵانی ٤٠٠٠ـ٣٠٠٠پ.ز وەکو یەکەمین چاخی پێشکەوتنی (دەرکەوتنی) بازرگانی شرۆڤە دەکات. کۆمەڵگای سۆمەر ڕێکەوتی چاخێک دێت کە لە سیستەمی دیارییەوە (سیستەمی پێشکەش کردنی دیاری لە نێوان جڤات و خێزانەکاندا) بۆ سیستەمی ئاڵوگۆڕ هەنگاو هاوێشترا و کاڵابوونێکی بەرفراوان (بەرهەمهێنان لەپێناو بەهای ئاڵوگۆڕدا) گەشەی کردووە. بۆیە چاوەڕوانی بوون بە **"کۆمەڵگای سەرۆکی بازرگانان"**ی لێ دەکرێت. لە نموونەکانی مێژوودا ـ لە نموونەکانی شوێنەوارناسیدا ـ دەرکی پێدەکرێت کە بەم جۆرە بووە.

دەبینە شاهێدی سیستەمێکی کۆلۆنی ئوروک کە وەکو دیار دەبێت لە قۆناخی ساڵانی ٣٥٠٠ ـ ٣٠٠٠پ.ز دەستی پێکردووە. کۆلۆنیەکانی ئوروک لە سیستەمی چیاکانی زاگرۆس ـ تۆرۆس لەوانەیە یەکەمین هەڵمەتەکانی کۆلۆنیکردن بێت کە بە ناوی دەوڵەتەوە ئەنجامدراوە. کۆلۆنی خانەدانەکان کۆنترە. هەروەها ناکرێت کۆلۆنی هۆز و تیرە جیاوازەکان بە کۆلۆنی ڕاستەقینە لەقەڵەم بدرێت. بۆ کردەی کۆلۆنی پێویستی بە "مەترەپۆڵ" هەیە. ئوروک وەکو مەترۆپۆڵێکی بەناو بانگ دەشێت خاوەنی کۆلۆنی بووبێت. دواتر کۆلۆنیەکانی ئور[1] (٣٠٠٠ ـ ٢٠٠٠پ.ز) ئاشوور

١ـ جێگەیەکی شوێنەوارناسی شارێکی کۆنە کە کۆنترین شارستانی مرۆڤایەتی بەخۆیەوە دیوە. پایتەختی سۆمەرییەکان بوو؛ شێوەی شارەکە هێلکەیی بوو. دەکەوتە کەنار ڕووباری فورات و نزیک شاری ئەریدو. بەناوبانگترین زەقورەکانی مێژووی

(٢٠٠٠ ـ ١٧٥٠پ.ز) بەناوبانگن. بۆچوونی شەخسیم شارەکانی چاخی کۆنی هەراپا و موهانجەدرۆی پەنجاب (٢٥٠٠پ.ز) و خودی شارستانی میسر (٤٠٠٠ پ.ز) بە واتایەکی گشتی و فراوان سیستەمێکی کۆلۆنی شارستانی سۆمەرن، هەرچەندە سەربەخۆ گەشەیان کردبێت و پەیوەندییەکی راستەوخۆیان لەگەڵ شارەکانی سۆمەر نەبووبێت، لە دیجلە ـ فوراتەوە هەڵقوڵاون کە شارستانییەکی زاڵە.

مسۆگەرە کە بازرگانی رۆڵێکی بە کاریگەری لە سیستەمی راهێبدا بینیوە. چونکە زیادبوونی بەرهەمەکانی خۆیان و پێویستی بەرهەمە کەمەکان، دەبێت لە رێگای بازرگانییەوە دابین بکرێن ـ چەندین ماددە بۆ شارەکانی دۆڵی خوارووی میزۆپۆتامیا پێویستە، هەربۆیە بازرگانی ناچارییە، یاخود زەوتکردن. دەشێت هەردووکیان پەیڕەوکرابێت ـ سیستەمی کۆلۆنی کە وەک تۆڕ کراوەتەوە، لەم پێناوەدایە. چەندین کۆلۆنی بەم ئامانجە لە کەناردکانی دیجلە ـ فورات ئاوەکراون. بە شێوەیەکی بەرچاو شوێنەوارەکانیان دەبینرێت. بە تایبەتیش بازرگانی تەختە، کانزا و قوماش بەرفراوانە.

هەر وەکو لە رێگای هێڵە گشتییەکانەوە هەوڵی پێشان دانیمان دا لە دەوروبەری زەقورە نموونەیەکی سەرەتایی کۆمەڵگا ـ دەوڵەتی نوێ پێکهاتووە. وەکو دیار دەبێت نموونەی هەرە سەرەکی پێشکەوتنی بەرجەستە و دەستنیشان کراوی کۆمەڵگا ـ دەوڵەت کە کاریگەری کردۆتە سەر یەکەمین و تەواوی سیستەمەکانی شارستانی سەرچاوەی خۆی لە زەقورەکانی سۆمەر وەردەگرێت. هەڵبەتە نموونەکانی دیکەش لە چینەوە تا دەگاتە میسر بە هەمان رێگادا دەڕۆن. لەدایکبوونی کۆمەڵگای شارستانی ـ دەوڵەت لە راستیدا بە **"منداڵدانی پەرستگای راهێب"**دا تێپەڕ دەبێت. نموونەیەکی کۆنکریتی نابینرێت کە گوزارە لە شێوە هەوێنی دیکە بکات.

کەواتە بە پشت بەستن بە شرۆڤەکردنی نموونەی زەقورە

---

تێدایە. شارە پیرۆزەکەی خوداوەندە ژن ئینانا بووە.

دەتوانین بڵێین، لە میانەی کۆمەڵگای سۆمەرەوە کەوتینە نێو یەکەمین سەردەمی خوداوەندە دەمامکدار و پادشا داپۆشراوەکان. هەر وەکو چۆن راهیبەکانی سۆمەر خواوەندی دەمامکدار بوون، دواتر یەک بە دوای یەک پادشا داپۆشراوەکان ـ بە پۆشاکی سیاسی ـ دێن. ئەویش بەردوتێکی بە تەنتەنە و هەیبەتەوە!

و. لە دوای کۆمەڵگای ـ دەوڵەتی راهیبەکان هاتنی دەوڵەتی خانەدان (بنەماڵە) دەبینین. ئەمیش بە وێنەی کۆمەڵگای دەوڵەتی وەک پەردسەندنێکی کۆمەڵایەتی پڕ واتا کەسایەتی راهیب دەردەخاتە پێش. لە سەرەتادا بۆ بەدەستهێنانی مەشروعیەت و ڕێکخستن پێویستی بە کەسایەتی ژێر هەیە. ئاواکردنی کۆمەلگایەک جێی باسە کە پێویستی بە خۆسەلماندن هەیە. زەحمەت نییە ئەو شرۆڤەیە بکەین کە شتێکی وەها لە میانەی هێزی سیاسی ـ سەربازییەوە ئاوا ناکرێت. بۆ ئەوەی توندوتیژی پەیرەو بکرێت بەر لە هەموو شتێک پێویستە سیستەمێکی بەڕێوەبەرایەتی و کۆمەڵگایەک هەبێت کە بۆ بەرهەمی زیادە و بازرگانی کراوە بێت و بەم ئاستە گەیشتبێت. لەم بوارەدا دەبێت کۆمەڵگای نوێ بە دەزگا بوو بێت. هێزی سیاسی ـ سەربازی تەنیا ئەو کاتە واتادار دەبێت کە کۆمەڵگای بە دەزگابووی بەم جۆرە بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. لە ڕەوشێکی پێچەوانەدا جگە لە پەرەپێدانی کائیۆس هیچ واتایەکی دیکەی نابێت.

بێگومان مێژووی خانەدانەکان لە میزۆپۆتامیادا کۆن و بەهێزە. لەگەڵ گەیشتنی ئەتنیک بە ناسنامەی جیاواز، لەناو سیستەمی هەر هۆز ـ خێڵێکدا کۆبوونەوەیان لە دەوری ئەو کەسانەی لە پاراستنی خێڵ، بەجێکردنی لە شوێنە بە پیتەکان و چارەسەرکردنی گرفتە ناوخۆییەکانیدا خاوەن ئەزموونن، وا دەکات پەرەسەندنی پێکهاتەی خانەدان دەست لێبەرنەدراو بێت. هەڵبەتە دوور نییە کە هۆز یان بنەماڵەیەک دەرکەوێتە پێش. یان بەڕێوەبەرایەتی هۆز ـ خێڵەکە دروست دەکات یان دەستی بە سەردا دەگرێت. بێگومان ڕەزامەندی

ئەندامەکانی خێڵ یەکلاکەرەوەدیە. لە نێوانیاندا پەیوەندییەکی خزمایەتی هەیە، جێگای کەسی بیانی نابێتەوە - مەگەر بەو شێوەیەی خێڵ دەخوازێت بچێتە ریزیانەوە و لەناویاندا بتوێتەوە، دەبێتە ئەندام - بە تایبەتی لە یەکەم قوناخی شێوە گرتنیدا، دوای لاوازبوونی ناسنامەی کومەلایەتی کلان بەهێزترین دەرکەوتەی پێکهاتەی ناسنامەیە. بەم جورە شروڤە دەکرێت، کە ئەم پێشکەوتنە بەقورسایی لە سالانی ٥٠٠٠پ.ز لە مێژوودا سەری هەلداوە. سەرچاوەکەی کۆمەلگای سۆمەر نییە. شیمانەی بەهێز ئەوەیە کە یەکەمین گروپەکانی زمان - کلتووری ئاریان وەک خێلایەتی پەرەی سەندبێت. دەتوانرێت بکووترێت کە کەشە کردنێکی هاوشێوەی سامییەکانیش لە سالانی نێوان ٩٠٠٠ - ٦٠٠٠پ.ز دا جێگای باسە کە لەوانەیە کۆنتریش بێت.

تا سالانی ٥٠٠٠پ.ز دەتوانین بەهێزبوونی خانەدان لە مێزوپۆتامیای خوارووودا ببینین. قوناخی ئەلعوبێد (٥٠٠٠ - ٤٠٠٠پ.ز ناوەندەکەی ئەریدۆیە) کە مەزەندە دەکرێت بەر لە سەردەمی ئوروک بووبێت، سەبارەت بە خانەدانەکان بەهێزە. بەلام هەنگاونانیان بۆ رێکخستنەکانی دەولەت بەرچاو ناکەوێت. هەندێک پێشکەوتن هەن کە هەنگاونانیان بەرەو جۆرێک لە کۆلۆنی دەسەلمێنێت. لە سالانی نێوان **"٥٠٠٠ - ٤٠٠٠پ.ز"**دا جێگیربوونی هەندێک خێزانی بژاردەی سامییەکان لەناو چینەکانی کلتووری ئاریاندا دەبینین. یەکەمین کۆلۆنی سامییەکان لە حەوزی سەرووی **"دیجلە - فورات"** دا دەبینرێت کە ئەمرۆ باشووری رۆژئاوای تورکیای پێدەگوترێت.

دەبێت زۆر باش دەرک بە خەسلەتێکی خانەدانێتی بکرێت، کە تایبەتمەندییەکە لە نزیکەوە رۆژگاری ئەمرۆشمان پەیوەندیدار دەکات: بنەماڵەگەرێتی و بوونی بە خاوەن ژمارەیەکی زۆری کوران، بەردی بناخەی ئایدیۆلۆژیای خانەدانە. فرەژنی و داخوازی بەردەوامیان بۆ ئەوەی کورِی زۆریان هەبێت، داخوازی سەرەکی ئایدیۆلۆژیای خانەدانە. هۆکاری ئەمەش هێزی سیاسییە. هەر وەکو

چۆن راهیب له میانەی پشت بەستن بە هیزی **"واتا"** پیشەنگایەتی کرد. کەسی بەهیزی خانەدان (بنەماڵە)یش له ریگای پشت بەستن بە هیزی **"سیاسی"** رۆڵی پیشەنگایەتی دەبینیت. کاتیک کویرایەلی هیزی سیاسی نەکریت توندوتیژی بەکاردینیت. هەرچی هیزی راهیبە کاتیک گویرایەلی نەکریت، هیزیکی مەعنەوی لە جوری **"غەزەبی خوداوەند"** رۆڵی ئاگادارکردنەوە دەبینیت. سەرچاوەی سەرەکی هیزی سیاسی **"داروودەستەی سەربازی پیاوە بەهیزەکەیە"**. لە سەردەمی پیشووتری نیچیرڤانی، بە تایبەتی لەو قوناخەی دایک ـ ژن تییدا بە کاریگەربوو پیاو سنووردار کراوە.

بە کورتی بۆ تیگەیشتن لەم دیاردەیە، پیویستە ددرک بە سیستەمی دایک ـ ژن و راستینەی خیزان بکریت. لە سیستەمی دایک ـ ژندا میرد یان دیار نییە یاخود زۆر لاوازە. دایک ـ ژن کاتیک منداڵی دەبیت، ئەو ئافرەتە نییە **"لەگەڵ ئەو پیاوەی خۆشی دەویت ئەشقبازی بکات"**. هیشتا ئەشق و کومەلگای رەگەزپەرستی لە رۆژەڤدا نییە. ئافرەت بە پەیوەندی ژن و میردایەتی کریدراوی هیچ پیاویک نییە. پیاویش لە دۆخیکی وەهادا نییە کە بالادەستی بەسەر ئافرەتدا ئاوا بکات و بلیت **"ژنی منی"**. نیچیروانی کاریکە خەریکی دەکات، جا کاتیک بەرهەمەکەشی کەم بیت بەهاکەی نازانریت. رەوشیکی وەها لەناو کومەلگادا پیش نەکەوتووە کە منداڵەکان بە هی پیاو ببینیت. منداڵەکان هی دایک ـ ژنە. وەک پیویستییەکی سروشتەکەی شتیکی لەم جۆرە جیگای باس نییە کە دایک ـ ژن بە دوای شەهوەتدا رابکات، بۆ چیژ وەرگرتن بە دوای جووتبوونی زایەندیدا بگەریت. وەکو زیندەوەرەکانی دیکە زایەند لای ئەویش بابەتیکە. پەیوەندییەکی زایەندی بە ئامانجی زۆربوون جیگای باسە. رەنجدان و زەحمەتکیشان لەپیناو منداڵەکانیدا، هۆکاری سەرەکی گەرانەوەی منداڵ بۆ سەر دایک ـ ژن. هەم لە دایکبوون هەم بەخیوکردنی منداڵان ئەو مافەی دەداتی. هەر بۆیە لە قوناخیکدا کە دیاربوون و دیار نەبوونی باوک هیچ واتایەکی کومەلایەتی نەبووە،

باسکردنی مافی باوک شتێکی بێواتایه. بەڵام براکانی دایک ـ ژن گرنگن. چونکە لەگەڵ ئەوانەدا گەورە بووە. خاڵ و پور هێزی خۆیان لەم حقوقە کۆنەی دایک ـ ژنەوە وەردەگرن. کەواتە خێزانی دایک ـ ژن لە خاڵ، پور ـ گەر هەبێت منداڵی ئەوانیش ـ و منداڵەکانی خۆی پێکدێت. ئەو باسەی خێزانی دایکسالاری پێدەگوترێت گوزارشت لەم لایەنە دەکات. دەشێت بەم جۆرە گوزارشتی کۆمەڵایەتیانەی باوەڕی خوداوەندە ژن شرۆڤە بکرێت کە سەرچاوەکەی دایک ـ ژنی بەردی بناخەی نیولیتیکە. جگە لە خاڵەکان پیاو بوونی نییە. میردایەتی و باوکێتی دانەهێنراوە.

خانەدانێتی وەکو ئایدیۆلۆژیا و کردار لە دەرئەنجامی سەراوژێربوونی ئەم سیستەمە (سیستەمی ژن) پێش دەکەوێت. بەڕێوەبەرایەتی ئەم سیستەمە کە دەکرێت بە پیاوسالاریش ناوی ببەین لە ئەنجامی ڕێکەوتن و هاوپەیمانی نێوان پیاوی بە تەمەن، دارودەستەی سەربازی پیاوە بەهێزەکان و شامانەوە[1] ریشەی خۆی دادەکوتێت.

پیاوی بە تەمەن گوزارشت لە ئەزموونی ژیان دەکات. دەشێت وەک ئەنجوومەنێکی تەمەنداران (ریش سپییان) بیریان لێبکرێتەوە. بەڕێوەبەرایەتی ریش سپییان کە لە ئەژێندای سیاسیدا ژەرنتۆکراسی (پیر سالاری) پێ دەڵێن پێشکەوتنێکە پێشوەخت (زوو) لە پێکهاتەی خێڵەکاندا دەبینرێت. ئەو کەسە پێشەنگەیە کە بۆچوونی وەردەگیرێت و راوێژی پێدەکرێت. جڤات پێویستی پێیەتی. ئەویش لە ڕێگای بەکارهێنانی ئەم ئەزموونەوە هەوڵی تێپەڕاندنی ناهەمواریيەکانی پیربوون دەدات. هاوسەنگییەکی بەم جۆرە لەگەڵ

---

١ـ لە پێش دەرکەوتنی راهیبەکانەوە هەبوون. ئەو پیاوانەن کە لەناو کۆمەڵگادا وەک پێشەنگێکی پیرۆزیی بینراون بۆ ئاینی شامانیزم، کە کۆنترین باوەڕی ئایینی مرۆڤایەتییە. بە شێوەیەکی سەرەکی پشت بە ئەفسون دەبەستێت. سەرباری ئەوەی کە مێژووی دەرکەوتنی ئەولو نازانرێت بەڵام دەگێڕدرێتەوە بۆ سەردەمی دایکسالاری. بەزۆری شتەکانی سروشت بەشە بینراوەکانی گەردوون و پەیوەندیان لەگەڵ مرۆڤدا بە پیرۆز دادەنێت. هەرچەندە لە جێیەکەوە بۆ جێیەکی تر پیرۆزییەکانی شامانیزم دەگۆڕێن بەڵام بەشێوەیەکی گشتی لە نموونەکانی وەک ئاسمان، خۆر، زەوی، ئاو، ژێر زەوی، ئاگر.. هتد دا کۆدەبێتەوە. شامانەکان ئەو کەسانەن کە داب و نەریت و رێکرەکانی شامانیان داڕشتووە و باڵوێزی (نێردراو)یان لە نێوان رۆح و مرۆڤدا کردووە. وشەکە بەبنەچە مەغۆلییە و بەواتای بانگکردنی رۆحە چاکەکان دێت بە ئامانجی یارمەتیدانی مرۆڤ.

جڤات ئاوا دەکرێت.

پیاوی بەهێز: ئەو پیاوەیە کە خوازیارە لە مەنگەنەی دایک ـ ژن رزگاری بێت و لە میانەی پێگەی نێچیروانییەوە ئەم هێزە بەدەست دێنێت. هێزی جەستەیی و بەهرەی نێچیروانی شانسی راوی سەرکەوتووانەی زیاد دەکات. ئەو یەکێنەیەی لەگەڵ ئەو لاوانەدا ئاوای دەکات کە خوازیارن سوود لە ئەزموونەکەی وەربگرن سەرکەوتنی زیاتریان بۆ فەراهەم دەکات. لەوانەیە یەکەمین ماهییەتی سەربازی مێژوو لەسەر ئەم بنەمایە سەریهەڵدا بێت. بەمجۆرە پیاو بۆ یەکەمجار لەمێژوودا بەرامبەر بە ژن زاڵبوونێکی بەرچاوی بە دەست هێناوە. بەو رێکەوتنەی لەگەڵ تەمەندارانی تیرەدا پێشی خستوود باوکسالارێتی لە بەرامبەر دایکسالارێتی بەهێز دەکات.

دوا ئەڵقەی رێکەوتنەکە شامانە کە شیفا بەسەر کۆمەڵگادا دەبەخشێتەوە و خاوەن موعجیزەیە. ئەرک و رۆڵی هاوبەشی راهیب و سیحرباز لەخۆوە دەگرێت. کارەکەی پەروەردەیە. لەوانەیە یەکەم پسپۆری ناو کۆمەڵگا بێت. کەمێک لەگەڵ فێلبازی تێکەڵیش بێت، پسپۆری شامان بەرەبەرە لەناو کۆمەڵگادا بە دەزگا دەبێت. شامانەکانیش زیاتر پیاون. لە ئاواکردنی خانەدانێتیدا، لە میانەی رێککەوتنی هەر سێ هێز سیستەمی دایکسالاری زەبرێکی کوشندەی بەردەکەوێت. لە دەقە سۆمەرییەکاندا شوێن پەنجەی ململانێی توند و بەرفراوانی نێوانیان دەبینین. لە سایەی ئەم سیستەمەدا پیاو هەم خاوەنی منداڵەکانە، باوکیانە؛ هەم خوازیارە ببێتە خاوەن منداڵێکی زۆر ـ بە تایبەتیش کوڕ بۆ بەهێز بوونی ـ هەم بە پاڵپشتی ئەمانە بەها کەڵەکەبووەکانی دەستی دایک ـ ژن زەوت دەکات. سیستەمی موڵکایەتی پێشدەکەوێت. لە تەنیشت موڵکی هاوبەشی دەوڵەتی راهیب، موڵکی تایبەتی خانەدانیش پەرەی سەندووە. لەم لایەنەوە باوکایەتی کردنی منداڵانیش پێویستە. واتا بۆ ئەوەی میراس بۆ منداڵان بمێنێتەوە ـ بە تایبەتی کوڕ. مافی باوکایەتی مەرجە.

خانەدانیتی، باوکسالاری و باوکایەتی نیشانە و بەلگەی نزیکبوونەوەیە لە کۆمەلگای چینایەتی. لە کێشمەکێشەکانیاندا لەگەل دەولەتی راهیب، سوود لە هێزە سەربازییەکەشیان وەردەگرن و **"شۆرشی سیاسی"** ئەنجامدەدەن. لە دەقەکانی سۆمەریدا چەندین شەر و سەراوژێر بوونی سیاسی لەم جۆرە دەبینریت. **"سیستەمی دەولەتەکانی ئور"** کە دوای دەولەتشاری ئوروک ئاواکران کارەکتەری خانەدانیتییان هەیە. یەکەمین، دووەمین و سێیەمین سولالەی خانەدانیتی ئور جەخت کردنەوەیە لەسەر ئەم پەرەسەندنە. بە بەراورد لەگەل بەریوەبەرایەتی تیولۆژییانەی راهیبەکان، بەریوەبەرایەتی خانەدان سیستەمیکی عەلمانی و سیاسی دینیتە بیری مروڤ. خوداوەندیتی نوێ ئاوادەکریت. ئیتر راهیبەکان بوونەتە خاوەن پیگەی یاریدەدری ریبەری سیاسی. دیسان رولی مەزنیان هەیە. بەلام هیندەی دەچیت هیزی خویان لە دەستدەدەن، هەریەکە وەکو ئامرازی بەدەستهینانی مەشروعییەت دەبن بەو پروپاگەندەچییانەی کە سیستەم پیروز دەکەن. خولقینەرانی دەولەت، خوداوەندە دەمامکدارەکان، ئیتر بە پلەی دووەم و سێیەم بە دەست و پیوەندی پادشای داپۆشراو دادەنرین. ئەو پادشایانەی لە راستینەی خانەدانیتییەوە هاتوون، بۆئەوەی قەلغانی مەشروعیەتی چینی راهیبە داهینەرەکانی دەولەت بەکاربهینن، ئیتر لە راگەیاندنی **"پادشا ـ خوداوەند"**یتی خۆیان دوودلی ناکەن. رۆژ لە دوای رۆژ جیاوازی چینایەتی قوول دەبیتەوە و ژمارەی شارەکان زیاد دەبیت، بەم جۆرەش شیوەی کۆمەلگای **"شارستانی سۆمەر"** هەمیشەیی بوونی خۆی دەسەلمینیت و بەدەزگا دەبیت. نەریتی کۆنی خانەدانیتی رۆژهەلاتی ناوین تا رۆژگاری ئەمرۆشمان هاتووە. پیشنەکەوتنی سیستەمەکانی کۆماری و دیموکراسی لە رۆژهەلاتی ناویندا لە نزیکەوە پەیوەندی بە دەولەتبوونی خانەدانیتی و راهیبەوە هەیە.

مۆدیلی کۆمەلگای شارستانی سۆمەر بەلانی کەم هیندەی مۆدیلی نیولیتیک پیشکەوتنی شارستانی لە جیهان دەستنیشان کردووە.

وەکو زاراوە جیاوازی "**شارستانی**" لەگەڵ "**کلتوور**" پەیوەندی بە جیابوونەوەی چینایەتییەوە هەیە. شارستانی پەیوەندی بە کلتوور و دەوڵەتی چینەوە هەیە. بە دەزگا بوونی شارنشینی، بازرگانی، تیۆلۆژی و زانست، پێشکەوتنی پێکهاتەی سیاسی و سەربازی، لەجیاتی ئەخلاق دەرکەوتنە پێشی حقوق و رەگەزپەرستی جڤاکی پیاو نیشانە لەپێشینەکانی کۆمەلگای شارستانی نوییە. بە واتایەکیش دەشێت کۆی ئەم تایبەتمەندیانە بە کلتووری کومەلگای شارستانی بەناو بکرێت. بەم جۆرە هەردوو زاراوە هاو ناوەڕوک دەبن. بە هەمان واتا بەکاردەهێنرێن. قۆناخێکی پەلهاوێشتنی هاوشێوەی پەلهاوێشتنە گەورەکەی کلتووری کۆمەلگای نیولیتیکی هیلالی بە پیت لە جیهاندا، بۆ دووەم جار دەست پێدەکات. ئەم جارە دوای ئەوەی هیلالی بە پیتی "**لانکەی شارستانێتی(ژیار)**" رولە تازەکەی (**ئیتر کچ نییە کوڕە**) لە خاکەکانیدا دەهێنێتە دونیا و لە بێشکەی خویدا گەورەی دەکات، لەگەڵ کچە پێگەیشتووەکانی جیهاندا هاوسەرگیری پێدەکات، بەم جۆرەش بەردەوامی بە زوربوونی خۆی دەدات. لێکچواندن لە جێگای خۆیدایە. دەشێت گریمانە بکەین کە پەلهاوێشتنی کلتووری نیولیتیک، لە میانەی گەیشتنی کچەکانی دایکە خوداوەند بە هەر گۆڕەپانێکی جیهان و پێگەیشتنیانەوە خۆی بە دەزگا کردووە. هەرچی کۆمەڵگای شارە کە گوزارشت لە کلتووری دەسەلاتداری پیاو دەکات، بڵاوبوونەوەی بە جیهاندا بە واتای بە دەزگابوونی کوڕەکانی دێت. کوڕانی وەچەی شارستانی پیاو کچان دەکەنە ژنی خۆیان و دەیان بەستنەوە ـ کۆمەڵگایەک کە قورساییەکەی ژنە لەناو کۆمەڵگای پیاوسالاریدا دەتوێنرێتەوە ـ دوای ئەمەش هەر کوڕیان دەبێت، بەم جۆرەش تا دەگاتە رۆژگاری ئەمڕۆمان پیاوێتی شارستانییەکەمان زیاد و بەهێزتر دەبێت، لەم چوارچێوەیەشدا بەردەوام دەبێت.

## ٢. راست شرۆڤەکردنی کۆمەڵگای شارستانی

گشتگیرکردنی هەوڵەکانمان بۆ شرۆڤەکردنی کۆمەڵگای سۆمەر و زیاتر کەوتنە ناو وردەکارییەکانەوە هێزی تێگەیشتن و ڕۆشن بوونەوەمان زیاتر دەکات. ئەوەی پێویستە ئەنجام بدرێت: لە ڕێی شیکارکردنی شارستانییەوە، داماڵینی ددمامکەکانی دەزگا و زهنییەتەکەیەتی، ئاشکراکردنی بەرژەوەندی و ڕووی راستەقینەیان و خستنەڕووی دۆخی بەرجەستە و سادەی کۆمەڵگاکەیانە.

کۆمەڵگا مێژووییەکەمان بەساڵاچوونی شارستانی کون وەکو بیانوویەک دەردەخاتە پێش، لەژێر ناوی **"چاخی نوێ، چاخی نزیک"** خوازیارە خۆی لاو پیشان بدات. لێرەدا نامۆبوونێک جێگای باسە. لاوێتی گوزارشت لە لەدایکبوون (پەیدا بوون)ی دیاردەیەک و کاتی نزیک بە پەیدابوونی دەکات. هەر وەکو سەلماندمان ئەگەر کۆمەڵگای سۆمەر بریتی بێت لە ساتی لەدایکبوونی شارستانییەکەمان، دەبێت لاوێتیش بە گوێرەی ئەو دەستنیشان بکرێت. لە دۆخێکی وەهادا سیفەتەکانی لە جۆری نوێ و لاو خەڵەتاندنێکە و دەرکی پێدەکرێت کە بە تەمەنترین کۆمەڵگای شارستانین. بە پێچەوانەوە خوێندنەوەی زەمان و پیشاندانی بە ساڵاچوو وەکو لاوێک، درێژەی ئەو دەمامکانەیە کە سەبارەت بەکۆمەڵگای شارستانی بەکارهێنراوە.

سەرەکیترین پرسیار کە پێویستە بیپرسین ئەوەیە: **کۆمەڵگای شار کە دەکرێت بە شارستانی شاریش ناوی ببەین بۆچی بەردەوام پێویستی بەدەمامکداری دەبینێت؟**

شارەزایی سەرسوڕهێنەرانەی راهیبەکانی سۆمەر لە دەمامکدارکردندا بە بێ پچڕان درێژەی پێدرا. بۆچی زاراوەی

ئیلاهیبوون کە لە سەرەتادا خاوەن ناوەڕۆکیکی ڕەسەن و واتادار بوو، بوو بە سەرەکیترین زاراوەی بێواتا و هەرە رووخێنراو؟

چەندین بۆچوون بۆ پشتگیری و دژایەتیکردنی کۆمەڵگای شارستانی ئاماژەی پێکراوە، بەڵام زەحمەتترینیان باسکردن و سەرکەوتنی، ڕەخنەکردنێکی ڕادیکاڵانەی شارستانی و پراکتیکی تێپەڕ کردنێتی. ئەمەش سەرنەکەوتنی شرۆڤە پێشخراوەکان پێشان دەدات. بۆچوونێکی هاوبەشیش ئەوەیە کە فشارێکی یەکجار مەزن لەسەر داخوازی ئازادی مرۆڤایەتی جێگای باسە. بەردەوام ئەوە دەگوترێتەوە کە لە مێژە بە ڕەوشێک گەیشتووە ئیتر ناتوانێت بەردەوام بێت. هیگل[1] مێژووی شارستانی وەکو **"قەسابخانە خوێناوییەکان"** دەبینی. ساڵێک نییە کە بەبێ شەڕ تێپەڕ بوو بێت. ژیانی ژێر فشار وەها پێشان دەدرێت هەر وەکو بڵێی یاسای سروشتە. قۆستنەوە (ئیستیغلال) تەواو کراوە بە ڕیسایەکی ژیان. مانەوە لە ڕەوشێکی ئەخلاقی، ساف و دڵسۆزانە بە گێلی دادەنرێت.

دەمەوێت بە شرۆڤەیەک بگەم کە دەرفەتی ڕەخنەکردن و تێپەڕاندنی کۆمەڵگای شارستانی دەدات. لە هەوڵەکانی چەندین قوتابخانەدا و لە سەرووی هەمووشیانەوە مارکسیستەکان دەرکەوتووە کە تەنیا لە میانەی ڕەخنەکردنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری، کۆمەڵگای شار تێپەڕ ناکرێت. هۆکاری سەرەکی ئەمەش، شینەکردنەوەی کۆمەڵگای شارستانییە کە وەکو ئەڵقەکانی زنجیرێک پێیەوە گرێدراوە. تێڕوانینی سەنترالیزمیانەی ئەورووپا سەبارەت بە جیهان، وەکو دیار دەبێت توندترین ڕکابەرەکانیشی بێکاریگەر کردووە. هەر وەکو لە پەیوەندی کلتووری نیولیتیک ـ

---

١. فەیلەسوفێکی ئەڵمانە لە نێوان ساڵانی ١٧٧٠ – ١٨٣١ دا ژیاوە. دامەزرێنەری میتافیزیکی ڕاسیۆنالە. بە پێی هێگل هەموو پێدراو و هەبوونەکانی سروشت بەرهەمی زیهنن، بەڵام نەک زیهنی مرۆڤ بەڵکو زیهنێکی موتڵەق لە دەرەوەی مرۆڤ کە هێگل بە گێیست بە ناوی دەکات. بەڵام پێی وایە کە گەوهەری ئەم زیهنە لە لایەن عەقڵی مرۆڤەوە دەستی بەسەردا گیراوە. واتا بە پێی هێگل گێیست لە سروشت و عەقڵی مرۆڤدا گوزارشت لە خۆی دەکات. لەم ڕێگایەوە لە چینی سەرمایەدار و پەیوەندییەکانیانی کۆڵیوەتەوە، ئەمەی گێڕاوەتەوە بۆ قۆناخە مێژووییە کۆنەکان و گوتویەتی کۆمەڵگای سۆمەری گوشاری بۆ کۆمەڵگای گوندی نیۆلیتیک بردووە. گرنگترین بەرهەمەکانی "زانستی ژیربێژی" و "پرەنسیپەکانی فەلسەفەی حقوق"ە.

شارستانی ئەوروپادا دەبینریت، پەیوەندی شارستانی ئەوروپا - کۆمەڵگا و میژووی شارستانییەکانی پیشووتر پیویستی بە شرۆڤەیەکی روون هەیە، ئەمەش بابەتیکە هەرد زیدە پیویستیمان پییەتی. مەحکوم بوونم بە دژوارترین فشارەکانی ئەم شارستانییە، تەنانەت ئەگەر بە شیوەیەکی ئەماتوریش بیت، پیشخستنی شرۆڤە بۆ من وەکو ماف و ئەرکیک دەستنیشان دەکات.

ا. راڤەکردنی شارستانی بەر لە هەموو شتیک کیشەیەکی لە پیشینەی کۆمەڵناسی بونیادییە. ئەگەر مەرجی سەرەکی زانست پەلەقاژیکردن نەبیت لەناو زەلکاوی پۆزیتیڤیزمدا، بەڵکو ئەو**"واتاناسی"**یە بیت کە جیاوازی **"ئۆبژە - سۆبژە"**ی تیپەڕ کردووە، هەرە زیدە لەگۆڕەپانی کۆمەڵناسی بونیادیی پیویستی بەمە هەیە. سەرەکیترین ئەرکی کۆمەڵناسی گشتی پشکنین و تیمارکردنی - هەر وەک چۆن کاری دکتۆر پشکنین و تیمار کردنە - کۆمەڵگایە. **دەشیت پیویستی زانین تەنیا یەک بیانووی هەبیت: ئەویش واتادار کردنی ئەو ژیانەیە کە زۆر پییەوە گریدراوین.** هەرچی واتادارکردنی ژیانە دەرفەتی تیگەیشتنی کیشە بونیادییەکانمان دەدات، ئەگەر لایەنی نا تەندروستانەشی هەبیت ئەوا ددرفەتی سەرلەنوێ بونیادنانەوەمان پیدەدات.

کۆمەڵگای شارستانی ئەو شوینەیە کە بەهۆی گردبوونەوەی یەک لەسەر یەکی بونیادەکانەوە، واتاناسی تییدا رووبەڕووی گەورەترین زەحمەتی دەبیتەوە. هەبوونی ئەم گردبوونەوەیە، بە تایبەتی لە نزیکەوە پەیوەندی بە شیواندنی واتاناسی و بی ناوەڕۆک کردنییەوە هەیە. لیڤی ئەتهان هەبوونیکی سەیرە، تەواوی چەکەکانی بەدەستەوە گرتووە، ئەگەر قوربانییەک لە کاتی پەلەقاژەی مەرگیشدا بیت، دوو بژاری بەسەردا دەسەپینیت، یان وەکو دوا گووتە دەبیت دان بە **"درۆ"** دا بنیت، لە رەوشیکی پیچەوانەشدا بە هەموو شیوازیکی **"قڕکردن"** لەناو دەچیت. دەشیت ئەم بوونەوەرە، واتا شارستانی وەکو راستییەکی خۆی

بە هەموو جۆرە درندەیەک بچوێندریت. بەلام ئەمە هەلویستیکی زور دواکەوتوانەیە. بە تایبەتیش ئەگەر ناسنامەی پیاوی زانست (زانا)مان هەبیت، لە خەیالی منداڵانە (خەیالی جانەودران) بەولاوە نامان بات. پشکنین و دەستنیشان کردنیکی بەهیزی درندەکەش بەس نییە. دەبیت بە پەلە تیمار بکریت. تەواوی تاقیکردنەوەکانی تیمارکردن مایە پووچ بوون؛ راپۆرتی رەوشی دواییشی ئەوەیە: بە گورِ خوێنی لیدەچوریت، ژیانیکی پرِ لە مەترسی و کومەلکوژی، خراپترین دۆخی برسیتی، بیکاری و هەموو جۆریکی نەخۆشی و ویرانبوونی سیستەمی ژینگەیی - ئەو ژینگەیەی مسوکەر بۆ ژیان پیویستە - یە. ئەگەر کۆمەلناسی ئازادی و بونیادیی نەحوازیت ببیتە زبلدان کە بەسەدان نموونەی جیگای باسە، دەبیت هیزی خوی لە بواری دەستنیشان کردن و تیمارکردندا پیشانبدات و بیسەلمینیت. لە رەوشیکی پیچەوانەدا هەر وەکو ئادۆرنۆ گوتوویەتی **"دوای سەربازگەکانی پاکتاوی نەژادی (جینۆساید) تاکە وشەیەکیش نەماوە کە تەواوی خوداوەندەکانی ئاسمان - گووتەبیژی پیاوانی زانست - بیلین".**

شارستانی تەنیا مەراسیمی **"قەسابخانە خوێناوییەکان"**(هیگل) نییە، تەنانەت شتیکی لەمەش خراپترە؛ **جینۆساید کردنی بەردەوامی واتای ئازادیخوازییە کە تاکە هۆکاری ژیانی مرۆڤە. ئەوەی دەمینیتەوە خلتەی ژیانە. بە سادەترین دەستنیشان کردن شارستانی پاشماوەکانی ئەو ژیانەیە کە واتای ژیانی ئازادی لیبەدەر نراوە.**

کاتیک تەماشای ژیانی ساکارترین زیندوو دەکەین ئەوەی دەیبینین ئەو مانایەیە کە بە ژیانی دەبەخشیت. ئەمە واتایەکە کە دەتوانیت: بە ملیونان جۆر بگات، ریشەی خۆی لەناو بەرد دابکوتیت، پیویست بکات لە سەرماکانی جەمسەریشدا دریژە بە هەبوونی خۆی دەدات و تەنانەت دەفریت، بە هیزی پیشخستنی ئامراز (تەکنیک)ی بی سنوور دەگات کە دۆزینەوەکانی مرۆڤ ناتوانیت بە کەناریشیدا تیپەرِ بیت. هەرچی کۆمەڵگای شارستانییە، هەر لە

سەرەتاوە لە ریگای فێل و تەڵەکەبازی و توندوتیژی رێکخراوەوە پێشکەوتووترین بوونەوەری ژیانی دووچاری لە دەستدانی واتا کرد؛ لە دواقۆناخیشیدا لە هێزی پاڵنان بەرەو رۆخی خۆکوژی بەولاوە خاوەنی کامە واتا یان بیواتاییە.

کۆمەڵناسی لە سەردەمی ناوەندیتی شارستانی ئەوروپادا دەبێتە پەیامی سەرلەنوێ پێناسە کردنەوەی ئەم هێزەی. بە گووتەی کرستیانی بووە بە **"دوا گووتەی خوداوەند"**. دەستبەردان لەم گووتانە پێویستی رێزگرتنە لە واتای ژیانی ساکارترین زیندەوەر. بەرکەماڵترین بوونەوەری ئەخلاق بە هیچ شتێک ناتوانێت ئەم بێ ئەخلاقییە روون بکاتەوە. با دووبارە بە بیر خۆمانی بێنینەوە: **تاکە گووتەیەکیش نەماوە خوداوەندەکان بیڵێن.**

ئایا ئەوەی کە بە مێژوو دادەنرێت و دەخوێنرێت، چیرۆکی ئاواکردن و رووخانی دەزگاکانی دەوڵەت و دامەزراوە یارمەتیدەرەکانیان نییە؟ ئایا تاکە ئامانجی هەڵکشان و رووخانی خانەدانەکان، پێشخستنی تەڵەکەبازی لەلایەن خانەدانێکی دیکەی نوێوە بۆ دەست بەسەردا گرتنی **"شوانێتی مێگەل"**نییە کە تەختی دەسەڵاتیشی پێدەڵێن؟ ئایا تاکە ئامانجی ئەمەش ئیستیغلال کردنی خوری، شیرەکەی، لە کاتی پێویستیشدا قۆستنەوەی گۆشت و پێستەکەی نییە؟

کامە چیرۆکی قارەمانێتی لە زۆرداری بێبەشە و دوورە لە قۆستنەوە؟ ئەوانەی دەڵێن کە لەپێناو خێڵ، قەوم و ئاییندا سەرهەڵدانیان کردووە، جگە لە تاجی دەسەڵات بەهایەکی دیکەیان سەلماندووە؟

کۆمەڵگای شارستانی کە تاکە ساڵێک و گۆرەپانێکی مرۆڤ نەماوە شەڕی تێدا نەبێت، بە ڕاستی جگە لە زاراوەی **"قەسابخانە"** دەشێت کامە ناو بۆی واتادار بێت؟

کامە پێشکەوتنی زانست، هونەر و تەکنۆلۆژیا کە باسدەکرێن سەری داهێنەرە راستەقینەکانیانی نەخواردووە یان زەوت

نەکراون؟

ئەو راستیانەی وەکو سیستەم، ئارامی و ئاشتی باسدەکرێن کامەیان جگە لە پەردەی شانۆگەرییەکانی بێدەنگی بەرخ و ددستەمۆ کردنی کۆیلەکان ـ کۆیلە، رەنجدەر، کارکەر، زەحمەتکێشان، تەواوی چەوساوەکان ـ بەولاوە خاوەن واتایەکی قووڵن؟ سەبارەت بە بابەتی ئەم شارستانییە پرسیارەکان بێ سنوور زیاد دەبن و قووڵایی واتاشیان هەیە. لە ڕاستیدا ئەوەی توقینەرد بە بوێری و بێ ئابڕووییەکی گەورەوە پێشکەشکردنی ئەم چیروکەیە وەکو پێویستییەکی مێژووی بەناوبانگ، ئایینی پیروز، داستانی ئەشق و جوانی، داهێنانە سەرسامەکان، خەیاڵی بەهەشتیک کە ڕوژێک دێت پێی دەگەی، دۆستایەتی، جوامێری و پێویستی ڕێکەوتن وەکو قەدەری ڕەهای مرۆڤایەتی.

**بێگومان ئامانجم لە پێشخستنی ئەم پرسیارانە هۆگری قووڵ و ڕێزگرتن و وابەستەبوونمە بە قارەمانێتی ڕاستەقینە، پیرۆزی، داستانی ئەشق و هەڤاڵێتی و دواگووتە نەگووتراوەکانی ئەو کەسانەی لەپێناو واتای ئازادیدا بەرخودانی مەزنیان کردووە. ئەگەر درەختە گوڵێک بۆ پاراستنی گوڵە جوانەکانی پێویستی بە بەرهەمهێنانی دڕک بێت، هێزی واتاش شەڕکردنە لەپێناو پاراستنی ژیانی مرۆڤی ئازاد کە لەوپەڕی جوانیدایە.**

ب ـ با لە داوەرییە ئەخلاقییەکانمانەوە توزێک بچینە سەر داوەرییە تیۆرییەکانمان. بە هەموو لایەنەکانییەوە تێگەیشتنی زاراوەی"**جیاوازی چینایەتی**" بە تایبەتیش ڕۆڵی لە ڕەوڕەوەی مێژوودا کە لە قۆناخی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا ڕکابەرەکان زۆر باسی دەکەن، چەندەی بڵێی گرنگە. لە حاڵەتی پێچەوانەدا جگە لە "**بنێشتێکی دیماگۆجییەت**"ی پەتی و یەکێک لە ئامرازەکانی داپۆشینی واتاناسی بەولاوە تێپەڕ ناکات.

یەکەمین مەسەلە کە پێویستە بۆ تێگەیشتنێکی ڕاستی چینایەتی بزانرێت ئەوەیە: ڕێکخەری هێزەکەی بریتییە لە بەشی دەست و

پێی. بە تەنیا و سەربەخۆ هیچ واتا و بەهایەکیان نییە. لەوانەیە لێکچواندنەکە زیدە سۆسیۆبایۆلۆژیانە بێت، بەڵام لە جێگای خۆیدایە. بە هەر حاڵ هیچ گفتوگۆیەک لەو بارەوە ناکرێت کە هێز، دەسەلاتداریتی سەر کومەلگا و لیڤی ئەتهانی کومەلگای شارستانی رێکخستەترین هێزە. ئەگەر دەوڵەت وەکو یەک پارچەیی پێشکەوتووترین پەیوەندییەکانی دەسەلات شرۆڤە بکەین کە وایکردووە کۆمەڵگای چینایەتی دەرفەت بە قۆستنەوە و فشاری گشتی بدات، ئایا ئەو کاتە ئەوانەی دەقوزرێنەوە و لەژێر فشاردان پارچەی جیانەکراوەی تۆڕی ئەم پەیوەندیانە نین؟ ئایا شارستانی نەک تەنیا لە رووی رێکخستنی دەوڵەتەوە بەڵکو لە ئایینەوە تا دەگاتە ئابووری هێزی بونیادنان و رێکخستن نییە؟ ئایا بە شێوەیەکی سەرەکی پێکهێنانی چینە کۆمەڵایەتییە ئاسۆیی و ستوونییە رێکخراوەکانی لە جۆری کویلە، سەپان و کارکەر و چەندینی دیکەی بێ ژمار ئەرکی سەرەکی ئەم هێزە نییە؟

بە بایەخەوە دەمەوێت ئاماژەی پێ بکەم: لە رێکخستنی هێزدا هەرگیز دەرفەت بەوە نادرێت کە دەست و پێ بەهای سۆبژەی پێبدرێت. ئەگەر دەسەلات رێکخستنێکی سەرکەوتوو بێت واتا دەسەڵاتی رەهای خۆی بەسەر ئەو رەنجدەرانەدا سەپاندووە کە بە قەبە ناویان دەبات. ئەمە بەو واتایە دێت ئەگەر پێشتر بەهایەکی سۆبژەییشیان لەناو هەلومەرجی دەسەلاتدا هەبوو بێت لەدەستی دەدەن. لەم سۆنگەیەوە لە سپارتاکۆسەوە تا دەگاتە کۆمۆنەی پاریس[1] یاخیبوونی کۆیلە و رەنجدەرەکان شانسی سەرکەوتنی نییە. تەنیا بە مەرجێک ئەم شانسەیان دەبێت: ئەگەر بەهای خوێنی تازەیان بۆ دەسەلات هەبێت. ئەمەش جگە لە سەرلەنوێ لکاندن

---

١. یەکەمین حکومەتی دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریایە لەمێژوودا کە لە ئەنجامی راپەڕینی کرێکارانی پاریس لە١٨ی ئاداری ١٨٧١ دامەزرا. تا ١٨ی ئایاری ١٨٧١ بەردەوام بوو، لە ئەنجامی خوێن رشتنێکی زۆرەوە رووخێنرا. چونکە سەرکردەکانی کۆمۆنە توانای بەڕێوەبردنی کاروبارەکانیان نەبوو، نەیانزانی چی بکەن و چۆن هەنگاوی دواتر بهاوێژن، ئەمەش بووە هۆی خۆکۆکردنەوەی دوژمنەکانیان. هەروەها پەسەند نەکردنیان لەلایەن دراوسێکانیانەوەش خاڵێکی گرنگ بوو کە حیسابیان بۆ نەکردبوو.

بە کۆمەڵگای شارەوە هیچ واتایەکی دیکەی نابێت، ئەزموونەکانی سەد و پەنجا ساڵەی سۆسیالیزمی زانستی نموونەیەکی بەرچاوی پوختەی روون کردنەوەی ئەم راستییەیە.

ئایا پەیوەندییەک لە نێوان ئەم ئەنجامانە و راکێش کردنیان بۆ ناو چوارچێوەی پەیوەندییەکانی دەسەڵات جێگای باس نییە؟ ئەو مەسەلە سەرەکییەی پێویستە دەرکی پێبکرێت ئاستی گرێدان و چۆنایەتی ئەو چینایەتییەیە کە لە پەیوەندییەکانی دەسەڵاتی فەرمیدا هەیە. واتا ئایا چینایەتی بە تەنیا و سەربەخۆ بەهای واتاو چالاکی هەیە یاخود نا. چ چینی سەرووی دەسەڵات ئەفەندی، ئاغا، خاوەنکار و بۆرژوا، چ چینی خواروو کۆیلە، رەنجدەر و کارکەر بێت لە پەیوەندی دەسەڵاتدا کۆکن لەسەر هەمان هەڵوێستی ئایدیۆلۆژی ـ سیاسی. ناڕەزایی دەربڕینی ناوخۆیان نرخێکی وەهای نییە. ئەم پەیوەندییە تۆڕێکی ئەوتۆیە کە هەزار و یەک گرێی هەیە. ئەگەر ناڕەزایی بەرامبەر یەکیکیان پیشان بدرێت، تەنانەت بە جۆرێک کە پارچە پارچە بکرێت، نۆسەد و نەود و نۆی دیکە دەکەونە گەڕ. هەر وەکو چۆن پارچەکراوەکە چاک دەکەنەوە، ئەوەی پارچەی کردوون دەیگرن و لە ئاڵۆزترین گرێدا دەیبەستنەوە، پێوست بکات کەللەی دەپەڕێنن و ئەم کارە جێبەجێ دەکەن.

با بیر لە زەحمەتکێشانی هۆز و خەباتکارانی پەیوەندییەکانی یەکەمین نموونەی دەوڵەت ـ دەسەڵات بکەینەوە کە لەلایەن راهیبەکانی سۆمەر و گەورەی خانەدانەکانەوە دامەزرێنران. ئەو خەباتکارەی راهیب هەوڵی بە کۆیلەکردنی دەدات بەر لە هەموو شتێک لەژێر کاریگەری سەرسامانەی مەشروعییەتی ئەو خوداوەندانە (زاراوەی پیرۆزی، کە هیچ هێزێکی ماددی ئەو کاریگەرییەیان لێناکات) دایە کە لە دوو نهۆم سەرووتر خولقێنراوە. ئەگەر بەم جۆرە نەبێت هەڵبەتە لەوێ وەری ناگرن. دووەمیان بە گوێرەی رابردوو خۆراکی باشترە. ئەلتەرناتیفێکی دیکەی بەرچاو بۆ خۆراکی باشتر لە ئارادا نییە. سێیەمیان، سەبارەت بە

ئارەزووە زایەندییەکانیتی کە راستینەی ئەو پەرییانەی جوانییان دەدرەوشێتەوە بەردەوام خەیاڵ دەگەشێننەوە.

پێشکەش کردن (نمایش کردن) ی ژنان کە لە رۆژگاری ئەمڕۆشماندا لە میدیا (راگەیاندن)کاندا دەکرێت، سەد قاتی سوپاکان زیاتر کۆمەک بە ملکەچ کردن و ئالوودە بوون بە سیستەمەوە دەکات.

ئەو کۆیلە نوییەی کە دەکەویتە چوارچێوەی چینەوە نەک یاخیبوونێکی ئازادی، مەگەر تەنیا خیانەتکاری ئازادی بێت. یاخود رووداوێکە لە چەمکی ژیانی ئازاد خالیکراوە. رووداوێکی جیاوازە. گەورەی **خانەدانش** کاتێک بەردو پەیوەندی دەوڵەت ـ دەسەڵات ئازاسە **دەکرێت هەمان** شت پەیڕەو دەکات. یەکەمین مەرجی نێوان هێزە سەرەکییەکانی رێککەوتن: رێکخستنێکی بەهێز کە پشت بە پەرژەوەندی پتەو ببەستی، بەرچاو بەرجەستە بێت. خێزانی خانەدان لەناو پەیوەندییەکانی ردچەلەکدا هەم رێزی لێدەگیرێت، هەم خاوەن مەشروعیەتێکە لیی دەترس. نەریتەکانی هۆز ـ خێڵ بەردەوام پلەداری مەزن دەکات. تەنانەت گرفتە بچووکەکانیش یان بە شێوەیەکی ئاشتیانە لەناو ئەنجوومەنی تیرە چارەسەر دەکرێت، یاخود لە رێگای پێکدادانەوە بەلاوە دەنرێت. خانەدانێک لەناو گردبوونەوەی پەیوەندی بەم جۆرە بەردو بەدەوڵەتبوون بچێت، ناتوانێت لایەنی پیشاندانی کارەکتەرە چینایەتییەکەی بکاتە هەڵوێستێکی ستراتیژیانە. دەمەوێت بەو جێگایە بگەم: **جیاوازی چینایەتی یەکێک لە کارەکتەرە بنەرەتییەکانی شارستانییە.** بۆ شۆڕشێکی چینایەتی بە بنەما گرتنی واتایەکی ستراتیژی لێی هەرچەندە لە بواری تیۆرییەوە مەحاڵ نەبێت، بەڵام لە بواری کرداریدا ئەنجامگیر نابێت. تەواوی ئەو شارستانی و دەسەڵاتانەی رووخاون، لەگەڵ کۆیلە و زەحمەتکێشەکانیاندا بە یەکەوە رووخاون. ئەو دەسەڵاتانەی لەلایەن بەندەو زەحمەتکێشەکانی خۆیەوە رووخێنراون یان زۆر کەمن، ئەگەر هەشبێت ئەو دەسەڵاتە نوێیەی

هاتووە بووە بە ئامێرێکی قۆستنەوە و ستەمێکی وەها، ئەوەی جارانی تێپەڕ کردووە.

هەڵسەنگاندنی مێژوو وەکو شەڕی چینایەتی بۆچوونێکی ئەوپەڕگەری میتۆدی بچووک کردنەوەیە. فشار و قۆستنەوە ئەو سیستەم و شێوازەی بەردەوامکردنە کە شارستانی و مێژووی شارستانی پشتی پێدەبەستێت. بەڵام ئایدیۆلۆژیا، سیاسەت تەنانەت ئابوورییەکەشی جیاواز کار دەکات. ڕاستتر چینایەتی کردن بەرامبەر بە چینێکی بەرتەسک شێوازی لیشاوگرتنی مێژوو نییە. لێرەدا بواری گفتوگۆ کردن لە باردی مەترسیداری بە کۆیلەکردن، نکۆڵیکردن لە ئازادی بچووک کردنەوەی خەڵک لەلایەن سیستەمەوە نییە. دەمانەوێت جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە کە ئاواکردن و هەرەسهێنانی سیستەمەکانی شارستانی و دەسەلاتەکەی لە میانەی واتاو ستراتیژی جیاوازتر ڕوویداوە، هەروەها دەمانەوێت ئەوە شروڤە بکەین کە لۆژیکی چین لە بەرامبەر چینێکی دیکە یان بە ئەنقەست چۆتە ناو شێوەیەکی نوێی دەسەلاتی سیستەم و شارستانی یاخود تەواو بە پێچەوانەوە سەرباری ئەوەی دژایەتی دەکات جگە لە بوون بە **"خوێنی نوێ"** - ئەزموونی سۆڤییەت و چین - هیچ ئەنجامێکی دیکەی لێناکەوێتەوە. ئەمەیە ئەوەی گفتوگۆی لەسەر دەکەین. دەشێت لەم گفتوگۆیەدا هەر لە ئێستاوە ڕەخنەیەکی بەم جۆرەم لەسەر پێش بخرێت کە سەبارەت بە دەسەڵات بە شێوەیەکی زێدەڕۆیی میتۆدی بچووک کردنەوەم پەیڕەو کردووە، بەڵام دەروازەی دەرکەوتن و ڕزگاربوون لە دەسەڵاتم پێشان نەداوە. ئەم بابەتە لە بەشی کۆمەڵناسی ئازادیدا بە شێوەیەکی بەرفراوان تاوتوێ دەکەین و بەم جۆرەش وەڵامی پرسیارەکە دەدرێتەوە. وەک هێماکردن بۆ وەڵام دانەوەش دەڵێین بەلانی کەم ئازادیش هێندەی ئایدیۆلۆژیا و سیاسەت و ڕێکخستنی دەسەڵات ستراتیژ، لۆژیک و گۆڕەپانی کۆمەڵایەتی جیاوازی خۆی هەیە.

ج - هەرچەندە پرسیاری تەبایی یان پێکدادانی نێوان

شارستانییەکان؟ یەکێک لەو کێشانە بێت کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا گفتوگۆ دەکرێت بەڵام واتا مێژووییەکەی بەرفراوانترە.

کومەڵگای شارستانی پێکهاتەیەکە کە هەم لەناو خۆیدا، هەم لەنێوان شارستانییە جیاوازەکاندا پێکدادان بەرهەم دێنێت. مانا و ئامانجی ئاواکردنەکەی، پشت بەستنی بە جیاوازی چینایەتی، لەم پێناوەشدا پەیڕەوکردنی فشار، قۆستنەوە، خەلەتاندنی بەردەوام و ڕاستینەی داپۆشراوییەکەی پیشانی دەدات کە بۆچی خاوەن کارەکتەرێکە بەردەوام شەڕ بەرهەم دێنێت. خودی دەسەڵات و جیابوونەوەی چینایەتی بۆخۆی پێکدادانە. ئەمە بەرامبەر ناوەوە بێت یان دەرەوە ناوەڕۆکەکەی ناگۆڕێت. لە ڕێی زۆرکردنی وەسفی شارستانیەکانەوە گۆڕینی ناوەرۆکیان، یان پیشان دانیان وەک ئەوەی گەوهەرێکی جیاوازتریان هەیە، واقیعی نییە. پێکهاتەکانی شەڕانگێزی، ئاشتیخوازی، تاکخودایی، فرەخودایی، بە پیت، بێ بەرهەم، بە کلتوور، نەزان، هاوڕەچەلەکی تایبەتمەندێتیەکەیان ناگۆڕێت. هێزی ئاراستەکاری شارستانی تا تەواوی جیهان فەتح دەکات خۆی ئەرکدار دەبینێت. بوون بە هێزی جیهان نەخۆشییەکی بونیادییە، دەسەڵات سەرچاوەکەیەتی. ئەو کاتەی فراوانبوونی بوەستێت دەست بە دواکەوتن دەکات. کۆتایی ئەم ڕەوشەش گەڕانەوە بۆ دۆخی ئاسایی نییە، رووخانە. چونکە هیچ سیستەمێکی دەسەڵات ئاسایی نییە. وەکو نەخۆشی شێرپەنجە یان لەناوبردنی ئەویتر یاخود لەناوچوونی خۆی دەکات بە ناچارییەک. چەندین کەسایەتی هەن کە گەورەی خانەدانێکی سادە بوون سواری ئەسپی شارستانی بوون و خۆیان کرد بە خوداوەند یان هێزی ئیلاهی.

لە پشت بانگەشەی خوداوەندێتییەوە هێزی لەناوبردنی مرۆڤایەتی شاراوەیە. ئەوەی لە ڕێگای شەڕەوە وێرانکاری گەورە بکات، وەها مەزەندە دەکات کە بە هەمان شێوەی گەورەیی خولقێنەریشە. ئەگەر لەرووی دەروونییەوە منێتی کۆنترۆڵ نەکرێت، دووچاری نەخۆشی خۆزلکردنی بێ سنوور دێت. سیستەمی شارستانی

ئەو کۆمەڵگایە پێشکەش دەکات کە زەمینەی ئەم نەخۆشییەی تێدایە. دەگوترێت هیچ بەهایەکی کومەلایەتی و کەسایەتییەک نییە کە دەسەڵات خراپی نەکات. ئەمە هەلسەنگاندێکە پەیوەندی بە ناوەڕۆکی شارستانییەوە هەیە. لەبەرئەوەی شارستانییەکان کۆمەڵگای دەسەلاتن سیستەمێکن کە هەرە زیدە ناکۆکییان لەگەڵ ژیاندا هەیە. لە براود تا دەگاتە ژن - دۆست هیچ بەهایەک نییە، لەپیناو دەسەلاتدا بەلاوەی نەنێت. کاتێک لیکولینەوە لە باردی هێزی بەرێوەبەرایەتی شارستانییەکانەوە بکرێت، دەبینریت هیچ تاوان و پیلانگێرییەک نەماود ئەنجامیان نەدابێت. بە سیستەمکردنی درۆش بە سیاسەت ناودەبەن.

د. پێویستە زۆر سەرنج بدرێتە سەر تایبەتمەندییەکی کومەلگای شارستانی کە بە دەزگابووە. دەشێت ئەم راستینەیە بە رەوشی ئامادەکراوی کۆمەلگا بۆ دەسەلات بە ناو بکرێت. ئەمەش هەر وەکو ئەوەیە کە: لەسەر نەریتی بە ژنێتیکردنی ئافرەتان سەرلەنوی کۆمەلگا ئاوا بکرێتەوە. دەسەلاتیش تا دلنیا نەبیت کە کومەلگای وەکو ژنێتی ئافرەتان ئامادە کردووە، ئەوا متمانەی بە هەبوونی خۆی نابێت. ژنێتی وەکو کۆنترین کۆیلایەتی، لە ئەنجامی ململانییەکی درێژخایەن و بەرفراوانی پیاوی بەهێز و دەست و پێوەندەکەی لەگەڵ دایک - ژن و تەواوی باوەڕیەکەیدا و لە دوا جار لەمیانەی شکستهێنانی ژن و بالادەستبوونی کۆمەڵگای رەگەزپەرستی پیاوەوە بە دەزگا بووە. ئەم کردارەی بالادەستی لەوانەیە بەر لە گەشەکردنی شارستانی جێگای خۆی لەناو کۆمەڵگادا کردبێتەوە. ئەمە تێکۆشانێکی هێندە دژوار و بەرفراوانە کە لەگەڵ ئەنجامەکانیدا لە بیرەوەرییەکاندا سڕاوەتەوە. ئافرەت ئەوەی نایەتەوە یاد کەچی، لە کوێ و چۆن لەدەستداوە. ژنێتییەکی دەستەمۆ و ملکەچ بە دۆخێکی سروشتی لەقەلەم دەدات. لەم سۆنگەیەوە هیچ کۆیلایەتییەک هێندەی کۆیلایەتی ژن هەرس نەکراوە و مەشروعییەتی پێنەدراوە.

ئەم پێکهاتەیە دوو جۆر کاریگەری وێرانکاریانەی لەسەر

کۆمەڵگا هەبووە: یەکەمیان کردنەوەی کۆمەڵگا بە ڕووی کۆیلایەتیدا، دووەمیان: بەڕێوەبردنی تەواوی کۆیلە (کۆیلایەتییە) کان لەسەر بنەمای کردنیان بە ژن. هەر وەکو مەزەندە دەکرێت ژنیتی تەنیا ئۆبژەیەکی رووتی زایەندی نییە و تایبەتمەندییەکی بایۆلۆژیانە نایەنێتەوە یاد، بەڵکو ژنیتی لە ناوەڕۆکدا تایبەتمەندییەکی کۆمەڵایەتییە. کۆیلایەتی، ملکەچی کردن، پەسەند کردنی جنێو، راهاتن لەگەڵ گریان و درۆزنی، نەبوونی بانگەشە، خۆ پێشکەش کردن و ..هتد و تەواوی ئەو رەفتار و راوەستانەی ئەخلاقی ئازادی پەسەندیان ناکات بە پێشەی ژن لەقەڵەم دەدرێت. لەم لایەنەوە زەمینەیەکی کۆمەلایەتی رووخێنراوە. بۆیە زەمینەی راستەقینەی کۆیلایەتییە. کۆنترین زەمینەی دەزگاییە کە تەواوی کۆیلایەتی و بێ ئەخلاقییەکان لەسەری دەست بەکار دەبن. کۆمەڵگای شارستانی پەیوەندی بە رەنگدانەوەی ئەم زەمینەوە هەیە لە تەواوی بەشەکانی کومەڵگادا. بە ژنیتیکردنی تەواوی کۆمەڵگا بۆ بەڕێوەچوونی سیستەم پێویستە. دەسەلات و پیاویتی یەک ناوەڕۆکیان هەیە. لە حاڵەتێکی وەهادا ژنیتی کۆمەڵگا پێویستییەکی ـ بۆ سیستەم و دەسەلات ـ دەست لێبەرنەدراوە. چونکە دەسەلات پرەنسیپی ئازادی و یەکسانی ناناسێت. لە رەوشێکی پێچەوانەدا دەسەلات بوونی نابێت. لێکچوونی نێوان دەسەلات و کۆمەڵگای رەگەزپەرست(رەگەزگەرایی) لە ناوەڕۆکدایە.

یۆنانییەکان کە بە یەکێک لە قۆناخە گەورەکانی شارستانی دادەنرێن بە شێوەیەکی فەرمی کوڕە لاوەکانیان وەک **"هاوجووت"**[1] یک پێشکەش بە پیاوێکی خاوەن ئەزموون دەکرد. بۆماوەیەکی درێژخایەن هۆکارەکەیم بۆ شینەدەکرایەوە. فەیلەسوفێکی وەکو سوقراتیش دەڵێت:**"ئەوەی گرنگە بەردەوام بەکارهێنانی ئەم کوڕە نییە، بەڵکو پەروەردە کردنێتی لەلایەن گەورەکەیەوە"**. لێرەدا لۆژیک و مەبەست لە بەکارهێنانی بەردەوامی لاوان وەک هاوجووتێک

---

١بە تورکی oglan ، بە عەرەبی غلام.

زیاتر ئامادەکردنیتی بو تایبەتمەندییە ژنانییەکان. بە شیوەیەکی روونتر شارستانی یونانیش خوازیاری کومەلگایەکی بە ژنکراوە. چەندە لاوانی رەسەن و بە رەچەلەک هەبن، ئەم کومەلگایە (بەژنکراوە) پیک نایەت. بو پیکهینانی ئەم کومەلگایە پیویستە تایبەتمەندییە ژنانییەکان هەرس بکەن. لە تەواوی کومەلگاکانی شارستانی مەیلی هاوشیوە هەن. نیربازی لەم کومەلگایەدا زور بەربلاوبووە. حالەتیکی وەهای بەخووە گرتووە، وەکو نەریتیک هەر گەورەیەک کورە لاویکی تایبەت بە خوی هەبوود. لەوە زیاتر کە نیربازی وەکو لادان و نەخوشییەکی زایەندی تاکەکان ببینریت، کرنک ئەوەیە وەکو دیاردەیەکی کومەلایەتی ببینریت، کە کومەلگای چینایەتی، کومەلگای دەسەلات ریگای لە پیش کردوتەوە. **لە کومەلگاکانی شارستانیدا زایەند و دەسەلات نەخوشی کومەلایەتین، وەکو شیرپەنجە وان. هەر وەکو چۆن بەبێ یەکتر نابن، یەکتریش زیاد دەکەن: هەر وەکو زیادبوونی خانەکانی شیرپەنجە** پەیوەندی نیوان شیرپەنجەی تاک و شیرپەنجەی کومەلگا لە مودیرنیتەی سەرمایەداریدا بە شیوەیەکی بەرفراوانتر شروڤە دەکەین.

دەمەویت بگەمە ئەم خالە: هەزاران سالە لە کومەلگاکانی شارستانیدا زەمینەی دەسەلات بە شیوەیەکی تایبەت و لە جوری ئامادەکردنی بووک بو زاوا ئامادە کراوە. نەریتی شارستانی ژن وەکو **"کیلکەی پیاو"** دەبینیت. نەریتیکی هاوشیوە لەناو کومەلگاش جیگای باسە. دەبیت پیاو وەکو ژنیک خوی پیشکەش بە دەسەلات بکات. ئەوانەی یاخی دەبن و خو پیشکەش کردن پەسەند ناکەن، لە ریگای شەرەوە هەولی ئامادە کردنیان دەدریت.

بینینی پروسەی دەسەلات وەکو کردەیەکی ساتەوەختی کەسیک، گروپیک، چین یان نەتەوەیەک بە هەلەداچوونیکی مەزنە. دەشیت حکومەتەکان لەناکاو ئاوابکرین، بەلام سیستەمی سیاسی و دەسەلاتەکان بەر لە هەموو شتیک لە کومەلگا شارستانییەکاندا لەلایەن سەدان ئیمپراتوری درندە، گروپی هیز و هیزە بالادەستەکانەوە وەکو

کلتووری باڵادەستی (کیلگە، نەریت) ئامادەکراون. کۆمەڵگاکانیش بەوێنەی ژن کە چاوەڕوانی مێردە لە چارە نووسراوەکەی دەکات، ئاوەها وەک وابەستەو کیلگەیەکی دەسەڵات، کۆمەڵگا چاوەڕوانی بەکارهێنانیانن لەلایەن خاوەنەکانیانەوە. یاخود بەم جۆرە فێرکراون. دەسەڵات لەناو کۆمەڵگادا وەکو کلتوورێکی باڵادەستی بوونی هەیە. لەم خاڵەدا گووتەی باکونین **"دانەسقە ترین دیموکرات، لە ماوەی بیست و چوار کاتژمێردا لە دەسەڵاتدا دەشێوێت"** واتادارە. ئەو خاڵەی ماوەیەکی درێژە خوازیارم روونی بکەمەوە: ئەوەی ئەم تێکچوونە فەراهەم دەکات خودی زەمینەی دەسەڵاتە. هەڵبەتە ئەو تەختەی لە دەرئەنجامی قوستنەوە (شەڕ و داگیرکاری بێ سنوور) و دەریای خوێنی هەزاران ساڵەود پێکهاتووە، بێگومان ئەوەی لەناکاو لەسەری دابنیشێت لە بیست و چوار کاتژمێردا دەشێوێت. بە مەرجێک ئەگەر بە شێوەی عیبادەت کردن خۆی نەپارێزێت! دەسەڵات کە لە زەمینە و هەلومەرجی تەڵەکەبازی بێ سنوور، شەڕ و چەوسانەوە بونیادنراوە، وەکو نەریت، کلتوور و سیستەم زۆر بە کاریگەرە و تەنانەت بە شێوەیەکی رەها تێکدەرە. بەرچاوترین نموونەی بەسەرهاتەکانی **"سۆسیالیزمی بونیادنراو"**ە.

ئاشکرایە کە گومان لە نیازپاکی و ئامانجی دامەزرێنەرانی سیستەمەکە ناکرێت. ئەی چۆن بوو دڵخوازانە تەسلیم بەم سەرمایەدارییە بوون کە هێندە لەبەرامبەری تێکۆشانیان کرد؟ بە بڕوای من هۆکاری سەرەکی ئەم تراژیدیایە هاتنە سەر دەسەڵات و چۆنییەتی و شێوەی بەکارهێنانێتی. دامەزرێنەرانی سۆسیالیزم لەسەر کلتووری کۆمەڵگای شارستانی بوون بە دەسەڵات. واتا نەک هەر تەنیا دوودڵ نەبوون لەوەی لەسەر پاشماوەی میراسی خوێناوی چەوسانەوە (ئەو کۆمەڵگایەی لەسەر نەریتی دەسەڵاتداری دەوڵەت ڕاهێنراوە) ببنە دەسەڵات کە بانگەشەی دژایەتی کردنییان دەکرد، بەڵکو بە دەست و پێ تێیەوە ئاڵان. **دامەزرێنەرانی سۆسیالیزم نەیان ویست لەم راستییە تێبگەن کە دەسەڵات سۆزانیەکی وەهایە،**

**هیچ خاوەنێکی دەسەڵات نییە کە لە رێ دەرنەکەوێت و سەرنجی رانەکێشێت.** لەم سونگەیەوە هەندێک رەخنەیان وەکو ئۆپۆرتۆنیزم هەلسەنگاندووە - کرۆپۆتکین[1] لینینی لەوبارەیەوە رەخنە کردووە کە بە خێرایی لە سۆڤێتەوە بەرەو دەسەلاتی دەولەت رۆیشتووە - کاتێک والرشتاین دەلێت: "سۆڤێت لەلایەن کاریگەری هاوبەشی سەرمایەداری و سیستەمی جیهانی هەلودشێنرایەوە، سۆڤێت هێزی تێپەراندنی ئەم کاریگەرییەی نەبوو" لە راستی نزیک بۆتەوە. بەلام وورد لەدەست بردن بۆ ناودرۆکی مەسەلەکە. هەرچی میشیل فوکویە کاتێک لە شرۆڤەکەیدا دەلێت: **"لەبەرئەوەی سۆڤێت هەمان تەکنۆلۆژیای زانست - دەسەلاتی سیستەمی بەکارهێناوە سەرلەنوێ لەگەڵ سیستەم بۆتەوە یەک"** زیاتر نزیکە لە راستییەوە.

شرۆڤەی هاوشێوە بۆ کۆمۆنەی پاریس، بزووتنەوەکانی رزگاری نیشتمانی، هەولی کۆمۆنیست و سۆسیال دیموکراتەکان لە جێگای خۆیدایە. هەر کێلگەیەک رووەکی تایبەت بە خۆی بەرهەم دێنێت. لە کێلگەی هەزاران سالەی زانست - دەسەلاتدا رووەکی ئازادی بەگشتی بە تایبەتیش رووەکی سۆسیالیزم بەرهەم ناهێنرێت. لەم سۆنگەیەوە پێویستە چالاکوانانی ئازادی و سۆسیالیزم (بێگومان تیۆریزانەکان) بەر لە هەموو شتێک کێلگەی خۆیان ئامادە بکەن، بەرامبەر بەو نەخۆشیانەی لە کێلگەی دەسەلات تەشەنە دەکات دەستنیشان کردن و تیمارکردنی نەخۆشییەکان بکەن، لە هەمووشیان گرنگتر دوورکەوتنەوەیە لەو نەمامانەی کە وەکو دەسەلات نەشونما دەکەن، پێویستە نەمامی خۆیان بچێنن و گەورەی بکەن. لە دۆخێکی پێچەوانەدا هەر وەکو لە مێژووی شارستانییەکاندا بینراوە بلێن **"ئازادیمان چاند"**، دواتر دەبینین کە لە سیستەمەکانی پێشووتری دەسەلات جیاوازتر نین، بەم جۆرەش لە دووبارە کردنەوەی هەزاران نموونەی رابردوو رزگاریان نابێت.

1. Kropotkin پیۆتێر ئالێکسیڤیچ کرۆپۆتکین نووسەرێکی کۆمۆنیست و بیرمۆزگەرێکی ئانارشیستی روسە، لە نێوان سالانی (١٨٤٢ – ١٩٢١) دا ژیاوە. گرنگترین بەرهەمەکانی "کێلگە و کارگە و ئەتولیاکان" و "ئەزیندای رووسی" و "بیرەوەرییەکانی شۆرشگێرێک".

لیرەدا بۆئەودی پەیوەندییەکەی لەگەڵ کومەڵناسی بونیادیی بێنمەوە یاد وەکو ئاماژە پێکردنێک پێویستی باسکردنیم بینی. لە بابەتی کومەڵناسی ئازادیدا بە بەرفراوانی شرۆڤەی دەکەین.

هـ . لە کۆمەڵگاکانی شارستانیدا خستنەڕووی رۆڵی کردە دەزگاییەکانی لە جۆری ئایین، زانست، فەلسەفە، هونەر و ئەخلاق زۆر گرنگە.

بانگەشە ئەوەیە کە پەیوەندییەکی نزیک لە نێوان شارستانی و پێشکەوتنی ئایین، زانست، فەلسەفە، هونەر و ئەخلاقدا هەیە. داودرییەک کە هەرە زێدە بۆ شرۆڤە کراوەیە ئەوەی سەبارەت بەم گوڕەپانانەیە. لەو بڕوایەدام کە بە شیوەیەکی بەرجەستە لە دەوڵەتی راهیبی سۆمەردا چۆنییەتی و ئامانجی ئاواکردنی ئەم گوڕەپانانەمان بینی کە لەوێدا یەکەمین پێهەڵگرتنی سەرسامانەی خۆیان ئەنجامداوە. هەروەها باسی ئەوەشمان کردبوو کە ئەم گوڕەپانانە دوخی کوڕپەلەیی رەسەنی خۆیان لە کلتووری نیولیتیکەوە وەرگرتووە کە لە حەوزی **"دیجلە ـ فورات"**دا بە دەزگا بووە.

زاراوەی پیرۆزی سەرچاوەکەی بۆ بەها پێدانی نائاسایی ئەو خۆراکانە دەگەڕێتەوە کە لە تێرکردنی مرۆڤدا بەکاردەهێنرێن. کاتێک بە خۆراکی زۆر هەمەڕەنگ گەیشتوون، ئەمەیان هاوتای ناسنامە کۆمەڵایەتییەکەیان بینیوە، وەکو لوتفی ئیلاهی هەڵیان سەنگاندووە و سوپاس گوزاریان کردووە. ژیان کە ئەمرۆش تەواو بە واتاکەی نەگەیشتووین کاتێک هەوڵدەدرێت لە میانەی ئەفسوون و ئەفسوونگەرییەوە واتادار بکرێت، ئەو زاراوەیەی هەرە زێدە وەکو پرەنسیپێکی خولقێنەر پەنای بۆ دەبرێت، ئیلاهیبوونە. نابێت ئیلاهیبوون لەگەڵ خودا (اللّه)دا تێکەڵ بکرێت. ئەڵلا کە لە هەلومەرجی کلتووری سامییەوە داهێنراوە جیاوازە و واتای پەرەسەندنێکی تایبەت دەبەخشێت. ئیلاهیبوون کە بۆ تەواوی کۆمەڵگاکانی مرۆڤ گوزارشتی خۆی لە پرەنسیپی خولقێنەردا دەبینێتەوە، زاراوەیەکە

بۆ شرۆڤە کردن زۆر کراوەیە. تا ئێستاش ئەم تایبەتمەندییەی خۆی دەپارێزێت. بوونەوەرێکی وەکو مرۆڤ کە بەهرە و توانای تێگەیشتنی سنووردارە، بانگەشەی: دەتوانێت سەرتاسەری گەردوون شرۆڤە بکات، زێدەڕۆیی کردنە لە گەورە کردنی مرۆڤدا. لە میانەی ئەم زانیاری و توانا سنووردارەی زانیارییەوە کە هەیەتی، هەر شتێک لێی تێنەگات زاراوەی ئیلاهیبوونی پێوە دەلکێنێت، لەم لایەنەوە میتافیزیکێکی باشە. لەو بڕوایەدام کە ئەمە هیچ خراپییەکی نییە. لە ڕەوشێکی پێچەوانەدا دەبێتە پەسەند کردنی مرۆڤ وەکو تاکە خوداوەند، لەو بڕوایەدام هێندە خۆ زلکردنیش واتای گەردوون ناهێڵێت.

راهیبەکانی سۆمەر کاتێک خوداوەندیان داهێناوە لە هەڵسەنگاندنێکی میتافیزیکی بەرکەماڵ زیاتر، وەکو ئاسانکارییەکی روون کردنەوە و هۆکارێکی مۆراڵ بۆ کۆمەڵگا بونیادنراوەکان بەکاریان هێناوە. لەوانەیە راهیبەکان بۆ جاری یەکەم واتای تاوان و سزایان لە زاراوەی خوداوەند بار کردبێت، بۆ پێشخستنی سۆزی گوێڕایەڵی کردن بەکاریان هێنابێت. هێدی هێدی **خودا دەکرێت بە دەوڵەت**. ریفۆرم لێرەدایە. لە پاشماوەی دیواری پەرستگاکان دیارە کە شوێنی دانیشتن و هێڵکاری وێنەکان بە گوێرەی بەهێزکردنی بەڕێوەبەرانی دەوڵەت نەخشەکێش کراوە. کاتێک پادشا بە ناوی خوداوەندەکەیەوە دەچێت بۆ شەڕ زۆر باش بەرژەوەندییەکانی خۆی دەمامک دەکات. لە تەواوی نەخشە و باسە نووسراوەکاندا بەڕێوەبەر بەردەوام کوڕە خۆشەویستەکەی خوداوەندە، دوژمنەکانیشی ئەو شەیتانەن کە بە نەعلەت دەکرێن. هێدی هێدی گروپێکی خوداوەندەکان شێوە دەگرێت. ئەمەش رەنگدانەوەیەکی زۆر ئاشکرای بەڕێوەبەرایەتی نوێیە.

بە ئەندازەی کۆمەڵگای سۆمەر لە هیچ کۆمەڵگایەکی دیکەدا هێندە بە ئاشکرا یەکبوونی خوداوەند و بەڕێوەبەر پیشان نەدراوە. پرسیاری کامەیان دەمامکی ئەویترە؟ چیتر هێندە گرنگ نییە.

بەو رادەیەی خوداوەند دەکریت بە ددولەت، لە کەسایەتی چینی بەڕیوەبەریشدا وەکو هیزی چاودیر، بەڕیودبەر و شکۆدار و خولقینەری کۆمەڵگا بەردەوام واتادار دەبیت. بەڕیودبەرایەتی چەندە تایبەتمەندی بەدەست بینیت خوداوەنددکەشی لەو کەمتر نابیت. چەندە کۆمەڵگا بە فەزیلەت بەڕیوەببریت، بەو ئەندایەزدیەش پەیوەندی بەڕیودبەر بە ئیلاهیبوونەوە دەرددکەویت و دەسەلمیندریت. ئیتر دەستنیشان کردنی جیاوازی نیوان خوداوەند ـ بەڕیوەبەر لەلایەن بەڕیودبراودکانەوە ئاستەم دەبیت. میتافیزیکی خراپ پەیوەندی بەم پیشکەوتنانەود هەیە. ئیتر ئیلاهیبوونی داهینراو دەبیتە میتافیزیکی خراپ. لەم قوناخە بەدواود هەموو کومەڵگاکانی شارستانی هیزی ئەفسوونی ئایین و خوداوەند لە مەشروعکردنی بەڕیوەبەرایەتیدا دەدۆزنەوە و بەرددوام بەکاری دینن. هەرچەندە خوداوەندی پیروزی زاوزیکردن و خولقینەردکەی جاران لە گۆشەیەکی هزر و سوزی چەوساود و بە میگەلکراودکاندا مابیت، ئەو ئایین و خوداوەندەی بووە بە ددولەت بە شیودیەکی ئاشکرا لە ریگای بەندە بەڕیوەبەرە خۆشەویستەکانیەود رۆل دەبینیت.

پەیوەندییەکی شایستەی سەرنجدان لە نیوان ژمارەی خوداوەندەکان و شیوەی کومەڵگادا جیگای باسە. فرەخودایی چەمکی خوداوەندی ئەو سەرددمانەیە کە حوکمی یەکسانی تیرە جیگای باس بوو. کەم بوونەوەی ژمارە و پابەندکردنیان بە ریزبەندی گەورە بۆ بچووک لە نزیکەوە گریدراوی پروتۆکۆلی بەڕیوەبەرە. پی بە پی هەڵکشان بۆ سەرۆکی خوداوەندان، گۆڕانکارییەکی پەیوەستە بە دەرکەوتنە پیشی یەکیک لە بەڕیوەبەردکانەوە. پەیوەندییەکی سەیر لە نیوان چەمکی ئایینی تاکخودایی نەبینراو و بی وینە لەگەڵ بە دەزگابوونی دەولەت و دابڕانی لە وابەستەیی بە کەسەکانەوە و بە دەزگابوونیان هەیە، کە تا بڵیی واتادارە و بۆ شیکردنەوەی پیویستی بە لیکۆڵینەوە هەیە. لەم لایەنەوە کارکردن لەسەر تیۆلۆژی دەشیت ریگا لە پیش رۆشنبوونەودیەکی واتادار بکاتەوە.

پی بە پی کەم جیگرتنی خوداوەند لە هیزی بەریوەبەرایەتیدا، لە کاتیکدا لەلایەکەوە کەوتنی دەمامکەکانیتی، لەلاکەی دیکەشەوە روون بوونەوەی واتای دەولەتە و ئەو راستییە ئاشکرا دەکات کە دەولەت گوزارشت لە بەرژەوەندی کی دەکات. لە دەستدانی رولی ئایینە بو بە دەستهینانی مەشروعییەتیکی پیویست و بەهیز. سەرباری ئەم پیشکەوتنانە کومەلگای شارستانی بەلانی کەم هیندەی زورداری کاریگەری ئایینی بو بەدەستهینانی مەشروعییەت بەکارهیناوە. بە دەولەتکردن و تایبەتیکردنی ئایین شانبەشانی کومەلگای شارستانی بەریوە دەچیت. بە تایبەتیش لە رووی پیشکەوتنی بەریوەبەرایەتییەکەیەوە. ئەم رەوشە جیابوونەوەی مەزهەبەکان و پیکدادانەکانی ئایینیش روون دەکاتەوە. پیکدادانی شارستانییەکان، واتا پیکدادانی ئایین و مەزهەبەکان. لە پیشەوە پیکدادانەکان بە ناوی ئایین و مەزهەبەکانەوە دەکرین تا تەواوی کومەلگا بەشداری پیکدادانەکان بیت. شەرە مەزن و دریژخایەنەکانی شارستانی بەردەوام لەژیر پەردەی پیکدادانی ئایینە مەزنەکاندا بەریوەبراوە. شەرەکانی لەژیر ناوی ئایینەکانی ئیسلام، کرستیان و موسەوی بەریوەبراون پەیوەندی بە بوونە هیزی پیشەنگ لە شارستانی روژهەلاتی ناویندا هیندە ئاشکرایە پیویست بە پەردەپوشکردن ناکات. کاتیک وەکو ئایدیولوژیای فەرمی دەولەت راگەیەنران ئاشکرایی گەیشتە ئاستی هەرە بلندی خوی. هەر وەکو دەبینریت دوای هەر گەیشتنە لووتکەیەک، گرنگییەکەشیان کەم دەبیتەوە. مەزهەبگەرایی رکابەر بەردەوام بوتە بەیداخی هەلویستی یاخیبوونی ئەو کومەلگا مارژینالانەی لە دەردوەی کومەلگای شارستانیدا ماونەتەوە. تارادەیەکیش رەنگدانەوەی ناکوکییە چینایەتییەکانن. لە روژگاری ئەمروماندا لەگەل ئاواکردنی دەولەت ـ نەتەوەی سەرمایەداریدا بوونەتە مەزهەبیک و بو جوریکی میللیگەرایی گوراون. ئەم جارە لەژیر ئەم کیسوە[1] یەدا دیسان رولی بوون بە دەمامک دەبینن.

١ـ ئەو بەرگە سپییەیە کە حاجیان لە کاتی حەجدا لەبەری دەکەن؛ ئیحرامیشی پیدەلین.

بە گوێرەی ئایین هەرچەندە جێگای فەلسەفە لە مێژووی شارستانیدا سنووردارە بەڵام گرنگە. پێشکەوتنی واتاناسی، کورتهێنان و ناتەواوی ڕوونکردنەوە ئایینییەکان پێویستی هەبوونی فەلسەفەی خستۆتە ڕوو. دانا (حەکیم)ی کە هێندەی ئایین مێژوویێکی کۆنی هەیە، دەشێت بە سەرەتایی فەلسەفەش لەقەڵەم بدرێت. دانا نوێنەرایەتی ئەو مرۆڤە دەکات کە بیردەکاتەوە، جیایە لە تیۆلۆژی و خۆی سەرچاوەیەکی واتایە. هێندەی گووتەکانی خوداوەند، بۆچوونەکانی ئەویش وەردەگیرێت. لەگەڵ دەولەت و شارستانی هێندە لەناو ئاشتیدا نییە. زیاتر پەیوەستە بە کۆمەڵگای دەردوەی کۆمەڵگای فەرمییەوە. لە پێشکەوتنی ئەخلاق و زانستدا ڕۆڵیان بەرچاوە. هەرچەندە لە سەرچاوە نووسراوەکاندا ڕەنگی نەدابێتەوە، ژنانی دایکە ـ خوداوەندی نیولیتیک و توێژە خراپ نەبوودکەی پلەداری لە دانایی نزیکن. لە کومەلگای سۆمەردا شوێنپەنجە بە هێزدکانی ددبینرێت. قەڵەمبازدکانی پێغەمبەرایەتیی پڕن لە دانایی. نەریتی دانایی ـ فەلسەفەی ڕوژهەلاتی ناوین پێویستی بە لێکولینەوەیە. هەبوونی فەلسەفە بەر لە کلتووری یۆنان ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە. شانسی فەیلەسوفە یۆنانییەکان لەوەدایە، بەیەکەوە لەناو شوێنگەی جوگرافی و قۆناخی هەرد هەلکشاوی شارستانیدا ژیاون. هەر وەکو چۆن ڕاهیبەکانی سۆمەر لە میانەی ئاواکردنی ئایین و خوداوەند بە یەکەوە بونیادنانی کۆمەڵگا و دەوڵەتیان بەڕێوەبردووە، فەیلەسوفەکانی یۆنانیش لە قۆناخێکی بەرزتردا لە ئاواکردنی کۆمەڵگای نوێ و بەردەوامکردنی لە ڕێگای نیو ئایین ـ نیو فەلسەفە ڕۆڵیان بینیوە. ئەو کارەی کراوە هەمان شتە: هونەری زاراوەسازی بەکارهێنراوە. یەکەمین لە ڕێگای ئاواکردنی ئایین ڕۆڵ دەبینێت، ئەویتریش لە میانەی زاراوەی فەلسەفی هەمان ڕۆڵ دەبینێت. ئیتر خوداوەندە دەمامکدارەکان جێگای خۆیان بۆ خوداوەندە بێدەمامک و پادشا ڕووتەکان بەجێدێڵن. ئەمەش پەیوەندی بەو پێشکەوتنەی هزری مرۆڤەوە هەیە کە لە ڕێگای

فەلسەفەوە بەدیهیناوە.

هزری فەلسەفی کە لە کۆمەلگاکانی روما و یۆنان رۆلیکی سنورداری دەبینی، لە کۆمەلگای سەرمایەداری ئەوروپادا شۆرشیکی گەورەی بە خۆیەوە بینی. لیرە هاوشیوەی ئالۆزی ئایینەکان، هەمان پیشکەوتن لە ئالۆزی فەلسەفیشدا دەبینین. وەکو پیویستییەکی سیستەم زەق بوونەوەی بەرژەوەندییە چینایەتی و نەتەوەییەکان لەم قۆناخە نوییەی شارستانیدا رولی لەم ئالۆزییەدا مەزنە. کاتیک لە ریگای شەر و پیکدادانە ئایینییەکان ناکوکییەکان چارەسەر نەکران، کاریکی زیاتر کەوتە سەر شانی فەلسەفە. سالانی ١٦١٨ ـ ١٦٤٩ سەردەمی دوا شەرە ئایینیەکانە. هەمان سەدەی حەڤدەهەمین سەردەمی شۆرشی فەلسەفییە. فەلسەفە کە رولیکی بەرپرسیارانەی لە کومەلگای یۆنان و رۆمادا بینی، لە کومەلگای شارستانی نویدا دەبیتە شیوەی ئایدیۆلۆژی پیشەنگ. قوتابخانەی مەزنی فەلسەفی سەرهەلدەدەن. لەلایەکەوە **"مردنی خوداوەند"** رادەگەیەنریت، لەلایەکی دیکەشەوە سەری پادشا داپوشراوەکان دەپەرینریت. ئیتر قۆناخی دەولەتە سەرمایەدارییەکان دەست پیدەکات کە دەولەت ـ نەتەوەی ئیلاهیکراو جگە لە پادشای رووت هیچ شتیکی دیکە نییە.

شۆرشی نیولیتیک لە بواری هونەریش ریگا لە پیش شۆرش دەکاتەوە. دوای هیلکارییە سادەکانی دیواری ئەشکەوتەکان، قۆناخ پر لە وینە و شیوەکانی دایکە ـ خوداوەند دەبیت. یەکەمین بابەتەکانی هونەر ئەم وینە و شیوانەن. ئەمەش بە بنەچەی پەیکەرسازی دادەنریت. لەگەل دەست پیکردنی کۆمەلگای شارستانی وینەکانی خوداوەند و بەریوەبەرەکان لەناو یەکتریدا نەخش دەکرین. لە ئەنجامی زیادبوونی جیابوونەوەی چینایەتی و ئەرکی بەریوەبەرایەتی بە ئەندازەی دەولەت ریگا لە پیش بە دەولەتیکردنی هونەریش دەکریتەوە. بە تایبەتی لە هونەری میسر، چین و هیندستاندا خوداوەند، پادشا و راهیبەکان بۆ پیشاندانی

هێزدکانیان لە پێشبڕکێدان. نەخش و پەیکەرە سەرسامەکان وەکو پێناسەی ئەم هێزانەیە. بیناسازیش بە هەمان ڕێڕەودا دەڕوات. خانووی بەڕێوەبەران و شوێنە ئایینییەکان گورەپانی جێبەجێ کردنی بیناسازییە. کۆشک و پەرستکای زەبەلاح دروست دەکرێن. گۆڕستانی گەورە ئاوادەکرین. ئەمانە هەموو نیشانەیەکی مەترسیداری ئەو ئاستەن کە قوستنەوە و فشاری سەر مرۆڤ لە کۆمەڵگای شار (شارستانی)دا پێی گەیشتووە. تەنیا بۆ دروستکردنی ئەهرامێک یان پەرستگایەک هەزاران مرۆڤ دەکرێنە قوربانی و خەرج دەکرین. لەگەڵ بەهێزبوونی بازرگانی، یەکێک لەو وێنە بەهێزانەی لە هونەردا رەنگی داوەتەوە بازرگانەکانن. ئەوانەیان کە بە ڕادەی پادشاکان بەهێزن دەشێت لە پاشماوە هونەرییەکاندا ببینرێن.

لە قۆناخی شارستانی یۆنان و ڕۆما، شۆڕشێک لە بواری بیناسازی شاردا ڕوودەدات. ئەو شارانەی پێشتر بریتیبوون لە ناوەوە و دەرەوەی قەڵاکان، وەرچەرخانێکی بونیادی ئەوتۆ بەخۆیەوە دەبینێت تەنانەت ئەمڕۆش جێی واق وڕمانە. نرخێک کە لە ژێر ئەم رەنجەدا شاراوەیە تارادەیەکی مەزن بە کۆیلەکردنی کۆمەڵگایە. بەشێکی زۆری رەنجی کۆیلەکان لە بیناسازی شاردا خەرج دەکرێت. گۆڕستان، پەرستگا و شارە مەزنەکان نیشانەکانی کۆیلایەتین. ئەم نیشانانە لە هەمان کاتدا ئەوە پیشاندەدەن کە کۆمەڵگای شارستانی بە چ خوێن و ئارەقەیەک بونیادنراوە. کۆمەڵگای ڕۆما و یۆنان لە بواری پەیکەر سازیشدا قۆناخێکی نوێی شارستانییە. خوازیارن شکۆداری و جوانی لە پەیکەرەکاندا بکەن بە ئەبەدی.

کلتوور و هونەری یۆنان و ڕۆما کە لە ڕێگای ڕێنسانسەوە زیندووکرایەوە هێزی ئیلهامی شارستانی ئەوروپایە. ئەوروپای سەردەمی دەرەبەگایەتی کە لەژێر حوکمی ئاییندا بوو، تەنیا لە میانەی ئەم کلتوورەی ڕێنسانس کە تارادەیەک بۆ هزری ئازاد

کراودیە بە پەنجەردیەکی نوێی زهنی دەکات. هونەر لە میانەی چینی نوێی شارستانی، واتا لە ڕێگای بورژوازییەوە تەنیا لە بواری چەندایەتییەوە چالاک دەبێت. جارێکی دیکە شکۆدارییە کۆنەکەی بەدەست ناهێنێت. هونەر بە تەواوی بەشەکانی بیناسازی شار، مۆسیقا، وێنە و پەیکەرسازییەکەی لە خزمەتی سەرمایەداریدا بە خێرایی تێکدەچێت، پیرۆزی خۆی لەدەستدەدات و لەژێر ناوی پیشەسازی هونەردا بێ ناسنامە دەکرێت، وەکو کالایەکی بەکاربردن بەکاردەهێنرێت، بە واتایەک لە واتاکان کۆتایی هاتنی خۆی رادەگەیەنێت.

دەشێت سەرچاوەی بنەڕەتی ئەدەب و مۆسیقاش بۆ بە دەزگابوونی نیولیتیک بگەڕێنرێتەوە. موسیقای دێرین هەر وەکو بلێی رەنگدانەوەی ئەو سەردەمەیە. بلوری شوان، دەهۆل و زورنا تەنانەت ئەمرۆش ئاوازە خەمناک و بەجۆشەکانی ئەو سەردەمانانەمان بۆ دەگێڕێتەوە. وەکو بنەچەی مۆسیقا وان. لە کۆمەلگای سۆمەردا شێوە و ناودرۆک زیاتر پێشدەخرێت. لە پەرستگا و کۆشکی پادشاکاندا مۆسیقا ژەن و گۆرانی بێژان شوێنێکی گرنگیان هەیە.

داستانە زارەکییەکان بە رەوانبێژییەکی بەهێز باسی پیرۆزی و حەسرەتەکانی یەکەمین ناسنامەی خێل دەکەن. ئەمانە سەرچاوەی سەرەکی داستانە نووسراوەکانن. داستانی گلگامێش یەکەمین دەقی نووسراوی مێژووە. لەوانەیە سەرچاوەی بنەڕەتی ئەدەب و دەقە پیرۆزەکانیش بێت. چەندین دەقی ئەدەبی و ئایینی سۆمەر تەنیا سەرچاوەی ئیلهامی ئەدەب و باسە تیۆلۆژییەکانی یۆنان نییە. داستانەکانی یۆنان لە سەرووی هەمووشیانەوە تەواوی وێنا میتۆلۆژییەکان نموونەیەکی تری ئەوانەی سۆمەرە کە بە ڕێگای ئەنادۆڵەوە تێپەڕیوە و گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە. کلتووری مۆسیقا و ئەدەب کە لە یۆنان گۆڕانکارییەکی دیاری بە خۆیەوە بینی، لە کۆمەلگای بۆرژوازی ئەورووپادا لە ڕێگای ڕۆماوە بە دوا ڕێڤیزیۆندا

تیپەڕی، دەکریت بە شێوازی پوپ[١] و پیشەسازی کلتووری، بەم جورە ئەفسوون و پیرۆزی سەرەتا لە دەستدەدات، وەکو هونەرەکانی دیکە بە شیوەی کالای ساکاری بەکاربردن رووبەڕووی لەناوچوون دەبیتەوە.

جیاوازی **"چاک - خراپ"** لە ئەخلاقدا گریدراوی پارچەبوونی کومەلایەتی بنەڕەتی کومەلگای شارە. لەلایەکەوە مەودای نیوان گروپەکانی بەرژەوەندی روون دەکاتەوە، بە گشتیش گوزارشت لە جیاوازی کومەلگای باش و کومەلگای خراپ دەکات. گەوهەرەکەشی کومەلگاگەراییە. وابەستەبوون بە کومەلگا گوزارشت لە ئەخلاق (رەوشت)ی باش دەکات، دوورکەوتن لە کومەلگا و ناکوکبوون لەگەل بەهاکانیدا گوزارشت لە خراپی دەکات. بونیادی کومەلگا هەر لە سەرەتاوە خاوەن کارەکتەرێکی ئەخلاقییە. واتا لەسەر بنەمای دلخوازی و پیرۆزییەوە گریدراوی ریساکانی سیستەمی نوین. یەکەمین **"دەستووری بنەڕەتی کۆمەلگا"** ریسا ئەخلاقییەکانیەتی. ئەخلاق لە ناوەڕۆکی کۆمەلگادا هەیە. هەر کومەلگایەک بناخەی ئەخلاقی خوی لەدەستبدات لە پەرتەوازەبوون رزگاری نابێت. هەرچی ریساکانی کۆمەلگایە لە گەوهەردا گریدانە بە ناسنامەی کۆمەلگا، هەبوونە ئیلاهییەکەی، زمان و ئەندامەکانی دیکەیەوە، بە جۆرێک کە هەر وەکو بلێی یەک گیانە، تەنانەت کاتێک پیویست بکات لەپیناویدا مەرگیش رەچاو بکریت. هەلبەتە فریدانە دەرەوەی کۆمەلگا یەکسانە بە مردن.

حقوق یەکێک لە داهینانە گرنگەکانی کومەلگای شارستانییە. مسۆگەر لەگەل پارچەبوونی کۆمەلگا، جیابوونەوەی چینایەتی و بە دەولەتبوون دەکەویتە رۆژەڤەوە. بناخەکەی ئەخلاقە. هەر وەکو چۆن بە دەولەتیکردنی پیرۆزییە ئایینییەکان ریگای لە پیش ئایینی دەولەت کردوتەوە، بە ددولەتیکردنی ئەخلاقیش ریگای لە پێش حقوق کردۆتەوە. حقوق گوزارشت لە بنەماکانی ریسا ئەخلاقییەکانی

١- پۆپ کورتکراوەی پۆپیلەرە کە بە واتای ناسراو یان بەناوبانگ دێت. بە زۆری لە بواری مۆسیقا، شانۆگەری، سینەما و ئەجێندابیدا بۆ ئەو رووداو، بابەت و ئۆبژانە بەکاردێت کە لەناو خەلکدا دەبنە جێی سەرنج.

سیستەمی کۆمەڵگای نوێی دەوڵەتی و بەرژەوەندییەکانی چینی بەڕێوەبەر، ماڵ و موڵک و ئاسایشەکەی دەکات، ئەمەش بە واتای **"دەستووری بنەڕەتی"** کۆمەڵگای نوێ دێت.

یەکەمین نموونەی لە کۆمەڵگای سومەردا دەبینرێت. زۆر پێش یاساکانی حامورابی دەقی نووسراو دەبینرێت. هەر بۆیە لەدایکبوونی حقوق لە ڕۆما و ئەسینا نییە، بەڵکو لە دەوڵەتشاری سۆمەرە. لە قۆناخی ئەسینا و ڕۆمادا پەیوەندی حقوق بە کۆمار و دیموکراسییەوە جەختی لەسەر دەکرێتەوە. ڕێکخستنەوەی بە شێوەیەکی نووسراو و فەرمیانە جێگای باسە. هەرچی لەدایکبوونی دیموکراسی و کۆمارە بە ئامانجی بەربەستکردنی دیکتاتوریەتی سەرەڕۆیی و پادشایەتی گوزارشت لە لێکەڕینی بەڕێوەبەرایەتی کۆمەڵکاری ئەرستوکراسی دەکات. هەرچەندە شوێن پەنجەکانی لە کۆمەڵگای سۆمەردا ببینرێت، بەڵام یەکەمین گوزارشتی فەرمی و نووسراوی خۆی لە قوناخی شارستانی کومەلگای یونان و ڕۆمادا دەبینێت، کە کریدراوی بەلاوەنان و ڕێکخستنەوەی کائیوس، پەشێوی و ئاستەمییەکانی بەڕێوەبەرایەتییە. دەستورخوازی، کۆماریخوازی لە سەرووی ئەو بابەتانەی حقوقەوە دێن کە لە شارستانی بۆرژوازی ئەوروپادا گفتوگۆی لە بارەوە دەکرێت. دوا دۆزینەوە دەرهەق بە **"مافەکانی مرۆڤ"** بوو. مۆرکی ئەو نوێنەرایەتی و تاکڕەوێتییە هەڵدەگرێت کە لە ئاستی کۆمەڵگادا فراوان بووە و گەشەی سەندووە.

پێویستە پێشکەوتنی زانستی وەکو پارچەیەکی ئەم پۆڵێن بەندییە بنەڕەتیانە ببینرێت. شێوەیەکی هۆشیارییە. تاکە لایەنی جیاکاری: گوزارشت لەو بەشەی زانیاری دەکات کە لە ئاکامی تاقیکردنەوەوە لەلای هەموو کەسێکەوە ئەرێکراوە. تەواوی زانیارییەکان نا، بەڵکو ئەو زانیاریانە لەخۆوە دەگرێت کە واتایەکی تایبەتی هەیە (بە تاقیکردنەوە پشت ڕاست کراوەتەوە). بە واتا گشتییەکەی زانیارییەک کە تاقی نەکرابێتەوە بوونی نییە. جیاوازی

لە جۆری زانیاری تاقیکراوە ـ تاقینەکراوە، پۆزەتیف ـ میتافیزیک و زانیاری تیۆری و پراکتیکی لە کۆمەڵگای شارستانیدا پێشدەکەوێت. ئەم ڕەوشەش گرێدراوی پەیوەندی زانیاری ـ دەسەڵاتە. لە ڕووی زانیاری زانستییەوە مێژوو ئاشنای سێ شۆڕشی گەورەیە: یەکەم قۆناخ بە دەزگابوونی نیولیتیک (قۆناخی تەل حەلەف ٦٠٠٠ـ٤٠٠٠پ.ز) بە کۆمەڵگای سومەریشەوە وەک پاشگرێک، قۆناخی دووەم کۆمەڵگای ئەسینا و ئەنادۆڵی ڕۆژئاوا (٦٠٠ـ٣٠٠پ.ز)، قۆناخی سێیەم ئەورووپای ڕۆژئاوا (لە ١٦٠٠ی زایین بە دواوە) پەیوەستبوونیان بە قۆناخەکانی شارستانی ئاشکرایە. هەر قوناخێکی مێژوویی لە ڕێگای شۆڕشی زانستی خۆیەوە پێشدەکەوێت. بەڵام پێویستە ئایین لەگەڵ فەلسەفە، ئەدەب، هونەر و حقوق لەناو پەیوەندییەکی نزیکدا ببینرێت. دیاریکردنی جیاوازی نێوان زانست و فەلسەفە زەحمەتە. دەشێت وەکو لایەنی تیوری و پراکتیکی هەمان ڕووداو بیریان لێبکرێتەوە.

بە شێوەیەکی گشتی ئەو پەیوەندییەی لە نێوان کۆمەڵگای شارستانی و ئەم کاتاگۆریانەی واتادا ئاوا دەکرێت، دەشێت لە دووالیزمی واتا ـ دەسەڵاتدا گوزارشتی لێبکرێت. ئەم کاتاگۆریانەی واتای مەزن کە بەرهەمی زهنییەت و پراکتیکی کۆمەڵگای مرۆڤن دووچاری دەست بەسەرداگرتن و چەواشەکارییەکانی توێژی دەوڵەتی کۆمەڵگای شارستانی دێن. یەکەمین کار کە دەسەڵات دەیکات، ڕێکخستنیانە بە شێوەی جیهانبینی کۆمەڵگا و سەرچاوەکانی هێزی کرداری خۆی. هەر قۆناخێکی شارستانی بە گوێرەی بنەماکانی جیهانبینیەکی نوێ ڕێکدەخرێت. لە کاتێکدا ئەم ڕێکخستەکردنانە بۆ خۆیان (بۆ دەسەڵات) تا دوا ڕادە پۆزەتیفە (دیاردەی بینراوە)، بۆ ئەوانەی لە دۆخی بەڕێوەبراوەکاندان بە واتای تاریک کردن، پەردەپۆش و زنجیرکردنێکی سەرسام دێت. بە بەراورد لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتییە ئاشکراکانی زۆرداری، ئەو مەشروعییەتەی لە ڕێی جیهانبینیە نوێکانەوە بە دەست دەهێنرێت،

بەردەوام بۆ بەڕێوەبەرایەتییەکان سەردکی بوود. پێشکەشکردنی بەرژەوەندییەکانی خۆیان وەکو بەرژوەندی تەواوی کۆمەڵگا و چارەنووسەکەی کاری سەرەکییانە. بەو رادەیەی سەرکەوتن لەم کارەیاندا بە دەست بێنن دەتوانن تەمەنی ئەو کۆمەڵگایانە درێژ بکەنەوە کە بە شارستانی دەژمێردرێن. هەر شارستانییەتێک لە ریشەدا مەشروعییەت ـ هێزی ئیقناعکردن ـ ی لەدەست بدات، تەنانەت ئەگەر سەردەمانێک شارستانیەتێکی زەبەلاحی جیهانیش بووبێت، لە رووخان رزگاری نابێت. بۆ نموونە هۆکارە سەرەکییەکانی هەرەسهێنانی شارستانی روما پەیوەندی بە لەدەستدانی سەرنج ڕاکێشی و قورساییەکەییەوە هەیە، لە ناوەوە بە دەستی کرستیانەکان لە دەرەوەش لەلایەن قەومە کۆچبەرەکانەوە. جڤاتەکانی مرۆڤ کاتێک بە شێوەی جڤاتەکانی ئایینی نوێ و جڤاتی قەومەکان بوون بەیەک هێزە سەرسامەکەی رۆما مەشروعییەتی خۆی لەدەستدەدات و پەرتەوازە دەبێت.

بە شێوەیەکی دابڕاو لەوانی تر لێکۆلینەوە لەو دەزگا کۆمەڵایەتیانەی کە دەتوانین وەکو کاتاگۆریەکی میتافیزیکیانەش پێناسەیان بکەین، رێگا لە پێش شێواندنی واتا دەکاتەوە. بێگومان ئەو راستییە میتافیزیکیانەی بە شێوەیەکی توند و رەها لەلایەن ماتریالیستەکانەوە رەخنە دەکرێت، بۆ خۆیان سەربەخۆ وەک باش و خراپ جیانابنەوە. بە گوێرەی ئەوەی زهن و کۆمەڵگای مرۆڤ بەبێ میتافیزیک ژیانی بۆ نابرێتە سەر، کەواتە ئەوەی واتادارە وەک پەیوەست بە یەکەوە و بە کۆمەڵگاوە لە شێوەی میتافیزیکی باش و خراپدا هەڵبسەنگێنرێت.

شارستانییە مەزنەکان بە گشتی شارستانی ئایینەکانن. کەی ئایین تایبەتمەندی بەدەستهێنانی مەشروعییەت لەدەستبدات ـ لە ئەنجامی فەلسەفە، زانست یان ئایینێکی نوێ بێت ـ ئەوا بە زۆری ئەم شارستانیانەش کۆتاییان پێدێت. تەواوی ئەم راستیانە گرنگی ژیانی کاتاگۆرییە مەزنەکانی واتا ـ ئایین، فەلسەفە، هونەر، حقوق،

زانست، ئەخلاق - بۆ کۆمەڵگای شارستانی(چینایەتی، دەوڵەتی، شارنشینی) پیشاندەدەن. ئەرکی رۆشنکردنەوەی ئەم کاتەگۆریانە لە کۆمەڵگای شارستانیدا دەکەویتە ئەستۆی کۆمەڵناسی بونیادیی، کۆمەڵناسی ئازادیش چۆنییەتی ئاویتەبوونی ئەم کاتەگۆریانە لەگەڵ ژیانی ئازادی کۆمەڵگای دیموکراتی لەسەر بنەمای رەخنەکردن شرۆڤە دەکات. ئەم بابەتە لە بەشی پەیوەندیدار بە بەرفراوانی هەڵدەسەنگێنرێت.

و. لە کۆمەڵگای شارستانیدا شرۆڤە ئابوورییەکان لەبارترین بابەتەکانی مێژوون بۆ شێواندن و ئالۆزی. بوونی ئابووری بە بابەتی لێکۆڵینەوە تیۆری و کردارییەکان یەکێک لە هونەرەکانی شارستانی سەرمایەدارییە. لە ماتریالی کۆمەڵگا دەکۆڵێتەوە. سیستەمی شارستانی سەرمایەداری کە خۆی وەکو شارستانی ماددی (شرۆڤەیەکی راست و بەجێی فرناند براودلە) کردووە بە موڵکی مێژوو دەتوانین وەک سیستەمی ئابووریش ناوی بنێین. هەر وەکو چۆن بەناوکردنی تەواوی سیستەمەکانی شارستانی پێشوو بە ناوی **"سیستەمە میتافیزیکەکان"** نابەجێ نییە، بەناوکردنی سەرمایەداریش بە **"سیستەمی ماتریالیست"** دەشێت روشنکەرەوە بێت.

**لە کاتێکدا هەم کۆمەڵگای نیولیتیک - بە جڤاتەکانی یەکەمین جۆری مرۆڤیشەوە - هەم تەواوی کۆمەڵگاکانی شارستانی - بەر لە سەرمایەداری - بەهایەکی مەزنیان بە پیرۆزی، واتا، ئەفسوون و تەواوی میتافیزیک دەدا، ژیانی بە جۆرێکی دیکە شرۆڤە نەدەکرد، خۆ پێشکەش کردنی شارستانی سەرمایەداری لە شێوەی "خوداوەندی بێدەمامک و پادشای رووت" پێشکەوتنێکی شایستەی سەرنج و بەها پێدانە. قووڵایی و بەرفراوانی واتاکەی پێویستی بە شرۆڤەی بەرکەماڵ هەیە. کۆمەڵگایەکە هێزی شێواندن، خەڵەتاندن و تواندنەوەی لە بەرزترین ئاستدایە.**

بە قەناعەتی شەخسی خۆم، ناوەڕۆکە سەرەکییەکەی بریتییە

لەوەی ڕدهەندی دزی و دەست بەسەرداکرتنی ناو ئەو چالاکیانەی لەژێر ناوی **"ئابووری"** دا ڕێکیان دەخات، دەیانکات بە بلاوترین شێوەی کومەلگا. واتای وشەی ئیکونومی (ئابوری) بە زمانی یونانی واتای **"یاسای خێزان"**ە. گوزارشت لە ریسا ماددییەکانی گوزەرانی خێزان، دەوروبەر، کەردسته و ماتریالەکانی دیکه دەکات. ئەگەر لە کومەلگای شارستانیدا زاراوەکه کەمیک کشتگیر بکەین، دەشێت وەکو **"ڕێساکانی گوزەران"**ی جڤاتە بچووکەکان گوزارشتی لێبکرێت. ئەو راستییه کۆمەلایەتییەیه که هەرده کەم بە دەولەتی و تایبەتکردن بکرێت. سەرەکیترین شانەی کولەکتیفیزمی کومەلگایه. تایبەتیکردن یان بە دەولەتیکردنی نابێت بیریشی لێبکرێتەوه. تایبەتیکردنی و دەولەتیکردنی ئابووری بە واتای وێرانکردنی شانەی بنەڕەتی کۆمەلگا دێت. بێبەشکردنی کۆمەلگایە لە پێویستیترین ڕێساکانی ژیان. لەبەر ئەم هوکاره هیچ کومەلگایەک هێندەی سەرمایەداری بیرکردنەوه و بویری ئەوەی نەبووە، تایبەتیکردن و دەولەتیکردنی ئابووری بکاته تایبەتمەندی سەرەکی کۆمەلگا. بێگومان لەبەرئەوەی لە کۆمەلگای شارستانیدا تەواوی گورەپانەکانی کومەلگا بە دەولەتیکراون (کراون بە مولکی دەولەت)، شانه سەرەکییەکەشی، واتا ئابووریش بوته بابەتی مولکایەتی تایبەت و مولکایەتی دەولەت. بەلام هیچ کومەلگایەک هێندەی سەرمایەداری بە شێوەیەکی فەرمی و ئاشکرا مولکایەتی تایبەت و دەولەتی وەکو سیستەم رانەگەیاندووە.

ئەم خالە زۆر گرنگه: تایبەتیکردن و بە دەولەتیکردنی ئابووری وەکو دزی و دەست بەسەردا گرتنیکی پێشوەخت شرۆڤە کراوه. کارل مارکس بە گوزارشتیکی **"زانستیانه"**تر سەبارەت بەم خاله دەلێت: **"بەهای زیادە و بەهای رەنج دزراوه (وەکو قازانج)"**. ئەم بابەتە پێویستی بە شرۆڤەیەکی قوولتر هەیه. بە گوێرەی من بوونی ئابووری بە بابەتی مولکایەتی دەولەت و تایبەتکردن دەبێت بێ بەستنەوەی بە هۆکاری بەهای زیادە و بەرهەمی زیادەوه وەکو

دەست بەسەرداگرتن و دزی هەڵسەنگێنرێت. ئابووری کە شانەی سەرەکی کۆمەڵگایە، تەواوی شێوەکانی بە موڵککردنی، بە تایبەت و دەوڵەتیشیەوە بێ ئەخلاقیانەیە. دەکەوێتە چوارچێوەی بابەتی دزی و دەست بەسەرداگرتنەوە. هەر وەکو چۆن تایبەتیکردن و دەوڵەتیکردنی دڵی مرۆڤ یان هەر ئۆرگانێکی دیکەی بێواتا یاخود جێگای مەترسییە، بۆ ئابووریش هەمان شت جێگای باسە. بە نیازم لە بەشی تایبەت بە سەرمایەداریدا بە قووڵایی باسی بکەم.

هەر وەکو دەبینین لە کۆمەڵگای شارستانیدا کاڵابوون وەکو دیاردەیەکی زۆر گرنگ پێشکەوتووە. واتا پەیوەندییەکی توند لە نێوان کاڵابوون(بە کاڵاکردنی بەرهەم) و کۆمەڵگای شارستانی - خاوەن موڵکایەتی تایبەت، چینایەتی، شاری و دەوڵەت - دا هەیە. کاڵا و کاڵابوون لە کاتەگۆرییە سەرەکییەکانی کۆمەڵگا و شارستانی بوونە. لە دۆخێکی وەهادا پێناسەکردنی کاڵا زۆر گرنگە. بە شێوەیەکی سادە هەر شتێک پێداویستییەکانی مرۆڤ جێبەجێ بکات، لە دەرەوەی بەکارهێنانی، کە بەهای ئاڵوگۆڕکردنی بە دەست هێنا دەتوانین بڵێین بووە بە کاڵا. بۆ ماوەیەکی درێژخایەن کۆمەڵگا لە بەهای گۆڕینەوە (ئاڵوگۆڕ) نامۆیە. تەنانەت بیریشی لێناکاتەوە، بە عەیبەی لە قەڵەمدەدات. شتێکی بەنرخ و بەهادار، وەکو دیاری پێشکەشی ئەو جڤات و تاکانە دەکات کە بەهاداریان دەبینێت. جێگرتنەوەی پێشکەشکردن لەلایەن **"گۆڕینەوە"**وە تەواو دۆزینەوە یاخود فێڵێکی شارستانییە. لە کۆمەڵگای پێش یان دەرەوەی شارستانیدا گۆڕینەوە عەیبە و ئەگەر زۆر ناچاری نەبێت پێویستە دەستبەرداری لێبکرێت. کۆمەڵگا لە میانەی ئەزموونە قووڵەکەیەوە باش دەزانێت کە بکەوێتە دەرەوەی دەزگا ئابوورییەکەی کە سەرەکیترین شانەیەتی و لە جیاتی دیاری ببێتە بابەتی گۆڕینەوە، دەشێت دووچاری هەموو جۆرە بەڵایەک بێت. لەم سۆنگەیەوە کۆمەڵگا بەرامبەر گۆڕینەوە زۆر هەستیارە.

دوای ئەوەی کاڵا بوو بە بەهایەکی ئاڵوگۆڕکردن، بازرگان و

بازرگانی بوون بە دەستە و پۆلێنێکی گرنگی شارستانی. بە کورتی ئاماژەی پێ بکەم، من وەکو کارل مارکس کالا شرۆڤە ناکەم. واتا پێوانی بەهای گۆڕینەوەی کالا بە رەنجی کرێکاران بە سەرەتای قۆناخی زاراوەیەک دەبینم کە گرفتی گرنگی لێدەکەوێتەوە. ئەگەر هەڵوەشانەوەی ئەو کۆمەڵگایە بێنینە بەرچاو کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا هیچ بەهایەکی نەماوە نەکرابێت بە کالا، ئەو کاتە باشتر روون دەبێتەوە کە خوازیارم چی بڵێم. پەسەند کردنی بەکالابوونی کۆمەڵگا لە بواری زهنی، واتای دەستبەردانە لە مرۆڤبوون. بە واتای ڕەوشێکی خراپتر لە هۆڤێتی دێت. ئەگەر لێکچواندنێک بکەین، بە واتای گواستنەوەی ڕەوشی ئەو ئاژدلە بۆ تەواوی کۆمەڵگای مرۆڤ دێت کە لە قەسابخانە پارچە پارچە کراوە و بۆ فرۆشتن دانراوە. **لە بناخەی کۆمەڵگای خراپدا سوو (ربا)، لە بناخەی سووشدا بازرگانی و لە بناخەی بازرگانیشدا کالا هەیە.** بازرگانیش پەیوەندییەکی نزیکی بە وێرانبوونی ئیکۆلۆژی هەیە. ئەو ناپوورییەی لە ڕەوشی شانەی کۆمەڵگا دەرکەوتووە، سەرەتای دەست پێکردنی دابڕانی ڕیشەییە لە سروشت. چونکە یەکێتی بەهاکانی ماددە و بەها زیندووەکان دووچاری جیاکردنەوەیەکی ڕیشەیی دەکرێت. بە جۆرێک لە جۆرەکان تۆوی میتافیزیکی خراپ دەچێنرێت. ماددە بێ ڕۆح، ڕۆح بێ ماددە دەکرێت، بەم جۆرە لە مێژووی هزردا ڕێگا لە پێش دووالیزمێک دەکرێتەوە کە هەرە زێدە زهنی تێکداوە. جیاوازی و گفتوگۆیە ساختە و دروستکراوەکانی لە جۆری ماددەخوازی و مەعنەویاتخوازی، بە درێژایی مێژووی شارستانی، ئیکۆلۆژی و ژیانی ئازاد لە ئارادا ناهێڵێت. لە میانەی چەمکێکی ماددە و گەردوونی مردووەوە، ڕۆحگەراییەکی نەناسراو زهنی مرۆڤ داگیر دەکات، دەستی بەسەردا دەگیرێت و دەیچەوسێنێتەوە.

سەبارەت بە خاڵێکی دیکەش خوازیارم ئاماژە بە گومانی خۆم بکەم. گومانم لەوە هەیە کە پێواندنی بەهاکانی کۆمەڵگا ـ بە کالاشەوە ـ شتێکی شیاو بێت. نەک تەنیا ڕەنجی زیندوو، ماددەیەک

که بەرهەمی رەنجێکی بێ کۆتایە لە قەڵەمدانی وەکو بەهای رەنجی کەسێک، بۆ خۆی هەڵەیەکە، زەوتکردنی بەهایە، هەڵوێستێکە رێگا لە پێش دزی دەکاتەوە. هۆکارەکەی ئاشکرایە: ئەو رەنجانەی ناژمێردرێن چۆن بەرامبەرەکەیان (هەقەکەیان) دەپێورێت؟ لەوەش زیاتر رەنجی ئەو خێزان و دایکە چۆن دەپێورێت کە رەنجدەرە رەنج نەپێوراوەکەی هێناوەتە دونیا و گەورەی کردووە؟ مافی تەواوی ئەم کۆمەڵگایە چۆن دەپێورێت کە ئەو شتەی تێدا دەرکەوتووە بە بەها ناوی دەبەین؟ دەتوانین گفتوگۆکە درێژتر بکەینەوە. هەر بۆیە زاراوەی لە جۆری بەهای ـ گۆڕینەوە، بەهای زیادە، بەهای رەنج ، سوو، قازانج و قەبلاندن لەگەڵ دزی و تاڵان یەکدەگرنەوە ـ بە فەرمی و لە رێگای هێزی دەوڵەتەوە ـ هەر بۆیە دۆزینەوەی پێوانەی جیاوازتر بۆ گۆڕینەوە یاخود پێشخستنی شێوەی نوێی پێشکەشکردنی دیاری دەشێت واتادار بێت. دەمەوێت دواتر لە بەشی مۆدێرنیتە و ژیانی ئازاددا ئەم خاڵە روون بکەمەوە.

تەنانەت لە کلتووری یۆنانیشدا بازرگانی وەکو پیشەی هەرە سووک دەبینرا. چونکە ئاگاداری پەیوەندییەکەی بوون لەگەڵ دزی کردندا. لە کۆمەڵگای رۆماشدا بازرگان پێگەیەکی ئابڕوومەندانەی نەبوو. کاڵاش لە هەندێک شتی سنووردار‌دا جێگای باس بوو. بەردەوام گرنگییان بە سنووردارکردنی ئاستی کاڵای ناو کۆمەڵگا دەدا. باس لە ئەخلاقی کۆمەڵگای نیولیتیک دەکەم. بەرلەوەی سەرمایەداری ببێتە سیستەمێکی دەسەڵاتدار، لە هەندێک ناوەندا زەمینەش ببینێت (واتا کاڵا)، تەنانەت کۆمەڵگا شارستانیەکانیش مۆڵەتی پێنادات تەشەنە بکات و پێش بکەوێت. بەردەوام لە ئاستێکی مارژیناڵدا دەیان هێشتەوە. لە سەدەی شانزدەهەمدا دۆزینەوەی دەرفەت و زەمینە لە هۆڵەندا و ئینگلتەرای رۆژگاری ئەمڕۆماندا بە هۆی هەندێک هەلومەرجی زۆر تایبەتەوە، لەوانەیە بۆ ئەوەی ببن بە هۆڵەندا و ئینگلتەرا سیستەمی سەرمایەداری پێویست بووبێت. بەم جۆرەش روویدا. لەماوەی چوارسەد ساڵدا تەواوی دونیا

دووچاری پەلهاویشتنی سیستەم هات. ئەم قۆناخەی شارستانی وەکو مۆدێرنیتە بە شێوەی بەشێکی جیاواز شرۆڤەی دەکەین.

ئەم پێشەکییە قەبە و کورتەی بە شێوەی پێناسەی شارستانی پێشکەشمان کرد لەپێناو جێگیرکردنی زانیاری کۆمەڵناسی و مێژوویمانە لەسەر بناخەیەکی پتەو. لە یەک هەڵپەدا روون کردنەوەی ئەو بابەتانەی ناودارترین فەیلەسوف و مێژوونووسان بە درێژایی تەمەنیان لەژێر باری دەرنەکەوتن، بەهرە و توانایەکی نائاسایی دەخوازێت. ئەم بانگەشەیەمان نییە، بەلام وەکو پێویستییەکی رێزگرتنمان بەرامبەر ژیانی ئازاد، هەبوونی هێزێکی شرۆڤە و واتاناسییەکی کۆمەڵناسی مێژوویی، دەبێت مەرجی لە پێشینەی ئەو کەسانە بێت کە ئەرکی کۆمەلایەتی جددی دەگرنە سەر شان.

توانەوەی "**سۆسیالیزمی بونیادنراو**"ی سەد و پەنجا ساڵەی پڕ لە تراژیدیا و دەیان شۆرشی رزگاری نیشتمانی و راچێتەی سۆسیال - دیموکراتەکان لەناو لێکدانەوە سەهولبەندییەکانی سەرمایەی فینانسی جیهانگیری؛ ئەوە دەسەپێنن کە پێویستە هێزی پێگەیشتووی شرۆڤەمان بەگشتی لە بارەی شارستانی، بە تایبەتیش سەبارەت بە شارستانی سەرمایەداری لەگەڵ کۆمەڵناسی ئازادی دەرهەق بە ژیانی ئازاد ئاوێتە بێت تا لە دۆزە مەزنەکانی ئازادیدا نەخەڵەتێنرێین و نەخەڵەتێنین.

## ٣ ـ کێشەی پەلهاوێشتنی کۆمەڵگای شارستانی

گفتوگۆ زانستییەکانی لە باردی کات و شوێنی ناوک و دروستبوون و گەشەکردنی ئەو شارستانیەود کە ئەمرو حوکمی جیهان دەکات دەرهەق بە حەوزی سەروو و خوارووی دیجلە ـ فورات لەیەکتر نزیکن. ئەو دوو بەشەی دوایی کە باسمان کرد بە قورسایی ئەم هەڵوێستە پیشاندەدات. شروڤەکانمان بناری چیاکانی حەوزی سەرووی دیجلە ـ فورات ودکو شوێنی پێکهاتنی ناوک پیشان دەدات. کاتێک یەکەمین هەوێنی ناوک لەلایەن راهیبەکانی سومەردوە ودک نەمامیک موتوربەکرا بناخەی کۆمەڵگای شارستانی دانرا. دەبێت لەبیر نەکرێت ئەم پێشکەوتنە واتاداردی خستوومانەتە ناو رستەیەکی پێنج چرکەیی لەبواری کرداریدا لە دەرئەنجامی ئەزموونی هەزاران سالەوە ئەنجامگیر و جێگیر بووە.

کۆمەڵناسی پۆزەتیف ـ ئەو کۆمەڵناسییە پۆزەتیڤە رەخنەگرد نا کە پێناسەمان کرد، بەڵکو کۆمەڵناسی دورکهایم، کۆنت[1] و کارل مارکس ـ کە بە تەواوی خۆیان لە رەهەندەکانی شوێن

---

١ـ ئاوگوست کۆمتە کۆمەڵناس و بیرکاری زان و فەیلەسوفێکی فەرەنسییە: لە نێوان ساڵانی (١٧٩٨ – ١٨٥٧) دا ژیاوە. بە باوکی کۆمەڵناسی لەقەڵەم دەدرێت. دامەزرێنەری مەزهەب و فەلسەفەی پۆزێتیڤیستە. هەرشەش زانستی فیزیا، کیمیا، بایۆلۆژی، کۆمەڵناسی و ئاسترۆنۆمی وەک زانستی سەردەمەکەی خۆی لەقەڵەمداوە و کۆمەڵناسی لەسەرووی هەموویانەوە داناوە. لە بواری کۆمەڵناسیدا وەک پێغەمبەرێکی ساختەی پۆزێتڤیزم هەوڵیداوە کە ئایینی مرۆڤایەتی دروست بکات. وەک ئاینێکی پۆزێتیڤ بەناوی دەکات و ناپلیۆن دەخاتە جێی شەیتان و وەعزی ئەوە دەدات کە بە نەعلەت بکرێت. ئەم کارانەی کۆمتە وەک کاردانەوەیەک بەرامبەر بە رۆشنگەری و شۆڕشی ئەو کاتەی فەرەنسا لێکدەدرێتەوە کە تەنانەت کۆبوونەوەی ئەمانە لەگەڵ ژیانی تایبەتیدا بونەتە مایەی تێکچوونێکی دەروونی ئەقڵی کاتیانە لە کۆمتەدا. کۆمتە ئایین و دەوڵەت و خێزان بە دەزگا سەرەکییەکانی کۆمەڵگا دەژمێرێت. سۆسیۆلۆژی دەکات بە دوو بەشی وەک ستاتیک و دینامیکەوە. ستاتیک بریتیە لە بیردۆزی سیستەمی بۆ کۆمەڵگا و دینامیکیش بیردۆزی پێشکەوتنەکەیەتی. بڕوای بە پەرەسەندن هەیە و مێژوو وەک قۆناخی بەرەو پێش چوون وەسف دەکات. واتا گەش بینە. مێژووی مرۆڤایەتی بۆسێ سەردەم دابەش دەکات: ١ـ دۆخی تیۆلۆژی (خەیاڵ) ٢ـ دۆخی میتافیزیک (نابەرجەستە) ٣ـ دۆخی پۆزێتیڤیست (زانستیانە). گرنگترین کاری (فەلسەفەی پۆزێتیڤیزم)ە کە لە شەش بەش پێکهاتووە

و کات، بە لێبووراو (بێبەری) دەبینن. ئەو رووداو و دیاردانەی باسی دەکەن شوێن و مێژووی نییە. بە زاردەکی کوایە بانگەشەی پەیڕەوکردنی زانستێکی ئەزموونگەرایی و دیاردەخوازی دەکەن. چەندە ئەنالیزی بێبەش لە کات و شوێن پێشبخەن لەو بڕوایەدان کە بەو رادەیە زانستیانە رەفتاریان کردووە. بە هەر چوار پەلیان لەم پەیڕەوە دەئالێن. لە راستیدا لە بواری کات و شوێن خۆ پێشاندانی مۆدێرنیتە بە ئەبەدی و جاویدانی لە ناوەرۆکی ئەم هەڵوێستەدا شاراوەیە. تەواوی ئەو زانست، فەلسەفە و هونەرەی ئەوروپا ناوەندەکەیانە هەڵوێست و مەیلێکی بەم جۆرەیان جێگای باسە.

هەر وەکو پابەند نەبوونی خوداوەند بە شوێن و کات، ئەم راهیبە هاوچەرخانەش ـ لەبەرئەوەی تیۆری ئایدیولۆژیای ئەوروپایان داناوە ـ لە نەبوونی سنوور و زەمانی ئەو زانستەی دایانناوە دڵنیا و ئاسوودەن. لەو بڕوایەدان چەندە لە تەنگەتاوی شوێن و کات رابکەن، بەو رادەیە پۆستە زانستییەکەیان رزگار کردووە. هەڵەیەکە کە جیهانبینیەکانی هەر قۆناخێک تێی کەوتوون زۆر باش دەزانین کە تاکە دیاردە، رووداو، دەزگا، کردار، کەسایەتی و کۆمەڵگایەک نییە کە کاریگەری کات و شوێن لەخۆوە نەگرێت.

پەسەند کردنی ئەم پەیڕەوە هێزی واتای شرۆڤە زیاد دەکات. لە گۆڕەپانی زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا **مێژوویبوون "ئێستایە"**، **"ئێستا"**ش **مێژووە**. جیاوازییەکەی زیاتر لە بواری رووخساردایە، زۆر کەم پەیوەندی بە کرۆکەوە هەیە. بەر لەوەی فرناند براودل بخوێنمەوە، گووتبووم: زاراوەی **"ماوە"** نەبێت، ناتوانین کۆمەڵناسییەکی واتادار ئاوابکەین، ئەمەشم وەکو پەیڕەوێکی بنەڕەتی دەستنیشان کردبوو. بە هەمان شێوە شوێنیش وەکو فاکتەرێکی دەست لێبەرنەدراوی پەیڕەو دەستنیشان دەکەم. ئەگەر بە شێوەیەکی پسپۆڕانەش نەبێت، بەلام بەرگرینامەکانم پراکتیزەکردنی بەهێزی ئەم چەمکە پیشان دەدات. دەشێت هەمان کاریگەری لە تەواوی شیکاردەکانمدا ببینرێت. کەواتە بۆچی

زاناکانی ئەوروپا کە سەبارەت بە بابەتی پەیرەو زۆر هەستیارن بە ئەندازەی ئەماتوریکی وەک منیش نزیکی شوین و کات نابنەوە؟ بۆچی هیندە لیی بێ ئاگان یاخود لیی رادەکەن؟ واقیعیترین وەلام بۆ روونکردنەوەی ئەم پرسیارە، ناوەندیتی ئەوروپا و گەردوونی بوونیتی. لەبەرئەوەی بەهۆی ئەم تایبەتمەندیانەوە لە میتافیزیایەکی قەبە رزگاریان نەبووە، لە راستیدا رول و بڕوایەکی وایان سەبارەت بە خۆیان هەیە کە کومەلگایەکی میتافیزیکی بەم جورەیان ئاواکردووە.

ئەمە لە کاتێکدا کە مێژوو و شوین (جوگرافیا) خستنە ناو کۆمەلناسییەوە، واتای چۆنییەتی تەوژم و ئاراستەگرتنی ئەو ژیانەیە کە پەیدا دەبێت، واتا ئەوەیە کە لە مێژوو و ئیستادا چین. ئەگەر مێژوو و ئیستا زۆر لە یەکتر نزیکن، شوینەکانیش وەکو سەکۆکانی پلیکانەیەک بە دوای یەکتر یەکدی تەواو بکەن، ئەو کاتە باشتر شروڤە دەکرێت کە ئەگەر قەوم، ئایین، دەولەت، نەتەوە، هاوپەیمانیتی، نەتەوەیەککرتووەکان و ئەنتەرناسیونالەکانیش نەبن، مرۆڤایەتی باشتر لەناو یەکیتی و یەکپارچەییدا دەژی. کەواتە ئەو دەزگایانەی گوایە لە یەکیتی دەگەرین، تەواو پێچەوانەکەی پێکدێنن. کۆمەلگای شارستانی هەبوونێکی سەیرە. تایبەتمەندییەکی بەم جۆرەی هەیە کە هەر شتێک بلێت پێچەوانەکەی راستە. لە دۆخێکی وەهادا، بۆ ئەوەی بە هەلەدا نەچین پێویستە بەردەوام کومەلگای شارستانی بە پێچەوانەوە بخوێنینەوە.

ئەم پێشەکییەم بە ئامانجی سەرنج راکێشانە سەر چۆنییەتی شرۆڤە کردنی پەلهاوێشتنی شارستانی لە رووی رەهەندەکانی کات و شوینەوە پێشخست.

## ١- کێشەی پەلهاوێشتنی ئەو شارستانییانەی سۆمەر و میسر سەرچاوەیانن

ئەو باسەی سەبارەت بە دەزگابوونی نیولیتیک (چاخی بەردینی

نوێ) ئاماژەمان پێکرد پێکهاتنی ناوکی ڕۆشن کردۆتەوە. ئەگەر بۆ ئەم ناوکە بیر لە موتوربەی سۆمەر نەکرێتەوە، ئەی لە کوێ موتوربە دەکرێت؟ ناوکێکی دیکە لە ئارادا نییە. ئەگەر هەشبێت لە دۆخێکی وەهادا نییە پێی بگات. چۆن بەبێ هەبوونی ئەوروپا ئەمرۆ ناتوانین بیر لە ئەمریکا بکەینەوە، بەڵکو لەمەش زیاتر، پێکهاتنی ناوکی شارستانی دیجلە ـ فوراتی سەروو نەبوایە، دیجلە ـ فوراتی خواروو هەرگیز لە شوێنگەی ڕوانی قامیش (هۆرەکان) ڕزگاری نەدەبوو. نەک تەنیا شارستانی تێدا هەوێن نەدەکرا، تەنیا دەیتوانی ژیانێکی هاوشێوەی "**پیگما**"کان بەسەر ببات.

گرفتێکی گرنگ لە بارەی پەلهاوێشتنەوە ئەوەیە کە بۆچی لە دیجلە ـ فوراتی ناوین، تەنانەت لە باکووری ئەنادۆڵ جێنشینەکان نەبوون بە شار. کاتێک بۆ پێنج هەزار ساڵ بەر لە ئێستا بگەڕێینەوە و تەماشای بکەین، دەبینین کە چەندین ناوچە هەبوون کە لە کەناری شارستانی بوون، گوندی هێندە گەورە هەبوون کە نزیک بە قۆناخی بوون بە شار بوون، بەڵام دواتر لەبەر هەندێک هۆکاری نەزانراو هەرەسیان هێناوە. بۆ نموونە چەتال هویوک، نێوان ئێران ـ تورکمانستانیش گۆڕەپانێکی بەم شێوەیەیە. وەک دەزانین چەندین هەلومەرج بۆ شار پێویستە. خاڵێکی دیکەی ناسراو ئەوەیە ژیانی ژمارەیەکی زۆری دانیشتوان لە ناوچەیەکدا گرێدراوی گەورە بوونی زێدە ـ بەرهەمە. ئەوەی دەرفەت بەم ڕەوشە دەدات، ئاودێری دەستکردی ئەو زەوییە لیتاویانەیە کە دەکەوێتە کەناری ڕووبارەکان. ئەو گۆڕەپانە (دەشتە) لیتەییەی ڕووبارەکانی نیل و دیجلە ـ فورات نزیک بە دەریا دروستی دەکەن ئەم تیۆرانینە پشت ڕاست دەکاتەوە. بۆ دەست پێکردن بە ئەندازەی پەیدابوونی شار، زیادبوونی ژمارەکەی و هەمیشەیی بوونی پێویستی بەم هەلومەرجە هەیە. مەرجێکی دیکەش لە ناوچەکانی نزیکدا مسۆگەر ئامادەبوونی ئەو هۆکارە کلتووریانەیە کە دەیخولقێنێت. هیچ گۆڕەپانێکی لیتەیی کلتووری نیولیتیکی پێ بەرهەم ناهێنرێت، چونکە مەرجەکانی ئەم

کلتووردی تیدا نییه. له کلتووری نیولیتیکیشدا هەلومەرجی ئەو شارانه بوونی نییه که گەورەیه، هەمیشەییه و ژمارەکانیشیان له زیاد بووندایه. له سۆنگەی ئەم بابەتانەوه یەکتری تەواوکردن دەبیته ناچارییەک.

تەواوی هیماکان ئەوه پیشان دەدەن که له حەوزی ناوینی دیجله - فورات، ئەگەر هیندەی خوارووش نەبیت، بەلام زنجیرەیەکی شاری قەبارە ناوین جیگای باسه. بەر لەوەی بیینه سەر ئەم بابەته، پیویسته بلیین که له سالانی "**٣٥٠٠پ.ز**"دا شارستانی شاری ئوروک داهینانی سیستەمیکه. سیستەمی کولونی ناوادەکات و ئەو مۆدیله پیشکەش دەکات که ژمارەی شارەکان زیاد دەکات. رۆلی خۆی دەبینیت: شەرەفی یەکەمین شارستانی میژوو بەدەست دینیت. باوەری خوداوندە ژن ئینانا و داستانی کلگامیش بەلگەی ئەمری ئەم شارستانیەن. شیمانه دەکریت له سالانی ٣٠٠٠پ.ز له ئاکامی پیشبرکییەوە لەگەل ئەو شارانەی باکوور هەردەسی هینابیت که ژمارەیان زیادی کردووه و به پیتتر بوون.

سەردەمی خانەدانی (سولالەی) ئور له سالانی ٢٠٠٠پ.ز دەست پیدەکات. به شیوەی سی خانەدان له ناو هەمان لۆژیکی پەیدابوون - هەرەس هینان پی به پی بەردو باکوور هەلدەکشین و تا سالانی ٢٠٠٠پ.ز بەردەوام دەبیت. دەبیت قۆناخی سەرجۆنی ئەکەدی و گودیای گوتی - به خانەدانەکەیەوە - لەم چواچیوەیەدا هەلسەنگینریت. یەکەمین دەقی نووسراوی حقوق، داستانه ئەدەبییەکان، ئەکادیمیا و پیکدادانه بی رەحمەکانی نیوان شارەکانی هاوشیوەی رۆژگاری ئەمرۆمان (شیوەن بۆ نیپور و نەعلەت کردن له ئەگادا بەرچاوترین داستانن) پاشماوەی ئەم قۆناخەن. لیرەدا دەرکی پیدەکریت که ئور سیستەمیکی بەرفراوانی کۆلۆنی بووه. یەکەمین کۆلۆنیەکان قارچک ئاسا له ناوچەکانی کەوانەی ناوەودی سیستەمی چیای زاگرۆس - تورۆس پیکدین. به خیراییش کۆتایی پیدیت.

ئەو ئەنجامەی له رووخانی ئەم کولونیانه بەدەست دەهینرین،

هیزی کلتووری ئەو کۆمەلگایانەیە کە کولونییان لەناودا ئاواکردووە. هەرچەندە شارستانییەکانی میسر، هەراپا، ئیلام و سوس وەکو شارستانی شاری سەربەخۆ هەلسەنکینرین، سەرباری ئەوەی پەیوەندییەکی راستەوخۆش نابینریت، بەلام بە کویرەی واتای بابەتی تەنیا دەتوانریت لەگەل کۆلونیەکانی سومەر بەراورد بکریت.

سەردەمی بابل لە سالانی ٢٠٠٠پ.ز کەمیکی دیکە لە باکوور بە هەمان لۆژیک دەست پیدەکات. دەکریت لە جیاتی سومەرییەکان، سەر بە ئەتنیکی ئەکادیش (ریشەیان بۆ کلتووری سامیش بگەرینریتەوە) لە قەلەم بدریت، لە ناوەروکدا شارستانییەکی سومەرد. ئەمە لە بواری زانست و بە دەزکابوون بە لووتکەی شارستانی سومەر دادەنریت. وەکو شار بابل هەمان رۆلی هاوشیوەی شاری پاریسی ئەوروپا دەبینیت. شاری زانست و کلتوورە. بازرگانەکانی زیادی کردووە، تەواوی کلتووردکان بەرەو ئەوی رۆیشتوون، بۆ یەکەمین جار تیکەلبوون روویداوە. کاریکەرییەکەی لەسەر دەوروبەر بەهیزە. لە میژوودا سەردەمی نەمروودەکان ـ یەکەمین پادشای بەهیز ـ دەست پیدەکات. وەکو شاری رووناکی تایبەتمەندی راکیشانی دەوروبەری هەیە. سی قوناخی گرنگی هەیە. قوناخی پیهەلکرتنە شکودارەکەی سالی ٢٠٠٠ ـ ١٦٠٠پ.ز کە بە حامورابی بەناوبانگ دەناسریتەوە. هەروەها ئەو قۆناخەی کە قەومەکانی هۆری کاریگەرییان کردە سەر١٦٠٠ـ ١٣٠٠پ.ز سەربەخۆیی خۆی لەدەستداوە. سییەمین قۆناغ، سالانی ١٣٠٠ـ٥٥٠پ.ز قۆناخی کاریگەری ئاشوورییەکان و داگیرکردنە لەلایەن پارسەکانەوە. سەردەمی ١٥٠٠ سالەی بابلییەکان ئەگەر بە شیوەیەکی ئاشکراش نەبیت شوین پەنجەیەکی بەهیز لە یادەوەری

مرۆڤدا بەجێدێڵێت. داستانی ئەنوما ئەلیش[1] کە بە شەڕی نێوان خوداوەندی پیاو مەردوخ و خوداوەندە ژن تیامات بەناوبانگە چیرۆکی دۆڕاندنە پڕ لە ئێشەکەی دایک ـ ژنە. گەردوونناسی، کەهانەتی ئەفسوونەکان، دیلبوونی نەوەکانی ئیسرائیل، چەندین دەقی ئەدەبی نووسراو و بەرخودان لەبەرامبەر ئاشوور یادگارییە دانەسقە و لەبیرنەکراوەکانی ئەم ناوەندەی کلتووری ئەکادە. ئەگەر ئەوە بە بیرخۆمان بێنینەوە کە شارێک بووە چەندین فەیلەسوفی یۆنانی لە سەرووی هەمووشیانەوە سۆلۆن وانەی تێدا خوێندووە ئەوکاتە باشتر دەرک بە بەهای کاریگەرییە زنجیردییەکەی دەکرێت.

دەتوانین سەردەمی ئاشوورییەکانیش بۆ سێ قۆناخ جیا بکەینەوە. قۆناخی یەکەم، قۆناخی پادشا بازرگانەکانی سالانی ٢٠٠٠ ـ١٦٠٠پ.ز. ئەو بازرگانانەی شاری نەینەوایان بۆ خۆیان کردبوو بە مەڵبەند، بۆ یەکەمین جار بەرفراوانترین کولونیە بازرگانییەکانی مێژوویان ئاواکرد. لە ڕۆژهەڵاتی دەریای سپییەوە تا کەنارەکانی پەنجاب، لە دەریای ڕەشەوە تا دەگاتە دەریای سوور لە زۆربەی ناوچەکان شارە بازرگانیەکانیان ئاواکردووە. دەشێت بگووترێت لە بواری بیناسازی و بازرگانیدا قۆناخێکیان بڕیوە. کول تەپە ـ لە قۆناخی ئاشوورییەکاندا **"کانش"**ی پێ دەگوترا ـ ی نزیک قەیسەری و کارکامیش ـ لە **"کاروم"** ەوە هاتووە کە بە واتای ئەژێندای بازرگانی دێت ـ کە دەکەوێتە شوێنی گەیشتنی ڕووباری فورات بە وڵاتی سوریا لەم قۆناخە ماونەتەوە. قۆناخی دووەم، سەردەمی دەسەڵاتی دەوڵەتی میتانی بە ڕیشە هوورییە لە سالانی ١٦٠٠ ـ ١٣٠٠پ.ز. هەرچەندە گرنگی جارانیان لەدەست دابێت، بەلام

---

١ـ چیرۆکی خولقاندن: لەساڵی ١٨٤٩ هنری لابارد لەشوێنەواری کتێبخانەی ئاشور بانیپال لە شاری نەینەوا دۆزیەوە، هەروەها جۆرج سمیت لەساڵی ١٨٦٧ چاپیکرد. ئەم ئەفسانە لە نزیکەی هەزار دێڕ پێکدێت، بە زمانی بابلی کۆن لەسەر حەوت تابلێت نووسراوە. بە گرنگترین سەرچاوەی تێگەیشتنی تێڕوانینی بابلیەکان لەبارەی جیهانەوە دەزانرێت.گرنگی ماردۆخ و خولقاندنی مرۆڤایەتی لەپێناو خزمەتکردنی خوداوەندا تێیدا ڕەنگدەداتەوە؛ ئامانجە سەرەکیەکەی شکۆدارکردنی ماردۆخە بەرامبەر بە خوداوەندەکانی دیکەی میزۆپۆتامیا. ئەم ئەفسانە بۆ سەدەی هەژدەهەمینی پێش زایین دەگەڕێتەوە..

نەریتی ئاشوور درێژە بە هەبوونی خۆیدەدات. ڕەونەقدارترین قۆناخیش ساڵانی ١٣٠٠ ـ ٦١٢پ.ز. یەکەمین ئیمپراتۆرییەتی بەهێز و بەرفراوانیان لە مێژوودا ئاواکردووە، لە شەڕدا بە بێ ڕەحمی ناسراون ـ قەلا و شورایان لە کەللەسەری مرۆڤ دروست دەکرد ـ بۆ یەکەمین پاکتاوی نەژادی ئەتنیک و چۆلکردنی ناوچەیەک بە سەرتاسەری یادەوەری ئەم قۆناخەیە کە مۆرکی خۆی لە مێژوو داوە. قۆناخێکە کە هەرە زیدە هۆشیاری بەرخودانی گەلانی تێدا پێشکەوتووە. گەورەترین بەرخودان لەلایەن کوردە سەرەتاییەکان هورییەکان و بەڕێوەبەرایەتی پادشاکانی ئورارتوو پیشاندەدرێ (پێکهاتەی ئەتنیکەکان جێگای گفتوگۆکردنە. ئەم خاڵەش بۆ تەواوی خانەدانەکانی بەڕێوەبەرایەتی لە جێگای خۆیدایە. تەواوی خانەدانەکان زمانی کلتووری دەسەلاتداری قوناخ بە بنەمادەگرن. هەربۆیە لای ئورارتو و دواتریش پارسەکان، زمانی ئاشووری و ئارامی لە کوشکەکاندا زمانی فەرمی دەولەتە). ڕۆلی ئەم بەرخودانە گەورەیە بۆ لەسەر پیمانەودیان لە جوگرافیای ڕوژگاری ئەمڕۆمان. کەچی لە ئاکامی ڕێککەوتنی ماد (میدی)ە بەرچەڵەک هۆرییەکان و بابلییەکان لە ساڵانی ٦١٢پ.ز ئەم ئیمپراتۆریەتە زەبەلاحە بووە بەمولکی مێژوو. وەکو دوا شارستانی بە ریشە سۆمەری لە مێژوودا خاوەن کۆمەک و ڕۆلێکی مەزنی تایبەتن لە گەشەکردن و پەلهاویشتنی شارستانی (بە تایبەتی لە بواری بازرگانی و بیناسازیدا).

بۆ یەکەمین جارە لە دەرەوەی میزۆپۆتامیای خوارووی شاهیدی ناوەندی دیکەی شارستانی دەبین. هەم لە بواری ڕووخسار هەم ناوەڕۆک گۆڕانکاری دەبینرێت. لە پێکهاتن و بڵاوکردنەوەی شارستانی سۆمەردا جێگیرکردنی میزۆپۆتامیای ناوین لە یەکەمین ئەڵقەدا هەڵە نییە. سەبارەت بەم نەوەیەی بە ڕیشە هۆرییە، بە تایبەتی لە سایەی هەلکۆلینە شوێنەوارناسیەکانی ناوچەکە و زماننناسی و نەژادناسی ڕۆژ دوای ڕۆژ زانیاری زیاتر بەدەست

دینین. هورییەکان یەکەمین گروپی گەل و ئەتنیکی کلتوور و زمانی ئاریانە کە لە سەرچاوە نووسراوەکاندا ناسنامەیان دەستنیشان کراوە، دێرین بوون. واتا ئەو گروپەن کە دوای دواترین قۆناخی سەهۆڵبەندان لەناو سیستەمی زاگروس ـ تۆرۆس جێگیربوون. لە پەرەپێدانی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری رۆلی سەرەکییان هەیە. راستتر لە سەرووی ئەو گروپەوە دێت کە شۆرشی گوند و کشتوکاڵی چاخی بەردینی نوێی لە ناوچەکە پێشخست. لە سالانی ٦٠٠٠ بەولاوە ناسنامە ئەتنیکییەکەیان جیادەکرێتەوە و دەخوێندرێتەوە. هەڵسەنگاندنیان وەکو کوردی سەرەتا واتادارترین پێناسەی گونجاوە. پێکهاتەی زمان، ئەنالیزی زمانناسی چەندین ووشە و نەژادناسی بە شێوەیەکی روون کرێدان و پەیوەندییان بە کوردانەوە پیشان دەدات. نیشتەجێبوون لە دەشتەکان، ردوەندیتی ناوچە کوێستانی و شاخاوییەکان بە یەکەوەن و لەناو یەکتریدان. شیمانەیەکی بەهێزە کە لە یەکەم گروپەکانی سومەرن. خۆی لە خۆیدا قۆناخی داگیرکاری گوتییەکان (٢١٥٠ ـ ٢٠٥٠پ.ز) داگیرکاری کاشییەکان[1] (١٦٠٠پ.ز کاشی و هیتیتەکان بە یەکەوە ١٥٩٦پ.ز یەکەمین داگیرکاری بابل) پەلهاویشتنی دواتری ماد و پارسیش ئەم راستییە دەسەلمینن. هۆرییەکان ئەو نەوەیەی نیولیتیکن کە بەرفراوانترین پەیوەندییان لەگەڵ سومەرییەکاندا هەیە. ئەوانی دیکەش ئارامییە بە رەچەڵەک سامییەکانن.

لە سەرەتاکانی سالانی ٣٠٠٠پ.ز شوێن پەنجەی یەکەمین شارستانی بە ریشە هۆری دەبینرێت (ئەگەر قۆناخی سالانی ٦٠٠٠ـ٤٠٠٠پ.ز نەژمێرین کە قۆناخی بە دەزگابوونی نیولیتیکە). لە راستیدا رووبەڕووی پێشکەوتنێکی بێ پچڕاندنین. نەوەکانی لە سۆمەر جێگیربوون پێشوەخت بەرەو شارستانی تێپەڕبوون،

١ـ لەشاخەکانی باکوری ناوچەی لوڕستانەوە لە سالانی ١٦٨٠ـ ١١٥٧ پ . ز کۆچیان کردووە .پادشاکانی سەرەتا نەیانتوانیوە ولاتی بابل فەتح بکەن؛ تا لە سالانی ١٥٨٠ پ . ز لە رێگای خانەقینەوە فەتحیان کردووە، سولالەی کاشییان دامەزراندووە، دەستیان بەسەر نەواری میراسی دەوڵەتی کۆنی بابلدا گرتووە؛ ئەم سولالە ٣٦ پادشای بەخۆیەوە دیوە؛ نزیکەی ٥٧٦ ساڵ حوکمڕانییان کردووە.

ئەوانەی مانەوە ئەگەر بە هێواشیش بێت ـ بە هۆی ئاودێری و هەلومەرجەکانی کەش ـ توانای گۆڕینی شوێنی نیشتەجێیان بۆ شار پێشانداوە. ئەو هەڵکۆڵینە شوێنەوارناسیانەی لە ناوەڕاستی حەوزی دیجلە ـ فورات کراوە چەندین نموونەی شاری ئاشکرا کردووە. هەڵکۆلینەکانی لە جۆری کازاز، توتریش، گرد، فرە، زەیتونی و هەڵکۆلینی هەرە دوایی گۆبەکلی تەپە کە لەناو ئورفادا کراون و چەندین هەڵکۆلینی دیکە کە قەڵای لە دەوروبەردا هەیە، ناوەوە و دەرەوەی لە شێوەی قەڵایە، پێکهاتەی لە جۆری پەرستگاکان، شێوە و وێنەکانی بەهای هونەرییان هەیە، نموونەی کەرەستەکانی بازرگانی ئەم راستینە یاخود پێکهاتەی شار دەسەلمێنن. مێژووی زۆربەیان بۆ سالانی ٣٠٠٠ ـ ٢٧٥٠ پ.ز درێژ دەبێتەوە. ئەگەر بڵێین یەکەمین گرووپە شارن کە لە سۆمەرییەکان سەربەخۆن واقیعی دەبێت. لە نزیکیانەوە بینینی کولونیە جیاواز و بە ریشە سومەرییەکان واتادارە. لە میانەی ئەم کولونیانەوە دەرکی پێدەکرێت کە ناوە ناوە داگیرکاری ئوروک، ئور و ئاشوورییان بە خۆیانەوە بینیوە. لە میانەی هەڵکۆلینە شوێنەوارناسییە نوێکانەوە، کار و خەباتی زماننासی و نەژادناسی دەرهەق بە ناوەندی شارەکانی حەوزی ناوەڕاستی دیجلە ـ فورات، ئاشکرا دەبێت کە دەشێت ناوەندێکی گەورەی شارستانی بێت. دوا لێکۆڵینەوە زانستییەکانیش بەم ئاراستەیەدا دەڕوات. بە تایبەتی ئەنالیزمی پێدراوەکانی لە گۆبەکلی تەپە دۆزراونەتەوە ناوەڕۆکی سەرلەنوێ نووسینەوەی مێژووی هەیە.

شەپۆلی شارستانی دووەمین نەوەی بە رەچەڵەک هۆری بەرفراوانتر دەبێت و بەڕێوەبەرایەتی سیاسی هاوشێوەی ئیمپراتورییەکان ئاوادەکات. بە تایبەتیش میتانییەکانی کە سەرچاوەکەیان بۆ میزۆپۆتامیای ناوین دەگەڕێتەوە جێگای سەرنجن. لە سالانی ١٦٠٠ پ.ز تا سالانی ١٢٥٠ وەکو ئیمپراتوریەتێک حوکمیان کردووە کە لە هەمان کاتدا سەردەمی هەڵکشانی ئیمپراتورییەتی

ئاشووریشە. پایتەختەکەیان شاری عامودا و سەریکانی سوریای ئەمرۆمانە کە لە بنەڕەتدا سەر بە ماردین[1] ن. لەو سەردەمەدا ناوی **"خۆش کانی"**یە. لە تابلێتەکانەوە دەزانرێت کە خاوەن پێکهاتەیەکی جیاوازی زمانە و بە ڕەچەڵەک هۆرین. لە کەرکوک (کەرکوک لەو سەردەمەوە ماوەتەوە) ی ڕۆژگاری ئەمڕومانەوە تا دەگاتە تەل ئەلئەعلای نزیک ئەنتاکیا لە پەلهاویشتندا سەرکەوتنیان بە دەست هێناوە. لەبەرئەوەی بە هەمان گروپ زمانی ئاریانی قسەدەکەن لەگەڵ هیتیتەکانی خاوەن یەکەمین دەولەتی ناوەندی ئەنادۆڵ یان خزمن، یان لە هەمان ریشەود هاتوون ـ نموونەی سەلمێنەر لەو نامەیەدا دەبینرێت کە شوپیلولیومای فەتحکاری حەلەب و کارگامیش بۆ پادشای میتانی ماتیزاوای نووسیوە ـ لە نووسینە هێرۆگلیفیەکانی کۆشکەکانی میسریش دەرک بە هێزەکەیان دەکرێت ـ یادەودرییەکانی شاژن نەفەرتیتی کە ودکو شاژنێک هاتۆتە کۆشکەکە ـ هەڵبەتە بە درێژایی چوار سەد ساڵ فشار خستنە سەر ئاشوورییەکان بەڵگەیەکی ئاشکرای هێزەکەیانە. هەمان خاڵ دەرهەق بە بابلییەکانیش لە جێگای خۆیدایە. وەکو دیار دەبێت نووسینی هیرۆگلیفی[2] و بزمارییان بەکارهێناوە. هەندێک شێوەی تایبەتی بیناسازی و پەروەردەکردنی ئەسپ بە ناوی **"کیکولی"** لەو شوێنپەنجانەیانە کە لە مێژوودا دیارن. دووەمین شارستانی گرنگی بە رەچەڵەک هۆرییە کە پێویستە ڕۆشن بکرێتەوە.

بینینی هیتیتەکان لەناو ئەم نەوەیە تا دواڕادە واقیعییە. هەر وەکو دەگوترێت هیتیتەکان ئەو گروپانە نین کە لە گەرووەکانی (ئەستەنبۆل)، قەفقاسیا، لە ڕۆژهەلات لە ڕێی ئێرانەوە هاتوون. لەبەرئەوەی پێکهاتەی زمان و کلتووریان شوێن پەنجەی هۆرییەکان لە خۆوە دەگرێت، دەشێت دەرئەنجامێکی بەم جۆرە بەدەست بێنین کە گروپێکی بەڕێوەبەرایەتی نەجیبزادەی هۆرییەکان بووبن.

---

١ـ شارێکی باکووری کوردستانە.

٢ـ وشەی هیرۆگلیفی بەزمانی یۆنانی کۆن (گریک) بە واتای نەخشی پیرۆز دێت. زمان و نووسینی هیرۆگلیفی بۆ یەکەمجار لە ساڵانی ٣٢٠٠ـ ٢٢٠٠ پ.ز لە میسر داهێنراوە. تاوەکو سەدەی چوارەمی زایینی بەکارهێنراوە.

خوداوەند، ئەدەب، پەیوەندییە دیبلۆماسییەکانیان و پاشماوەکانی کۆشکی میسرییەکان پیشانیدەدەن کە ئەوەی میتانییەکان و ناوەوەی ئەنادۆڵ لە یەکتری دەچن. هەر وەکو چۆن میتانییەکان ناوەندەکانی ئاشووریان خستوتە ژێر کۆنترۆڵەوە، هیتیتەکانیش لە هەمان قۆناخدا کۆتاییان بە سەردەمی کۆلۆنی ئاشوورییەکان هێناوە، لە هەمان مێژوودا (١٦٠٠ ـ ١٢٥٠پ.ز) ئیمپراتورییەتی هیتیتیان ئاواکردووە و درێژدیان پێداوە. بە جۆرێک لە جورەکان دوو ناوچەی گەورەی ناوەندی بەڕێوەبەرایەتی هورییەکان دێنێتە بیری مرۆڤ کە تا ئێستاش نەزانراوە بۆچی وا بووە. نەک تەنیا زمان و خزمایەتی، هەموو لایەکی ژیانیان تاڕادەیەکی مەزن بە یەکتر دەچێت. ئەڵقەی وونی نێوانیان لە ناوچەی نێوان هەردووکیان (میتان و هیتیتەکان) دایە کە دوو هێزی هەمان قۆناخ بوون. چەنددی لێکۆڵینەوەکان پەردیان پێبدرێت لەو بڕوایەدام کە روشن دەبێتەوە. ناوەندە گرنگەکانی پاشماوەی هیتیتەکان لە سەرووی هەمووشیانەوە هاتووشاش[1] پیشاندەدەن کە هەندێک پێشکەوتنیان بۆ شارستانی بە دەست هێناوە. جێنشینێکی پیرۆز جێگای باسە کە زەقورەکانی تێپەڕ کردووە. پەرستگای ئایینی، کۆشکی بەڕێوەبەران و شوێنی خەباتکاران و عەمبارەکان بە تەواوی لێک جیاکراونەتەوە. گۆڕەپانی شوراکراوی بەرفراوانتریان هەیە. چەندین پێکهاتەی شاری بەم جۆرە بەرچاوان دەکەوێت. بە گوێرەی قۆناخی خۆی لایەنە سەربازییەکەیان لە هەموو دەوڵەتەکان بەرکەماڵترە.

لە رۆژئاوایەوە لەگەڵ شاری تروادەدا (یان دامەزرێنراوی هیتیتەکانە، یان هاوپەیمانێکی نزیکیتی، شارێکی تایبەتی شارستانییە کە لە هەمان گروپی کلتووریدان) کە ئاهیاوییەکانی بە رەچەڵەک خەڵکی یەکەمین نیمچە دوورگەی یۆنان تێیدا نیشتەجێبوون (لەقەڵەمدانی ئەم گروپە وەکو ئەوەی کاریگەری ئەنادۆڵیان کراوەتە سەر یاخود بینینیان وەکو ئەو گروپە ئاریانیانەی لە

[1] ١ـ شارێکی ئاسیای بچوکە، پایتەختی هیتیتەکان بووە، دەکەوێتە تورکیا و لەرۆژی ئەمڕۆمان بوغاز قەڵای پێدەڵێن.

سالانی ١٨٠٠پ.ز کۆچیان کردووە، راستترە. ئەو بۆچوونەی دەلێت لە باکووردوە هاتوون و بە ریشە ئەوروپایی بوون باسێکی پێچەوانەی ئاراستەی پەلهاویشتنی مروڤایەتییە. هەمان هەڵە بۆ هیتیتەکانیش دەکرێت) لەگەڵ ئەشکاوییەکانی باکووری ئەنتالیادا، لە باکووریەوە لەگەڵ کاشکاکاندا (خەلکانی دەریای رەش) لە چقورۆوا لەگەڵ کلیکاییەکاندا (ئەو گەلەی چیای تورووس کە لوییەکانن و ماوەیەکی درێژ لەسەر پێ مانەوە) لە باشووریشیەوە لەگەڵ دەولەتی میسری فیرعەونیەکان کە رکابەرە بەناوبانگەکەیانە لەناو دراوسێتیی و پەیوەندیدایە. ئەو گەلەی لە کوردپانی ناوەندیدایە، هاتییە تایبەتەکانن. خۆناساندنیان وەکو **"وڵاتی هەزار خوداوەند"** پیشانیدەدات کە لە رکابەرایەتی خوداوەندەکان زیاتر، گرنگی بە دۆستایەتی ـ وەک رەنگدانەوەیەکی رێکەوتنی میرنشینەکانە- نێوانیان دەدەن. بەستنی یەکەمین پەیمانی نووسراوی مێژوو- کە لە دوای شەری (کادەش) ی نزیک بە رووبارەکەی شاری حەمای ئەمروی سوریا مۆرکراوە ـ لە نێوان دووەمین رامسیسی فیرعەونی میسر و سێیەمین هاتووشیلی پادشای هیتیت ناودارترین یادەوەرییە مێژووییەکەیانە. ئەنجوومەنیکی ئەرستۆکراتەکانیان بە ناوی پانقوش هەبووە. ئەم شرۆڤەیە واقیعییە کە ئەم ئەنجوومەنە فیدراسیۆنی میرنشینەکان بووە و یەکەمینەکانی (گەورەکان)ی هاتووشاش جێگای خۆیان تیدا گرتووە.

چەند جارێک ئاماژەمان بە شارستانی میسری کەناری نیل کرد. هەرچەندە وەکو پێهەلگرتنێکی سەربەخۆ دیار بێت، بەلام کاتێک بگوترێت شوێن پەنجەی هەمان بەهاکانی کلتووری ئاریان لەخۆوە دەگرێت راستتر و سەلمێنەرترە ـ هاوشێوەیەکی دووری سۆمەرییەکانە-چونکە دینامیکەکانی ناوخۆی نیل و دراوسێ نزیکەکانی هەبوونێکی وەها پیشان نادات کە شارستانییەکی بەم جۆرە بخولقێنین. ئەوەی دەمێنێتەوە رەنگدانەوەی کلتووری ئاریانە کە لە دەرئەنجامی کۆچی دوولایەنە بەدیهاتووە و لەو

سەردەمەدا بەربڵاوبوو. گەورەیی شارستانی میسر مەسەلەیەکی حاشا هەڵنەگرە. بەڵام ئەوەش راستییەکە لە کەناری نیل بەوڵاوە بڵاو نەبۆتەوە. بۆچی تایبەتمەندی پەلهاویشتنی پیشان نەدا، رەوشێکە پێویستە لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوەی لەسەر بکرێت. لە کەناری نیل کلتوورێکی رەسەن نەبینراوە کە پشتی پێ بەستبێت. بە پەرجوویەک دەچێت کە لە ئاسمانەوە هاتبێتە خوارەوە. ئەگەر وەها نەبێت، دیسان دەبێت دووبارەی بکەینەوە کە سەرچاوەی لە دایکبوونی (پەیدابوونی) راستینەی هۆزی عیبرانی و هکسۆس شۆڕشی نیولیتیکی سیستەمی زنجیرە چیای زاگرۆس ـ تۆرۆسە.

نووسینی هیرۆگلیفی لە نووسینی بزماری سەرەتاییترە و بۆ گەشەکردن زێدە گونجاو نییە. کارەکەی سنووردارە. دەشێت ئەهرامەکان سەیر و سەمەرەی بیناسازی بن. بەڵام یەکێک لەو سەرشێتیانەیانە کە بە شێوەیەکی ترسناک رەنجی کۆیلەکانی قووتداوە. کاتێک بو قوناخی جیاواز دابەش بکرێت، قۆناخی پادشایەتی کۆن سالانی ۳۰۰۰ـ ۲٥٠٠پ.ز دەگرێتەوە. بۆتە شاهیدی ژمارەیەکی زۆری بنەماڵەکان. لە نزیکترین زەوی لیتەیی، واتا لە نزیک شاری قاهیرەی رۆژگاری ئەمڕومان پێشکەوتووە. ئەم سەردەمە بە گۆڕستانی ئەهرامەکان دەناسرێت. لە قۆناخی ناوینی پادشایەتی نێوان سالانی ۲۰٥٠ ـ ۱۸٥٠پ.ز قورسایی پەرستگاکان و راهیبەکان بەرچاو دەکەوێت. داگیرکاری هکسۆسەکانی سالانی ۱۸۰۰پ.ز جێگای تێفکرینە. رووخاندنی رژێمی فیرعەون کە هیچ قەومێک نەیتوانی تێکی بشکێنێت هێزی رێکخستن و کلتوورەکەی پشتیان پیشاندەدات. نزیکەی ۱٥٠ساڵ میسریان بەڕێوەبردووە. لە سالانی ۱٦۰۰ قۆناخی نوێی پادشایەتی لە رێگای **"سیت"**ی یەکەم بونیادنراوە. هەر وەکو ئاشوورییەکان هاوکاتی قۆناخی پێشکەوتنی بازرگانییە. هەر وەکو ئاشوورییەکان چۆن لە هەرە باکووری میزۆپۆتامیای خواروو سەریان هەڵدا، قۆناخی نوێی پادشایەتیش لە هەرە باشووری نیل لە کارناک پێشکەوتووە. بۆ قۆناخێکی

جیاوازی گۆڕستانەکان هەنگاو نراوە (لەبواری بیناسازی). لەگەڵ ئەوەی راهیبەکان بەهێزن بەڵام کەوتوونەتە پلانی دووەمەوە.

لەم قۆناخەدا هۆزی عیبرانی هاتوتە میسر. دوای هکسۆسەکان سالانی ١٦٠٠ مێژوویکی گونجاوە. دوای سێ سەد ساڵ مانەوە لە کۆتاییەکانی سالانی ١٣٠٠پ.ز شیمانە دەکرێت دیسان گەڕاونەتەوە. پادشا ئەخناتوون[1] بەوە بەناووبانگە کە یەکەمین جار ئایینی تاکخودایی راگەیاندووە (سالانی ١٤٠٠پ.ز). چەندین شاژنی هیتیت و میتانییەکان وەک بووک هێنراونەتە کۆشکەکانیان. نموونەی گۆڕستانەکان پیشانیدەدن کە بیناسازییەکی زۆر پێشکەوتوویان پێشخستووە. لە بواری بیناسازی لە سۆمەرییەکان زیاتر کاریگەرییان کردوتە سەر شارستانی گریک ـ رۆما. پێکهاتە ئایینییە تێکەڵەکەیان وەک کۆپیەکی تێکەڵەی سۆمەرییەکانە. نەریتی ئیسیس[2]ـ ئۆسیریس[3] وەکو جۆرێکی کوپی ئینانا ـ ئەنکییە. هەرچی نەریتی ئامۆن[4]ـ رایە[5] نزیک بە سیستەمی زەقورەکانی راهیبی سۆمەرە.

بەردەوام ئەم پرسیارە دەگووترێتەوە: سۆمەر و میسر کامەیان چۆن کاریگەری لەوەکەی تریان کردووە؟ شارستانی میسر لە بواری دروستکردنی بەلەم، چەقاندنی ستوونی بەرد، نەخشاندنی وێنەی دیوارەکان، هونەری ساڵژمێری، پزیشکی، گەردووناسی و مۆمیاکردنەوە پیهەڵگرتنی رەسەنیان هەیە. کاریگەرییان کردۆتە سەر شارستانی گریت، لەم ڕێگایەشەوە کاریگەرییان کردۆتە سەر کلتووری یۆنان. پەیوەندییان لەگەڵ فینیقییەکان لە

١. یان ئەمنەحتوبی چوارەمی پێگوتراوە، کوڕی ئەمنەحتوبی سێیەم و مێردی نەفەرتیتییە. لەگەڵ ژنەکەی ١٧ ساڵ حوکمڕانییان کردووە، دژی ئایینی ئامون وەستا و گشت ئاهەنگ و مەراسیمەکانی پێشووی بە بتپەرستی و کەوتن دانا، بانگەشەی باوەڕی تاکخودایی کردووە؛ ئاتون ی بە تاکە خوداوەندی جیهان داناوە؛ کە خوداوەندی خۆرە، سەرچاوەی روناکی و ژیانە. هەربۆیە ناوی خۆشی کرد بە ئەخناتون. بەڵام رووبەڕووی نارەزایی کاهینەکانی رامون بوویەوە، لە کۆتایی شکستی هێنا.

٢ـ خوداوەندە ژنی مانگە لای میسریە کۆنەکان. بەدایکی سروشت و خودی زەمەنیان داناوە.

٣ـ خوداوەندی خۆر و مردنە لای میسرییە کۆنەکان؛ مێردی خوداوەندە ژن ئیسیسە.

٤ـ پادشای خوداوەندە ژن ی میسری کۆنە، وشەی ئامون بەولتای پادشای شاراوە دێت.

٥ـ یان رع؛ خوداوەندی خۆرە؛ خولقێنەری بەردەوامە: هەموو گەردوون لە چاویەوە دروست بووە.

ئاستێکی پێشکەوتوودا بوو. لەسەر سوریا و فەلەستینی ئەمڕو لەگەڵ هیتیت و میتانییەکان لەناو کێشمەکێشدا بوون. لە دوای سالآنی ١٠٠٠پ.ز دووچاری هێرشی قەومە بە رەچەلەک سودانی ـ حەبەشییەکانی باشوور هاتوون. لە سالانی ٦٧٠پ.ز لە ئاکامی پەلاماری ئاشوورییەکان بۆ یەکەمین جار بە دەسەلاتی هێزێکی دەرەکییەوە بەستراونەتەوە. بەرێز لە سالآنی ٥٢٥پ.ز، سالانی ٣٣٣پ.ز کەوتوونەتە ژێر داگیرکاری و بەڕێوەبەرایەتی پارسەکان و ئەسکەندەر. لە سالانی بەرەو سەرەتای زاییندا لە ئاکامی دۆڕاندنی کلیۆپاترای خاوەن کلتووری هێلینی بەرامبەر بە رۆما یەکەمین سەردەمی شارستانییەکی چوار هەزار سالە کوتایی پێهات.

ئەم شارستانییە کە بەلانی کەم هێندەی سۆمەرییەکان مۆرکی خۆی لە مێژوو داوە دیارترین دۆخی سیستەمی کلاسیکی کۆیلایەتی ژیاندووە. بەیەکەوە بوونی کۆیلە- کۆیلەدار لە هیچ شارستانییەکدا بەم جورە پێشنەکەتووە. سوزە ئایینیەکانی تایبەت بە دونیای دیکە بۆ ئەو کۆیلانەی لە دونیادا خۆشییان لە خۆیان نەدیوە بۆتە ئامرازێکی بەهێزی مەشروعییەت پێدان. ئەو گۆڕەپانە بەهێزەی شارستانییە کە بەهەشت ـ دۆزەخ و جیهانبینی ئاخیرەتی تێدا داهێنراوە. دەشێت هاوسەرگیری خوشک و برا فیرعەونەکان سەرچاوەی خۆی لە پێویستی تێکنەچوونی خانەدان و نەریتی کلآنی کۆنەوە وەرگرێت. شیمانە دەکرێت بەلانی کەم هێندەی باوەڕییە ئایینیەکانی سۆمەر- بابل ئایینە ئیبراهیمیەکانیش کاریگەرییان هەبوو بێت. سەرچاوە گرتنی حەزرەتی موسا لە کلتووری میسر، راکردنی باپیرەکەیان حەزرەتی ئیبراهیم لە نەمرودەکانی بابل، کاریگەری بەهێز و سەنتێزی هەردوو کلتوور پیشان دەدات. گەلآلە کردنی ئایینە ئیبراهیمیەکان لە دەرەوەی کاریگەرییەکانی ئەم دوو کلتوورە وەکو شیمانەیەک نابینرێت و ئاستەمە. بە دۆخە ئۆرژینالەکەی رژێمی فیرعەونەکانی میسر نزیکترین سیستەمە لە **"کۆمۆنیزمی دەوڵەت"**.

شارستانی ئورارتووش له یەکەمین نەوەکانی شارستانییە. شیمانە دەکرێت دوای کێشمەکێش و تێکۆشانی بەردەوامی نەهرییەکان - گەلی نەهرەکان (رووبارەکان)، شیمانە دەکرێت گوزارشت لەو کوردە دێرینانە بکات کە لە شوێنی هەڵقولانی دیجلە و لقەکانیدا دەژین - لەگەڵ ئاشوورییەکان و لە ساڵانی ٨٧٠ پ.ز دوای قۆناخێکی درێژخایەنی کۆنفیدراسیۆنەکان بەرەو یەکەمین سیستەمی پادشایەتی ناوەندی هەنگاوی هاویشتووە. کاتێک لە نووسراوە ئاشوورییەکاندا بە شان و باڵی پادشا "**ساردوری**"دا - لەوانەیە بە واتای سەردار بێت - هەڵدەدرێت کە پشت بە هێز و چاودێری خوداوەندی گەورە خالدی - دەشێت گودا، گودیا و گۆتییەکان لە ناوی هەمان خوداوەندوە هاتبن. لای سامییەکان ئەڵلا چی بێت، لە کلتووری ئاریان گودا (خودا) هەمان شتە. بە واتای "**ئەوەی خۆی خولقاند**"دێت. تا ئێستاش لە زمانی کوردی و فارسی لە جێگای ئەڵلا بەکاردەهێنرێت - هەر کێیەک رووبەڕووی بێتەوە تێکی دەشکێنێت، لە راستیدا مژدەی ئەو کاروانە سەرسامە دەبەشێتەوە کە بەرەو پادشایەتی ناوەندی دەچێت. شاری وانی رۆژی ئەمڕۆمان وەک ناوەند هەڵبژێردراوە. لەبەرئەوەی لە تیرەی وانلیلییەوە هاتوون، ناوی وان ماوەتەوە. ناوەکەی دیکەی (تووشپا) لە خوداوەندی خۆر تیشوپ[1] ماوەتەوە کە یەکێک لە خوداوەندە مەزنەکانە. قەڵایەکی زۆریان لەم ناوەندەدا ئاواکردووە. لە رۆژهەڵات لە بنارەکانی چیای زاگرۆسی بە ڕووی ئێراندا تا دەگاتە کەنارەکانی فورات لە رۆژئاوا، دۆڵەکانی ئاراس لە باکوور، لە باشوور لە ناوچەی ئاشوور تا دەگاتە باکووری سوریای رۆژی ئەمڕۆمان دەسەڵاتێکی بە هێز و ناوەندییان ئاواکردووە. مەزەندە دەکرێت بۆ یەکەمین جار ئەوان سیستەمی ئەیالەتیان ئاواکردووە. ئەم راستینەش یەکەم ناوەندیبوونە لە مێژوودا. سیستەمی باوەڕییان لە ژێر کاریگەری بە هێزی سۆمەر و ئاشوورییەکاندایە. نووسینی

---

١ـ خوداوەندی گەردەلوول و خۆرە، بەناوبانگترینی خوداوەندی هیتیتەکانە.

بزمارییان بەکارهێناوە. بەڕێوەبەرەکانی ئاشوور بۆ یەکەمین جار لە پاڵ زمانی ئاشووری زمانێک بەکاردێنن کە تا ئێستا تەواو شیکار نەکراوە، بەڵام بە تێکەڵەی پاشماوەکانی زمانی هوری و کۆچبەرەکانی قەفقاسیا دەچێت، لەم قۆناخەدا سروشتییە کە سیستەمێکی زمانی تێکەڵی هاوشێوەی ئەرمەنییان هەبێت. گووتەی لە بابل قسە بە ٧٢ زمان دەکرێت ئەزموون بەخشە.

بەڵام بە بایەخەوە پێویستە ئاماژە بەم خاڵە بکەین: بەردەوام زمانی کۆشکەکان لەگەڵ زمانی جڤاتە پابەندەکانیاندا جیاوازە. لە سەدەکانی رابردوودا لە چەندین کۆشکی ئەورووپادا ئەو زمانانە بەکاردەهێنرا کە هیچ پەیوەندییەکی بە گەلی خۆجێییەوە نەبوو، بۆ نموونە زمانی ئەڵمانی، زمانی لاتینی ـ زۆر پێشتر ـ لە رۆژهەڵاتی ناوینیش بۆ ماوەیەکی درێژخایەن زمانی عەرەبی لە کۆشکەکان بەکارهێنراوە. دووری زمانی عوسمانییەکان لە زمانی تورکی راستەقینە تەنانەت بە قەدەر دووربوونی لە زمانێکی بیانییە. زمانی ئینگلیزی ئەمڕۆمان زمانی فەرمی دەیان وڵاتە کە هیچ پەیوەندییەکی ئەتنیک، قەوم، نەتەوەییان لەگەڵ ئینگلیزەکان نییە. دەکرێ هەمان ریسا بۆ کۆشکەکانی پادشایەتی ئورارتووش لە جێگای خۆیدا بێت. پێشتر بەکارهێنانی زمانی ئاشووری ئەم راستییە دەدات بە دەستەوە. بە بەهێزترین شارستانی قۆناخی ئاسن لە قەڵەم دەدرێت. چەندین بەرگ، مەنجەڵ، قاپ و چەک کە لە تێکەڵەی ئاسن ـ مس دروستکراون، تا رۆژگاری ئەمڕۆمان ماونەتەوە. یەکەمین شارستانییە کە هەرە زێدە ئاسنی بەکارهێناوە. لە پایتەخت و مەڵبەندی ئەیالەتەوە چەمکی شار پێشکەوتووە. هەموو رێگاکان دەچنەوە سەر گرتنەبەری پادشایەتی. تا ئێستاش ئاراستەی ئەم رێگایانە و مۆڵگەکانیان دەگیرێنەبەر. چاڵکردنی گۆڕی پادشاکان لە ناو تاتە بەردەکاندا سەرسووڕهێنەرە. لە هەر گەلێکی دراوسێوە کۆیلە کۆکراوەتەوە و لە بیناکردنی قەڵاو شارەکاندا بەکاریان هێناون. لە دروستکردنی سیستەمەکانی جۆگەلەی ئاو و گۆلەکان

پێشکەوتوون. تاکە هێزن کە بەرامبەر ئاشوورییەکان لە سەرپێ ماونەتەوە. دوای ئەو پێکدادانانەی نزیکەی سێ سەد ساڵ لە نێوانیاندا بەردەوام بووە، هەردووکیان لە هەمان کاتدا و لەلایەن هەمان هێزەوە کوتاییان پێ هێنراوە ـ ٦١٥پ.ز ـ جارێکی دیکە لە هەمان جوگرافیادا مێژوو شاهیدی پێکهاتەیەکی سیاسی هاوشێوە نەبوود.

ئیمپراتۆریەتی مادـ پارس دوا پێهەڵگرتنی شکۆداری نەوەی یەکەمە. مادەکان پێهەڵگرتنەکەیان ئامادە کردووە. ووشەی ماد زیاتر لە کلتووری یونانییەکانەوە تا رۆژگاری ئەمرۆمان ماوەتەوە. مێژوو نووسەکان لەم بارەیەوە هاوبیرن کە لقێکی پێشکەوتوو و بە هێزی ئاریانەکان پێکدێنن، لەبەرئەوەی جگە لە مادەکان هیچ جڤاتێکی دیکەی ئەتنیکی ئەم ناوچەیەیان نەکردوتە شوێنی نیشتەجێبوون، لە جێگای خۆیدایە باسی دێرینی کلتووری ماد و میدیا بکەین. تا ئیستاش گوزارشتی ماد و میدیا بو هەمان ناوچە بەکاردەهێنرێت. وەکو دەبینرێت لە سیستەمی زنجیرە چیای زاگرۆسدا بوونەتە کلتوورێک. دەتوانرێت ریشەکەیان بۆ کاشی و گۆتییەکان بگەرێندرێتەوە. بۆچوونێکی دیکەی هاوبەش و پەسەندکراو ئەوەیە کە لەناو ناولێنانی گشتگیری هۆرییەکانیش جێگای خۆیان دەگرن. دەشێت بگووترێت لقی ئەو خێڵانەن کە هەرە زێدە ململانێیان لەگەڵ ئاشوورییەکان کردووە و لە ناو ئێنش و ئازاردا ژیاون. بە دەوڵەتبوونیان لە نزیکەوە پەیوەندی بەم بەرخودانانەوە هەیە. تەلیسمی سەرکەوتن لە کۆنفیدراسیۆنی خێڵەکاندا دەبینین. لە ساڵی ٧١٥ پ.ز کە بۆ یەکەمین جار سەرۆک هۆزەکان دێنە لای یەکتر یەکێتییەکی خاو (سست)دروست دەکەن. هەر وەکو دەزانرێت فشارەکانی ئاشوور و ئورارتوو ناچاری ناکۆکی و رێککەوتنی کردن لەگەڵ تیرە بەناوبانگەکانی ئیسکیت کە لە قەفقاسیاوە هاتبوون (پێویستە نەریتێکی مێژوویی بێت).

ناوە ناوە پێشەنگایەتی دەست گۆرکێ دەکات. لە ئاکامی

ئەم بەرخودانەی نزیکەی سێ سەد ساڵی خایاندووە، سەرەتا کۆشکەکانی ئورارتوو - نزیک ساڵی ٦١٥پ.ز - یەکسەر دوای ئەویش پایتەختی ئاشوور دەڕووخێنن و دەیدەنە بەر ئاگر. بەم جۆرە کۆتایی بەم دوو شارستانییە بەهێزەی میزۆپۆتامیا دێنن. باس لەوە دەکرێت کە پایتەختێکی بەناوبانگیان بە ناوی ئەکبەتان دامەزراندووە، دەوربەریان بە حەوت شورای حەوت ڕەنگی گرتووە -نزیک بە شاری هەمەدانی ئێرانی ئەمڕۆ -لە ڕۆژئاوا سنوورەکانیان تا ڕووباری سوور فراوان کردووە. لەگەڵ فریگیاییەکان بوونەتە دراوسێ. پەیوەندییەکانی خزمایەتی کە لەگەڵ تیرەکانی فارس (پارس) هەیان بوو، هۆکاری تەمەن کورتی قۆناخی دەسەلاتدارێتیانە. ئەو پێکهاتە سیاسیەی لە دەرئەنجامی هەوڵێکی گەورەی سێ سەد ساڵی ئاوایان کرد، لە میانەی گەمەیەکی کورت خایەنی کۆشک خستوویانەتە دەست خانەدانی هاخەمەننشینی فارس. لە ئاکامی ڕێککەوتنی کوڕە فارسیکی دایک میدی بە ناوی **"کیرۆس"**(کورش) ەوە لەگەڵ فەرماندەی سەربازی کوشک **"هێرباکۆس"** لە میانەی کودەتایەکی پڕ لە ئێشی کۆشک دوا پادشای بە ساڵاچوو ئیستیاک لە دەسەلات خراوە. لە میژووی هیرۆدۆتەوە دەزانین کە ئیستیاک بەرامبەر ئەم خیانەتە گوتوویەتی: **"ئەی ساختەکار، مادەم منتان لە پادشایەتی خست، بۆچی دەسەلاتت بە فارسیکی زۆڵ بەخشی؟ هیچ نەبێت خۆت ببویتایە بە دەسەلات، بۆچی دەسەلاتت بۆ فارسەکان گواستەوە؟ هیچ نەبێت با بە دەست مادەکانەوە بمایەتەوە!"** بە ڕاستی ئەگەر هیرۆدۆت بۆخۆی ئەمەی ڕێک نەخستبێت -ناچارین باوەڕی پێ بکەین. چونکە میژوو نووسێکە هەرە زێدە گەڕاوە و زانیاری زانیوە - پیشان دەدات کە هەزاران ساڵ بەر لە ئێستا تایبەتمەندییەکی زۆر ساختەکارانەی کوردە بە کرێگیراوەکان پێکهاتووە.

من لەو بڕوایەدام کە یەکەمین کوردی بە کرێگیراو لە میژوودا ئەنکیدۆیە کە پادشای ئوروک گلگامیش لە دارستانەوە هێنای -

لەو سەردەمەدا دارستان لەو شوێنانەدا چڕە کە کوردەکانی سەردتا تێیدا دەژین ـ تا لە ناوچە دارستانیەکان وەکو سیخوڕ ـ بە کرێگیراوێک بەکاری بێنێت. واتا رابردوویێکی هێندە کۆنی هەیە کە ببێتە بابەتی یەکەمین داستانەکان. هەڵبەتە هەر وەکو بەردەوام ڕوویداوە دیسان لە ڕێی ژنێکەوە! ئاوو هەوای چیای ئازاد و هەڤالانی کردبووە قوربانی ئارەزوو و چێژی ساختەکارانەی کچە راهیبەیەکی پەرستگا. چەندە بە ڕۆژگاری ئەمڕۆمان دەچێت! ـ بەسەدان هیرباکۆس لەناو بزاڤی ئازادیخوازی کورد و (PKK) دەرکەوتوون ـ دەبێت باش بزانرێت کە کەسایەتی کوردە بەکرێگیراوەکانی ئەمڕۆمان لە مێژوودا پێکهاتووە، هیچ بەهایەک نییە لەپێناو ئەو ژن و خێزانەدا نەیفرۆشێت کە تەنانەت پێنج فلسیش ناکات، هەر بۆیە لە ڕەسەنێتی، سیاسەتمەدارێتی و دانایی ڕاستەقینە و ژیانی واتادار و بەچێژ (بە ژیانی ئازاددا تێپەڕ دەبێت) دابڕاوە، لەم سۆنگەیەشەوە بە شێوەیەکی زۆر قێزەون دەژی.

یۆنانییەکان و بە تایبەتی هیرۆدۆت بەشێکی زۆری مێژووەکەی بۆ مادەکان تەرخان دەکات (باس لە یۆنانی کۆن دەکەین، نەک گاڵتەجاڕییەکەی مۆدێرنیتە). مەزندە دەکەم تەواوی ئەوانەی لە سەرچاوەی کلتووری هۆرییەوە دێن بە مادەکان ناو دەبات، ڕێز لە گەورەییەکەی دەگرێت. پارسەکان لە ڕیزی دووەم دادەنێت. کاتێک دەڵێت مۆرکی کلتووری ناوچەکە هی ڕەسەنی مادەکانە هەر وەکو بڵێی ڕاستی بینیوە. لەو قۆناخەدا پارسەکان گرووپێکی نەناسراون، کلتووریان لاوازە و تازە هاتوونەتە سەر شانۆی مێژوو. شکۆداری کلتووری هۆرییەکان لە کەنارەکانی ئیجەوە تا ئیلام، لە سنوورەکانی قەفقاسیا تا کۆشکەکانی میسر ناوبانگی هەبووە. وەکو ڕاستییەک هیرۆدۆت لە مێژووەکەیدا باسیدەکات.

ڕۆڵی ئاواکردنی خوداوەند و زهنییەتی نوێ کە یەکەمین جار راهیبەکان لە شارستانی سۆمەردا بینیان، لە هەمان گۆڕەپاندا بۆ شارستانییەکانی ئورارتوو و ماد ـ پارسیش جێگای باسە.

دەتوانین شرۆڤەیەکی بەم جۆرە بکەین: ئەو راهیبانەی بە ماغ (موغ) ناودەبران لەژێر رێبەرایەتی زەردەشت کە دەشێت ئەدرەس یان وێنەیەکی سیمبولی بێ، ناوەندی پیرۆزیان شاری موشاسیری ناوچەی برادۆستی رۆژگاری ئەمرۆمان بووە، یەکەمین پانتائۆن (ئەنجوومەن)ی خوداوەندەکان لەوێ ئاواکراوە، دواتر بۆ توشاب، ئەکبەتان و پەرسەپۆلیس گواستراوەتەوە. چونکە تا نەریتێکی درێژخایەنی راهیبەکان نەبێت ئاواکردنی شارستانی جددی ئاستەمە. لە کلتووری یۆناندا فەیلەسوفەکان، لە شارستانی ئەورووپاشدا رۆشنبیرانی سەردەمی رۆشنگەری رۆڵێکی هاوشێوە دەبینن. لە سامییەکاندا شێخ، لای عیبرانییەکانیش پێغەمبەر دەشێت لەهەمان پۆلێندا ببینرێن.

پێویستە زۆر بە باشی زەردەشت و موغەکان خۆیان و رۆڵیان پێناسە بکرێن کە لە پێهەڵگرتنی ماددا رۆڵێکی گرنگیان هەبووە. راهیبەکانی ماد و زەردەشت وەک دامەزرێنەر و بیر و باوەڕییەکەی وەها شرۆڤە دەکرێت کە ئاگر، کشتوکاڵ و ئاژەڵی بە پیرۆز لە قەڵەمداوە، لەم لایەنەوە رەنگدانەوەی بەهاکانی کۆمەڵگای نیولیتیکە، لەو بڕوایەدام کە ئەخلاق و باوەڕییەکەی بەوە بەناوبانگە کە تێکەڵی پیسی و خراپییەکانی شارستانی نەبووە. لە راهیبەکانی سۆمەر جیاوازترن کە داهێنەری پادشا ـ خوداوەندی دەمامکدارن. تەنانەت دژێتی. خاوەن چەمکێکی گەردوونی و دیالیکتیکی پڕ لە کێشمەکێشی چاکە- خراپە، رووناکی ـ تاریکییە. راهیبە زەردەشتییەکان کە بە تەواوی لەناو شارستانی نقوم نەبوون و لە کەش و هەوای شاخ ـ لە کلتووری یۆناندا کلتووری خوداوەند دیۆنیسۆس ـ گەورە بوونە ئەخلاقی ئازاد دەستووری سەرەکییانە. لە جیاتی داهێنانی خوداوەند، باس لە پیرۆزی کشتوکاڵ و ئاژەڵ و خەسڵەتی مرۆڤی ئازاد دەکات.

لە تێکشکانی ئاشوورییەکان و هەڵکشانی ماد- پارسدا ئەم ئەخلاقە پێگەیەکی دیاریکراوی هەیە. ئەگەر تامەزرۆییان بۆ ژیانی

ئازاد نەبوایە وەکو گەلانی دیکە بە ئاسانی دیل دەبوون. کاتێک دەڵێم گەلانی دیکە مەبەستم ئەوانەیە کە ماوەیەکی درێژ لە ژێر کاریگەرییەکانی کۆمەڵگای شارستانیدا ماونەتەوە.

دوای مردنی کۆرش (قۆناخی ٥٥٩-٥٢٩) لە میانەی کودەتایەکی راهیبەکانی مادەوە لە ساڵی ٥٢٨پ.ز جارێکی دیکە گروپێکی بە ریشە میدی دەسەڵات دەگرنە دەست، بەڵام بە ئاسانی پاکتاو دەکرێن و قۆناخی داریوشی بەناوبانگ دەست پێدەکات (٥٢١ - ٥٠٦پ.ز) دوای ئەوەی لە ماوەیەکی کورتدا بابل، میسر و شاری ئیۆنی کەناری ئیجە دەکەون، لە کەنارەکانی ئیجەوە تا دەگاتە (بەشسو) کەنارەکانی پەنجاب لە رۆژهەڵات بەرفراوانترین ئیمپراتۆر لە مێژوودا ئاوادەکرێت. جگە لە چین، تەواوی دونیای شارستانی دەکەوێتە ژێر حوکمی قەڵەمڕەویانەوە. بێگومان شتی زۆری لە کلتووری سۆمەر - بابل - ئاشوور - ئورارتوو - کلتووری شارستانی وەرگرتووە. جگە لەمە خوراکی لە دەمارە ئازادەکانی کلتووری ئاریانیش وەرگرتووە. لە ڕێی ئیستیکە بەناوبانگەکانەوە کە لە باکوورەوە هاتبوون بە تورکە سەرەتاییەکانی رۆژهەڵاتیش کاریگەر بووە و دەستی بە پەیوەندی کردووە لەگەڵیاندا. لە میانەی سەنتێزکردنی ژمارەیەکی هێندە زۆری کلتوورەکانەوە لە بونییەی خۆیدا نموونەیەکی تایبەتی پێشکەش بە مێژوو کردووە.

ئیمپراتۆریەتی ماد- پارس بەرفراوانترین و دوا نوێنەری نەوەی یەکەمە (مادەکان بە پلەی دووەم هاتوون، لە ناو سوپاشدا لە هێزە سەرەکییەکان بوون. خزمایەتی نزیک لەمەدا بە کاریگەرە). یەکەمین نەوە لە ڕێگای کلتووری شارستانیەکەیەوە گەیشتۆتە بەرزترینی ئەو ئاست و قۆناخەی شارستانی کە دەرفەتی پێگەیشتنی هەیە. شکۆمەندی ناوەند (پاشماوەکانی پەرسەپۆلیس تا ئێستاش شکۆدارە) و هێزی مەڵبەندی ئەیالەتەکان تەنانەت وەکو دەستپێکی ئیمپراتۆریەتی رۆما وەهایە. گریک - رۆما بەهێزترین فاکتەری ئامادەکردنی دونیایە. هەم بە سیستەمە سیاسیەکەی (دوای

ئورارتووییەکان بۆ یەکەمجار سیستەمی ئەیالەتیان هەبووە) و هەم ڕێگا سەرسوڕهێنەرەکانی پۆستە و گەیاندن (یەکەم ڕێگای درێژی لە مێژوودا ناسراو، شا ڕێ کە لە کەنارەکانی ئیجە لە شاری سارد دەست پێدەکات و لە پەرسەپۆلیس تەواو دەبێت) بەناوبانگن. یەکینە تایبەتەکانی گارد و هێزی نەمران بەناوبانگە. سوپاکەی بە هێزێکی سەدان هەزار کەسی گەیشتووە. لە بواری بیناسازی پێشکەوتن بەدیهاتووە. لەلایەنی باوەڕی ئایینی و ڕێوڕەسمەکانی جیاوازی دروست بووە. جیاوازی لە نێوان ئایینی گەل (میترایيزم) و ئایینی نەجیبزادەکاندا پێشکەوتووە. هەنگاو بۆ ئەرستۆکراسیەک نراوە کە زور لە نەریتی تیرە بەرکەمالترە. لە کۆی تێکرای ئەوانەی پێش خۆی زیاتر گۆڕەپانی شارستانی بەرفراوان کردووە. بۆ یەکەمین جار هونەری کۆکردنەوەی هۆز، خێڵ، ئایین، مەزهەب، زمان، و کلتووری لە ژمار نەهاتوویان لەناو یەک بۆتەدا یەک خستووە. شارستانی هەرد دوایی شکۆدار و بەرچاوی ڕۆژهەڵاتە لە چاخی یەکەمدا. بە گوێرەی شارستانی یۆنانی کلاسیک کە تازە پەرەدەسەنێت لە هەموو بوارێکەوە لە پێشترە و بەراورد پەسەند ناکات. لە ڕاستیدا خوێندکارەکەی ئەرستۆ ئەسکەندەر، لەژێر کۆمپلێکسێکی قووڵی کلتووری ڕۆژهەڵاتدا دەناڵێنێت، بۆ ئەوەی ببێتە خاوەنی شکۆداریەکەی ئێرە، لە جێگای خۆی ناوەستێت و دەبێتە داگیرکارە بەڕبەڕەکەی وڵاتە تازە پێگەیشتووەکانی دەوروبەری. ئیمپراتۆریەتی ڕۆما بەرامبەر بە گۆتەکان چییە، بۆ بێکاران، سەرۆک تیرەکان و پادشا بچووکەکانی یۆنانیش ئیمپراتۆرییەتی پارس هەمان واتای هەیە. مسۆگەر لە بواری گەورە بوون، دەوڵەمەندیتی و شکۆداری لە ڕۆما کەمتر نییە. ئەگەر لەم ڕوانگەیەوە سەیری داگیرکارییەکەی ئەسکەندەر بکەین دەتوانین بە شێوەیەکی ڕاست و واتادار مێژوو شرۆڤە بکەین.

لە میانەی خستنە سەری چەند خاڵێکی دیکە با کۆتایی بە باسەکەمان بێنین دەرهەق بە گرفتەکانی قەڵەمباز و پەلهاوێشتنی

قۆناخی یەکەمی کۆمەڵناسی شارستانی. یەکێک لەم کێشانە ئەوەیە کە هۆزی عیبرانی لە کوێ جێگیر دەکەین. یەکەم شت پێویستە بگووترێت تایبەتمەندییەکی بەم جۆرەیان هەیە، لە نێوان کلتوور و زمانی ئاریان و کلتوور و زمانی سامیدا، دیسان لە نێوان شارستانییە بە ریشە سۆمەر و شارستانییە بە ریشە میسرییەکاندا لە سالانی ١٧٠٠پ.ز بەولاوە تا رۆژگاری ئەمرۆمان دێن و دەچن. لە پەرتووکە پیرۆزەکاندا بە تایبەت ناوی سروج، ئورفا و حەران تێپەڕ دەبێت. وەکو شوێنی باپیرەی ئیبراهیم باس دەکرێت. رووخساری هۆزێکیان هەیە کە لەوێود تا میسر رانە مەڕەکانیشیان بە دواوەیە و تا رادەیەکیش خەریکی بازرگانین. باوەڕییە ئایینیەکەیان لە نێوان یاهۆڤا و ئەڵلادا دێت و دەچێت. بەرامبەر توانەوە لەناو کۆمەڵگای شارستانی بەرخودان دەکەن. باوەڕی خوداوەندی تایبەت بە خۆیان گرێدراوی ئەم بەرخودانەیە. جیاوازییەکی تایبەت بە خۆیان هەیە ئەویش پێشخستنی خوداوەندی هۆز- تیرەیە. ئەو ژیانەی کە بە هەڵوێست پیشاندانی حەزرەتی ئیبراهیم بەرامبەر نەمرود (پادشای بابل) دەستی پێکرد، لە میانەی هەڵوێستی حەزرەتی موساوە بەرامبەر فیرعەون (پادشای میسر) درێژەی پێدرا، بە شێوەی کێشمەکێش لەگەڵ چەندین تیرەی فەلەستین و خوداوەندەکانیان بەردەوام دەبێت. لە پەرتووکی پیرۆزدا چیرۆکە سەیرەکانیان جێگای باسە. بۆ ماوەیەکی درێژخایەن لەژێر رێبەرایەتی راهیبە - ئەگەر بە سۆمەرییەکانیان بچوێنین یەکەم پادشا راهیبە- هارونییەکاندا (هارون برای حەزرەتی موسایە) بەردەوامی بە تایبەتبوونی خۆیان دەدەن.

دوای تەواوبوونی یەکەمین قۆناخی راهیبەکان کە بە حەزرەتی موسا دەستی پێکرد (لە کۆتاییەکانی ١٣٠٠پ.ز) و بە راهیبی بەناوبانگ سامۆیل کۆتایی پێهات، قۆناخی ئەو پادشایانە دەست پێدەکات کە لایەنی سیاسی - سەربازییان بەهێزە (لە سالانی ١٠٢٠پ.ز بەدواوە ساول، داود، سولەیمان و بەردەوامییەکانیان)

پادشا لاوازەکان جێگای پادشا بەهێزەکانی سەرەتا دەگرنەوە. پادشایەتییەکی بچووک پێشدەخەن. بەردەوام ناکۆکی لە نێوان پادشا و راهیبەکاندا هەیە. بەردەوام لە شێوەی دوو یان سێ پارتی گرێدراو بە دەرەوە دەژین. بەرخودانکار و بەکرێگیراوەکان لە سالانی ٧٢٠پ.ز بەرامبەر بە ئاشوورییەکان بەیەکەوە شکست دێنن. لە سالانی ٥٤٠ پ.ز دوورخستنەوەیان بۆ بابل دەست پێدەکات. لەگەڵ کۆتاییهاتنی دەسەڵاتی بابل لەلایەن پارسەکانەوە، رزگاریان دەبێت. ئەمەش لە رزگاربوونی ئەو جولەکانە دەچێت کە لەگەڵ چوونی سوپای سۆڤێت بۆ ناو بەرلین رزگاریان بوو. چەندین چیرۆکی هاوشێوە هەن. لە سەردەمی ململانێی پارس - گریک دیسان دوو پارتی بەکرێگیراو پەیدا دەبن: سادوقی و فەریسیەکان. دواتر بەرخودان بەرامبەر رۆما و دوورخستنەوەی یەکەم و دووەم (٧٠پ.ز - ٧٠ی زایین) روودەدات؛ سەرەتا بۆ میسر و ئەنادۆڵ دواتریش بە ریز لە تەواوی گۆرەپانی شارستانیدا پەرتەوازە دەبن. پارس، گریک و رۆما لە ریزدایە.

حەزرەتی عیسای بەرخودانکار پەیدا دەبێت، لە خاچ دەدرێت. وەک سەرەتای ئەفسانەیەکی پرۆلیتاریاکانی رۆما دەبێتە سەرەتای دووەمین ئایینی بە ریشە ئیبراهیمی. لە شارستانیەکانی گریک - رۆما و ئەوروپادا ماجەرا نەگبەتییەکانی تیرە بچووکەکانی عیبرانی بەردەوام دەبێت. بەشێکی گرنگی رێبەرەکانیان بە ئەفەندی (سەردار)، رەبی و نەبی بەناو دەکەن کە بە واتای نێردراوی خودا دێت. بەم جۆرە زنجیرەیەکی درێژی پێغەمبەرایەتی دەست پێدەکات. حەزرەتی عیسا و حەزرەتی محەمەد دەبنە دوا پێغەمبەر. بەڵام موسەوییەکان دانیان پێدا نانێن. ناکۆکییە ئایینییەکان لە میانەی پێکدادانە سیاسیەکانەوە بەردەوام دەبێت. قۆناخی نووسەر (کاتب)ەکان زیاتر لە دوای دەسەڵاتی رۆما دەست پێدەکات. تا رۆژگاری ئەمرۆمان لە میانەی نەریتی نەوەیەکی بەهێزی نووسەر - رۆشنبیران بەردەوامە کە بەلانی کەم هێندەی پشتێنەی پێغەمبەران

بەهێزە. هەنگاوە بازرگانییە بچووکەکەی سەرەتا، لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا رۆڵی سەرەکی لە سەرهەڵدانی سەرمایەداری و باڵادەستی فینانسی رۆژی ئەمڕۆماندا دەبینێت. ژمارەیان کەمە بەڵام هێندەی ئیمپراتۆرییەکان کاریگەرییان لەسەر مێژووی شارستانی جیهان هەیە. هۆزی عیبرانی بابەتێکە پێویستە بەلانی کەمەوە هێندەی شارستانییەک لێکۆڵینەوەی لە بارەوە بکرێت. وەکو ئیمپراتۆری بابەتەکانی زانست، یاسا و پارە (دراو) وان. هەمان رۆڵ بە ئەندازەی مێژوو، بە هەموو لایەنە سەیرەکانییەوە لە رۆژگاری ئەمڕۆشماندا بەردەوامە. چیرۆکی شەخسی منیش بە شوێن پەنجەیەکی بچووکی ئەم تیرەیە دەچێت. هەر وەکو حەزرەتی ئیبراهیم لە سروجی سەر بە ئۆرفا دەستم بە هەنگاونان کرد، بەڵام لە ئاکامی یارمەتی پادشا بەکرێگیراوەکانی سیستەم ـ لە هی حەزرەتی عیسا پادشا یەهودا، بۆ منیش رێککەوتنی موساد ـ ئەمریکا ـ هەر وەکو حەزرەتی عیسا بەرخودانەکەمان لە ناو شێوەیەکی دیکەی لە خاچداندا بەردەوامە.

کێشەیەکی دیکە لیشاوی ئیسکیتەکانە کە لە باکوورەوە هاتوون. ئەم لیشاوانە کە لە سالانی ١٨٠٠پ.ز ناسنامەیان بە دەست هێناوە، بۆ تیرە بە رەچەڵەک قەفقاسەکان دەگەڕێتەوە. ئەم تیرانەی لە ناوەڕاستی ئەورووپا تا ناوەوەی ئاسیا، لە کوێستانەکانی باشووری روسیا تا میزۆپۆتامیا لە هەموو لایەک بڵاوبوونەتەوە، لەبەرئەوەی لە جیاتی کلتوور پشتیان بەهێزی فیزیۆلۆژیانەیان بەستووە شوێن پەنجەیەکی ئەوتۆیان لە دوای خۆیان بەجێ نەهێشتووە. بەڵام هاوشێوەی هۆزی عیبرانی لە ئاواکردن و رووخاندنی چەندین ئیمپراتۆرییەتدا رۆڵیان هەیە. وەکو دەست و پێوەندی سەربازی و ژنانی کۆشک خزمەتێکی زۆریان پێشکەش کردووە. ئەم رۆڵەیان تا سەردەمی دوا ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی تەنانەت سەردەمی کۆمار بەردەوام دەبێت. وەکو دەبینرێت نەیانتوانیوە هێندەی عیبرانییەکان خۆیان بپارێزن. وەک رەنگی رەچەڵەکێکی تر کلتوورەکان هەمەڕەنگتر دەکەن. دەشێت جوانییەکەیان و راوەستە

جوامێرییەکەشیان جێگای باس بێت. ئیسکیت و هاوشێوەکانی بابەتێکن کە پێویستە لە یەکەمین نەوەی کۆمەڵگای شارستانی باش لێکۆڵینەوەی لەبارەوە بکرێت.

دەشێت بۆ لێکۆڵینەوە لە پێکهاتنی سیستەمە مێژووییەکان زاراوەی ناوەند- کەنار وەکو گریمانەیەک بەکاربهێنرێت. کاتێک ناوەندەکانی شارستانی جێگای باس بن، پرسی لە کەنار چی روودەدات دەبێتە جێی بایەخ. کاتێک بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا ناوەندی شارستانییەکانی سۆمەر، میسر و چین ئاوابوو، بە گوێرەی سۆمەر و میسرییەکان هێزەکانی کەنار تیرە سامییەکانی ئارامی و ئابیرۆن، بە گوێرەی چینەکان هۆنەکان بوون کە تورکە سەرەتاییەکانن، بە گوێرەی رۆماییەکانیش گۆتەکانن. سەرۆکی ئەم تیرانە کە زیاتر لە قۆناخی هەرە سەرووی بەربەرێتیدا بوون کاتێک ئاشنای چەکەکانی شارستانی بوون و بەدەستیان کەوت، هەر وەکو جۆرێک لە شەڕی گەریلایی بەردەوام لە پێگەی هێرش کردن و خۆپاراستندا دەژین. چارەنووسەکەیان: یان ئەوەتا لەناو مەڵبەندی شارستانی دەسەڵاتداردا دەتوێتەوە، یاخود پێکهاتەیەکی هاوشێوەی ناوەندەکانی شارستانی لە کەنار ئاوادەکەن. بۆ نموونە ئەکەدییە ئامۆرییەکان، درێژەیان بە پەلامارە یەک بە دوای یەکەکانیان دا، تا لە ئاکامدا وەک خانەدانێکی جیاواز بوون بە دەوڵەت. عیبرانییەکانیش لەسەر بنەمای ئەوەی لە میسر فێربوون، پادشایەتی سەربەخۆی خۆیان ئاواکرد. هونەکان بەهێزترین بزووتنەوەی کەنار بوون لە مێژوودا کە نەیانتوانی لە چین، ئەوروپا، تەنانەت لە ئێرانیش خۆیان لە توانەوە بپارێزن. گەورەی تیرە - هۆز وەکو بەڕێوەبەرێک لەناو کلتووری ناوەندەکانی شارستانی توانەوە، هەرچی خەڵکە رەش و رووتەکەی هۆز - تیرەشە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن بە مارژینالی مانەوە، یاخود لە رێگای هەندێک گەورەی نوێوە هەمان پێگەی خۆیان دووبارە کردەوە. گۆتەکانیش لە ئاکامی هێرشە بەردەوامەکانیان بۆ سەر رۆما بناخەی میرنشینی ئەڵمانیان دانا، هەندێک جاریش

تاجی رۆمایان لەسەر دەکرد. مێژوو نموونەیەکی زۆر واتادارمان لەم بارەیەوە پێشکەش دەکات: گەورەی تیرەکانی ئۆغوز و مەغۆل کە یەکەمین خانەدانە دامەزرێنەرەکانی عوسمانین، بەرامبەر بە شارستانی بیزەنتی تەواو هێزێکی کەنار بوون، دوای ململانێیەکی سەدان ساڵەی نێوان ناوەند ـ کەنار، دەستیان بەسەر ناوەندا گرت، لە رەوشی کەنار دەرکەوتن و خۆیان بوون بە ناوەند.

ئیسکیتەکانیش هێزێکی کەنارن، بە تایبەتیش بۆ ناوەندەکانی یەکەمین نەوەی شارستانی، کە بە گشتی لە باکوور بە تایبەتیش لە قەفقاسیا رۆڵیان بینیوە. کاتێک ئاشنای شارستانیەکان بوون و خۆیان بەچەکەکانیان چەکدار کرد بویان بوون بە هێزێکی سەرسورهێنەری هێرش کردن. مەزەندە دەکرێت لە ساڵانی نێوان ٨٠٠ ـ ٥٠٠پ.ز زۆر چالاک بوونە. سەرباری ئەوەی وەکو سەربازی بە پارە و خزمەتکارانی کۆشک رۆڵێکی زۆریان بینیوە، ناوەندی شارستانی خۆیان ئاوا نەکردووە و بەشە هەرە زۆرەکەیان لە توانەوە رزگاری نەبووە.

## ب ـ پەرەسەندنی کلتووری چین، هیند و هیندیە سوورەکان

بە کورتی چاو پیداخشاندنێک بە پەرەسەندنەکانی کلتووری چین، هیند و هیندیە سوورەکان ئەزموونبەخش دەبێت کە لەناو تایبەتبوونی خۆیاندا خاوەن سیستەمی شارستانین.

هەر وەکو پێشتریش ئاماژەمان پێکرد چین ئەو ناوچە گرنگەیە کە لەگەڵ کۆتایی هاتنی دوا قۆناخی سەهۆڵبەندان لە ساڵانی ١٠٠٠٠پ.ز بەولاوە ئەو گروپانە تێیدا نیشتەجێبوون کە لە باشووری رۆژئاوای سیبریاوە بەرەو باشوور بڵاوبوونەوە. زەوییە بە پیتەکانی کەناری دەریا و ئاوە بەلێشاوەکان، دەوڵەمەندی رووەک و ئاژەڵ، تا دوایی زەمینەیەکی لەبار بۆ کلتووری نیولیتیک و شارستانی شارەکان پێشکەش دەکەن. پێشکەوتنی شۆڕشی نیولیتیکی چین

لە سالانی ٤٠٠٠پ.ز بەرچاو دەکەوێت. لێرەدا گرفتی سەرەکی ئەودیە: ئەم شۆڕشە کشتوکاڵییەی نیولیتیک تا چ رادەیەک تایبەتە و تا چ رادەیەک بە پەلهاویشتنی کلتووری ئاریانی کاریگەر بووە. رەنگنەدانەوەی کلتووری نیولیتیکی ئاریان لەسەر چین کە بەلانی کەم ٦٠٠٠ساڵ بەر لەو پێشکەوتووە، بیری لیناکرێتەوە. لەم سۆنگەیەوە رۆڵە دیاریکەرەکەی بایەخدار دەبێت. مێژوو پیشانمان دەدات کە شۆڕشە کلتوورییە مەزنەکان بە ئاسانایی روویندداوە، هەلومەرجێکی تایبەت و درێژخایەن بۆ ئەمە پێویستە. بە گوێرەی لێکدانەوەکانی من بەو رادەیەی لە رۆژی ئەمڕۆماندا سۆسیالیزم و سەرمایەداری چین خۆجێیی و رەسەنە، ئەوا نیولیتیک و شارستانی چینیش هێندە مورکی تایبەت و خۆجێیی پێوەیە. بە هەڵە تێنەگەن، هیچ گومانێکم لەوەدا نییە کە ئەو سەرمایەدارییەی تەنانەت بە میللیش دادەنرێن هاوردەن. ئەم خاڵە بو چینیش لە جێگای خۆیدایە. دەتوانین بڵێین بلاوبوونەوەی دواتری نیولیتیکی چین لە ڤێتنام و نیمچە دوورگەکانی دیکەی هێندی چینی، دوورگەکانی ژاپۆن، ئەندەنوسیا، نیمچە دوورگەی کۆریا مێژووەکەی ناگەڕێتەوە بۆ بەرلە ٤٠٠٠پ.ز.

ئەو مێژووەی پێشبینی دەکرێت شارستانی کۆیلەداری چین تێیدا سەریهەڵدا بێت نزیکەی سالانی ١٥٠٠پ.ز. دەتوانم بڵێم یەکەمین گەورە ئیمپراتورییەتی ناوەندی لەم مێژووەدا ئاواکراوە، چەندین پیرۆزی لە خۆوە گرتووە و بە واتای **"ئۆروک"**ی چین هاتووە. هەر وەکو لە شارستانی سۆمەر و میسر روویدا، لە سالانی ١٠٠٠پ.ز لە دوای قۆناخی ئاواکردن بەرفراوان بوون و پەرتبوونی جێگای باسە. لەم قۆناخەی دووەمدا چەندین دەوڵەتشار ئاوا دەکرێن و هاوشێوەی قۆناخی ئوری سۆمەرییەکان شەڕێکی بەرفراوانی کێبڕکێی نێوان شارەکان روودەدات. لە قۆناخی سێیەمدا (٢٥٠پ.ز ـ٢٥٠ی زایینی) سەرلەنوێ خانەدانە ناوەندییەکان بەهێز دەبنەوە. لە قۆناخی دەرەبەگایەتیدا خانەدانە ناوەندییەکان قورسایی خۆیان

پیشانددەدن. دەشێت هەندێکیان بە رەچەڵەک خۆجێیی، هەندێکیشیان بیانی بن. تا سەرەتاکانی سەدەی بیستەم بە شێوەیەکی زۆر خەست بەردەوام دەبن. هەر وەکو تێبینی دەکرێت لەم قۆناخەدا شارستانی چین لە سالانی ٥٠٠ ی زایین بەولاوە لە چینی هیندی، دوورگەکانی ژاپۆن، ئاسیای ناوین لەناو مەغۆل و تورکە سەرەتاییەکاندا بلاوبۆتەوە.

هاوشێوەی راهیبەکانی سۆمەر لە جیاتی داهێنانی خوداوەندەکان، شرۆڤەی داناکانیان لە بارەی گەردوونەوە سەیرە. تێگەیشتن و شرۆڤە کردنیان لە بارەی گەردوون و سروشت ناوەرۆکێکی زانستیانەی هەیە. گەردوون بە زیندوو دەبینن (دادەنێن). پێناسەکەیان لە بارەی ووزەوە فێرکەر و ئەزموونبەخشە. بە شێوەیەکی گشتی دەشێت روحانییەتی (روحگەرایی) چین بە **"تاویزم"**[1] ناوببرێت. دەشێت **"دانایی"**شی پێ بگووترێت. کۆنفوشیوس کە لە سالانی ٥٠٠پ.ز ژیاوە زیاتر هەولدەدات تیوری ئەخلاق و پرەنسیپەکانی سیستەمی دەولەت و شارستانی دابنێت. لە یاسا فەرمییەکانی بەڕێوەبەرایەتی کۆمەلگای دەولەت زیاتر، گرێدراوی بیر و باوەڕەکەی خۆیەتی کە بە پرەنسیپەکانی ئەخلاق پشت ئەستوورە، ئەم بیر و باوەڕەش بەرەو پێشەوە دەبات. لە هەمان سەردەمی زەردەشت و سوقراتدا دەژی، بە ئەندازەی ئەوانیش کاریگەری لەو کۆمەڵگای شارستانییە دەکات کە تێیدا دەژی. ئەم سێ دانا گەورەیە باس لە گرنگی ئەخلاق و فەزیلەتی ناواخن دەکەن، پارێزەر و دانا گەورەکانی ئەخلاقن.

---

١ـ رەوتێکی فەلسەفییە کە لە سالانی ٦٠٠پ. ز دا لە چین لە لایەن "لیۆ تێس" ەوە دامەزرێنراوە. بەلام هەم وەک ناوی ئەو بیرۆکانەی لەسەر رێی لیۆ تێس رۆیشتوون و هەم وەک ناوی ئەو ئایینانەی لەسەر بنەمای ئەم فەلسەفەیە لە چین دامەزرێنراون بەکاردەهێنرێت. تاویزم کە وشەی تاوۆ یەکەم وەک یاسای سروشت یاخود ئاسمان، دووەم وەک دانایی بە بنەما دەگرێت، لە رووی هەبوون و ئەخلاقەوە بە شێوەیەکی رەها داکۆکی لە سروشتی بوون دەکات. لیۆ تێس کە دەڵێت: "لە ژیانێکی سروشتیدا جێگای خۆ نواندن، فێلبازی، خۆ بە زل زانین و راکردن بە شوێن ئارەزوو و داخواز و قازانجدا نابێتەوە. هەر کەسێک بە گوێرەی تاوۆ بجولێتەوە، تەواو خۆی لەگەڵیدا یەکانگیر بکات، بەوەی بە تەواوەتی خۆی لەم رێگایەدا بۆ گەیشتنە ئامانج بەخت بکات لە ناو تاوۆدا بتوێتەوە: ئەوا بە نەمری دەگات" هەموو جۆرێکی بەڕێوەبەرایەتی لە سیاسەتدا مەحکوم دەکات. هەروەها لیۆ تێس داکۆکی لەوە دەکات کە ئەو شوێنەی تاویزم تێیدا بالا بێت ئاشتی بەرقەرارە و کەسی دانا هەرگیز چەک ناگرێتە دەستی و ئەگەر ناچاری ئەمەش بکرێت تا هەیە نا بەدڵ بەکاری دەهێنێت. لەلایەکی ترەوە لەبەرئەوەی پێی وا بووە کە شارستانی و زانیاری رێگا لە پێش کۆمەڵێک خراپەکاری زۆر نەرێنی دەکەنەوە کەوتۆتە سەر رێی دەست هەلگرتن لێیان.

پێشکەوتنی گرنگ لە ڕووی شارستانی ماددییەوە تۆمار دەکەن. لە بواری پەرەپێدانی پیشەسازییەوە زۆر پێش ڕۆژئاوا هەنگاویان هاویشتووە(مەبەست چینە). داهێنەری کاغەز، باروت و چاپخانەن. لەوپەڕی ڕۆژهەڵاتی بازرگانیدا جێگا دەگرن، ئەمەش شوێنی کەوتنەگەڕی ڕێگای مێژوویی ئاوریشمە. پەیوەندی بەردەوامی لەگەڵ شارستانیەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین لە کۆتاییەکانی پێش زایین و سەدەکانی سەرەتای زایین هەیە. لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمینیش بە ڕووی سەرمایەداریدا کرایەوە. لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا وەکو دێوێک گەورە دەبێت و دیار نییە وەکو لیڤی ئەتهانی نوێ چیدەکات و چۆن بڵاو دەبێتەوە، بە مەراقەوە چاوەڕوانی دەکرێت.

لە هیندستان پێشکەوتنێکی درێژخایەنی نیولیتیک بە شێوەیەکی خۆجێیی نابینین. شیمانە دەکرێت بەر لە یەکەمین بەریەککەوتنیان لەگەڵ ئاریانەکان لە قۆناخی کلانە سەرەتاییەکاندا دەژیان کە لە پێگما ڕەشەکان دەچوون. یەکەمین لێشاوی ئاریانەکان بۆ ناو هیندستان بۆ سالانی ٢٠٠٠-١٥٠٠پ.ز دەگەڕێتەوە. شۆڕشی نیولیتیک پەیوەندی بەم لێشاوەوە هەیە. هەر وەکو لە سۆمەرییەکاندا بینرا ئەوەی ڕێبەرایەتی شۆڕشی شارستانی سالانی ١٠٠٠پ.ز کرد ڕاهیبەکان بوون. پەرتووکی پیرۆزی ئەم چینەی وەک ڕاهیبە بەناوبانگەکانی براهمان دەناسرێن **"ڤەدا"**[1]یە کە سەرچاوەکەی بۆ سالانی ١٥٠٠پ.ز دەگەڕێتەوە. نوسخەی هیندی پەرتووکی پیرۆزی عیبرانییەکانە، بەڵام زۆر درێژ و تێکەڵە. باس لە ئاواکردنی سەرسامانەی چینی ڕاهیب لەسەر بنەمای ئیلاهیبوون دەکات. کردنی بە بابەتی داستانیش پشتگوێ ناخەن. کاستەکان دەبنە بناخەی ڕژێم. لە سالانی ١٠٠٠پ.ز خاوەن هێزی سیاسی - سەربازی **"ڕاجا"**کان پەیدا دەبن. لەگەڵ براهمانەکان دەکەونە

---

١-پەرتووکی پیرۆزی براهمان (کاهین)ەکانە، بەزمانی سانسکریتی نووسراوە؛ وشەی ڤیدا بەواتای مەعریفە دێت. گاتاکانی ڤیدا بە واتای پەرتووکی مەعریفە دێت.

ناو پێکدادانێکی توند و دژوارەوە. هەر وەکو لە شارستانییەکانی دیکەشدا بینراوە، دەبنە خاوەنە نوێکانی دەوڵەت. دووەمین هێزی کاست پێکدێنن. هاوشێوەی چین کەنارەکانی دەریا و رووبارەکان بۆ کێڵگە لەبارە. لە کاتێکدا زیاتر لە سالانی ١٠٠٠پ.ز شارەکان زیاد دەبن، بە کۆشکە گەورە و پەرستگاکانیان جیاوازی خۆیان پیشاندەدەن. کشتوکاڵ زیاتر پێشکەوتووە، جووتیاران و پیشەکاران سێیەمین چینی کاست پێکدێنن. لە هەرە خواروو چینی پاریال هەیە، کە لە ئاژەڵ خراپتر سەیری دەکرێت. تەنانەت بەرکەوتنیشیان بە گوناهـ دادەنرێت.

تیۆلۆژییەکی هەمەڕەنگ پێکدێنن. بە ئەندازەی خوداوەندە گەورەکان، ئاواکردنی هەبوونی ئیلاهی لە ژمار نەهاتووش جێگای باسە. لە ڕاستیدا کاریگەری قووڵی سۆمەرییەکان دەبینرێت. هۆکاری تێکەڵی و ئاڵۆزکردنی فکری مرۆڤیان بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لە توانای ئاواکردنی سەنتێز بێبەشن و سەرچاوەکەیان بۆ رەگوڕیشەی دەرەکی دەگەڕێتەوە.

هەر وەکو لە تەواوی شارستانییە گرنگەکاندا بینرا (لە چین کۆنفۆشیوس، لە گریک سوقرات، لای ماد ـ پارسەکان زەردەشت) لە سالانی ٥٠٠پ.ز لە هیندستان ریفۆرمخوازی گەورەی ئایین بودا لە دایک دەبێت و لەم قۆناخەدا دەژی. بودا بەوە دەناسرێت کە لە میانەی پشت بەستنەوە بە ئەخلاق و بەبێ گەڕانەوە بۆ خوداوەندەکان ریفۆرمی پێشخستووە. کاتێک ئازارە زۆرەکانی ناو کۆمەڵگا و سروشت دەبینێت بە ئامانجی بەلاوەنانی هەوڵی پێشخستنی باوەڕییەکی میتافیزیکی دەدات، بودیزم بیر و باوەڕییەکە خاوەن کارەکتەری ژینگەپارێزی و پەرچە کردارە بەرامبەر بە شارستانی. لە چین، چینی هیندی و ژاپۆن پەرە دەسەنێت. بیر و باوەڕ، کردەوەی بەهێز، کۆنترۆڵکردنی نەفس و رژێمێکی چاکسازییە کە پێویستە لەرووی میتافیزیکی ئەخلاقەوە تاوتوێ بکرێت. هەروەها ریفۆرمخوازی خوداوەندیش جێگای باسە کە **"کریشنا"**ی پێدەڵێن.

هەر وەکو بڵێی لە باوەڕی دیونیسۆس دەچێت بەرامبەر بە باوەڕی زیۆس (زیاتر پێشکەوتنە پادشاییەکانی سەرەتا سیمبۆلیزە دەکات). ئایینێکە لە میانەی ژیانی شاخ، گەڕیدەیی، ئاهەنگەکانی ژنی ئازاد و چیرۆکە تۆکمەکانی ئەشقەوە بارکراوە و کاریگەرییە بەهێزەکانی کلتووری نیولیتیکی هەڵگرتووە. راستتر بڵێین چەمکێکی ئەخلاقییە کە بەهایەکی بەرز بە داخوازی ژیانی ئازاد دەدات. بەوەی کە لە هەمان کاتدا هەڵگری ئەوپەڕگەری میتافیزیکی خوداوەندەکانی هیند و دژەکەیەتی کە جۆرێک لە مەیلی ماتریالیستییە، تێکەڵەیی کۆمەڵگا، گەورەیی و قوڵایی ژیان پیشان دەدات.

شارستانی هیند دوای داگیرکاری پارس و ئەسکەندەر دەبێتە خاوەن پێکهاتەیەکی ناوەندی. بۆ یەکەمین جار لە ساڵانی ٣٠٠پ.ز ئیمپراتۆر ماشوکا ناوەندیبوونی ئەو راجایانە فەراهەم دەکات کە بەربڵاو و دەستەمۆن. هاوشێوەی پەیوەندی نێوان ریفۆرمی ئایینی زەردەشتی و ئیمپراتۆریەتی ناوەندی ماد ـ پارس، ماشوکاش کە بە شێوەیەکی بەهێز ریفۆرمە ئایینیەکەی بودای پەسەند کردووە، لەم هەوڵەیدا سەرکەوتوو دەبێت. دواتر ناتوانێت وەکو چین درێژە بە سەرکەوتنەکەی بدات. هیندستان لە دوخی بێ دسپلینی راجاکان و رەوشی کائیۆسدا درێژە بە ژیانی خۆی دەدات. لە ساڵانی ١٠٠٠ی زایینی دووچاری داگیرکاری دەوڵەتە ئیسلامییەکان دێت. لە سەرەتای ساڵانی ١٥٠٠ی زایینی لە ژێر بەڕێوەبەرایەتی ئیمپراتۆرییەتە ئیسلامییە بە رەچەڵەک مەغۆلییەکاندا دووبارە بە ناوەند دەبن. پێشکەوتنێکی دیاریکراوی شارستانی بەدیدێت، پەلهاوێشتن بەردەوام دەبێت. ئەو دزەکردنانەی لە ساڵانی ١٥٠٠ی زایینی دەستی پێکرد و بە سەرمایەداری پشت ئەستوور بوو، لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا لە ئاکامی داگیرکاری سەرمایەداری ئینگلیز دەکەوێتە قۆناخێکی نوێوە. دوای دووەمین جەنگی جیهانی دەبێتە دەوڵەتێکی سەربەخۆ. هەرچەندە لە باکووری رۆژهەلات و باکووری رۆژئاوا دوو پارچەی بە ناوی پاکستان و

بەنگلادیش لە دەست دەدات، بەلام لە میانەی کەناری ئەو دەریا و رووبارانەی لە بناری شاخەکانی هیمالایاوە تەواوی نیمچە دوورگە دەگرێتەوە، ئەمڕۆ بەو هەموو ئالۆزییەی لە ئارادایە دەوڵەمەندێتییە کلتوورییەکەی بە سەرمایەداری موتوربە کردووە و بەم جۆرە درێژە بە خۆی دەدات. لە زەمینەیەکی پڕ پێکهاتەی ناکۆک و کائیۆسدا، لە ڕێی ئاشنا بوونیەوە بە پێکهاتە هەمە ڕەنگە هونەری، ئەخلاقی، ئایینی، سیاسی و زمانە جیاوازەکان و دیموکراسی، لە درندەیەکی پارچە پارچەوە گۆڕانی بۆ لیڤی ئەتهانیکی بەهێز، بە لانی کەم هێندەی چین جێگای مەراقە کە چون کاریگەرییەک دەکاتە سەر جیهان.

پێشکەوتنی گۆرەپانی شارستانی ولاتەکانی لە جۆری ژاپۆن، ئەندەنوسیا، ڤیتنام، کۆریا و هاوچەشنەکانیان کە لە کلتووری بنەڕەتی بە ریشە چینییەوە هاتوون کاردکتەریکی هاوشێوەیان هەیە. پێگەکەیان بەدواداچوونی پێشکەوتنی شارستانی بنەڕەتی و بلاوکردنەوەیەتی. سەبارەت بە بابەتەکەمان لێکۆلینەوەیەکی تایبەت و جیاواز لەم بارەیەوە پێویست نییە.

بڵاوبوونەوەی شارستانی لە کیشوەری ئەمریکا دوو قۆناخی هەیە. لە قۆناخی یەکەم پێشبینی دەکرێت گروپی هیندیە سوورەکان لە سالانی ٧٠٠٠پ.ز (سەرباری ئەوەی لێکدانەوەی مێژوویی جۆر بە جۆر لەم بارەیەوە هەیە، بەلام هەرە نزیکیان لە ژێرییەوە بڵاوبوونەوەی دوای چاخی سەهۆڵبەندانە کە هاوکاتی ئەم مێژووەیە) لە گەرووی بیرینگەوە سەرەتا بۆ باکوور دواتریش بۆ ئەمریکای باشوور بڵاوبوونەتەوە. مەزەندە دەکرێت لە سالانی ٣٠٠٠پ.ز ئاشنای شۆڕشی نیۆلیتک بوون، لە سالانی ٥٠٠ی زایینیش بەرەو شارستانی بوون هەنگاویان هاوێشتووە. لە رۆژهەلات (ئەمریکای باشوور) لە مەکسیکەوە تا دەگاتە شیلی یەکەمین شارستانییەکەیان

لە ژێر ناوی ئازتەک[1]، مایا[2] و ئنکا[3] وە ئاوادەکەن. ئەم شارستانیانە کە شارستانی ئوری یەکەمین قۆناخی سۆمەرییەکان بە بیری مرۆڤ دێنێتەوە، بەرلەوەی ببنە شاری گەورە و ژمارەیان زیاد بێت دەکوژێنەوە. شیمانە دەکرێت کە کەش و هەلومەرجە جوگرافییەکان رۆڵیان لەمەدا هەبوو بێت. کاتێک ئەوروپاییەکان چوون ئەگەر بە شێوەیەکی کزیش بێت بەردەوامییان بە هەبوونی خۆیان دا. پاشماوەی پەرستگاو بونیادە تۆکمەکانی شار ئەفسونین. ئەگەر بەردو قوولایی کیشوەر دەرفەتی بەرفراوان بوونیان بدۆزیایەتەوە، دەیان توانی بە قۆناخی پێشکەوتووتر و ژمارەیەکی زۆری ناوەند و ناوەندیبوون بگەن. لەم تاقیکردنەوە و ئەزموونانەی شارستانیشدا قورسایی راهیبەکان دەبینرێت. دەتوانین وەک شارستانی راهیبەکانیش ناوزەدیان بکەین. قوربانیکردنی لاوان مەترسیدارە ـ قوربانیکردنی مرۆڤی گەنج بۆ خوداوەندەکان لە زۆر شارستانیدا هەیە ـ بەلام پێشنەکەوتووە. چەمکی رۆژ ژمێریان پێگەیشتووە. هەندیک جۆری ئاژەل و رووەکیان پێشکەش بە شارستانی گشتی کردووە. لەم قۆناخەدا ئەمریکای باکوور هێشتا ئاشنای شارستانی نەبووە.

تەقینەوەی بنەڕەتی شارستانی لە کیشوەری ئەمریکا لە میانەی ئەو دۆزینەوە، داگیرکاری، دەست بەسەردا گرتن و چەوسانەوەیەوە روویدا کە لە سەدەی شازدەهەمدا دەستی پێکرد. لە سەدەی نوزدەهەمدا لە ئاکامی گەشەکردنی شارستانی سەرمایەداری نوێ کە لە دەرئەنجامی دابەشبوونی سەرمایەداری بە شێوەی دەولەت ـ نەتەوە لە رووخساردا وەکو ولاتی سەربەخۆ لە دایکبوون، لە ئەمریکای باکوور ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

---

١ـ ئەزتەک: ئیمپراتۆریەتی ئەزتەک بە دەولەتی ئەمریکییە رلستەقینەکان دادەنرێت کە ئەمڕۆ بە مەکسیک دەناسرێت. لە سالی ١٤٢٨ـ١٥٢١ حوکمڕانی کردووە، دواتر لە لایەن ئیسپانیەکانەوە داگیرکرا.

٢ـ شارستانی ئیمپراتۆریەتی مایا لە باکوری گواتیمالا، بەشێکی مەکسیک، هندوراس و سلفادور ئاوادکراوە. لە سالی ٧٠٠ پ.ز بە لووتکە گەیشتووە. شارستانی نوێی مایاش لە سەدەی چوارەمەوە تا هاتنی ئیسپانەکان١٤١١ بەردەوام بوو.

٣ـ دواترین شارستانییە کە پیرۆ بەخۆیەوە دیوە، لە ١٢٠٠ تا ١٥٣٤ بەردەوام بووە، لەلایەن ئیسپانیەکانەوە داگیرکراوە.

ئاوا دەکریت ـ لەبەرئەوەی پێشتر هیچ پیشکەوتنێکی شارستانی بە خۆیەوە نەبینیوە، سەرمایەداری لەوێ بە شێوەیەکی ڕیشەیی زۆر خێرا پێشدەکەویت ـ بەم جۆرە تەڤلی سیستەمەکانی شارستانی جیهانی دەبیت و لە گەڵیدا ئاوێتە دەبیت. لە دوای دووەمین جەنگی جیهانی لە ڕێگای ئەمریکاوە وەکو هێزی هەژموونگەرای سیستەم درێژە بە پیهەڵگرتنی خۆیدەدات. هەرچی لێگەڕینەکانی مۆدێلی نوێی شارستانییە (کوبا، فەنزویلا، بولیڤیا و .. هتد) کەلە ئەمریکای باشوور بەرامبەر شارستانی سەرمایەداری بە ریشە ئەمریکی و ئەورووپی لە ئارادایە، لە ڕوژگاری ئەمڕۆماندا بە جۆش و خرۆشەوە بەردەوامە.

لیڤی ئەتهانە زەبەلاحەکەی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان، لە یەکەم قۆناخی ئەورووپادا بەشی بە دەزگاکردنی کلتووری نیولیتیکە. لە ساڵانی ١٠٠ پ.ز کە ئیمپراتۆریەتی ڕۆما لە پەلهاوێشتندا بووە، لە دەردەوەی چەند مولگەیەکی سەربازی ڕوما تەنانەت ناوی شارستانیش لە ئەورووپا ناخوێندرێتەوە. لەم قوناخەدا پیکدادان و کۆچی چەندین تیرەی لە جۆری ئیسکیت، هونەکان، گۆتەکان، کەلتەکان و نۆریکەکان و پەرەسەندنەکانی کشتوکاڵی گوند و بازرگانی کردنی بڕێکی کەمی کانزاکان جێگای باسە. کلتووری یۆنان و ڕۆما لە دەردەوەی ئەم قۆناخە دەگرینە دەست. ئەم دوو شارستانییەی زیاتر نوێنەرایەتی جەمسەری ڕۆژئاوای شارستانی ڕۆژهەڵاتی ناوین دەکەن لەژێر سەرەدێرێکی جیاوازدا هەڵیدەسەنگێنین.

ئەفریقیای دایکیش کە یەکەمین جار لەوێ مرۆڤ کاروانەکەی دەست پێکرد، ئامرازی بەدەستەوە گرت و بۆ بەدەستهێنانی خواردەمەنی لێگەڕینی دەست پێکرد، سەرەتا هێمای بەکارهێناو دواتر بوو بە خاوەنی دەنگ، تا ئێستاش لە ناوچەکانی پێکهاتنی کلتوورە بنەڕەتییەکاندا درێژە بە وابەستەبوونی یەکەمین کلتووری ریشەیی خۆی دەدات. لە سۆدان بەولاوە هیچ بەش و وڵاتێکی ئاشنای شارستانی میسر نەبوود، لە چاخی یەکەمیشدا تەنیا حەبەشە لە

گۆشەیەکەوە شارستانی کرستیانی وەرگرت، لە میانەی شارستانی ئیسلامەوە تەقینەوەی بە خۆیەوە بینی، لە ئاکامی داگیرکارییە بەرفراوانەکەی عەرەبە سامییەکان وەکو کیشوەر بەشی باکووری بوو بە موسڵمان، لە سەدەی نۆزدەهەمدا لە هەموو لایەکەوە لەلایەن شارستانی سەرمایەدارییەوە گەمارۆ درا. ئەفریقیا کە وەکو پێویستییەکی پێکهاتەی ناواخنەکەی بە زەحمەتی شارستانییەکان هەرس دەکات، لە رۆژی ئەمرۆماندا لە ناو کائیۆس و کلتووری هەمەرەنگ و قۆناخەکانی شارستانیدا تەواو لە رەوشێکی تێکەڵ دایە. وەک ئەمریکای باشوور و رۆژهەڵاتی ناوین، بە مەراق و ئەندێشە و هیواوە چاوەڕوانی لەمیش دەکرێت کە ئاخۆ لەگەڵ کام لە شارستانی یان مۆدێرنیتە یان ژیانی ئازاددا ئاوێتە دەبێت.

## ج ـ شارستانی گریک ـ رۆما و گرفتەکانی پەلهاوێشتن

بە یەکەوە لێکۆڵینەوە کردن لە بارەی پەلهاوێشتنی شارستانییە بە ریشە سۆمەری و میسرییەکان نابێت سەیر ببینرێت. هەردووکیشیان بە شارستانی رەگ (بنەڕەت) دادەنرێن. بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا بە شێوەی کار لە یەکتری کردن لە هەمان قۆناخدا پەرەسەندنیان بە خۆیانەوە بینیوە. پەلهاوێشتنیان لە نزیکەوە کاریگەری لە یەکتری دەکات. بنەچەی رۆژهەڵاتی ناوین هۆکارێکی دیکەی ئەم بەیەکەوە بوونەیە. بەناویەکداچوونیان لەسەردەمی پەیدابوونیانەوە تایبەتمەندێتییەکی کارەکتەریانەی ناوچەکەیە. هەر وەکو پێشتر باسمان کرد داهێنەری چەندین زاراوە و پێکهاتەی یەکەمینن. ناتوانرێت نکۆڵی لەم راستییە بکرێت کە پەلهاوێشتنەکانی دواتر ناوەڕۆک و شێوەی ئەم دوو شارستانییەتەیان بە بنەما گرتووە. ئەگەر هەمان شتیش نەبن، بەڵام پەیوەست بوون بە رەگەوە جێگای گفتوگۆ کردن نییە. تا بیر لە سۆمەر و میسر نەکرێتەوە، ناشێت هیچ شارستانییەکی دیکە وەکو پێویست

شیکار بکرێت. هەر وەکو چۆن لە شارستانی سەرمایەداریدا جێگای باسە، لە یەکەمین مۆدێلی شارستانی کۆیلەداریشدا، بە شێوەی سەرەکی سۆمەر، لە ریزی دووەمیش نموونەی میسر، لە میانەی کەمێک گۆڕانکارییەوە دووبارە دەبێتەوە و بڵاودەبێتەوە. مێژووناس و کۆمەڵناسەکان بە هەر هۆیەک بێت بەبێ ئەوەی ئەم لێک نزیک بوونە هەستیارە ببینن، کلێشەی شرۆڤەکانیان دووبارە دەکەنەوە. هۆکاری سووربوونمان لەسەر ئەم ئاماژە پێکردنانە هەڵوەشاندنەوەی چەمکی ئەم کلێشانەیە.

لە باسی پەلهاوێشتنی ئەم یەکەم مۆدێلەدا ئاماژەمان بەو ئاستەمیانە کرد کە ڕووبەڕووی بوتەوە. یەکەمیان، ئاستی کاریگەری نێوان سۆمەر و میسرە. بابەتێکە پێویستی بە ڕۆشنکردنەوە هەیە. دووەمیان، گرفتی ژماردن و نە ژماردنی شارستانی ماد ـ پارسە وەک ریشەیەکی جیاوازی یەکەمین شارستانی کە لە دەرەوەی ناوەندەکانی میزوپۆتامیا پێکهاتووە. هەر وەکو دەزانرێت چەندین پێکهاتی سەرەکییان لە سۆمەرییەکان و بەردەوامەکانیانەوە واتا لە بابل، ئاشوور و ئورارتووییەکان وەرگرتووە. بەڵام لە مێژووشدا سەلمێنراوە کە ریفۆرمی گەورەیان ئەنجامداوە. شۆڕشی ئەخلاقی زەردەشت (نزیک بە ئەخلاقی ئازادییە)، سیستەمی ناوەند ـ ئەیالەت و سیستەمی سوپا لەو بوارە نوێیانەن کە دایان هێناوە. هەر بۆیە ناچار بووین وەک ئەڵقەیەکی پەڕینەوەی جیاواز و گرنگی نێوان شارستانی گریک ـ ڕۆما و شارستانی سۆمەر ـ میسر شرۆڤەی بکەین. ئەم قۆناخە گرنگ و جیاوازانەی شارستانی لەمیانەی چەمکێکی ڕاستی مێژووەوە لە شیکردنەوەی مەسەلەی قۆناخەکانی شارستانیدا ڕۆڵی کلیل دەبینن. لە ڕەوشێکی پێچەوانەدا بە شێوەیەکی ڕاست شارستانی گریک ـ ڕۆما شیکار ناکرێت. یاخود ئەوەتا تایبەتمەندی پەڕجووانەی پێدەبەخشین، بە شرۆڤەیەکی وەها نازانستیانە زیاتر دەیخەینە ناو ئاڵۆزییەوە.

گرفتی سێیەم پرسی ڕەگی شارستانییەکانی چین و هیندستانە.

جەختمان لە سەر ئەوە کردەود کە پێویستە لایەنی تایبەت بوونیش وەکو شیمانەیەک ببینرێت. ئەم هەڵوێستەش دەرفەتی ئەوەمان پێدەدات کە جیاوازی و لە یەکچوونی نێوان شارستانییەکان بە شێوەیەکی راستتر شرۆڤە بکەین.

ئەگەر شارستانییەکانی ئەمریکای باشوور، هەراپا و موهانجەدرۆ تایبەتیش بن، بەڵام بەر لەوەی قۆناخی یەکەمین شاری دامەزرێنەر (شێوازی ئوروک) تێپەڕ بکەن کوژاونەتەوە، پەسەندکردنی ئەمە شرۆڤەیەکی واقیعیترە. دەبێت بڵێین کە لە ئەفریقیا، ئەوروپا (جگە لە گریک ـ رۆما) و تەنانەت ئوسترالیاش لە میانەی پەلهاوێشتنەکانی دواتری ئێرەوە شارستانییان تیدا پێشکەوت، بە ئەمریکاشەوە زیاتر لەسەر بنەمای سەرمایەداری بوون بە شارستانی، پێش لە شارستانییەتی ئیسلام و لە رۆژگاری ئەمڕۆشماندا لە شارستانی بوونی ئەم ناوچانە رۆڵ دەبینێت. لە ڕێگای ئەم پێشەکییە کورتەوە دەتوانین بە شێوەیەکی راستتر پێناسە و پەلهاوێشتنی شارستانی گریک ـ رۆما شرۆڤە بکەین. راستییەکی حاشا هەڵنەگرە کە شارستانی گریک ـ رۆما بە بەراورد لەگەڵ ماد ـ پارس لەرووی تایبەتبوونەوە نموونەیەکی لە پێشتریان ئاوا کردووە. بەڵام ئەگەر پەلهاوێشتنی بەرفراوان و تایبەتمەندییەکانی شارستانییەکانی میسر، سۆمەر و ئەوانەی دواتر (بابل، ئاشوور، میتانی، هیتیت، ئورارتوو، ماد ـ پارس) رەچاو نەکرێت، بانگەشەی ئەوە بکرێت گوایە ئەم تایبەتبوونە لە هەلومەرجەکانی نیمچە دوورگەدا تەقیوەتەوە دەبێتە شێواندن و کوێرییەکی مێژوویی. تەواوی داهێنانەکانی لە بەردەستدایە، کاتەگۆرییەکانی زهن، پێشکەوتنە ئایینی، ئەخلاقی، فەلسەفی، هونەری، سیاسی، ئابووری و زانستییەکان لە قۆناخی لەدایکبوون، پەرەسەندن، ململانێ و پێکدادانی شارستانییە ئاماژە پێکراوەکانەوە بەدیهاتوون. تارادەیەکی مەزن ئەم داهێنانانە وەک میراسێکی قۆناخی بە دەزگابوونی کۆمەڵگای نیولیتیک بۆیان ماوەتەوە. هەوڵی باسکردنیمان دا. بە تایبەتیش بەبێ پشتگوێ

خستنی هەوڵەکانی توێژی بەڕێوەبەرایەتی بۆ دۆزینەوەی دەمامک و ڕەوایی پێدانی دەست بەسەردا گرتن و تاڵان.

زانست و ڕۆشنگەری ئەوروپا بۆ ماوەیەکی درێژ لەم ڕاستییە بێ ئاگا دیار بوو. ڕێنسانسی کلتووری یۆنان و ڕۆمای بە ڕیشە دەگرت و سووربوو لەسەر ئەوەی زۆرینەی داهێنانەکان هی ئەوە. بەم جۆرە بوو بە بەرپرسی پێناسە چەوتەکەی دەرهەق بە شارستانی گریک - ڕوما.

تەنانەت ئەگەر تەنیا مێژووی هیرۆدۆت بخوێنینەوە، تا ڕادەیەکی مەزن دۆزینەوەی سەرچاوەی کلتووری یۆنانیش زەحمەت نابێت. تەواوی بەڵگە و پێدراوە مێژووییەکان دەیسەلمێنن کە لە ساڵانی ٥٠٠٠پ.ز کلتوور و زمانی هیندۆ - ئەوروپی (ئاریان) بۆ نیمچە دوورگەی یۆنان تەشەنەی کردووە و شۆڕشی نیولیتیکی بە خۆیەوە بینیوە. پشتگوێ نەخستنی سەرچاوەی ئەم قۆناخە بۆ خوێندنەوەیەکی ڕاستی مێژووی پێشکەوتنەکان بایەخدارە. دەشێت بگووترێت لە ساڵانی ١٨٠٠پ.ز بەولاوە شەپۆلە نوێکانی کۆچبەری داهێنانەکانی شارستانییان گواستۆتەوە. لە ساڵانی ١٤٠٠پ.ز تێپەڕی قۆناخی ئاواکردنی یەکەمین شاری هاوشێوەی ئوروک دەبن. ئەم پرۆسەیە کۆمەک و مۆدێل لە سێ لاوە وەردەگرێت. بە شێوەیەکی زیاتر کاریگەری هیتیتەکانیان لەسەرە. هیتیتەکان لە بەڵگەکانیاندا ئەم ناوچانە لەژێر ناوی ئاهییەوا باسدەکەن. لە ساڵانی ٣٠٠٠پ.ز بەولاوە لە ڕێگای تروادەوە بازرگانی دوولایەنە لەگەڵ ئەم ناوچەیە دەست پێدەکات. لەم قۆناخەدا (ساڵانی ٣٠٠٠-١٢٠٠پ.ز) ترواده شارێکی ژیانییە بۆ ئەم نیمچە دوورگەیە. هەر بۆیە لە سەرووی ئامانجەکانەوە دێت. هیتیتەکان هەم لە بواری ئایدیۆلۆژی (خوداوەندەکان، ئەدەب، زانست) هەم ماتریال (بابەتەکانی بازرگانی بەتایبەتیش شتە کانزاییەکان، گڵکاری، بەرهەمەکانی ڕستن) بەرهەمێکی زۆری بازرگانی پێشکەش دەکەن. ڕۆڵێکی گرنگ لە گواستنەوەی شارستانیدا دەبینن. فینقییەکان بە

تایبەتی فێری هونەری دەریاوانی و ئەلف و بێی فینیقییان دەکەن. شاری بازرگانی لە جۆری مۆدێلی رۆژهەلاتی ناوین ئاوادەکەن. مسۆگەرە کە رۆلی پێشەنگایەتییان بینیوە. میسرییەکان هەم بە شێوەیەکی راستەوخۆ، هەم لەسەر بنەمای کولۆنیەکانی، لە ریگای شارستانی گریت ـ تاکە شارستانی تایبەتە کە میسرییەکان کاریگەریان لێکردووە ـ کاریگەرییەکی چڕی بەسەریانەوە هەیە، هەموو جۆرە داهێنانێکی شارستانی رۆژهەلاتی ناوین لە هەر چوار کەناڵەوە رۆلی بەخێوکەر دەبینن (لە سالی ٢٠٠٠پ.ز تا ٦٠٠ی زایین) هەرە دوایی سۆلۆن، پیساگۆر و تالیس لە سالانی ٧٠٠-٦٠٠پ.ز لەکۆشک و سیستەمی قوتابخانەکانی میسر، بابل و ماد ـ پارس دەگەڕێن، وانە و سیستەمی ریساکانیان فێردەبن و بۆ نیمچە دوورگەی دەگوازنەوە.

دوای کەوتنی ترَوادە (١٢٠٠پ.ز) کەنارەکانی رۆژئاوای ئیجە دووچاری دەست بەسەردا گرتنی تیرەکانی ئیۆن، ئایۆل و دۆر دەبێت کە لە نیمچە دوورگەوە هاتوون. دەشێت ئەم کۆچانە بۆ سالانی ١٠٠٠پ.ز بگەڕێنینەوە. ئەم تیرانە کە میسرییەکان بە قەومی دەریا ناویان بردوون، یەکەمین هێرشەکانیان پەیوەندی بە کەوتنی ترَوادەوە هەیە و تا رۆژهەلاتی دەریایی سپی و میسر درێژ دەبێتەوە. ئەو گروپانەی لە ئەنادۆلی رۆژئاوا و دوورگەکانی ئیجە دەسووڕێنەوە، لای شارستانی هیتیت و ترَوادە "بەربەر"ییەکانیان پێدەگوترێت. گۆڕەپانی شارستانییان بریتییە لە ولاتی هیتیت و پادشایەتییە بچووکەکەی ترَوادە. بەربەرەکان تەنیا دوای ئەوەی بۆ ماوەیەکی درێژ لەناو کلتووری شارستانی جێگیر دەمێننەوە دەبن بە شارستانی. هەر واش دەبێت و دوای ماوەیەکی درێژ لە سالانی ٧٠٠پ.ز لە نیمچە دوورگە، دوورگەی ئیجە و کەنارەکانی شارستانیبوون دەست پێدەکات. هۆمیرۆس قارەمانیتی شەڕەکانی پاشماوەی ئەم قوناخە درێژەی نیشتەجێبوون، بە تایبەتیش ئەوانەی لە دەورووبەری ترَوادە روویانداوە دەکات بە داستان.

هەرچی ئۆدیسایە چیرۆکی نیشتەجێبوونە لە دوورگە. ئەمە راستییەکە شارستانی (مەدەنی) بوونی کەنارەکانی ئیجە تا رادەیەک ردسەنیتی لەخۆوە دەگرێت. ئەو میراسە دەوڵەمەند و هەمەڕەنگییە کلتوورییەی وەریان گرتووە و لەباری زەوی ناوچەکە بگرە تا دەگاتە جۆرە نائاساییەکانی رووەک و ئاژەڵ هێز و دەرفەت دەدات بە رەنگدانەوەی ئەم سەنتێزە بێ هاوتایە لە ناسنامەی شارە نوێکاندا. لە گۆڕین و بە وەرچەرخانی فاکتەری ماددی و ئایدیۆلۆژی کلتووری رۆژهەلاتی ناوین، پێدانی ناوەرۆکێکی تا رادەیەک نوێ و گۆڕینی شێوەکەی خولقکارییەکی مەزنیان لە دروستکردنی سەنتێزدا پیشانداوە. دەتوانرێت بگووترێت بە ئەندازەی داهێنانەکانی قۆناخی ٦٠٠٠ـ٤٠٠٠پ.ز نیولیتیک و دۆزینەوەکانی قۆناخی سۆمەر، میسر، هیتیت، ئۆرارتوو و ماد ـ پارس کۆمەکی مێژوویی خوشیان پێشکەش دەکەن. دووەمین یاخود سێیەمین هەلمەتی کلتووری مەزن ئەنجامدەدەن.

وەکو یەکێک لە هەڵمەتە گەورەکانی رۆشنکردنەوە لە مێژوودا، لێرەدا پرسیاری گرنگ ئەوەیە ناوەند لە کوێیە. کاتێک ئەوە رەچاو بکرێت کە یەکەمین ئاواکردنی شار ( سالانی ١٤٠٠پ.ز ) هەمیشەیی (دائیمی) نەبووە و لە قۆناخی دواتردا لە تاریکیدا ماودتەوە، تەنیا فینیقییەکان هەندێک کۆلۆنی بازرگانییان هەبووە، ئەو کاتە دەبینرێت کە نیمچە دوورگەی یۆنان تا سالانی ٧٠٠پ.ز هیچ شارستانییەکی لەخۆوە نەگرتووە. پێکدادانی تیرەکان لە ئارادایە. ئەوانەی ناویان هاوشێوەی **"ئاکا"**کانە بە تایبەتی لە رێگای ئیجەوە بەردەوام هێرش دەکەنە سەر ناوچەکانی شارستانی ئەنادۆڵ. مسۆگەرە کە لە قۆناخی بەربەریتیدان. سەرکردەکانیان لە پادشا زیاتر لە شێوەی گەورەی تیرەدان. هەرچەندە لە سالانی ٦٠٠پ.ز هەڵکشانی ئەسینا ببینرێت، بەڵام دوورە لەوەی ببێتە ناوەندی شارستانی. گشت شیمانەکان پیشانیدەدەن کە ئەو شارانەی تیرەکان لە کەناری ئیجە ئاوایانکرد رۆڵێکی ناوەندییان بینیوە. هۆمیرۆس، حەوت داناکان، لە سەرووی

هەمووشیانەوە تالیس، هیرکلیتس، پارمنیدیس، دیموکریتۆس، فیتاگۆرس و تەواوی ناوە دیارەکانی هەڵمەتی رۆشنگەری خەڵکی شارەکانی کەناری رۆژئاوای ئیجەن. شارە یەک بە دوای یەکەکان (بەشێوەی زنجیر) لێرە ئاوا دەکرێن.

خاڵێکی گرنگ، سەرچاوەی چیرۆکی لە دایکبوونی زۆربەی خوداوەندە بەناوبانگەکانیان لە سەرووی هەمووشیانەوە ئاپۆلۆن، بۆ ئەم ناوچەیە و دەوروبەرە نزیکەکانی دەگەڕێتەوە. بە بەراورد لەگەڵ نیمچە دوورگە، شارستانی ماددی لەم ناوچەیە زۆر پێشکەوتووە. دیسان بەناوبانگترین پەرستگا و مەڵبەنددکانی کەهانەت دەکەوێتە رۆژئاوای ئیجە. ئەو بەڵگانەی دەتوانرێت زیاتری دەستنیشان بکرێت، پیشانیدەدات کە دوای هیتیت، فریگیا و لیدیاییەکان یاخود لە پشتێنەی هەمان قۆناخدا شارەکانی ئیۆن ناوەندە نوێکانی شارستانی ئیجە بوون. ئەوانە(واتا شاردکان)ی نیمچە دوورگە وەکو بەردەوامی ئەوانەی ئیجەن. خاڵی هەستیار ئەوەیە: دوای ئەوەی ئیمپراتوریەتی ماد ـ پارس لە سالانی ٥٤٥ پ.ز ئەم ناوچەیان داگیرکرد، ناوەندی شارستانی بۆ ئەسینا گوازرایەوە. لەم سونگەیەوە دەشێت سالانی ٥٠٠ـ٤٠٠پ.ز وەکو چاخی شکۆداری ئەسینا شرۆڤە بکرێت. هەر وەکو دەزانرێت تەواوی ئاسەوارە ماددی و ئایدیۆلۆژییەکانی شارستانی شارەکانی کەناری ئیجە بۆ ئەسینا دەگوازرێتەوە. بەشێکی هەرە زۆری رۆشنبیران پەنا دەبەنە بەر یۆنان، باشووری ئیتالیا و هەندێک دوورگە. لەژێر دەسەڵاتی پارسەکاندا ناوچەکە هێدی هێدی گرنگی جارانی لە دەستدەدات.

بێگومان شارستانی پارسیش شارستانی هەرە شکۆداری ئەو قۆناخەیە. تەنیا لە ناوچەی گریک وەرناگرێت، کۆمەکێکی زۆریشی پێشکەش دەکات. بەڵام لەگەڵ لە دەستدانی سەربەخۆییەکەی ناوچە (کەناری ئیجە) لەوانەیە بۆ یەکەمین و دواجار شانسی ئاواکردنی شارستانییەکی مەزن لە دەستدەدات. ئەگەر بەم جۆرە

نەبوایە، بە دڵنیاییەوە دەتوانم بڵێم، لە کەنارەوە بۆ تەواوی ئەنادۆڵ بڵاودەبوونەوە و دەیانتوانی شارستانییەک ئاوا بکەن کە لە گەورەییدا تەواوی شارستانییەکانی سۆمەر، میسر، هیند، چین، هیتیت و پارس تێپەڕ بکات. لەوانەیە نیمچە دوورگەکانی گریک و ئیتالیا وەکو دوو ئەیالەت (هەرێم)ی گرێدراو بمانایەتووە. شانسی ئاوا کردنی ئیمپراتۆریەتێک لە دەستدەدەن کە هەم لەلایەنی ناوەڕۆک هەم بەرفراوانی چەندین قات (جار) لەوەی بێزەنتییەکان لەپێشترە. مانەوەی پارسەکان لە ئیجە، هەم کۆتایی بە خۆیان هێنا، هەم بووە بەربەست لەبەردەم پێشەنگایەتی کردنی خەڵکی ئیجە بۆ سیستەمیکی گەورەی شارستانی، کە مافی خۆیان بوو. بە هۆیەوە چەندە تورە و خەمگین بێت لە جێگای خۆیدایە. پێشتر مەکەدۆنییەکان ئەم شانسەیان لە کەسایەتی ئەسکەندەردا بەکارهێنا. ئەوەی هاتە ئاراوە کلتووری سەنتێزی رۆژهەڵات ـ رۆژئاوا بوو کە پارچە پارچەیە، ناوەندی نییە، تەنانەت چەند ناوەندیکە. هەرچەندە جیهانی کلتووری **"هێلین"**ی پێ بڵێن لە سەنتێزیکی پارچە پارچە بەولاوە تێپەڕی نەکردووە. لە خولقارییەکی رەسەن و راستەقینە دوورە. ئیمپراتۆرییەتی رۆما کە دواتر ئاواکرا، جگە لە بوونی ئیجە بە ئەیالەتێک کە ناوەندەکەی بەرگمایە شانسێکی دیکەی پێنەدا. ئەوەی پارسەکان لە رۆژهەڵاتدا بەسەریان هێنان، رۆماییەکان لە رۆژئاوا دووبارەیان کردەوە.

ئەو شارستانییەی ناوەندەکەی ئەسینایە سەبارەت بە گەورەبوونی شارەکان و زیادبوونی ژمارەکەیان شرۆڤە کردنی بە شارستانییەکی راستەقینە وەک زاراوە راستە. لە گۆڕەپانی شارستانی ماددی و ئایدیۆلۆژیدا مۆرکی خۆی لە چاخێک دەدات. کاتێک ئەسینا هەڵدەسەنگێنین دەبێت وەکو پێکهاتەیەکی نوێی تواندنەوەی تەواوی ئەم شارستانیانە لە بۆتەیەکدا بیخوێنینەوە. بە ئەندازەی مێژووی شارستانی، تەواوی دەسکەوتەکانی مێژووی کلتووری نیولیتیک و دۆزینەوە ماددی و ئایدیۆلۆژییەکانی

سەرلەنوێ لەگەڵ فاکتەرە خۆجێییەکان و زەمەنی نوێدا یەک دەخات و شۆڕشە گەورەکەی شارستانی ئەنجامدەدات.

یەکەمین تایبەتمەندی گەورەی ئەوەیە کە لە بواری ئایدیۆلۆژی، فەلسەفە، شێوەی هزر و باوەڕییەوە لە ئایینە بتپەرستەکان زیاتر پەسەند دەکرێت. فەلسەفە ڕێگا لە پێش تەقینەوەی واتا دەکاتەوە. تۆوی تەواوی مەیلە فەلسەفییەکان لەم قۆناخەدا کراوە: ئایدیالیزم، ماتریالیزم، میتافیزیک و تەواوی شێوەکانی هزر شانسی پەیدابوون و گفتوگۆ کردنی هەبووە. لە کاتێکدا بەر لە سوقرات **"فەلسەفەی سروشت"** لە پێش بوو، لەگەڵ دەرکەوتنی سوقرات و قۆناخی دواتر **"فەلسەفەی کۆمەڵگا"** دەرکەوتوتە پێش. گەورە بوونی **"کێشەی کۆمەڵگا"** (فشار و چەوسانەوە) ڕۆڵ لەم گۆڕانکاریەدا دەبینێت. با جارێکی دیکە ئاماژە بەم خاڵە بکەین: **"کێشەی کۆمەڵگا"** واتا ئاواکردنی زنجیرەی شار ـ بازرگانی ـ دەوڵەت ـ بەڕێوەبەر. هەروەها شار وەکو شارستانییەکی ماددی هەبوونی هزری فەلسەفی دەکاتە ناچارییەک. خودی شار بە واتای دابڕان لە کۆمەڵگای ئۆرگانی (سروشتی) دێت. هەر بۆیە زهنییەتێکی دابڕاو لە سروشت، زۆر بە ئاسانی لە زەمینەی شاردا شێوە دەگرێت. منداڵدانی سەرەکی هەموو جۆرە هزرێکی مەعنەوی، میتافیزیکی قەبە و ماتریالیستی، شارستانی شارە کە لەسەر بنەمای خیانەتکردن لە ژینگە ئاواکراوە.

کەواتە لە کاتێکدا فەلسەفە لە لایەکەوە هەڵمەتێکی هزرییە ، لەلایەکی ترەوە شێوەیەکی دیکەی هزری نامۆ بوونە لە ژینگە. سۆفیستەکان زانیاری فەلسەفییان بڵاو دەکردەوە جۆرێک لە ڕۆشنبیرانی قۆناخی خۆیانن (وەکو ڕۆشنبیرانی سەدەی هەژدەهەمینی ئەوروپا). بە پارە وانە بە منداڵی ئەو بنەماڵانە دەڵێنەوە کە ڕەوشی ماددیان لەبارە. هەر وەکو چۆن ڕاهیبەکان داهێنانەکانی ئایین و مرۆڤی پەرستگایان بونیاد ناوە، فەیلەسوفەکانیش قوتابخانەی خۆیان ئاواکردووە. بە جۆرێک لە جۆرەکان کڵێسا (ئەنجوومەن)

کانی خۆیان ئاوا دەکەن. هەر وەکو ئایینە فرە خوداییەکان چەندین قوتابخانەی فەلسەفی پێکدێت. دەشێت هەر قوتابخانەیەک وەکو ئایین یان مەزهەبێک شرۆڤە بکرێت. لەبەرئەوەی ئایینەکانیش شێوەیەکی هزرن، دەشێت بە فەلسەفەیەک لە قەڵەم بدرێت کە بە دەزگا بووە و شێوەی باوەڕی وەرگرتووە. دەبێت جیاوازی نێوانیان تەواو وەکو دژ دەرکی پێنەکرێت. لە کاتێکدا ئایین زیاتر خۆراکی ئایدیۆلۆژی خەڵکە بەڕێوەبراوەکەیە، فەلسەفە خۆراکی رۆشنبیران و لاوانی چینی پێگەیشتووە. ئەفلاتۆن و ئەرستو بە چاویلکەی فەلسەفیانە خوازیارن ئەرکی ئاواکردنی شار و پاراستنی و رزگار کردنی سەربخەن کە پێشتر راهیبەکان دەیان کرد. بابەتی سەرەکی کە فەیلەسوفەکانیش پێیەوە خەریکن، دەرهەق بە چۆنییەتی باشتر بەڕێوەبردنی دەوڵەتشار و کۆمەڵگایە، بە تایبەتیش لەو بارەیەوە کە باشترینیان لەسەر کام بنەما ئاوا دەکرێت.

دووەمین تایبەتمەندی گرنگی شارستانی ئەسینا ئەوەیە کە بۆ یەکەمین جار لە بواری تیۆری و پراکتیکییەوە بە بایەخەوە راوەستە سەبارەت بە دیموکراسی (کۆمار)دەکات. لە مێژووی گشتی شارستانیدا قۆناخێکی گرنگە، بەڵام ئەمە دیموکراسییەکە تەنیا بۆ ئەرستۆکراسەکانە. کاتێک ئەو راستییە بێنینە بەرچاو کە هاووڵاتیتی شار زۆر بە سنورداری پێناسە کراوە، لەوانەیە ١٠/١ی کۆمەڵگاش نەگرێتەوە. بەڵام دیسان هەنگاوێکی نوێی زۆر گرنگە. رۆڵێکی مەزن لە پێکهاتنی هونەری سیاسەت و فەلسەفەدا دەبینێت. دیموکراسی وەکو زاراوە بە واتای خەریکبوونی گەل بە سیاسەتەوە، واتا خەریکبوونی بە کاری بەڕێوەبردنی خۆیەوە دێت. لە تەواوی گرفتە کۆمەڵایەتییەکانی ژیاندا بیرکردنەوە، گفتوگۆ کردن و بڕیاردان بنەمای سیاسەتی دیموکراتییانەیە. هەر بۆیە تایبەتمەندی سیاسەتی دیموکراتییانە کە لە شارستانی ئەسینادا بە واتای کۆمەڵگای کراوەش دێت، کۆمەکێکی گرنگ و بەهادارە.

پەنتائۆن (ئەنجوومەن)ی خوداوەندەکان لە میانەی بیناسازییەکی

نوێوە خۆی پیشان دەدات. شێوەی نیو خشتەكیانە كە بە ستوونە ئەستوورەكان هەڵچنراوە و لە دەرەوەش بە شورایەک دەورە دراوە، سەرسوڕهێنەرە. پەرستگاكانی ئاپۆلۆن، ئارتەمیس و ئەسینا لە تەواوی شارە ناودارەكاندا هەر وەكو بڵێی لەگەڵ یەكدی لەناو كێبڕكێدان. لە كۆمەڵگای ئەسینا زیاتر دەرک بەو راستییە دەكرێت كە خوداوەندەكان وێنا كراون. چەندەی دەچێت باوەڕی ئایینی باو بەهای خۆی لە دەستدەدات. وەک بڵێی خوداوەندە دامەزرێنەرەكانی شارەكانی سۆمەر لە شارستانی رۆما و ئەسینادا لە دوا سەردەمی تەمەنیاندان. ئەسینا كە بە شاری دامەزرێنەر لە قەڵەمی دەدەن، بە گوێرەی ناوی خوداوەندە ژن ئەسینا ناونراوە كە خوداوەندی دامەزرێنەرە و پارێزەری شارەكەیە. ئەمەش ئینانای خوداوەندە ژنی ئوروک دێنێتەوە بیری مرۆڤ. تەنانەت ئەم نموونەیەش پیشانی دەدات كە لێكچوون و بەدواداچوونی یەكتری نێوان شارستانییەكان نەریتێكی چەندە زەق و بەرچاوە. بەشەكانی دیكەی شار چەندین تایبەتمەندی بە دەزگابوونی لە جۆری ئاگۆرا (شوێنی بازاڕ)، كڵێسا (شوێنی ئەنجوومەن)، شانۆ، ستۆوا (شەقامە بە سێبەرەكان)، ژیمۆناسیۆم (ستادیۆم) و ..هتد بە دەست هێناوە، كە دەشێت بێ شوراش بێت، چەندین كۆشكیشی تێدایە و بە بونیادی تۆكمەتر گەیشتووە. شارەكانی بە هی هیتیتەكان دەچێت، بەڵام پێكهاتەی ئەوانی تێپەڕ كردووە. ژمارەی دانیشتوانیان زیاترە و گەورەتر بووە.

ئەدەبی نووسراو پەرەی سەندووە. لەوانەیە رووبەڕووی گەورەترین كلتووری ئەدەبی بین كە لە بەڵگە مێژووییە نوسراوەكاندا باس كراوە. شانۆ شۆڕشگێڕانەترین قۆناخی بە خۆیەوە دیوە. داستان و تراژیدییەكان بە چڕی باسدەكرێن. شاكارە مێژووییەكان دەنووسرێن. داستانی هۆمیرۆس وەک پەرتووكەكانی وانە دەخوێندرێت. رووداوە سەرنج راكێشەكان دەكرێن بە شانۆگەری. هەر وەكو بڵێی پەیامی هاتنی سینەما دەدات. هونەری دەریاوانی و

بازرگانی پەرەی سەندووە. لە دوای فینیقییەکان پێشکەوتووترین شارستانی بواری کەشتیوانییە. هەرچەندە بازرگانی پیشەیەکی بەرچاو و جێگای رەواج نەبێت، ئەگەر لە ئاستێکی مارژینالیشدا بێت یەکەمین تووەکانی سەرمایەداری لە کۆمەڵگای ئەسینا جێی خۆی کردۆتەوە. کەمێکی دیکە هەوڵ بدرێت، هەر وەکو بڵێی تێپەڕی سیستەمی سەرمایەداری دەبێت. بیناسازی پێشکەوتووە، بونیادی شار بۆ خۆی بەڵگەیەکی سەلمێنەرە. پەیکەرسازی بە شێوەیەکی نزیک بە نموونەیی گەیشتووە. کاتێک دیمەنەکانی پەیکەرسازی میتۆلۆژیا دەنوێنن چەندەی بڵێی سەرنج راکێشە. دەبێت ئەوەش بڵێین ئەدەبێکی میتۆلۆژی بەهێزیان هەیە، کە لە سەنتێزی میتۆلۆژیای تەواوی شارستانییە کۆنەکان پێکدێت. میتۆلۆژیا کە لە چاخی یەکەمدا بەربڵاوە، هونەرێکی باسکردنە کە لە رێگای چیرۆکی نموونەییەوە ئەو رووداوانە دەگێڕێتەوە کە کۆمەڵگاکان لێیان تێناگەن.

مۆسیقا هەم لە رووی ژمارەی ئانسترومانەکانیەوە هەم لە رووی جۆرەوە (ئیلاهیەکان، نائیلاهیەکان، ئەشق، داستان) پێشکەوتووە. لیر ئامێرێکی سەرنجڕاکێشە. پەخشانە شیعرییەکان بە ئەندازەی قۆناخی قارەمانێتی (لەسەروبەندی دروستبوونی کۆمەڵگای شارستانی کە قۆناخێکی بەربەری بەرز بوو)ش نەبێت درێژە بە هەبوونی خۆیان دەدەن.

دوای ئەسینا سپارتا دێت. تایبەتمەندی سپارتا ئەوەیە کە بە شێوەیەکی ووشک درێژە بە نەریتی کۆنی پادشایەتی دەدات. بەردەوام ململانێ و شەڕ لە نێوانیان لەئارادا بووە. مۆدێلەکانی ئەسینا و سپارتا لە تەواوی نیمچە دوورگەکەدا شوێن پەنجەی خۆیان بەجێهێشتووە. بڵاوبوونەوە و زیادبوونی شارەکان بە خێرایی بەدیهاتووە. بەر لە هەمووشیان دوورگە و کەنارەکانی ئەوبەری دەریا پڕبوون لە مۆدێلی هەمان شار. لە کەنارەکانی دەریای رەش و مەڕمەڕەش دەبینرێت کە شار ئاواکراون. زیادبوونی ژمارەی

دانیشتوان و بازرگانی سەردەمێکی پێشکەوتووی کۆلۆنیکردنی دەست پێکردووە. تەنانەت لە تەواوی کەنارەکانی دەریای سپی و دوورگەکانیدا شارە کۆلۆنیەکان ئاواکراون. تەنانەت لە میسریش دەشێت لقێک، شار یاخود گەڕەکێکی گریکەکان هەبێت. لە باشووری فەرەنسا تا مارسیلیا و کەنارەکانی دەریای سپی ئیسپانیا جۆرێک لە خانەکان (مۆڵگەکان)ی بازرگانی ئاوا دەکرێن، دواتر دەبن بە شار. باشووری ئیتالیاش تاڕادەیەکی مەزن کراوە بە کۆلۆنی. هەر وەکو بڵێی رۆڵی فینیقییەکانیان زەوت کردووە. سەرباری تەواوی ئەم پێشکەوتنە گەورانە و ئاواکردنی یەکینەکانی شار لە نیمچە دوورگەکەدا، بەڵام نەیانتوانیوە بە هێزی ئیمپراتۆریەتێکی لە جۆری پارس یان رۆما بگەن. وەکو پێویستییەکی رۆحی ئەو قۆناخە ئەوەی نەبێت بە ئیمپراتۆریەت، دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆرییەکانی دیکە. شارستانی نیمچە دوورگە کە ئەسینا پێشەنگایەتی دەکرد، لە ساڵانی ٣٤٠پ.ز رووبەڕووی هەڕەشەی مەکەدۆنییەکان بۆتەوە کە لە باکوور وەکو پادشایەتییەکی نوێ هەڵدەکشان. شارستانی گریک کە هێزە ماددی و ئایدیۆلۆژییە سەرسوڕهێنەکەی خۆی نەکرد بە خاوەنی سیستەمێکی سیاسی (ناوەندی)کە شارەکان تێپەڕ بکات، دوای چەند شەڕێکی بەرخودان لە ساڵانی ٣٣٠پ.ز بەولاوە ئیتر سەربەخۆیی خۆی لە دەست دا. بەڵام هەر وەکو بابل، وەکو ناوەندی نوێی کلتووری درێژە بە هەبوونی خۆی دەدات.

دوا گورز لەلایەن یەکینەی مەکەدۆنییەکانەوە لە دیموکراسی ئەسینا درا - لە شەڕی سی ساڵەی بەردەوامی لەگەڵ سپارتا لێدانی قورسی بەرکەوت بوو - **"فلیپ"**ی پادشای مەکەدۆنییەکان و ئەسکەندەری کوڕی کە خوازیار بوون سەرۆکەکانی ئەو تیرانەی لە کلتووری یۆنانی بوون، زمانی جیاوازیان بەکار دەهێنا و نوێنەرایەتی رەچەڵەکی دیکەیان دەکرد، لە ناو یەکێتیەکی توندا بهێڵنەوە، لە ساڵانی ٣٥٩پ.ز وایان کرد لەسەرتاسەری نیمچە دوورگەکە دان بە دەسەڵاتیاندا بنرێت. ئەسکەندەری کوڕ کە

ژیانێکی سەیری هەبوو، بۆ ماوەیەکی درێژ قوتابی ئەرستۆ بووە. ئەرستۆش لە شارێکی نزیک بە ناوچەی مەکەدۆنیا لە دایک ببوو. دیارە کە پەیوەندییەکی بەهێزتر لە پەیوەندی مامۆستا ـ قوتابی لە نێوانیاندا هەبووە. دوای مردنی ئەسکەندەر، راکردنی ئەرستۆ لە ئەسینا نیشانەی ئەم پەیوەندییەیە. ئەرستۆ ئەسکەندەری لە شارێکی کەنارەکانی ئیجە پەروەردە کردبوو. لە دوای قۆناخی دەسەلاتی پارسەکان بە تەواوی بەهاکانی کلتووری یۆنان و خوداوەندە میتۆلۆژییەکان مێشکی ئەسکەندەری پڕ کردبوو. هیچ سیاسەتمەدارێکی یۆنان نەبوو نەزانێت کە دەوڵەمەندێتی ئیمپراتۆرییەتی پارس چەندە ئیشتیهای مرۆڤ دەکاتەوە. ساتێک زووتر سەرکەوتن بەسەر پارسەکاندا ببوو بە خولیایەک. هەستێکی هاوشێوەی داخوازی موسڵمانەکانە بۆ تێکشکاندنی بیزەنتییەکان. ئەم هەستە لای تەواوی ئەو سەربازانە هەبوو کە بەشدارییان لە هێرشەکەدا دەکرد. سوپای ئەسکەندەر سوپای کۆیلە باوەکان نەبوو.

دەبێت باش دەرک بەمە بکرێت: ئەسکەندەر چاوی خۆی بڕیبووە دەوڵەمەندێتی رۆژهەلات و کلتوورێک کە سەرکەوتنی خۆی سەلماندبوو، لەگەڵ یەکینە خۆبەخشەکانی ژێر بەڕێوەبەرایەتی ئەو سەرۆک خێڵانەی تازە دەرچووبوون لە قۆناخی بەربەرێتی و یەکینەکانی فلانج کە رێکخستنی سوپایەکی نوێ بوون کەوتبووە جووڵە، لە میانەی شەڕەکانی گرانیکۆس لە ئەنادۆڵ، ئیسۆس لە چقورۆوا و رۆژهەلاتی دەریای سپی و شەڕی ئەربێلای باکوری ئێراق لە رێگای پێکدادانی بەردەوامەوە هەرە دوایی تا کەنارەکانی هیندۆسی هیندستانی فەتح کرد. دوای کاروانە پڕ لە نەهامەتییەکەی باشووری ئێران و گەڕانەوەی بۆ ناوەندی ئەو کاتەی جیهان (بابل) کاتێک لە تەمەنی سی و سێ ساڵی لە رەوشێکی نادیاردا مرد، جوگرافیایەکی فراوانی ئەوتۆی فەتح کراوی لە دوای خۆی بەجێهێشت کە لە ئیمپراتۆریەتی پارس بەرفراوانتر بوو. ئەمە

جوگرافیایەک بوو کە هەمووی بۆ کلتووری یۆنان کراوە بوو.

ئەم جوگرافیایە پێشتر شارستانیبوونی بەخۆوە دیبوو، بەلام فاکتەرە ئایدیۆلۆژی و ماددییەکانی بۆ یەکەمین نەوەی کۆیلەداری دەگەڕێتەوە. هەرچی کلتووری یۆنانە لە مێژ بوو ئەم کلتوورەی شارستانی تێپەڕ کردبوو. گەنجتر بوو و چاوەڕوانی داهاتووی لێدەکرا. هەر بۆیە توانای تێپەڕکردنی هەبوو. هەر وەکو چۆن راهیبەکانی سۆمەر لە رێگای موتوربە کردنی کلتووری نیولیتیک یەکەمین کلتووری چینایەتی، شار و دەوڵەتییان ئاواکرد، کلتووری یۆنانیش هەرچەندە بەو رادەیە قووڵیش نەبێت بۆ گۆڕەپانەکانی شارستانی موتوربەیەکی لاوێتی بوو. قۆناخی سالانی نێوان ٣٣٠ پ.ز ـ ٢٥٠ی زایینی کە وەکو قۆناخی **"هێلینیزم"**یش ناودەبرێت چەندین میرنشین ئاواکران. لە میسر پتۆلیما، ئەنادۆڵ بیرگانیۆس، لە سوریا و میزۆپۆتامیاش سیلیڤکۆسەکان بەرچاوترینی ئەم پادشایەتییانە بوون. خانەدانی پارتەکان کە دوای تێکشکانی خانەدانی هاخامەنی هاتنە سەر حوکم، خانەدانی نوێی پارتەکان هەوڵی رەستۆرەکردنی ئیمپراتۆرییەتی ئێرانیان دا. پارتەکان کە لە هەمان قۆناخی سالانی ٢٥٠ـ٢٢٠پ.زحوکمڕانییان دەکرد، نوێنەرایەتی نوێبوونەوەیەکیان نەدەکرد. نزیکەی ئەم پێنج سەد ساڵە **"هێلینی"**یە؛ بە تایبەتی لە رووی بونیادنانی شاری نوێ، ئەو پەنتائۆنانەی کە نوێنەرایەتی ژمارەیەکی زۆر لە کلتوورە تێکەڵەکان و لە سەرووی هەموو شیانەوە خوداوەندەکانی یۆنان و ئێرانی دەکرد، زاڵبوونی کلتوور و زمانی یۆنانی لە تەواوی ئەم گۆڕەپانانەدا و بوونی بە کلتوور و زمانی فەرمی، گوزارشت لە سەنتێزێکی زۆر گرنگ دەکات. خودی ژیانی ئەسکەندەر سەنتێزی رۆژهەلات ـ رۆژئاوا بوو. هەڵبەتە سەنتێزی کلتوورە دەسەلاتدارەکانی قۆناخی خۆیەتی. بەلام دیسان گرنگ بوو. جارێکی دیکە مێژوو تا رۆژی ئەمڕۆمان سەنتێزێکی تری هێندە مەزنی کلتوورەکانی بە خۆیەوە نەبینیوە. زیندووترین بەڵگەی ئەمە گۆڕە وێران بووەکەی **"ئەنتیۆکیۆس"**ی پادشای کۆماگەنایە

لە چیای نەمرود: کە یەکێک لە میرنشنیە بەهێزەکانی ئەو قۆناخە بووە و ناوەندەکەی لە ئادیامان بووە. لەبەرئەوەی گوزارشت لەم راستییە دەکات بۆتە یەکێک لە حەوت سەیر و سەمەرەکانی جیهان و سیمبۆلی سەنتێزی رۆژهەلات ـ رۆژئاوا.

ئەوەی سەبارەت بە بابەتەکەمان جێگای بایەخە، ئەوە نییە کە لەم قۆناخەدا پەلهاوێشتنی شارستانییەکی کۆیلەداری گۆڕەپانە چۆلەکانی گرتۆتەوە یاخود نیولیتیک و کلتوورە بەربەرەکانی کردووە بە شارستانی؛ بەلکو شارستانییەکی کۆیلەداری نوێ کە تازە بە قۆناخێکی لەپێشتر گەیشتووە، واتا شارستانی یۆنان ـ هێلین لە هیندستانەوە تا رۆما، لە کەنارەکانی باکووری دەریای رەش تا دەریای سوور و کەنداوی ئێران، لە سایەی زالبوونی کلتووری نوێوە هەولی دووبارە شارستانیکردنی تەواوی گۆڕەپانەکان دەدات. نوێنەرە لاو و چالاکەکەی کلتووری نوێ کە دواتر لە شاری رۆما دەست بە هەلکشان دەکات، هەمان رێباز زیاتر پەرە پێدەدا و بەڕێوەی دەبات و بە گوێرەی قۆناخی خۆی گەورەترین ئیمپراتۆریەتی کۆیلەداری ئاوادەکات.

پێناسە کردنی کلتووری رۆما بەلانی کەم هێندەی کلتووری ئەسینا گرنگە. یەکەمین هۆکاری گرنگبوونی ئەوەیە کە، لووتکەی شارستانی کۆیلەدارییە، واتا چیای ئێڤرێستی کۆیلەدارییە. لەمە بەدواوە شارستانی کۆیلەداری بە خێرایی دەکەوێت. دووەمین هۆکار: بە قوولی و بەرفراوانی گەورەترین نوێنەری کلتووری ئیمپراتۆرییە. هیچ ئیمپراتۆرییەتێک لە مێژوودا هێندەی رۆما سەرسوڕهێنەر نەبووە. سێیەمین هۆکار: دواترین و بەهێزترین نوێنەری پادشا ـ خوداوەندە دەمامکدارەکان بوو. لە دونیادا هیچ هێز و خاوەن ئیرادەیەک نەبینراوە کە هێندەی ئیمپراتۆرەکانی رۆما هەم خۆیان بە مرۆڤ هەم بە خوداوەند دابنێن، هێزی خۆیان لە فەرمان و ئیرادەی کردارەکانیان وەربگرن، ماف بە هیچ کەسێک نەدەن لێیان بپرسێتەوە، بەلام مافی لێپرسینەوەی هەموو کەس

و هەموو شتێکیان هەبێت، هەموو کەسێک ملکەچی خۆیان بکەن. چوارەمین: دەوڵەتێکە کە حقوق و هاووڵاتێتی بە بەرفراوانترین جڤاتەکانی مرۆڤایەتی ناساندووە. پێنجەم: ئیمپراتۆریەتێکە کە بۆ یەکەمین جار ڕێگای لە پێش هاووڵاتێتی جیهان و کۆسمۆپۆلۆتیزم و ئایینی دونیا (کاسۆلیکی و ئەکیومەنی) کردەوە. شەشەم: کاتی بەرەبەیان و پردی شارستانییە گەورەکەی ئەورووپایە. حەوتەم، ماوەیەکی درێژ وەکو کۆمار ژیاوە.

بێگومان رۆما لە ڕێگای پەرجووەوە ئەم پێشکەوتنە مەزنانەی بەدەست نەهێناوە. لە سایەی بوونی بە نوێنەری دوایی و خولقکاری هەر چوار کلتووری گەورەکەی پێش خۆی هێزێکی مەزنی پۆتانسیل و سەرپشکی بە دەست هێناوە. یەکەمین کلتوور، کلتووری شۆرشی نیولیتیکە کە کۆنترین کلتوورە. ئەم کلتوورەی لە ساڵانی ٤٠٠٠پ.ز هاوشێوەی تەواوی ئەورووپا نیمچە دوورگەی ئیتالیاشی خستە ژێر کاریگەری خۆی، دوا نوێنەری ئەم کلتوورە تیرەکانی لاتینۆی ئیتاڵیایە. ئەو مەزەندانەی دەڵێت لە ساڵانی ١٠٠٠پ.ز ناسنامەیان بۆ ئیتالیای رۆژگاری ئەمرۆمان بەدەستهێناوە، ناسنامەی ئەتنیکیان بۆ دەستنیشان کردووە شیمانەیەکی نزیک بە راستییە. دەتوانرێت بگووترێت لە ڕێگای ئەم کلتوورەوە لەگەڵ تەواوی دەزگاکانی نیولیتیک و زهنییەتەکەی ئاشنا بووە. دەبێت بە ریشە ئەورووپی بن. شیمانە دەکرێت هەڵگرانی دووەمین ناسنامەی کلتووری لە ساڵانی ١٠٠٠پ.ز لە ڕێگای ئەنادۆڵەوە کلتوور و زمانی ئاریانی میزۆپۆتامیایان گواستبێتەوە، ئەمەش ئەو گروپەیە کە لە نێوان دۆخی نیوە نیولیتیک و نیوە کۆیلەداریدا دەژی و گروپی ئەتروسکی پێدەڵێن. دەشێت ئەم گروپە لە ساڵانی ٨٠٠پ.ز لە باکووری ئیتالیا نیشتەجێ بووبێت و بڵاوبووبێتەوە. یەکەمین گەلن کە تۆوی شارستانییان بۆ شاری رۆما و ئیتالیا بردووە. سێیەمیان، کلتووری گریک کە ناوەندەکەی ئەسینا بوو لە سەردەمی شکۆداری خۆیدا دەژیا، لەسەردەمی پێکهاتنیدا بە شێوەی کۆلۆنی لقێکی خۆی

لە باشووری ئیتالیا جێگیر کرد (پیساگۆر و گروپەکەی ساڵانی ٥٥٠پ.ز). چوارەمیان، کولۆنی قەرتاجە و هاوشێوەکانی کە لە ساڵانی ٨٠٠پ.ز لەلایەن فینیقییەکان ئاواکران دەشێت کلتووری میسر و کلتووری بە ڕەچەڵەک سامی ڕۆژهەڵاتی دەریای سپییان بۆ نیمچە دوورگەی ئیتاڵیا گواستبێتەوە.

دەتوانرێت بگووترێت کە جگە لە کلتووری چین گواستنەوەی تەواوی کلتوورەکان وەک هەنگوینێکی پاڵاوتە بۆ نیمچە دوورگە بیانووی سەرەکی چیرۆکی ڕۆمایە. ئاوی (جەوهەری پێکهاتووی) ناو منداڵدانەکەیەتی. کاتێک بگووترێت کە هۆکاری لەپێشتربوونی ئەم سەنتێزە لەبەرامبەر سەنتێزی کلتووری ئەسینا و ئیجەی ڕۆژئاوادا بۆ ئاویتەبوونی پۆتانسێل و سەرپشکییەکانی ئەم چوار کلتوورە دەگەڕێتەوە، گووتەیەکی هەرە نزیکە لە ڕاستی. ئەو میتۆلۆژییەی دەڵێت ڕوما لەلایەن هەردوو برا ڕۆمولوس و ڕۆموس ئاواکراوە کە هەردووکیان دێڵە گورگێک هێناونیتیە دونیا، گووتەیەکی گەلەرییە کە بۆ دامەزراندنە هاوشێوەکانی تریش دەگووترێت. گووتەیەکی سەیرە بۆ پیشاندانی بیانیبوونی سەرچاوەکەی (ئاماژەکردن بۆ دەرەوە) و گوزارشت کردن لە توانەوە (توانەوەی کلتوورەکان لە بۆتەیەکدا)!

لە دوای کەوتنی تروادە دەرکەوتنی ئەو چیرۆکە میتۆلۆژیەی باس لە ئاواکردنی شارستانی ڕۆما لەلایەن **"ئانیسیس"**ی هاوڕێی پاریس[1] لە شەڕدا، سەبارەت بە پیشاندانی کارەکتەری ئەنادۆڵیانەی تا دوا ڕادە ئەزموونبەخشە. گوزارشتێکی داستانیانەی (ئەدەبیانەی) هەڵوێستەکەمانە.

چیرۆکی ئاواکردنی لەلایەن پادشا ـ ڕاهیبەکان لە ساڵانی ٧٠٠پ.ز لەگەڵ مەیلی ئاواکردنی تەواوی شارەکانی شارستانیدا گونجاوە. هەرچی چیرۆکی پێکدادانی بەردەوامی تیرەکانی دەوروبەرە سەبارەت بە ڕوونکردنەوەی پەیوەندی نێوان دەزگاکانی شار و

---

١. مەبەست لە براکەی هیکتۆرە کە کوڕی پاشای ترواده بوون.

چین ـ دەوڵەتبوون گرنگە. کێشمەکێش و پێکدادانی نێوان ئەتروسک و لاتینۆکان کە لە زۆر نموونەی تری دامەزراندندا پێکدادانی وەها دەبینرێن، سەرچاوەکەی ناکۆکی نێوان کلتووری خۆجێیی نیولیتیک و کلتووری بە بیانی لەقەڵەمدراوی شارستانیبوونە.

شانسی ئاواکردنی شاری رۆما و هەڵکشانەکەی لەوەدا بوو کە دەکەوتە نیمچە دوورگەوە، لەوپەڕی رۆژئاوای شارستانییەکان بوو، لە باکوور شارستانییەکی ئەوروپایی بەهێز جێگای باس نەبوو. لەوانە بوو مەترسی لە دوو لایەنەوە بێت: شارستانی نیمچە دوورگەی گریک کە ئەسینا ناوەندەکەی بوو، لەگەڵ قەرتاجە کە بەهێزترین کۆلۆنی فینیقییەکان بوو لە باکووری ئەفریقیا، بەڵام بە شارستانی شارێکی سەربەخۆ گەیشتبوو. تێپەڕنەکردنی چاخی پێشخستنی کۆلۆنی لەلایەن شارستانی یۆنان، لە رۆژهەلاتەوە هەبوونی هەڕەشەی بەردەوامی پارسەکان، بەهۆی ئەو کێبڕکێ بەهێزەی لە نێوان شارەکاندا هەبوو، نەبوونی بە خاوەن ئیمپراتۆرییەت یان پادشایەتییەکی ناوەندی و لە ماوەیەکی کورتدا کەوتنە ژێر دەسەلاتی مەکەدۆنییەکان پیشانیدەدات کە بۆ رۆما نابێت بە هەڕەشەیەکی جددی. لەوانە بوو قەرتاجە ببێت بە رکابەرێکی جددی. زۆر نزیک بوونیان لە یەکتری، ئامادەباشیان بۆ پەلهاوێشتن لە هەمان گۆڕەپاندا و وەکو پێویستییەکی خەسڵەتی شارستانییەکان هەڵپەکردنیان بۆ حوکمڕانی زوو یان درەنگ وای دەکرد بکەونە پێکدادانەوە. رۆما بەسەرکەوتنی لەو پێکدادانەی نێوانیاندا کە سەدەیەک زیاتر بەردەوام بوو، گەورەترین کۆسپی لە پێش خۆی هەڵگرت. کاتێک ئەسکەندەر ماوەیەکی کەم بەر لە مردنی رۆمای وەکو ئامانج پیشاندا ـ لە نیمچە دوورگەی یۆناندا وەک پادشا ـ خوداوەند پەسەند کرابوو ـ لەوانەیە ببوایە بە جددیترین هەڕەشە. مردنی پێشوەختی ئەسکەندەر شانسێکی دیکەی رۆمایە. لەجیاتی ئیمپراتۆریەتی روما، ئیمپراتۆرییەتی ئەسکەندەر دەبوو بە گەورەترین هێزی دونیا. ئەم توانا و بەهرەیە لای ئەسکەندەر

هەبوو: دواتر (ساڵانی ١٥٠پ.ز پاش دوایین شەڕی قەرتاجە) دونیای کلتووری نیولیتیک و تەواوی شارستانییە کۆنەکان بەرامبەر بە ئارەزووی ڕۆما بۆ فەتح ئامادە بوو. جگە لە ئیمپراتۆریەتی ئێران کە سەرەتا پارتەکان دواتر خانەدانی ساسانی حوکمڕانییان دەکرد.

لە ساڵی ٥٠٨پ.ز هەنگاونانی ڕۆما بۆ کۆمار (سیستەمی کۆماری) وەکو بەردەوامیکی بە دەزگابوونی دیموکراسی ئەسینایە. لەمەدا بە ئەندازەی بناخەی کلتووری نوێ، بەهێزی ئەرستۆقراسیش ڕۆلێکی گرنگی هەیە. جگە لەمەش ئەزموونی پادشایەتی پێشتر کە بە وێنەی سپارتای ڕکابەری ئەسینا بۆ پێشکەوتن کراوە نەبوو، دەشێت ڕۆڵی لەمەدا ببینێت. بە شێوەیەکی گشتی پادشایەتی مەحافەزەکارە، هێندە دەرفەت بە درەوشانەوەی ئەرستۆقراسی نادات.

وەکو شاری کۆمار تا دواڕادە گەلی ڕۆمای هوشیار کردوتەوە و لەلایەنی بەرژەوەندییەکانیانەوە بوونەتە خاوەن ئیرادە. پێکهاتەی خاوەن دوو ئەنجوومەن (هی ئەرستوکراتەکان و خەڵکی سادە)، کۆنسوڵگەری، پێشکەوتنی دادوەری وەکو دەزگایەکی جیاواز، بە دەزگابوونی هاوشێوەی هێزەکانی گاردی شار پێشانیدەدات کە بە بەراورد لەگەڵ دیموکراسی ئەماتۆری ئەسینا کۆماری ڕۆما پرۆفشناڵ و جێگیر بووە. بەڕێوەبەرایەتی کۆمار یەکێک لە سەرچاوە بنەڕەتییەکانی پێشکەوتنی هونەری سیاسەتە. هەر وەکو چۆن ئەم ڕەوشە پەیوەندی سیاسەت لەگەڵ حقوق پێشاندەدات، لە هەمان کاتدا نموونەیەکی ڕەسەن و مێژوویی بە دەزگابوونی حقوق و پێشاندانی ئەو ڕاستییەیە کە حقوق سیاسەتێکە لەسەری ڕێکەوتوون. هەر وەکو دەزانرێت لەژێر سایەی ڕژێمی کۆماریدا ڕۆما لە ناوخۆدا گەشە کردنێکی کلتووری شکۆداری بەخۆوە بینی، لە دەرەوەش فەتحکارییەکی گەورەی ئەنجامدا. شارستانی ڕۆما لە میانەی کۆمارەوە بە سنوورە سروشتییەکانی گەیشت. چیرۆکی هەنگاونان

لە کۆمارەوە بۆ ئیمپراتۆریەت لە راستیدا دان پێدانانی هەڕەشە و پێکدادانی ناوخۆو دەرەوەدیە. زۆر راشکاوانە دەتوانرێت بگووترێت کە ململانێی نێوان سزار جۆلیۆس و رکابەرەکانی رەنگدانەوەی ناکۆکییەکانی نێوان ناوەند و دەوروبەری رۆما، ئەرستۆقراسی و پلبەکانە. کاتێک پرۆتۆس وەکو بیانوو بۆ خیانەتەکەی باس لەوە دەکات کە کەرامەتی رۆمای مەزن دەکرێتە قوربانی خەڵکی لادێ (دەوروبەر) و ئەمە دەکاتە بەهانەی بەرگریکردن لە خۆی، لایەنگیری پلبەکان بۆ سزار جۆلیۆس، جێگرتنی ئەرستۆکراتە هەڵبژاردەکانی شار لە پیلانگێڕیدا و زۆری لایەنگرانی جۆلیۆس لە ئەیالەتەکاندا ئەم داوەرییە پشتڕاست دەکاتەوە.

هەر وەکو چۆن سەرهەڵدانەکانی دەرەوە بەردەوام بوون، ئێرانییەکانیش گەیشتبوونە فورات. هێرشەکانی سەزەر بۆ سەر گالیا، بریتانیا و ئەڵمان، یاخیبوونەکانی ئەنادۆڵ، کوژرانی پیاوی سێیەم (کراسیۆس) لە کاتی پێکدادانی لەگەڵ ئێرانییەکان، یاخیبوونی یەهودییەکان لە رۆژهەڵاتی دەریای سپی، شەڕە نەبڕاوەکانی قەفقاسیا و نیمچە دوورگەی یۆنان، لە ئامادەباشیدا بوونی هێرشی گوت، ئیسکیت و هونەکانی باکووری رۆژهەڵات، هێرشە بەردەوامەکانی عەرەبەکانی باشوور بۆ بەدەستهێنانی غەنیمەت و هەروەها پاشماوەی بەهێزی پادشایەتی میسر گەورەیی هەڕەشەکان پیشاندەدەن. ئاشکرایە کە گفتوگۆ بێ کۆتاکانی کۆمار سەبارەت بە سەناتۆ، ئەو کێشمەکێشانەی لەپێناو دەستنیشان کردنی ئەندامانی پارتە رکابەرەکان بۆ کۆنسوڵی دەکرا و رەوشی سیاسەتی فێرکردنی خەڵک بۆ غەنیمەتەکانی دەرەوە، لە رووی تێکۆشانەوە بەرامبەر هەڕەشە دەرەکییەکان و وەرگرتنی بڕیارە پێویستییە مێژووییەکانەوە کۆماری تەنگەتاو دەکرد.

ئاگۆستۆسی خوارزا کە لە سەرەتای زاییندا سیمبۆلی تێپەڕبوون بوو لە ئیمپراتۆریەتەوە بۆ کۆمار، لە بناخەی سیاسەتەکانیدا ئەو هەلومەرجانە شاراوە بوون کە ئاماژەمان پێکرد. ئەوەی ئەم

هەلومەرجانە پێویستی پێی بووە، سیاسەتی ئارامی لەناوخۆ و متمانە لە دەرەوە بوو. لە سایەی ئەم سیاسەتانەوە تا ساڵی ٢٥٠ی زایینی چاخی ئاشتی رۆما (Pax Romana) بەردەوام بوو. هەر وەکو دەزانرێت لەم چوارچێوەیەشدا سیستەم رێکخرا. سەناتۆ بە تەواوی لە هێز خراوە و بووە بە ئەنجوومەنێکی راوێژکاری، لە جیاتی هەڵبژاردن بە دامەزراندن دەزگاکان پڕ دەکرێنەوە و بەڕێوە دەبرێن، لە رێگای رابواردنەوە گەل رۆژی خۆی بەسەر دەبات و خەریک دەکرێت، لە دەرەوەش ئاواکردنی مۆڵگە بەهێزەکانی سەربازی، دروستکردنی شورا بۆ پاراستن و شەڕەکانی بەرگریکردن جێی باسە. هەرچەندە بەرامبەر تەواوی ئەو گۆڕەپانانەی ئاماژەمان پێکرد هێرشی کردبێت، بەڵام گشتیان بە ئامانجی بەرگریکردنە. لەمە بەدواوە خاوەن لیستەیەکی بەناوبانگی ئیمپراتۆرەکانین. لیستەی دوا نیو ـ خوداوەند و نیوە ـ مروڤەکان! ئەوەی سەیرە ئیمپراتۆرەکانی رۆماش رۆژ لەدوای رۆژ زیاتر دەرک بە بێواتابوونی پەنتائۆنی خوداوەندە کلاسیکەکان دەکەن. دەیانزانی کە لە میانەی دەمامکی ئەم خوداوەندانەوە ناتوانن مەشروعییەت بەدەست بێنن.

ئاڵۆزییە مەزن و کردەوە چەند لایەنییەکانی ئیمپراتۆرییەت لە ساڵانی ٢٥٠ی زایینی بەدواوە نیشانەکانی پارچە بوون و رووخان بوون. تەنانەت شاژنی تەدمور **"زەنوبیا"**ش بەشی خۆی وەک ئیمپراتۆریەتێک دەبینی کە میسر، سوریا، ئەنادۆڵ و ئێراق ـ لەو قۆناخەدا بەم جۆرەی ئێمە گوزارشتی لێنەکراوە، بۆ ئاسانکاری ناوە جوگرافییەکان دەڵێین ـ بگرێتەوە. چیرۆکە خەمناکەکەی یەکێک لە کلاسیکەکانی رۆمایە. لە رۆژهەڵات دامەزرێنەری خانەدانی ساسانی ئەردەشێری یەکەم و ئیمپراتۆری مەزن شاپوری یەکەم یەک لەدوای یەک سوپاکانی رۆما تێکدەشکێنن. هەر وەکو دەزانرێت ساسانییەکان تا رۆژهەڵاتی دەریای سپی و چیاکانی تۆرۆس دەڕۆن. لەم قۆناخەدا شاری بەناوبانگی زوگما کە مۆڵگەی سەربازی بووە و کەوتۆتە نزیک فورات ـ بیرجیک لە ساڵی ٢٥٦ی زایینیدا لەگەڵ

زەوی تەخت دەکرێت و جارێکی دیکە زیندوو نابێتەوە. بە تایبەتی میزۆپۆتامیای سەروو دەبێتە مەیدانی پێکدادان و دەستگۆڕکێی نێوان ئیمپراتۆرییەتی رۆما و ئیمپراتۆرییەتی ساسانی و پارتەکانی ئێران. ئەم خاکە پیرۆزانەی شۆڕشی نیولیتیک و یەکەمین شارستانی شار، لۆژیکی دیالیکتیک تێیدا پێچەوانە دەبێتەوە، لە جیاتی ئەو سەرچاوەیەی کە شارستانییەکان بە فیچقە لێی دەردەکەتن، دەبێتە گۆڕەپانی پێکدادانیان. یەکێک لە پێشکەوتنە هەرە تراژیدییەکانی مێژوو ئەوەیە: لە دوای ئورارتوویییەکان ئەم ناوچەیە پێکهاتەیەکی ناوەندی خۆی ئاوا نەکرد، تا رۆژگاری ئەمرۆمان بەردەوام دووچاری دەست بەسەردا گرتن، داگیرکاری و لکاندن بە رژێم و هێزەکانی دیکەی شارستانی دەبێت. هەر وەکو ژن ـ دایک دوای ئەوەی گەورەترین شۆڕشی کلتووری خولقاند، ئەو هەبوونەیە کە هەرە زیدە پێشێل دەکرێت.

سەرباری ئەوەش سوپاکانی رۆما لە میانەی دژە هێرشەکانیانەوە تا کەنارەکانی رووباری دیجلە بەرەو پێش دەچوون. ئیمپراتۆری بەناوبانگ جولیانۆس هەر وەکو بڵێی دەیەوێت لاسایی ئەسکەندەر بکاتەوە بەڵام کاتێک ساڵی ٣٦٥ لە کەناری دیجلە لە ئاکامی شەڕێکی مەزن بە شێوەیەکی تراژیدی دەکوژرێت، ئیتر سەردەمی ئیمپراتورە گەورەکانی رۆما پەردەکەی دادەخرێت. بە تایبەتی شەڕەکانی رۆژهەڵات و کێشوەری ئەورووپا پیشانیان دەدا کە ئیتر ئیمپراتوریەت لە رۆماوە بەڕێوە نابرێت. کاتێک ئیمپراتۆری بەناو و دەنگ دیکلیانۆس لە ساڵی ٣٠٦ دا مرد، لە هەمان کاتدا شەش ئیمپراتۆر لەسەر ئیمپراتۆریەتەکە بوون. قوستەنتینی یەکەم کە لەناو ئەمانەدا دەرکەوتە پێش لە ساڵی ٣١٢ دا ئایینی ئیمپراتۆرییەت و لە ساڵی ٣٢٥ یشدا پایتەختەکەی گۆڕی. لە دوای دوا ئیمپراتۆری خانەدانی قوستەنتین، واتا دوای جولیانۆس لە ساڵی ٣٩٥ بە شێوەیەکی فەرمی پارچەبوون روویدا. ئیمپراتۆرەکانی رۆمای رۆژئاوا ئیتر ببوون بە بوکەڵەی دەستی هێرشە مەزنەکانی

گۆتەکان. تەنانەت گەورەی هونەکان ئەتیلا ئەگەر مەبەستی بوایە لە ساڵی ٤٥١ دا دەیتوانی دەست بەسەر رۆمادا بگرێت. لە کاتێکدا لە ساڵی ٤٧٦ دا پادشای گۆتەکان ئۆکار و یەکەمین ئیمپراتۆرییەتی رۆما لە مێژوودا ژێر خاک کرا، کلتوورەکەشی ماوەیەکی درێژ لەژێر خاکدا چاوەڕێی ژیانەوە بوو، بەڵام نەمرد.

دووەمین رۆما، واتا چیرۆکی بیزەنت، بۆ ماوەیەکی درێژخایەن لە میانەی پێکهاتەیەکی بێ کاریگەر و لاسایی کەرەوە (لاسایی رۆژئاوا و رۆژهەڵاتی دەکردەوە، نەیدەتوانی سەنتێز دروست بکات و بێبەرهەم بوو) درێژەی بە هەبوونی خۆیدا. هەرچەندە بۆ هێشتنەوەی گۆڕەپانە کۆنەکانی ئیمپراتۆرییەت لە چنگی خۆیدا هەوڵە گەورەکانی جوستینین (٥٢٧ ـ ٥٦٥ی زایینی) کاریگەریان هەبوو، بەڵام هێدی هێدی ئەیالەتەکان لە دەستیدا نەدەمان.

بیزەنت خۆی وەکو رۆمای دووەم پێناسە دەکات. بانگەشەی قوستەنتین پۆلیس بۆ بوون به رۆمای دووەم زێدەڕۆییە. جگە لە دووبارە بوونەوەیەکی نەزۆکانەی سەر گۆڕەپانە کۆنەکانی رۆما، زەحمەتە هیچ واتایەکی دیکەی پێبدرێت. ناوەڕۆکە کرستیانییەکەی بابەتێکی دیکەیە و لێکۆڵینەوەی جیاوازی پێویستە. دواتر عوسمانییەکان تەنانەت رووسە سلاڤەکان ـ ناوەندەکەیان مۆسکۆیە ـ حەزدەکەن بە رۆمای سێیەم ناوبنرێن. ئەم بانگەشانەی بوون بە رۆمای سێیەم کە وەک کلتووری ئایدیۆلۆژی پەیوەستە بە کرستیانی و ئیسلامەوە تەنیا زێدەڕۆیی نییە، بەڵکو لە میانەی تێکەڵکردنی قۆناغ و کلتووری جیاوازەوە رێگا لە پێش ئاڵۆزی واتاش دەکەنەوە. لە بەشی دواتردا هەوڵدەدەم دەستەواژە بە گرفتەکانی لە شێوەی **"شارستانی کرستیانی، ئیسلام و موسەوی"** شرۆڤە بکەم.

بە یادی رۆما چەندین ئیمپراتۆری بچووک سەریانهەڵدا: لە ئینگلتەراوە تا دەگاتە دەریای رەش. دوای بتپەرستی کە لەگەڵ رۆما هەرەسی هێنا، بۆشاییەکی گەورە بۆ شۆڕشێکی نوێی ئایینی

دروست بوو. ئەگەر ئەورووپا ببوایە بە بتپەرست یان خاوەن میتۆلۆژی ئەوا بەرامبەر بە نموونەی رۆما بە گرگنی دەمایەوە. چونکە ئەو بت پەرستییەی ئایینی فەرمی رۆما بوو و هەرەسی هێنا نەدەبوو ببێتە خۆراکی ئایدیۆلۆژی ئەورووپای نوێ. لە هەموو لایەکەوە بە ئەندازەی شۆڕشی ماددی، سیاسی و ئابووری، شۆڕشێکی مەعنەوی و ئایینیشی دەکرد بە پێویستییەک.

بەرلەوەی بێینە سەر باسی دەرکەوتن و واتای شۆڕشی کرستیانی و ئیسلامی، هەوڵدەدەین لە میانەی هێڵە گشتییەکەیەوە ئاماری ماددی و کلتووری رۆما بخەینەڕوو.

بەرهەمی کشتوکاڵی، کانزاگەری، پیشە و بازرگانی لەژێر سایەی ئیمپراتۆرییەتدا لە گەورەترین گۆڕەپانەکانی شارستانی جیهان گەورەتر بووە. گووتەی **"هەموو رێگاکان دەچنەوە رۆما"** ئاراستەی ئەم سەرچاوە ئابوورییانەش دیاری دەکات. جیهان رۆمای بەخێو دەکرد. لە میانەی ئەم داهاتە گەورەیەوە لە سەروویانەوە رۆما چەندین شاری سەرسوڕهێنەر ئاواکران. گەلێک لە شارەکانی سەردەمی هێلێنی نەک هەر وەک خۆیان پارێزران، بەڵکو پێشیش خران. شارەکانی ئەنتاکیا، ئەسکەندەرییە، بەرگاما، تەدمور، سامۆسات، ئەدیسا، ئامید، ئەرزەنی رۆم، نەوقەیسەر و قەیسەریا، تارسوس، تراپزوس و چەندین شاری دیکەی هێلێنیستی وەکو ئەستێرەی رۆژهەڵات بوون. لە ئەورووپا لە دایکبوونی بناخەکانی شاری نوێ، واتا لە دایکبوونی ئوروکەکان و لە سەرووی هەمووشیانەوە پاریس دەکەونە بەرچاو. بیناسازییەکانیان هەمان بیناسازی شارەکانی یۆنانە. بەڵام گەورەترن و شکۆداری زیاتریان بە دەست هێناوە. دیسان بەنداو و جۆگەلە سەرسوڕهێنەرەکانی ئاو زۆر پێشکەوتوون. تۆڕی رێگاکان لە ئاستێکدا بووە کە هاوشێوەکەی نەبینراوە. ئارامی سەقامگیر بووە. بە ڕاستی پاکس رۆمانا جێگای باس بووە. بەکارهێنانی کانزا (مەعدەن) و ئامرازەکانی بیناسازی پێشکەوتووە. خەڵوزی بەردین و بەردە داتاشراوەکان

تەنیا دەکرێت لەگەڵ میسری کۆن بەراورد بکرێت. چەک و کیفە مەعدەنییەکان بە شێوەیەکی سروشتی پێشکەوتووترین لقەکانی پیشە بوون. بازرگانی تەواو بە دەزگا بووە، بە گوێرەی کلتووری یۆنان پێگەی پەیدا کردووە و رەواجی هەبووە. بازرگانی بەناوبانگ سەریانهەڵداوە. قۆناخێکی بەهێزی پێهەلگرتنی بازرگانی جێگای باس بووە.

لەوانەیە بۆ جاری یەکەم لە مێژوودا حقوق هێندە پێشکەوتبێت و بە دەزگا بوو بێت. کۆد و زاراوە حقوقییەکان هێندە بەهرەدار بوون تەنانەت ئەمرۆش بە نموونە وەردەگیرێت. دەرئەنجامی سروشتی حقوق دەزگای بەهێزی هاوڵاتیتی بوو. هاووڵاتیتی رۆما جیاکارییەکی مەزن بوو. دەوروبەرە بازرگانی و ئەرستۆکراسەکانی تەواوی جیهان ژیانێکی هاوشێوەی خەڵکی رۆمایان بە جیاکاری لەقەڵەمدەدا. وەکو جۆرێک لە ژیانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری رۆژگاری ئەمرۆمان. ژیانی شێوازی رۆما ببوو بە نەخۆشییەک. لەوانەیە کاریگەری مۆدێلی پۆشاکی ئیتاڵی لە سەرتاسەری جیهاندا سەرچاوەکەی لەم نەریتەوە بێت.

رووبەڕووبوونەوەکانی وەرزش هۆڤانە بووە. زۆرانبازی گلادیاتۆرەکان، زۆرانبازی لەگەڵ شێردا و لە **"ئەرانا"**[1] کان بە زیندوویی فڕێدانی مرۆڤە بەندەکان بۆ بەردەمی شێرە برسییەکان یەکجار سامناکە. گەل فێری ئەم جۆرە بەسەربردنەی کات کراوە، لە رووی ئەخلاقییەوە رووخێنراوە. ئەو پەرستگایانەی لەژێر ناوی پەنتائۆن و خوداوەندەکاندا ئاواکرابوون لە قۆناخەکانی دواییدا تاڕادەیەکی مەزن گرنگی خۆیان لەدەست دەدەن. تیۆلۆژی رۆما، ناوەکانی تیۆلۆژی یۆنانی دەگۆڕێت و پەسەندی دەکات. فیرجیلیۆس داستانی ترواددەی هۆمیرۆسی بە نموونە وەرگرتووە و داستانی ئاواکردنی رۆما **"ئانیاس"**ی نووسیوە. بە ئەدەبی

---

١- گۆڕەپانی گەورەن بە شێوەی یاریگاکانی ڕۆژی ئەمڕۆمان دروست کراون و زیاتر نمایشی توند و تیژیان تێدا کراوە. وەک کلتوورێکی باوی ئیمپراتۆریەتی رۆما خەڵک و ئیمپراتۆریش تامەزرۆیانە تەماشای ئەو نمایشانەیان کردووە.

یۆنانیشەوە تەواوی فاکتەرە کلتوورییەکان تەنیا کراون بە زمانی لاتینی و پەسەندکراون. تەنانەت بە نووسینی شانۆگەری، مێژوو و فەلسەفەشەوە. دیسان سەرباری ئەمەش شاکاری گرنگییان پێشکەش کردووە. خیتابەت (جوانبێژی) هونەرێکی بەهێز بووە. زمانی رۆمایی لە هەمان کاتدا شێوازێکی قسە کردن بووە. لەگەڵ ئەوەی جلوبەرگ و پۆشاک کاریگەری قووڵی رۆژهەڵاتی بەسەرەوە بووە، بەڵام باشیش تایبەت کراون. هێدی هێدی زمانی لاتینی لە جیاتی زمانی گریکی بۆتە زمانی فەرمی دبلۆماسی و نێودەوڵەتی . وەرگێڕانەکانی زمانی لاتینی رۆڵێکی مەزنی هەبووە لە وون نەبوونی کلاسیکەکانی یونان‌دا. سیاسەت کراوە بە هونەرێک.

کاتێک کلتوورەکانی رۆما و ئەسینا لەگەڵ یەکدی بەراورد بکەین، دەبینین کە کلتووری ئەسینا لایەنی ئایدیۆلۆژی لە پێشە، بەرامبەر بەمەش کلتووری رۆما لایەنی ماددی ـ سیاسی قورسترە، بەڵام دەستنیشان کردنی ئەو راستییەی کە هەردوو کلتوورەکە تەواوکەری یەکترن گرنگیەکی مەزنی هەیە. هەر وەکو بڵێی ئەو بناخە کلتوورییەی ئەسینا داینا، بەرهەمەکەی یەکەم جار لەلایەن ئەسکەندەر، دواتر پادشاکانی پاش ئەو و هەرە دواییش لەلایەن رۆماییەکانەوە کۆکراوەتەوە. بە بێ هەبوون و بیرکردنەوە لە کلتووری یۆنان وێناکردنی رۆما، بە تایبەتیش بوونی بە ئیمپراتۆری جیهان مەحاڵە.

بەڵام گرنگتر ئەوەیە کە ئەم دوو کلتوورە دواترین دەرئەنجامی پەرەسەندنی کلتووری رۆژهەڵاتن. بە پێچەوانەی مەزندەکانەوە کلتوور و ئیمپراتۆرییەتێکی بە ڕەچەڵەک یۆنانی و رۆمایی نەخوڵقێنراوە. هەردووکیان دەرئەنجامی سەنتێز کردنی هەلومەرجە خۆجێییەکانی خۆیان و سەرچاوەکانی کلتووری رۆژهەڵاتن. تەنانەت ئەورووپاش لە میانەی جەبرکردنی سەرچاوە کلتوورییەکانی ئەم سەنتێزانەی رۆما و ئەسیناوە، شۆڕشە کلتوورییە مەزنەکەی خۆی ئەنجامداوە. بەبێ میسر و میزۆپۆتامیای لانکەی رۆژهەڵات

ناتوانرێت بیر لە کلتووری ئەورووپا بکرێتەوە.

لەلایەنی ماددیشدا پێشکەوتنە مێژووییەکان یەکپارچەیە. ئاوا‌کردن و زۆربوونی شارەکان کە لە ئوروک (وەرکا)وە دەستی پێکرد وەکو زنجیرێک گرێدراوی یەکترن. هەر وەکو بینیمان هەر شارستانییەک ئوروکێکی خۆی هەیە. ئەمە بابەتێکی رێکەوت نییە، دیالیکتیکێکی شارە. لە کاتی لە دایکبوون و پەلهاوێشتنی نیولیتیکیشدا هەمان پەرەسەندنی دیالیکتیکی رووبەڕوومان ببووەوە. لەم روونکردنەوە و هەڵسەنگاندنە پوختەدا کە سەبارەت بە پەلهاوێشتنی شارستانی پێشمان خست دەبینین کە ناتوانین لە میانەی دابڕانی پەرەسەندنی کۆمەڵگاکانەوە لە زەمینەکانی کات (مێژوو) و شوێن (جوگرافیا) واتای پێ بدەین.

فەتح کردنی جیهان لەلایەن سیستەمەکانی شارستانی بە شێوەیەکی قورس لەلایەن شارستانی رۆما تەواو بووە. تەنانەت لەمێژەوە کەوتوونەتە ناو بازنەی نەزۆکی سەرلەنوێ فەتحکردنی گۆڕەپانە کۆنەکانی شارستانی. ئەو فەتحکارییەی سەرلەنوێ لە نێوان شارستانییەکاندا پێشدەکەوێت لە بنەمادا خاوەن کارەکتەری زەوتکردن و تاڵانە. چونکە کارەکتەری شارستانییەکان وەکو یەکن. هەر هەموویان مەرامیان تاڵانکردنی داهاتی کەڵەکە بووە (بەم زاراوەیە مەبەستم داهاتەکانی موڵکە. ئینجا ئەمە موڵکی تایبەت یان هی دەوڵەت بێت. دەست بەسەردا گرتنی هەر شتێک کە وەک بەشێکی زیادە دوای تێربوونی مرۆڤەکان دەمێنێتەوە، تاڵان و موڵکە) تا بیکەن بە موڵکی خۆیان. لەم سۆنگەیەوە ئەو پەلهاوێشتنانەی پشت ئەستوورن بە دەستگۆڕکێ و پێکدادانی نێوان شارستانییەکان لە خوڵقاندنی بەهایەکی نوێ زیاتر، لە میانەی تێکدانی بەهاکانەوە بەدیدێت.

کاتێک سەیری دواوە بکەین دەبینین قۆناخی ئاشوورییەکان بەوە لە قۆناخەکانی پێشتری جیادەکاتەوە بۆ یەکەم جار زەوت کردنی بەهای شارستانییەکانی پێش خۆی لەمانەوە دەستی پێکردووە.

ئیمپراتۆرییەکانی ئاشوور بەو زهنیەتەیان کە پەسنی خۆیان دەکەن لەبەرئەوەی لە ڕێگای تۆقاندن و دروستکردنی قەڵا لە کەللە سەری مرۆڤەکانەوە دەست دەگرن بەسەر شارستانیەتەکانی هیتیت، هۆری، فینیقی ء میسردا، لە ڕاستیدا زۆر بە ئاشکرا دان بە ڕاستینەیەکدا دەنێن: شەڕەکانی شارستانێتی دڕندایەتییە. هیگڵ هەمان لۆژیکی بە **"قەسابخانەکانی مێژوو"** ناوبردووە. چونکە کاتێک هۆکارەکەی دەستگۆڕکێی موڵک و داهات بێت، بە شێوەیەکی دیکە بەدی ناهێنرێت. لەلایەکەوە کۆمەڵگایەک هەیە ژیانی بە تەواوی گرێدراوی کلتووری شارستانییە، لەلایەکی دیکەشەوە کۆمەڵگایەکی دیکەی شارستانی هەیە کە دەخوازێت ئەمە زەوت بکات: بەڵام بە گوێرەی ئەوەی کاتێک یەکێکیان ئەویتریان لە تەواوی بەها ماددی و مەعنەوییەکانی دابڕێت گوایە بە ئامانجەکانی دەگات، بۆ ئەوەی دیکەش جگە لە لەناوچوون هیچ ئەلتەرناتیفێکی دیکە نامێنێتەوە. تەنانەت ئەگەر خۆشی ڕادەست بکات، لە لەناوچوونی پێگەیشتووترین بەشی دانیشتوانەکەی ناتوانێت چاوەڕوانی ئەنجامێکی دیکە بێت (دەست بەسەر ژنان و منداڵاندا دەگرن، کوشتنی پیاوانیش ڕێسایەکە). ئەمەیە تراژیدیاکە.

ڕۆشنبیرانی یۆنان ئەم بابەتەیان باش شیکار کردووە، و تراژیدیترین چیرۆکەکانی چاخی کلاسیکیان نووسیوە. داستانەکانی سۆمەریش هەمان چیرۆکی تراژیدین. شیوەن بۆ نیپوور و نەعلەتکردن لە ئەگادە هەر وەکو بڵێی هەواڵی ڕەوشی بەغدای ئەمڕۆ ڕادەگەیەنن. ئیمپراتۆرییەتی پارسیش خاوەن ناوبانگێکی هاوشێوەیە. بە تایبەتیش بەربەستکردنی گەشەکردنی سەربەخۆییانەی کەنارەکانی ئیجە، یەکێک لە زیانە تراژیدیەکانی مێژووە. دواتر ئەسکەندەریش هەمان لۆژیکی شارستانی هاوشێوەی ڕۆیشتنی باگردێن بەسەر مێروولەدا بەکاریهێناوە. پادشا ـ خوداوەند دەبێتە ناونیشانێک کە بەپلیشاندنەوەی مرۆڤەکان وەک مێروولە بەدەست دەهێنرێت. دەشێت هەندێک مرۆڤ لەلایەنی ویژدانییەوە بەرامبەر

ئەم کردەوانە نارەحەت و نیگەران نەبن. ئەوەی ئەنجامیداوە گەیاندنی ئەم لۆژیکەیە بە ئاستێکی بەهرەمەندانە. خولانەوە لەناو هەمان بازنەی بەتاڵ، دەستگۆڕکێ لە ڕێگای تۆقاندن، لەناوبردنی خاوەنە کۆنەکان لەگەڵ دەست و پێوەندەکانیان یاخود ڕاگرتنیان وەکو دیلی سوودبەخش، ئەگەر کرداری ووشک کردنی ویژدانی مرۆڤایەتی نییە ئەی چییە؟

کاتێک مێژووی ئایینە تاکخوداییەکان لێکۆڵینەوەی لەبارەوە بکرێت دەبینرێت کە لە میانەی زهنییەت و پراکتیکێکی نوێوە دەرکەوتنیان بەرامبەر فرەخودایی و بتپەرستی کە هاوتای ڕژێمەکانی شارستانی دەبینرێت یەکێک لە پێشکەوتنە هەرە واتادارەکانی مێژووە. هەرچەندە هەندێک پەلهاوێشتنی شارستانی لەسەر بنەمای ئەم ئایینانە بەردەوام بووبێت، بەلام ئاشکرایە کە ڕووبەڕووی پێشکەوتنێکی جیاوازین. لەژێر سەرەدێڕێکی دیکەدا هەنگاوەکانی ئەم لایەنە شروڤە دەکەین.

## ٤ ـ قۆناخەکانی کۆمەڵگای شارستانی و کێشەکانی بەرخودان

لەگەڵ هەرەسهێنانی رۆما لە کۆتاییەکانی سەدەی چوارەمدا تەنیا شارێک و شارستانییەک هەرەس ناهێنێت، بەڵکو قۆناخێکی درێژخایەنی تەواوی شارستانییەکانی چاخی یەکەم و کلاسیک کۆتایی پێدێت. بە ناوکردنی سەرەتاکەی بە چاخی تاریکی و سەدەکانی دواتریشی بە چاخی ناوین بووە بە خوویەک. ئەم ناو لێنانەش بۆ شێوازی ئاواکردنی زانستی مێژوو دەگەڕێتەوە. بەهایەکی واتای پێگەیشتووی نییە، تەنانەت لایەنی تێکدانی واتای زیاترە. بەناو کردنیشی وەک سەردەمی دەرەبەگایەتی، بە تایبەت دەگەڕێتەوە بۆ میتۆدی شێوەپێدانی کۆمەڵگا لەلایەن چەمکی مێژوویی مارکسەوە. پێناسەی دەرەبەگایەتی بۆ کۆمەڵگا تاڕادەیەک وەکو ناچارییە. قووڵایی واتا بەدەستەوە نادات. هەر وەکو ئاماژەمان پێکرد زیاتر خزمەت بە تێکەڵکردنی واتا دەکات.

شرۆڤەکردنی هەرەسهێنانی رۆما وەکو هەڵوەشانەوەی سیستەمێکی کۆیلەداری چاخەکانی یەکەم و کلاسیک دەشێت

قووڵایی واتا فەراهەم بکات. خۆی لە خۆیدا گەڕانەوەی ڕیشەی مانیفیستۆی کرستیانی واتا ئینجیل ڕۆڵی هەرە گەورەی هەبوو لە هەڵوەشانەوەی ڕۆما کە ڕیشەکەی بۆ سۆمەر و میسر دەگەڕێتەوە، ئەمەش گوزارشتی ئەم یەکپارچەییەی چاخە لە بەرەی بەرامبەردا. هەمان خاڵ بۆ دووالیزمی ئیسلام و بیزەنتیش لە جێگای خۆیدایە.

بە بڕوای من قوناخی دوای ڕۆما پێویستی بە شرۆڤەیەکی جیاواز هەیە. وەک سەرەتایەک دەڵیم، بەناوکردنی قۆناخی نوێ بە **"چاخی ناوینی تاریکی" یان "سەردەمی نوری کرستیانی و ئیسلامی"** تەواو واتای بوویەر و ڕووداوەکان نادات، تەنانەت دەیشیوێنێت. بە درێژایی هەڵسەنگاندنەکانمان سەبارەت بە شارستانی بەردەوام باسی گرنگی ڕۆڵی دامەزرێنەرانەی ڕاهیبەکانمان کرد. ڕاستتر بڵێین تێبینیمان کرد. دواتر بینیمان خاوەنەکانی هێزی سیاسی و سەربازی کە کۆتاییان بە سەردەمی ڕاهیبەکان هێنا مورکی خۆیان لە تەواوی پرۆسەکانی شارستانی قوناخی پادشایەتی داوە. وەکو بە هێزترین شرۆڤە هەوڵماندا دیاری بکەین کە بە شیوەیەکی یەکپارچەیی کلتووری شارستانی لەگەڵ کلتووری نیولیتیک لەناو پێکداداندایە، بەردەوام گۆڕەپانی کلتووری نیولیتیک تەسک دەکاتەوە، دەستی بەسەردا دەگرێت، دەیتوێنێتەوە و هەوڵی پاکتاوکردنی دەدات. جەختمان لەسەر گرنگی ئەوە کردەوە کە پێکدادانی کلتوورەکان لە تێکۆشانی چینایەتی سنووردار گرنگترە، پێویستە تێکۆشانی چینایەتی وەک پارچەیەکی ئەم پێکدادانە هەڵسەنگێنرێت، هەروەها پێکدادانی نێوان خودی شارستانییەکانمان وەک **"کوشتارگەی قەسابەکان"** هەڵسەنگاند.

سەرلەنوێ شرۆڤە کردنی تەواوی ئەم باسانە لەژێر دوو زاراوەدا بە گوێرەی من ئەزموون بەخشترە: ئەویش کلتووری ماددی و ئایدیۆلۆژین. ناوبردنی کلتووری سەرمایەداری لەلایەن فرناند براودل وەک **"کلتووری ماددی"** گرنگ دەبینم. نەک تەنیا بۆ شارستانی سەرمایەداری بەڵکو بەکارهێنانی ئەم پێناسەیە بۆ

تەواوی شارستانییە چینایەتی، شاری و دەوڵەتییەکان توانای شیکار کردنمان زیاد دەکات. جیاوازی نێوان کلتووری ماددی و مەعنەوی لە قۆناخەکانی ئاواکردنی شارستانییەوە تا سەرمایەداری بەبێ پچڕان بەردەوام بووە. سەرمایەداری تەنیا نوێنەرایەتی لووتکە و دوا قۆناخی ڕەهەندی کلتووری ماددی ئەم قۆناخانەی شارستانی دەکات. کلتووری ئایدیۆلۆژی (دەشێت مەعنەویشی پێ بگووترێت، دواتر زانستی واتا)ش کە هەر لە سەرەتاوە بوونی هەیە، لەو قۆناخەی کۆمەڵناسی ئازادیدا کە هاوکاتە لەگەڵ سەرمایەداریدا ناچارە بگاتە لووتکە. کاتێک لەم لایەنەوە لێکۆڵینەوەکانمان پەرە پێبدەین: هەم هێزی واتامان سەبارەت بە پەیوەندی و پێکدادانی نێوان کلتووری ماددی و ئایدیۆلۆژی چ لە ڕەهەندی شارستانیدا و چ لە ڕەهەندی بەرخودانی بەرەی بەرامبەریدا بەهێز دەکەین؛ هەم پەیوەندی **"چاخی ناوین و مۆدێرنیتەی سەرمایەداری"** بە کۆمەڵناسی ئازادییەوە دادەنێین، بەم جۆرەش ئامادەکارییەکی باش بۆ هەڵسەنگاندنی واتای ژیانی ئازاد لەناو ڕەهەندی کلتووری ئایدیۆلۆژیدا دەکەین.

ئەو شرۆڤانەی دەیکەم زیاتر دەبێتە تاقیکردنەوەیەک سەبارەت بە ئاواکردنی کۆمەڵناسی ئازادی بۆ ئەو کلتووری نیولیتیک و شارستانییەی کە تا ئێستا ئاماژەمان پێی کردووە. خەباتە بنەڕەتییەکانیشمان دەرهەق بە ئاواکردنی کۆمەڵناسی ئازادی، بە شێوەیەکی بەرفراوانتر دوای پێشاندانی تێبینییەکانمان سەبارەت بە شارستانی سەرمایەداری پێشکەش دەکەین.

ا. دەبێت ئاماژە بەوە بکەم کە لە جیاکردنەوەی کلتووری نیولیتیک بۆ کلتووری ماددی و ئایدیۆلۆژی گرفتێکی ئەوتۆ دەرناکەوێت، بەڵام زیاتر کاتێک دەکەوێتە قۆناخی بنبەستبوون و بەرامبەر بە پێشکەوتنی کۆمەڵگای شارستانی خۆی بۆ ناپارێزرێت، ڕووبەڕووی کێشەی بەردەوام دەبێتەوە. بەر لە هەموو شتێک پێویستی ڕوونکردنەوەی زاراوەی **"کێشەکان"** دەبینم کە بەردەوام

کردوومە بە سەردێڕی بابەتەکان. ئەو زاراوەیەی بە واتاکەیەوە بەکارم هێناوە گوزارشت لە ڕەوشی کائیۆسی کلتووری ماددی و ئایدیۆلۆژی دەکات کە چیتر لەلایەن تاک و کۆمەڵگاوە بواری درێژە پێدانی نەماوە. هەرچی دەربازبوونە لە ڕەوشی کێشە گوزارشت لە دۆخی دواتر دەکات کە کۆمەڵگای نوێ بۆتە خاوەن پێکهاتەی واتادار و ڕێکخراو. هەرچی کلتووری ئایدیۆلۆژییە گوزارشت لە واتا، دۆخی زهنییەت و چۆنییەتی ڕۆڵی ئەو پێکهاتە، دەزگا و شانانە دەکات کە هەوڵی شرۆڤە کردنیمان دا کلتووری ماددیش گوزارشت لەو ڕۆل و واتا بینراو و بەرجەستانە دەکات، کە هەوڵمان دا لە میانەی زاراوەی لە جۆری سیما، داردە، دەزگا، بونیاد و شانە ڕوونی بکەینەوە. ئەگەر بمانەوێت بە زمانی گەردوونی ئەمە ڕوون بکەینەوە گەرانە بە شوێن دووالیزمی دیالیکتیکی **"ووزە - ماددە"** لە ڕاستینەی کۆمەڵگادا.

لەژێر ڕۆشنایی ئەم زاراوانەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە لە نێوان فاکتەرەکانی کلتووری ماددی و ئایدیۆلۆژی کۆمەڵگای نیولیتیک، بە تایبەتیش لە قۆناخی دامەزراندن و بەدەزگابوونیدا تایبەتمەندییەکی وەها پەیدا نەبووە کە هەڕەشە لە ژیان بکات یان بەرەو پێکدادنی ببات. ئەخلاقی کۆمەڵگا دەرفەتی پێنادات. موڵکایەتی تایبەت دەرفەتی پەیدابوونی نییە، کە هۆکاری سەرەکی درزی کۆمەڵایەتییە. بابەتێکی دیکەی گرێدراوی ئەمە، واتا دابەشبوونی کار لە نێوان هەردوو ڕەگەزدا، هێشتا موڵکایەتی تایبەت و توندوتیژی نەناسیوە. بەدەستهێنانی خۆراکیش کە بەرهەمی کاری هاوبەشە موڵکایەتی تایبەت تێیدا جێگای باس نییە. ئەو جڤاتانەی لەلایەنی قەبارە و ژمارەوە گەورە نەبوون، لە تەواوی ئەم بابەتانەدا کلتوورێکی ماددی و ئایدیۆلۆژی هاوبەشی پتەویان هەیە. تێکدانی ئەم پێکهاتەیە لەلایەن موڵکایەتی تایبەت و توندوتیژییەوە وەکو هەڕەشەیەکی ژیانی دەبینرێت، وەکو ڕێسایەکی سەرەکی ئەخلاقەکەشیان، هاوبەشیتی و هاوکاری

پرەنسیپی سەرەکی لەسەر پێ هێشتنەوەی کۆمەڵگایە. وەکو پێویستییەکی ئەم پرەنسیپەی واتا پێکهاتەی ناوخۆیی کۆمەڵگای نیولیتیک تا دوارادە قایم و پتەو دیارە. هۆکارەکانی هەزاران ساڵ بەردەوام بوونیشی سەرچاوەی خۆی لەم راستییەوە وەردەگرێت. کاتێک لە رووی پەیوەندی نیوان **"کۆمەڵگا - سروشت"**ەوە لەگەڵ کۆمەڵگای شارستانیدا بەراورد بکرێت، نەک هەر تەنیا کەندەلان لە نیوانیاندا نییە، بەڵکو گونجانی هەردوو کلتوورەکە لەگەڵ پرەنسیپی ئیکۆلۆژیدا (ماددی و ئایدیۆلۆژی) بە شێوەیەکی بەهێز بەردەوامە. هەڵوێستی زهنیانە بەرامبەر سروشت پڕە لە پیرۆزی و ئیلاهی. هەر وەک خۆیان سروشتیش بە زیندوو پەسەند دەکەن. لەبەرئەوەی هەوا، ئاو، ئاگر و هەموو جۆرە خواردەمەنییەکی رووەکی و ئاژەڵییان پێشکەش دەکات هاوتای خوداوەندی دەبینن، راستتر بەهێزترین فاکتەری ئیلاهیبوونە. بە شێوەیەکی چڕ تێبینیمان کرد کە یەکێک لە بەهێزترین هوکارەکانی زاراوەی خوداوەند و ئیلاهی لەم راستینەیەدا شاراوەیە.

لە شوێنی خۆیدا ئەو واتایە شرۆڤە دەکەین کە کۆمەڵگای شارستانی بە زاراوەی خوداوەندی داوە. ئەوەی گرنگە ئەو خوداوەندانەی تارادەیەکی مەزن زهنییەتی کۆمەڵگای نیولیتیکیان داگیرکردووە پەیوەندییان بە فشار، چەوسانەوە و ستەمکارییەوە نییە و پێویستی بە پەردە پۆش کردنیش نییە. زیاتر پەیوەندی بە رەحمەت، شوکران، بەرەکەت، خۆشەویستی و جۆش هەیە، کاتێک کاریش بەرەو خراپی بچێت ئەوا پەیوەندی بە زاراوەی وەکو ترس و رووناکییەوە هەیە، گرنگییەکی زۆر بە تەبابوون لەگەڵیاندا (واتا لەگەڵ سروشتدا، بە واتا زانستیەکەش تەبایی لەگەڵ ئیکۆلۆژی) دەدات. کاتێک پێویست بێت بەهادارترین هەبوونیان، پارچەیەکی خۆیان، کوڕ و کچە لاوەکانیان وەکو قوربانی پێشکەش دەکەن. هەرچی لایەنی بە کۆمەڵگابوون (کۆمەڵایەتیبوون)ی خوداوەندە لە میانەی زاراوەکانی **"تەوتەم"**، **"تابۆ"** و **"مانا"**وە کە لە کۆمەڵگای

کۆنی کلاندا باوەڕییەکی پەسەندکراو بوون، وەکو باپیرەی (بنەچەی) بەدیهێنەری جڤات پەسەند دەکرێت. واتای جۆرێک لە ئایینی **"باپیرە گەرایی"** (بنەچەگەرایی)، **"دایکە- خوداوەندی"** هەیە. پیرۆزی و زاراوەکانی تەوتەم، تابۆ و مانا تەواو ئیلاهیش نەبن، وەکو هەورێکی قورسی زهنییەتیان، بەردەوام بەسەر سەریانەوە دەسووڕێنەوە. ئەوەی لە ناوەڕۆکی پیرۆزیشدایە لە شێوەی کەیف و دلگەرمی، هەندێک جار ترس و نیگەرانی یان خۆشەویستی و ڕێز، یاخود ئێش و گریاندا پیشاندانی هەلویستە بەرامبەر هەموو شتێک کە کاریگەری لە ژیان دەکات. بەهایەکە و بە کاریگەری ئەو شت و واتایانەی دەدەن کە کار لە ژیانیان دەکات. دەشێت وەکو ئەخلاقیش شرۆڤەی بکەین. چونکە ئەم خوداوەند و پیرۆزیانەی بە هۆکاری لەسەر پێ مانەوەی جڤاتەکان دادەنرێن ڕۆلی سەرەکی لە بناخەی ئەخلاقدا دەبینن. سەبارەت بەم بابەتە جڤاتەکان زۆر جددین. لەو بڕوایەدان پێشکەش نەکردنی قوربانی لە کاتی خۆیدا بێ ڕیزی کردن یان بچووکترین پێشێلکاری ڕیساکان ئەنجامەکەی کارەسات دەبێت. واتا تەواو کۆمەلگایەکی ئەخلاقین.

هەرچەندە خاوەندارێتیەکی کۆمەلایەتییان بۆ ئەو ئاژەلە مالی و رووەکانە هەبێت کە کردوویانە بە کلتوورێکی خۆیان، بەلام ئەمە بە مولکایەتی بەناو ناکرێت. مولکایەتی بە ئۆبژە کردنی دەوێت. هێشتا زهنییەتێک پەیدا نەبووە کە ڕێگا لەپێش جیاوازی ئۆبژە - سۆبژە بکاتەوە. تێڕوانینیان بۆ هەموو ئۆبژەیەک وەک تێڕوانینیانە بۆ خۆیان، وەک خۆیان لەقەلەمی دەدەن. ئەندامانی جڤات چەندە مولکی یەکدین، ئەو رووەک و ئاژەلانەی کەمەندکێشی مالیکردن کراون و بوونەتە کلتوور هێندە مولکن. لەم سۆنگەیەوە ناتوانرێت باس لە پێشێلکارییەکی ئەوتۆی ژینگە بکرێت. بێگومان سەرەتایەک دەستی پێکردووە کە ڕێگا لە پێش مولکایەتی دەکاتەوە. بەلام وەرچەرخانی ئەمە بۆ مولکایەتی لە هەلومەرجی جیاوازتر و دوای ماوەیەکی درێژ ڕوودەدات. نابێت لەم باسانەی ئاماژەمان پێکردن

واتایەکی وەها دەرکەوێت کە کۆمەڵگای نیولیتیک "بەهەشتە". خودی کۆمەڵگا هێشتا لاوە و داهاتووی نادیارە، بەهۆی هەلومەرجەکانی سروشت کە بەردەوام لە گۆڕاندایە، ڕووبەڕووی شکانە، هەر بۆیە لە ڕەوشێکی مەترسیداردایە. ئاگاداری ئەم ڕەوشەیە. هەڵبەتە ئەمەیە کە مۆرکی خۆی لە زهنییەت داوە. وەکو چارەیەک بۆ ئەم ڕەوشە، تەنانەت زۆر ساویلکەش ببینرێت، پێشخستنی میتافیزیکی خاوەن ڕەهەندی ئایینی و میتولۆژی وەکو ناچارییەک دەبینرێت.

لەسەر بنەمای ئەم شرۆڤانە دەتوانین باشتر لە واتای ئەو میتافیزیکە ئیلاهییە تێبگەین کە لە میانەی پشت بەستن بە پیرۆزی و ژیانی هاوبەش ـ کۆمەڵکارییەوە لە دەوروبەری ژن ـ دایکدا پێشکەوتووە. وەچەخستنەوە، بەخێوکردن، میهرەبانی و پێگە گەورەکەی دایک کە وەکو سروشتە، فاکتەری سەرەکی کلتووری ماددی و مەعنەوییە. مێردایەتی پیاو نەک هەر دیار نییە، هێشتا "**سێبەر**"یشی لەسەر کۆمەڵکاری کۆمەڵگا نییە، نابێت. شێوەی ژیانی کۆمەڵگا ڕێگای پێنادات. هەر بۆیە تایبەتمەندییەکانی لە جۆری ڕەگەز، مێردایەتی، خاوەن موڵک و دەوڵەت کە بۆ پیاو دەگێڕدرێنەوە تەواو کارەکتەرێکی کۆمەڵایەتییان هەیە و دواتر پێشکەوتوون. کۆمەڵگا بە واتای دایک ـ ژن، منداڵ و براکانی ژن دێت. هەرچی ئەو پیاوەیە کە شیمانەی بەرئەندامێتی مێردی لێدەکرێت، لە دەرەوەی سوودی پیاوێتییەکەی ، ئەگەر بەهرەیەکی هەبێت، بۆ نموونە لە میانەی نێچیروانی، کۆکردنەوەی ڕووەک وماڵیکردنی ئاژەڵەوە خۆی بسەلمێنێت وەکو ئەندام دەبینرێت. هێشتا ماف و هەستێکی لە جۆری مێردی ژنەکەمم، باوکی منداڵانی خۆمم وەکو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی پەیدا نەبووە. نابێت لەبیری بکەین؛ هەرچەندە ناکرێت بگووترێت دایکایەتی و باوکایەتی ڕەهەندێکی دەروونییان نییە، بەڵام لە بنەڕەتدا زاراوە و دیاردە و تێگەیشتنێکی کۆمەڵایەتین.

کۆمەڵگای نیولیتیک کەی کەوتە گەرووی تەنگەبەرییەوە یاخود

هەوڵی تێپەڕ کردنی درا؟ دەشێت لەسەر بنەمای هۆکارە ناوخۆیی و دەرەکییەکان هەندێک شرۆڤە پێشبخرێت. دەشێت پیاو لە میانەی بەلاوەنانی لاوازییەکەی و بوونی بەڕاوکەرێکی سەرکەوتوو و بەیەکەوە لەگەڵ دەست و پێوەندەکەی بە پێگەیەکی بەهێز گەیشتبێت، بەمەش هەڕەشەی لە سیستەمی دایکسالاری کردبێت. دەشێت بەهرەی بەخێوکردنی ئاژەڵ و رووەک رێگای لە پێش ئەم هێزە کردبێتەوە. قورسایی تێبینییەکانمان پێشانی دەدات کە کومەڵگای نیولیتیک لەبەر هۆکارە دەرەکییەکان توێنراوەتەوە. بێگومان ئەم هۆکارە کومەڵگای دەوڵەتی پیروزی راهیبە. چیرۆکی یەکەمین کۆمەڵگای شارستانی میزۆپۆتامیای خواروو و نیل تاڕادەیەکی مەزن ئەم هەڵوێستە پشتڕاست دەکاتەوە. هەر وەکو بە بەڵگەوە باسمان کرد، کلتوورە پێشکەوتووەکانی نیولیتیک و تەکنیکی ئاودێری دەستکرد لە زەوییە لیتاوییەکاندا بۆ ئەم کومەڵگایە رێگای لە پێش زێدە ـ بەرهەمی پێویست کردەوە. ئەو کومەڵگا نوێیەی لە چوار دەوری گەورەیی زێدە بەرهەمدا شاری ئاواکرد و بە شێوەی دەوڵەت خۆی رێکخست، بە قورسایی لە رێگای هێزی پیاوەوە بە پێگەیەکی زۆر جیاواز گەیشتووە. زیادبوونی شار، واتای کاڵا بوونە. ئەویش بازرگانی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. هەرچی بازرگانییە بە شێوەی کۆلۆنیەکان دزەی کردە ناو دەمارەکانی کۆمەڵگای نیولیتیک، پێ بە پێ کاڵابوون، بەهای گۆڕینەوە ـ لە کۆمەڵگای نیولیتیکدا بەهای شتەکان بە رادەی بەکارهێنانی دەپێورێت و لە جیاتی گۆڕینەوە وەک دیاری پێشکەش دەکرێن ـ و موڵکایەتی چڕ کردەوە، بەربڵاوی کرد، بەم جۆرە هەڵوەشانەوەی خێرا کرد. ئوروک، ئور و کۆلۆنیەکانی ئاشووری زۆر بە روونی ئەم راستینە دەسەلمێنێت.

ناوچەی بنەڕەتی نیولیتیک حەوزەکانی ناوین و سەرووی دیجلە ـ فورات لەسەر ئەم بنەمایە بەشداری شارستانی کردووە. تەواوی جڤاتەکانی کلان جا ئەگەر بە ئاستی نیولیتیک گەیشتبێت یان نا، لە

ئاکامی ئەو هێرشانەی لە دەرەوە هاتوون رووبەڕووی پەیڕەوەکانی داگیرکاری، دەست بەسەردا گرتن، چەوسانەوە، توانەوە و قڕکردن بوونەتەوە. تێڕوانینەکانمان پیشانیدەدات کە تەواوی ئەو ناوچانەی جڤاتەکانی مرۆڤی تێدا ژیاوە ئەم جۆرە پێشکەوتنانەی تێدا بەدیهاتووە. دواتر لە هەر گۆڕەپانێک و قۆناخەکانی سەرووتردا لە میانەی هێرشەکانی کۆمەڵگای شارستانی، خانەی بنەڕەتی کۆمەڵگا، واتا کۆمەڵگای نیولیتیک و ئەوانەی لە قۆناخی پێشووتردا ماونەتەوە، کەوتوونەتە ناو قۆناخی هەڵوەشانەوە، وەکو پاشماوە تا رۆژگاری ئەمرۆمان درێژەیان بە هەبوونی خۆیان داوە.

بۆچوونی شەخسیم ئەوەیە، هەرگیز کۆمەڵگای بەر لە شارستانی تەواو نابێت و لەناو نابردرێت. لەبەرئەوە نییە کە زۆر بەهێزن، هەر وەکو لە دیاردەی خانە ریشەییەکاندا دەبینرێت، هەبوونی کۆمەڵایەتی (کۆمەڵگا)ش وەهایەو بەبێ ئەوان نابێت. کۆمەڵگای شارستانی تەنیا لە میانەی کۆمەڵگای پێش خۆی دەتوانێت پەیدا بێت. ئەمەش راستییەکی هاوشێوەی: ئەگەر کارکەر نەبێت سەرمایەداریش نابێت. بە پێی دیالیکتیکیش وەها رێی تێدەچێت کە کۆمەڵگای شارستانی بە پشت بەستن بەو کۆمەڵگایانەی شارستانی نین یاخود نیو ـ شارستانین دەتوانێت درێژە بە هەبوونی خۆی بدات. دەشێت بە شێوەیەکی رێژەیی قڕکردن و لەناوبردن بەڕێوەچووبێت، بەڵام ئەنجامدانی بە شێوەیەکی سەرتاسەری لەگەڵ سروشتی کۆمەڵگابوون ناکۆکە.

شانبەشانی ئەمەش نابێت کلتووری ئایدیۆلۆژی کۆمەڵگای نیولیتیک بچووک بکرێتەوە کە بە درێژایی مێژوو لەسەر پێیان ماوەتەوە. بەها نەمرەکانی لە شێوەی حقوقی دایکێتی، هاوکاری کۆمەڵایەتی، برایەتی، خۆشەویستییەکی بێ بەرژەوەندی کە تەنیا لەپێناو کۆمەڵگایە، رێز، بۆچوونی چاکە واتا ئەخلاق، یارمەتیدانی بێ بەرامبەر، رێزگرتنی خولقێنەرانی بەهای راستەقینە و ئەوانەی کۆمەڵگا دەژێنن، وابەستەبوون بە ناوەڕۆکی پیرۆزی و ئیلاهی

چەواشە نەکراو، ریزگرتنی دراوسێ، تامەزرۆیی یەکسانی و ژیانی ئازاد هۆکارە سەرەکییەکانی هەبوونی ئەم کۆمەڵگایەن و لە هەمانکاتدا تا ژیانی کۆمەڵگا بەردەوام بێت، بەهایەکن هەرگیز لەناوناچن. لەبەرئەوەی بەهاکانی شارستانی لە جۆری فشار، چەوسانەوە، زەوتکردن، تالان، دەستدرێژی کردن، کۆمەڵکوژی، بێ ویژدانی (بێ ئەخلاقی)، لەناوبردن و توانەوە بۆ کۆمەڵگا پڕن لە فاکتەرە کلتوورییە ماددی و مەعنەوییە پووچەکان، هەبوونیان لەناو کۆمەڵگادا کاتییە. ئەمانە زیاتر تایبەتمەندیتی کۆمەڵگا نەخۆش و بەگرفتەکانن.

لە بەشی کۆمەڵناسی ئازادیدا ئەوە تاوتوێ دەکەین کە چۆن دەتوانین لە رێی بەلاوەنانی بەها شێوێنراو و نەخۆشەکانی کۆمەڵگای شارستانییەوە و پشت بەو بەها هەمیشەییانەی کۆمەڵگا کە ماونەتەوە لەگەڵ کۆمەڵگای دیموکرات، ئازاد و یەکساندا ئاوێتە ببین.

ب- شرۆڤە کردنی کۆمەڵگای شارستانی لە رێگای سێ قۆناخەوە. دەشێت فێرکەر و ئەزموون بەخش بێت: ئەویش وەکو سەرەتا، ناوین و کۆتایی. بەڵام دەبێت باش بزانرێت کە کۆمەڵگای شارستانی یەکپارچەیە، بەڵام ئەم جۆرە دابەشکردنانە بۆ شیکارکردن ئاسانکاری دەکەن، لە رووی بەرجەستەییشەوە یەکپارچەیی و ئاڵۆزیی **"درێژ ماوە"** دەپارێزێت.

**تایبەتمەندییەکانی لە جۆری بەرێزی، ناسکی، جوامێری، گوێڕایەڵی رێساکان، بە پێوان، بە پلان، بە ئەقڵ، گرێدراوی مافەکان و ئاشتیخوازی کە بە کۆمەڵگای شارستانیەوە لکێنراون رووکەشین و تەنیا بەهایەکی پڕوپاگەندەییان هەیە. رووی راستەقینەی کۆمەڵگای شارستانی لەگەڵ سروشتی ژیان ناکۆکە و پڕە لە چەواشەکاری و نەخۆشی کۆمەڵایەتی وەک توندوتیژی، درۆزنی، خەڵەتاندن، قەبەیی، تەڵەکەبازی، شەڕ، تالان، دیلی، لەناوبردن، بەندایەتی، بێ وەفایی، زەوتکردن، بێ ویژدانی، پێشێلکردنی حقوق، پەرستنی**

پرەنیسیپی هێز، شێواندنی پیرۆزی و ئیلاهیەت و بەکارهێنانی لەپێناو کەمینەیەکی سوود پەرستدا، دەستدرێژی، رەگەزگەرایی کۆمەلایەتی، خنکانی لایەنێک لە نێو ماڵ و موڵک و ساماندا و مردنی لایەکەی دیکە لە برسێتی و نەهامەتیدا، گردبوونەوەی ئاپۆرای کۆیلەکان، لادێییە پەرتەوازە و کارکەرە بێکارەکانە. لە میانەی هێزی پروپاگەندە و هەڵویستێکی میتافیزیکی خراپ و ساختەوە بۆ شاردنەوەی رووی راستەقینەی خۆی بەردەوام لە نێو هەوڵێکی رێکخراو دایە.

ئەگەر پێناسەیەکی زانستی پێشبخەین دەتوانین بڵێین کۆمەڵگای شارستانی ئەو کۆمەلگایەیە کە لەگەڵ پەیدابوونی شاردا بۆ جیابوونەوەی چینایەتی هەنگاوی هاویشت و لەلایەن رێکخستنێکەوە بەڕێوە دەبرێت، کە دەوڵەتی پێدەڵێن. لەکاتێکدا ئەو هاوکاری و خزمایەتییەی لەناو ئەتنیک ـ خێڵدا هەیە رێگا لە پێش جیاوازییەکی کومەلایەتی دەکاتەوە کە هەرە زێدە دەگاتە ئاستی پلەداری، ئەوا دابەشبوونی چینایەتی و گەیشتن بە دەوڵەت لەگەڵ سروشتەکەی ناگونجێت. کلتووری خێل لەگەڵ کلتووری چینایەتی و دەوڵەتی ناگونجێت. هەرچی ناوەڕۆکی بنەڕەتی جیاوازی چینایەتییە، مامەڵە کردنە بە زێدە ـ بەرهەمی زۆر بووەوە. دەست بەسەردا گرتن و بە موڵک کردنی هەموو ئەو ئامرازانەیە کە رێگایان لە پێش زێدە ـ بەرهەم کردۆتەوە، لە سەرووی هەمووشیانەوە زەوی (خاک). هەر وەکو هەموو کاتێک گووتراوە، موڵکایەتی دزییەکە لە کۆمەڵگا دەکرێت. هەرچی زێدە ـ بەرهەمە، بەرهەم و ئەو کرێیەیە کە لە بەرامبەر دزی کردندا وەردەگیرێت. لە بنەڕەتدا رێکخستنی دەوڵەت، ئامرازی هاوبەشی پاراستنی ئەو موڵکە و دابەشکردنی کۆی ئەم زێدە ـ بەرهەمەیە بەسەر خاوەنەکانیدا. بە رێکخستنبوونی خاوەنداریێتی موڵک و زێدە بەرهەم و بەهای زیادەیە. هەڵبەتە لەم پێناوەشدا بە درێژایی مێژوو پێویستی بە سوپای ترسناک، ئەرستۆقراسی، چەک و ئامرازەکانی مەشروعییەت پێدان هەبووە.

زانست، یۆتۆپیا، فەلسەفە، هونەر، حقوق، ئەخلاق و ئایینی گریدراوی خۆی خولقاندووە. میتافیزیکێکی بێواتا رۆلی کۆمەلایەتی تەواوی ئەم کاتەگۆریانە و پەیوەندییەکانیانی لەگەڵ ژیانی ئازاددا چەواشە کردووە. لەگەڵ ئەوەی پەیوەستبوونی کۆمەلگا بە کلتووری ماددی و ئایدیۆلۆژی ئالۆزی و شێواندنێکی مەزن لە خۆوە دەگرێت، بەلام ئەوەی بنەڕەتییە بونیادەکەیەتی. ئەمەش هەبوونی کلتووری ماددییە کە چەندەی دەچێت هەڵدەکشێت. باس لە نەبوونی کلتووری ئایدیۆلوژی ناکەین. هەبوونەکەی کلتووری ئایدۆلۆژی دوو تایبەتمەندی سەرەکی هەیە. مانەوە لە پلانی دووەم و شێوێنراوی.

بۆ تێگەیشتنی ئەم خالانە پێویستە زیاتر روون بکرێنەوە. هەر وەکو دەزانرێت بونیادیی و کارابوون دوو زاراوەی پەسەندکراوی "**زانستی واتاناسی**"ین. هەر بونیادێک (پێکهاتەیەک) رولێکی هەیە، هەر رۆلێکیش پێکهاتەیەکی هەیە. هەرپێکهاتە و رۆلێک کە لە کائیوسدا بێت لەناو قەیراندا دەژی. رووبەڕووی هەلوەشان و پەرتەوازدبوون دەبنەوە. لەم نێوانەدا هەندێک رۆلی ناکۆک و پێکهاتەی ئالۆز و کاتی دەکەونە گەڕ. ئەم خالەی ئاماژەم پێکرد ناوەڕۆکێکی گەردوونی لە خۆوە دەگرێت. بۆ نموونە پێکهاتەی ئاو ($H_2O$)یە. لە هەر گۆشەیەکی گەردوون بین، ئەگەر گەردی ($H_2O$) دروست بووبێت، واتا پێکهاتە دروست بووە. هەرچی رۆلەکەیەتی هاوشێوەی "**ئاو**" چۆنێتیەکی تا دوا ڕادە روون و بە لێشاوە. بەستنی یاخود بە هەلمبوونی، بە واتای تێکچوونی پێکهاتەی راستەقینەی دێت، ئەمەش لە دەستدانی رۆلەکەی یاخود سنورداربوونی رۆلەکەی لەگەڵ خۆیدا دێنێت. دروستکردنی مێزێک لە تەختە یان کانزا کارێکی پێکهاتەییە. سوودی مێزەکە رۆلەکەیەتی. هەمان پارچەی تەختە و کانزاکان لە دۆخی مێزدا نەمێنن رۆلی خۆیان لە دەستدەدەن. ئەگەر لەناویش نەچن ئەم رۆلەیان نامێنێت. دەشێت مێزی خواروخێچیش هەبێت. لە دۆخێکی وەهادا هەم خراپی

پێکهاتە هەم خراپی ڕۆڵ دەبێتە جێی باس.

هەموو هەبوونێکی گەردوون تایبەتمەندییەکی بەم جۆرەی هەیە. لە یەک کاتدا هەڵگری پێکهاتەیی و ڕۆڵە. بە واتا گشتییەکەی ئەگەر ماددە وەکو پێکهاتە (بونیاد) شرۆڤە بکەین، بۆ لەسەر پێ ڕاگرتنی ئەم پێکهاتەیە یەکسەر ووزەمان بەبیردا دێت. ووزە بۆ ماددە واتای ڕۆڵ بەخشینە. لە رووی زانستییەوە سەلمێنراوە کە لە دوالیزمی **"ووزە ـ ماددە"**دا، ووزە سەرەکییە. پێکهاتە ماددییەکان بەبێ ووزە نابێت، بەلام دەشێت ووزە بە بێ بونیادی ماددی هەبێت. ماددە لەناودەچێت (لە رووی بونیادییەوە)، بەڵام ووزە لەناوناچێت، ئەمەش بابەتێکە دەرکی پێکراوە. هەلبەتە کارابوونی رۆلی ووزە، هێندەی ئاگادارین بەدیهاتنی پێکهاتە ماددیەکانیش دەکاتە ناچاری. تەنانەت زیندوویێتیش گرێدراوی پێکهاتە ماددی و زەمینە زۆر پێشکەوتووەکانە. ناتوانرێت بیر لە زیندەوەرێک بکرێتەوە کە بەرامبەرێکی ماددی نەبێت، ڕاستتر پێکهاتەیەکی ماددی نەبێت. ئەگەر هەبێت ئێمە نازانین. ئەگەر گشتگیری بکەین، دەشێت هاوتای بەرامبەری پێشکەوتووترین پێکهاتەی ماددی، پێشکەووترین ڕۆڵ بێت.

کەواتە بەرامبەرە هاوتاکەی ڕۆڵ و پێکهاتەی ماددی کۆمەڵگا، کلتووری ماددی و کلتووری ئایدیۆلۆژییە. شرۆڤەکانمان لەبارەی کۆمەڵگاوە دەرهەق بەوەیە کە کۆمەڵگای شارستانی هەر وەک چۆن بەرامبەر پێگەیشتوویی بێ سنووری پێکهاتەی ماددی بە تەواوی ڕۆڵەکەی پێش نەخستووە، لە دەستیداوە، تەنانەت پێکهاتەکانیشی شێواندووە. هۆکاری سەرەکی ئەمەش ئەوەیە: پابەند نییە بە کلتوورە ئایدیۆلۆژی و پێکهاتە بنەڕەتییەکانی ئاواکردنی کۆمەڵگاوە و، لە ڕادەبەدەر تەنگەتاوی کردوون. دەشێت بەوەی بچوێنین: نەوت تێکەڵ بە ئاو بکەیت ئاو تێکدەدات و ڕۆڵی خۆی لە دەست دەدات. نەوتیش وەکو ئاو بە لێشاوە (بەجووڵەیە)، بەڵام ڕۆڵەکەی زۆر جیاوازترە. ئەگەر پێشکەوتنی کلتووری ماددی لەگەڵ پێشکەوتنی

کلتووری ئایدیۆلۆژی هاوسەنگ و گونجاو بێت، مەترسی نییە و ناتوانین باس لە کاریگەری خراپی بەسەر کۆمەڵگاوە بکەین. دەشێت بڵێین ئاساییە. بەڵام پێشکەوتنی کلتووری ماددی و کۆبوونەوەی لە دەستی گرووپێکی کۆمەڵایەتی سنووردراردا بە شێوەیەکی گشتی بە واتای تێکدانی رۆڵ و بونیادی گشتی کۆمەڵ دێت، بە شێوەیەکی تایبەتی بە واتای توانەوەی کلتوورێکی ئایدیۆلۆژی و گەورەبوونی کلتوورێکی ماددی بەرتەسکە.

بە نموونەیەک دەتوانین بۆچوونی خۆمان زیاتر روون بکەینەوە. ئەهرامەکانی میسر بونیادی ماددی زەبەلاحن. بەڵام لە بەرامبەر ئەمەدا ملیۆنان مرۆڤ رۆڵ و، ژیانی واتادار و ئازادی خۆیان، واتا کلتووری ئایدیۆلۆژی خۆیان لە دەستداوە. شارستانی شتێکی بەم جۆرەیە. بونیادی زەبەلاح ئاوا دەکات. تەنانەت دەشێت لە میانەی پەرستگا، شار، دیوار، پرد، کێڵگە و عەمبارەکانەوە گەورەییەکەی خۆی خستبێتە روو. بە پێی شارستانیەتەکان هەبوونی کۆمەڵگای بەم جۆرە شتێکی شیاوە. بەڵام لە هەمان کۆمەڵگادا کە لە رۆڵ و بەهای کلتووری ئایدیۆلۆژی بگەڕێیت، دەبینی یان لەدەستدراوە یاخود دۆخێکی شێوێندراوی هەیە. کەمینەیەک لە گشتی کۆمەڵگا دابڕاوە، کۆمەڵگای خستۆتە ژێر فشار و قۆستنەوەیەکی بێ ڕەحمانەوە، یان لە کلتوورە ئایدیۆلۆژییەکەی دایبڕیوە، یاخود ئەوەتا شێواندوویەتی و بە شێوێنراوی پێشکەشی کردۆتەوە، بەم جۆرەش لە بەهای کلتووری ئایدیۆلۆژی راستەقینە بێبەشی کردووە.

هەرچی ئەو کلتوورە ماددی و ئایدیۆلۆژیەیە کە کەمایەتی لەسەری دەژی لە دوولایەنەوە رێگا لە پێش کۆمەڵگایەکی نەخۆش دەکاتەوە. لەناو ماددەدا خنکاوە، بە تەواوی لە ئایدیۆلۆژیایەکی ئازاد و ژینگە پارێزیش دابڕاوە. ئەو دۆخانەی بە **"کێشەی کۆمەڵایەتی"** ناوم برد، ئەنجامی ئەم پێشکەوتنە دیالیکتیکییەیە. تەواو لەبەر ئەم هۆکارە کۆمەڵگای شارستانی لەدەوروبەر دادەبڕێت. هەر وەکو

مەزەندە دەكرێت ئەم دابڕانە چۆنایەتیانە یان ماهیەتیانە نییە بەڵكو ئەنتۆلۆژیانەیە. واتا هەبوونی كۆمەڵگای شارستانی بە ناچاری دابڕان لە دەوروبەر (ژینگە) دەكاتە پێویستییەك. دەوروبەر و ژینگە چ بە شێوە كۆنەكەی واتا كاملكردنی سروشت ـ كۆمەڵگا یاخود شێوە زانستییەكەی واتا یەكێتی سروشت ـ كۆمەڵگا لێی تێ بگەین، هەر كامێكیان بێت كۆمەڵگایەكی دەوێت كە پێوانە سەرەكییە بەدیهێنەرەكانی شارستانی، واتا چین ـ شار و دەوڵەتەكەی تێپەڕ كردبێت. باس لە كردارێكی قەبەی لەناوبردن ناكەم. كۆمەڵگای نوێ هاوسەنگی و گونجاوی كلتووری ئایدیۆلۆژی و ماددی، بە بنەما دەگرێت. لە كاتێكدا هاوسەنگی كلتووری ماددی و ئایدیۆلۆژی لە ناوەوەی كۆمەڵگادا، ئاوێتەبوونی كۆمەڵگا لەگەڵ سروشت لە شێوەی سروشتی ئازادكراو (یان وەك مورای بۆكین دەڵێت: سروشتی سێیەم) ئەنجامدەدات، لە هەمان كاتدا ڕێگا لە پێش بەلاودنانی ناكوكی ناهاوسەنگانەی **"كۆمەڵگا ـ سروشت"**ی كۆمەڵگای شارستانی دەكاتەوە.

كاتێك لەژێر ڕۆشنایی ئەم ڕێنماییە گشتییەدا یەكەمین قۆناخی بونیادنانی كۆمەڵگای شارستانیمان شرۆڤە كرد، لە هەموویاندا كلتوورێكی ماددی زەبەلاح دەبینین. ئەهرامە زەبەلاحەكانی میسر، زەقورەی سۆمەرییەكان، شاری ژێر زەمینی چینیەكان، پەرستگای هیندییەكان، شار و پەرستگا هاوشێوەكانی ئەمریكای لاتین، بە شێوەیەكی ئاشكرا هەبوونی كلتووری ماددی پیشان دەدەن. ئەو واتا یان كلتوورە ئایدیۆلۆژییەی كە لە ناوەڕۆكدایە جەستە مۆمیا كراوەكان، پەیكەرەكانی خوداوەند و ڕەوتی پادشا و سوپاكەیەتی لەو دونیا. واتا گۆڕاوە یاخود بە شێوەیەكی سەرسوڕهێنەر شێوێنراوە. لە ڕەوشی بەم جۆرەدا جەخت لەسەر زاراوەی **"من"**ی دەروونی مرۆڤ دەكرێت و واتای پێدەدرێت. بەڵام ئاشكرایە كە واتای ڕاستەقینە لە وەرچەرخانەكەی كۆمەڵگابووندا شاراوەیە. كۆمەڵگا نەبێت یاخود وەرنەچەرخێت ئەم جۆرە پێكهاتانە

تەنانەت بە ئەقڵی مرۆڤیشدا نایەت، ئەمەش دەرکی پێدەکرێت. بە ئیلاهیکردنی پادشاش رەوشێکی زهنییەتە. بەلام زهنییەتێکە کە چەواشەکراوە و زهنییەتی ئایدیۆلۆژی بنەڕەت و خولقێنەری کۆمەڵگای رووخاندووە. زهنیەتێکە کە لەسەر حیسابی زهنیەتی راستەقینەی کۆمەڵگا دەرکەوتووە، نرخی ئەو دەرکەوتنەش رووخانی کلتووری ئایدیۆلۆژییە کە ئایینە تاکخوداییەکانیش بە توورەییەکی گەورەوە لە پێناو هۆکاری هەبوونیاندا بەرەنگاری بوونەتەوە. ئەو کۆمەڵگایەی لە شار جێگیربووە و خۆی وەکو چینی دەوڵەت رێکخستووە، توانا مەزنەکانی خۆی وەکو کلتووری ماددی، زهنییەتی چەواشە، میتافیزیکی خراپە، لە سروشت بەدەرنان، چوونە سەررووی سروشت و هەبوونێکی دەردوە پێشکەش ددکات کلتووری ئایدیۆلوژی خستە پیلانی دووەم و وەک چەواشەکردنی هەڵدەسەنگێنین.

ناتوانین بلێین ئەم قوناخە بە بێ کاردانەوە، بە جوش، پەرجوو و بەبێ ئازار پێشوازی لێکراوە. باسی میتولوژی گوزارشتێکی زۆر شاراوەی راستییە. بەڵگە پیرۆزەکانی ئایین و میتۆلۆژی جۆرێک لە چیرۆکەکانی بەرخودانن. شرۆڤە کردنی بەرخودانی سەرەتا وەکو سەرهەڵدانی کلتووری ئایدیۆلۆژی چەسپاندنێکی واتادارە. بەرخودان فرە رەهەندە. بەر لە هەموو شتێک بەرخودانی مەزن لە بەرامبەر بەندکردنی ژن لە زیندانی ماڵ و بەستنەوەی بە پیاوەوە لە نموونەی ئینانادا روون و ئاشکرایە. لەگەڵ ئاواکردنی شارەکاندا ئابلۆقەدانیان بە دیوار، سیمبۆلی سەرهەڵدانی کلتووری ئایدیۆلۆژی ئەتنیکە لەبەرامبەریاندا. کاتێک چەمکی خوداوەندی خولقێنەر و مرۆڤی بەندە بە قووڵایی شیکار بکرێت، ئەو کاتە دەبینرێت کە تێکۆشانێکی مەزنی چینایەتی بەڕێوەبراوە. بەرهەمی خوداوەندی خولقێنەر لە جێگای چەمکی سروشت ـ خوداوەند جێگیر کراوە، کە لە ناوەڕۆکی خۆی بەتاڵکراوە. لە راستیدا چینی بەڕێوەبەر کە هیچ پەیوەندییەکی بە خولقاندنەوە نییە و لێی دابڕاوە، کاتێک تەواو لە

میانەی چەواشەکارییەکی ئایدیۆلۆژییەوە خۆیان وەکو خوداوەندە دەمامکدار و خولقێنەرەکان رادەگەیەنن، خولقێنەری راستەقینە و خاوەنی پیرۆزی و ئیلاهی راستەقینەش، واتا ئەندامانی کۆمەڵگا بەو کەسانە وەسف دەکەن کە لە پیسایی دروستکراون، بە زمانێکی میتۆلۆژی گوزارشت لە شەڕێکی گەورەی چینایەتی دەکەن.

کەوتنە گەورەکەی کلتووری ئایدیۆلۆژی لەم باسانەدا شاراوەیە. باسە میتۆلۆژییەکانی ئاواکردنی یەکەمین شارستانی، بە تایبەتیش کارامەیی خولقاندنی خوداوەند دەشێت وەکو شێوەی تێکۆشانی چینایەتی بخوێندرێتەوە. هەڵبەتە لەو قۆناخەدا زمانێکی دیکەی گێڕانەوە لە ئارادا نییە. کێبڕکێی نێوان شارەکان و رووخان و سووتاندنیان گەواهی ململانێیەکی کۆمەڵایەتی دژوارە. داستانەکان، رێکخستنی پەنتائۆنەکان، بیناسازی شارەکان و پێکهاتەی گۆڕستانەکان هەڵدێری جیاوازی چینایەتی و ئەو مەودایە بە روونی پیشان دەدات کە لەگەڵ کۆمەڵگای دەرەوەی شاردا دروست بووە. چیرۆکەکانی فیرعەون و نەمرود بەڵگەی بە قووڵی کەرتبوونی کۆمەڵگایە. ئاوازی خێڵەکانیش شوێن پەنجەی زەحمەتی و بێچاردییان بەرامبەر پەلاماردکانی شارستانی لە خۆوە دەگرت.

لە یەکەمین قۆناخی ئاواکردنی کۆمەڵگای شارستانییەوە تا رۆژگاری ئەمڕۆمان نەریتی پێغەمبەرایەتی لە سەرووی ئەو بەرخودانانەوە دێت کە روویانداوە. چیرۆکەکانیان کە بە باسی ئادەم و حەوا، واتا بە دوو مرۆڤە یەکەمینەکە دەست پێدەکات، تەواوی تایبەتمەندییەکانی مۆرکی کلتووری ئایدیۆلۆژی لە خۆوە دەگرێت. ئەگەر بە شێوەیەکی راست ئەو زهنییەتەی شارستانی شرۆڤە بکەین کە ئادەم و حەوا بەرامبەر بە کۆمەڵگای نیولیتیک دەکات بە ئیلاهی، ئەو کاتە دەبینین کە یەکەمین سەرەداوەکانی پێکدادانی سەردار ـ کۆیلە بەدەستەوە دەدات. دەتوانین دیالۆگەکانی ئادەم لەگەڵ خوداوەند و پەیوەندییەکانی لەگەڵ حەوا بەو شێوەیەش

شرۆڤەی بکەین کە بە ئەندازەی جیابوونەوەی ئەفەندی ـ کۆیلە، کەوتنی **"ژن ـ دایک"**یش بۆ پلەی دووەم سەمبۆلیزە دەکات. سەرهەڵگرتنی حەزرەتی نوح هەر وەکو بڵێی کۆمەڵگای نیولیتیک بەرامبەر ئەفەندییە زۆردارەکە لە کەشتییەک باردەکات و لەو ناوچە شاخاوییانەی شارستانی پێی ناگات سەرلەنوێ ئاوای دەکاتەوە. هەڵبەتە چیرۆکەکە بەرامبەر کۆمەڵگای سۆمەر باسی کۆمەڵگای نیولیتیک دەکات کە بۆ لەسەر پێ مانەوە بەرخودان دەکات. گەڕاندنەوەی سەرەتای نەریتی ئەم دوو پێغەمبەرە بۆ قۆناخی ئاواکردنی کۆمەڵگای شارستانی پیشانی دەدات کە بەرخودان لە سەردتاوە هەبووە و بەلانی کەم هێندەی بەردەوامی شارستانی ئەویش هەمیشەیی بووە. هەر وەکو چۆن مێژووی خانەدانەکان مێژووی چینی سەروو بووە، مێژووی پێغەمبەرایەتیش زیاتر مێژووی کلتووری تیرە و قارەمانەکانی بەرخودانە. فاکتەری هاوبەشی هەموویان وەستانیانە لە دژی بتپەرستی.

پێویستە بتپەرستی کۆمەڵگای شارستانی و تەوتەم و ڕەمزە هاوشێوەکانی تیرە لە یەکتری جیا بکرێتەوە. ئەو خوداوەندانەی لە پەنتائۆنی کۆمەڵگای شارستاندا هێنراونەتە لای یەکدی کۆپییەکی وێنەی بەڕێوەبەرانی ئەو قۆناخەیە. گشتیان لە شێوەی مرۆڤن. لەمەش زیاتر خودی مرۆڤە بەڕێوەبەرەکانن. بەڵێ هێرشکردنی پێغەمبەران بۆ سەر ئەم نموونانە (پەیکەر) لەگەڵ هێرشکردنە سەر بەڕێوەبەرەکان لە ناوەڕۆکدا هەمان شتە. **"دژە ـ بت پەرستی"** واتا **"دژە ـ دەوڵەتگەرایی"**یە. واتا بەرخودان و دژبەرایەتییە بەرامبەر تەواوی ئەو هێما و زاراوانەی کە سیمبۆلی ئەوکۆمەڵگایانەن کە بە دەزگابوون. شەڕی نێوان ڕاهیبەکان و پادشا سیاسیەکان ناوەڕۆکێکی جیاوازتری هەیە. ڕاهیبەکان داوای بەشی خۆیان لە پادشاکان دەکەن سەبارەت بەو کۆمەڵگایەی خۆیان ئاوایان کردبوو. تێکۆشانیان لەناو خودی چینی سەروودایە. ململانێیەکی ناوخۆی دەوڵەتە. لەبەرئەوەی خولقێنەری کلتووری ئایدیۆلۆژین،

بە شێوەیەکی نا ڕاستەوخۆش بێت کاریگەری لە پێغەمبەرەکان دەکەن. لە بنەڕەتدا ڕاهیب زانای ئایینی دەوڵەتە. هێندە پەیوەندی بە کۆمەڵی مەدەنییەوە نییە. هەرچی پێغەمبەرایەتییە پێچەوانەکەیەتی. ووتەبێژی کۆمەڵگای دەرەوەی دەوڵەتە.

لایەنی تایبەتی ئەو نەریتەی لە ڕێگای پێغەمبەر ئیبراهیم دەستی پێکراو لەلایەنی حەزرەتی موساشەوە بە دەزگا کرا: بوێری دابڕانی تەواو لە کۆمەڵگاکانی میسر و سۆمەر و ئیرادەی ئاواکردنی کۆمەڵگای خۆیانە. ئاشنای شۆڕشێکی ئایدیۆلۆژی تەواو دەبین. نەمرود و فیرعەون دوو نازناوی سیمبۆلی بەڕێوەبەرانی دوو کۆمەڵگا، دوو دەوڵەتە. تایبەتمەندی بە دەزگابوویان هەیە. گوزارشت لە دەسەڵاتی ڕەها دەکەن. حەزرەتی ئیبراهیم و موسا لە ڕێگای کلتووری ئایدیۆلۆژی، واتا لە میانەی بەرخودانی زهنییەتەوە رادەگەیەنن کە ئەم دەسەڵاتە ناناسن. بۆ ئەم قۆناخە سەرهەڵدانێکی زۆر بەهادارە. هەر وەکو چۆن ئەمڕۆ دروشمی **"دونیایەکی دیکەش هەیە"** گرنگە، لەو قۆناخەشدا رایان دەگەیاند کە لە دەرەوەی جیهانی فەرمی فیرعەون و نەمرود دونیایەکی دیکەش هەیە. لەم پێناوەشدا زۆر لەگەڵ گروپەکانی خۆیان خەریک دەبن. بەر لە هەموو شتێک بزووتنەوەیەکی هیوایە. ناتوانرێت بەشی ئەم چیرۆکە لە بناخەی هێزی ئەمڕۆی ئیسرائیلدا ، بە تایبەتیش لە رووی خۆراکی کلتووری ئایدیۆلۆژییەوە بچووک بکرێتەوە. تەواوی چیرۆک و یۆتۆپیاکانی نەریتی ئیبراهیمی باس لەو بەسەرهات و حەسرەت و بەربەستانە دەکات کە تیرەکان لەلایەن شارستانییەوە دووچاری هاتوون. هەردوو شارستانییەکەش کاریگەرییان لێکردوون. بەڵام دەبێت ئەوە باش شرۆڤە بکرێت کە لە ناوەڕۆکدا چیان رەت کردۆتەوە. وەکو ئەوان ئامانجیان ئاواکردنی شارستانی نییە. شوێنی ئەم راستینەیە لە پێکدادانی نێوان پادشا و راهیبە یەهودییەکاندا گرنگە. تا ئێستا کێشمەکێشی بەم جۆرە لەناو دەوڵەت و کۆمەڵگای ئیسرائیلدا بە هەموو دژوارییەکەوە بەردەوامە. هیتیت،

میتانییەکان، ئاشوورییەکان، ماد - پارس هەرە دواییش گریک - رۆماییەکان شاهیدی میژووییانن. خڵتەی ئەم شارستانیانە لە یادەودرییاندا کەڵەکە بووە. میژوو سالانی ١٦٠٠-١٢٠٠پ.ز وەک قۆناخیکی بریقەداری کلتووری ماددی دەبینیت. پەیوەندییەکانی نیوان هیتیت، میسر و میتانییەکان یەکەمین نموونەی زیندووی دبلۆماسی نیودەوڵەتی پیشکەش دەکەن. عیبرانییەکان نزیکترین قەومی قۆناخن و کە سەیر دەکەن لیی تیدەگەن. بینینی حەزرەتی ئیبراهیم و موسا دوور لەم هات و چویە، تیگەیشتن لییان بە ناتەواوی دەهیڵیتەوە. ئەو وەڵامانەی داویانەتەوە وەڵامی کلتووری ئایدیۆلۆژییە.

حەزرەتی عیسا و محەمەد لەناو ئەم نەریتەدا دوو ریفۆرمخوازی گەورەن. پیگەیان لە بەرزکردنەوەی کلتووری ئایدیۆلۆژیدا بۆ دواتر بەجیبهیڵین.

بابل و ئاشوور دوو ئەڵقەی گرنگن لە بەرزبوونەوەی کلتووری ماددیدا. ئەو شار و بازرگانییەی گەورە بوون لە سەردەمی ئەم دوو پادشایەتییەدا قۆناخیکی مەزنیان بڕیوە. بابل پاریسی سەردەمی خۆیەتی. ئاشوورییەکان غەدارترین نوینەری ئاواکردنی پادشایەتی بازرگانی و ئیمپراتۆریەتن. نەریتیکی بەڕیوەبەرایەتین کە لە رۆژهەلاتی ناویندا هەرە باش نوینەرایەتی کۆمەڵگای ماددی دەکەن. لە چەواشە کردن و هیشتنەوەی کلتووری ئایدیۆلۆژی لە پلانی دووەمدا خاوەن رۆڵە. کلتووری زەردەشتی کە نەریتی ماد - پارس پشتی پیدەبەستیت بۆ ئەوەی دووبارە رۆڵی پیشەنگ بۆ کلتووری ئایدیۆلۆژی بگەڕینیتەوە تیکۆشانیکی مەزنی کردووە. سیانەی زەردەشت - بودا - سوقرات لە ماوەی زەمەنی نزیک لە یەکتردا هەم فەیلەسوفی گەورەی ئەخلاقن، هەم کەسایەتییەکی دانای مەزنن کە بالابوونی کلتووری ئایدیۆلۆژیان بەسەر کلتووری ماددیدا لە کەسیتی خۆیاندا بەرجەستە کردووە و نوینەرایەتی دەکەن. هۆشیارکەرەوە و دەنگی مەزنی ویژدانی مرۆڤایەتین کە

شارستانی دایڕووخاندووە. بەرامبەر بە باڵادەستییە بێ ڕکابەرەکەی جیهانی کلتووری ماددی کە لەو قۆناخەدا لە ئاستی پێگەیشتندا بووە، لە میانەی ژیانی خۆیانەوە پیشانیان داوە کە هەم دەشێت دونیای دیکە هەبێت، هەم خۆشیان لیگەڕی سەرسوڕهێنەری ئەم جیهانەیان پێشکەش کردووە.

لە سەرووی هەموویانەوە ئیسکیتەکان، بەرخودان و دژە هێرشەکانی کلتووری دەوروبەر کە کۆتاییان پێنەهاتووە، بەڵگەی بەردەوامی ئەوەن کە کلتووری ئایدیۆلۆژی بە ئاسانی لەناو ناچێت. ئامۆرییەکان لە کلتووری سامییەکانەوە، هۆرییەکان لە کلتووری ئاریانەوە، ئیسکیتەکانیش لە کلتووری باکووری قەفقاسیاوە، کە بەرەنگاری شارستانی بوونەتەوە پیشانی دەدەن کە ئەڵقەکانی بەرخودانیش بەلانی کەم هێندەی ئەلقەکانی شارستانی بێ پچڕان و بەهێزن. ئەگەر گۆتەکان بۆ شارستانی ڕۆما چ واتایەکیان هەبێت، ئەوا عەرەبە ـ ئامۆریەکان، مادە ـ هۆرییەکان و ئیسکیتەکانیش بۆ ئیمپراتۆریەتەکانی ڕوژهەلاتی ناوین گوزارشت لە هەمان پێگە دەکەن. بەرخودانی کۆمەڵگاکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین چەندین پێهەڵگرتنی ئایینی لە جۆری کرستیانی لی کەم نەبووە.

ج ـ کۆمەڵگای شارستانی گریک ـ ڕۆما نوێنەرایەتی قۆناخی ناوین، سەردەمی پێگەیشتنی مێژووی شارستانی دەکات. دەشێت بە شارستانی چاخی کلاسیکیش بەناو بکرێت. بریقەدارترین پۆتانسیلی کارای شارستانییان پێش خستووە. بە گوێرەی قۆناخی خۆی شکۆدارترین چاخی کلتووری ماددییان خولقاندووە. ئەم شارستانییەی بە سەرکەوتووترین سەنتێزی کلتوورە ماددییەکانی پێش خۆی گەیشتووە دوا گووتەی قۆناخی خۆیەتی. لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا زەحمەتە بڵێین بە کلتوورێکی ماددی وەها گەیشتووین کە لەگەڵ ئەوەی ڕۆما بەراورد بکرێت. ئیندوستریالیزمی سەرمایەداری کە وەکو شۆڕشێک پیشان دەدرێت، شارستانی نییە، نەخۆشی شارستانییە.

قۆناخی ئەسینا کۆتایی کلتووری ئایدیۆلۆژی چاخی یەکەمیش دیاری دەکات. لەلایەنێکەوە فەلسەفە ئەنجامی ئەم راستیەیە. پەنتائۆن وەکو گۆڕستانی ئەو خوداوەندانەیە کە زیندوویی خۆیان واتە بەهای کلتووری ئایدیۆلۆژییان لە دەستداوە. هەر وەکو لە هەموو شتێکدا روودەدات لە لووتکەدا رووبەڕووبوونەوەی ئەم رەوشە، شتێک نییە مایەی تێگەیشتن نەبێت. کۆتایی هەر لووتکەیەک کەوتنە.

مسۆگەرە کە کۆیلەداری بە تەواوی سیستەمێکی کلتووری ماددییە. داڕووخانی مرۆڤایەتی تایبەتمەندی بنچینەیی ئەم سیستەمەیە. داڕووخانێکی هێندە قووڵ لە دونیای هیچ زیندوویەکدا نابینرێت. بەم ئەندازەیە گونجاوی و لەباربوونی بۆ داڕووخانی ویژدانی، لە نزیکەوە پەیوەندی بە شکۆداری و سەرنجڕاکێشی کلتووری ماددییەوە هەیە. تاکو ئێستاش ناکرێت لە بەرامبەر پەیکەرە زەبەلاحەکانی ئەم کلتوورەدا نەلەرزیت و لەلایەکی دیکەشەوە شەیدایان نەبێت. مرۆڤ لەمە زیاتر نابێت بە خوداوەند. بەڵام کاتێک بە خوداوەندکردنی مرۆڤ، مرۆڤ بکات بە ئامانج بۆ کارەسات دەگۆڕێت. بۆ خوداوەندەکان، ئەوانی دیکە هەموویان بەندەن. هیچ یەکێک لە ناکۆکی و ململانێکانی کەرتبوون یان تێکۆشانی کۆمەڵایەتی هێندە بە شێوەیەکی ئاشکرا باڵای نەکردووە. بۆ باشتر تێگەیشتنی داڕووخان راست شیکار کردنی رووداوی "نێربازی" لە کلتووری کلاسیکی یۆناندا، تا دواڕادە فێرکەرە. پەیوەندی ئەمە بە کۆیلایەتی ژنانەوە تەنیا لە رووی پێشکەش کردنی زایەندیانەوە نییە. بەڵکو لەبەرئەوەی لە هەمان دیاردەی کۆمەڵایەتیدا هاوبەشن پەیوەندییان بە یەکەوە سەرنج ڕاکێشە.

کاتێک زیاتر لە نزیکەوە تەماشای کۆیلایەتی ئافرەت بکەین، لایەنی پلیشاندنەوە و دەرخستنی لە مرۆڤایەتی سەرنجمان رادەکێشێت. بەستنەوەی لەماڵدا، تەنیا زیندانی کردنێکی شوێن نییە. تەنانەت زیندانیش نییە. بە قووڵی گوزارشت لە بەستنەوەی بۆ

لاقەکردنی دەکات. هێندەی دەخوازرێت با لە میانەی ڕێوڕەسمەکانی دەستگیرانی و بووکێنی هەوڵی شاردنەوەی ڕاستییە قووڵەکە بدرێت، دیسان یەک ڕۆژ بۆ ئەو کەسانەی خۆیان دەناسن واتای کۆتایی هاتنی کەرامەتی مرۆڤە. ئافرەت لە میانەی ئامرازە هەمەڕەنگەکانی سیستەمی توندوتیژییەوە، لەویش زیاتر لە ڕێگای ئامرازەکانی داڕووخانی ئایدیۆلۆژییەوە ـ بە بابەتی ئەشقیشەوە ـ ئەوەندە لە بەهای هەزار ساڵییەکانی بەرهەم، پەروەردە، بەڕێوەبەرایەتی و ئازادیخوازی دوور دەخرێتەوە و بچووک دەکرێتەوە، کە ئەنجامەکەی لە رادەست بوون خراپترە. واتا بە تەواوی ناسنامەی خۆی لە دەستدەدات و بۆ **"ژنێتی"** دەگۆڕێت (مەبەست ژنی پیاوە). لەبەرچاوی پیاوێکی هەرە ئاسایی، تەنانەت لای شوانێکی چیاش ئافرەت تەنیا بۆ ژنێتی یە، دەتوانێت ببێتە ژنی پیاوێک. هەرچی ژنێتی یە بە واتای مافی هەموو جۆرە مامەڵە کردنێک دێت پێیەوە ـ تەنانەت بەوەشەوە کە هەر کاتێک بیەوێت، دەتوانێت بیکوژێت ـ ئەو تەنیا موڵکێک نییە، بەڵکو موڵکێکی زۆر تایبەتە. بۆ خاوەنەکەشی پۆتانسێلی بوون بە ئیمپراتۆرێکی بچووک لەخۆوە دەگرێت، ئەگەر بزانێت بەکاری بێنێت!

یەکێک لەو کۆڵەکانەی شارستانییان ئامادە کردووە ئەم ڕاستییە بووە. یەکێک لە جۆرەکانی سنوورنەناسی کلتووری ماددیش گرێدراوی ئەم ڕاستییەیە. خواستوویانە ئەو ئەزموونە سەرکەوتووەی بەرامبەر ئافرەت بە دەست هێنراوە، بۆ تەواوی کۆمەڵگای بگوازنەوە. ئەمە دووەمین هۆکاری ترسناک بووە. بۆ ئەفەندییەکان دەبوایە کۆمەڵگاش وەکو ژن ڕۆڵ ببینێت. دواتر هەوڵی ڕوون کردنەوەی دەدەین کە چۆن تەواوکردنی بە ژنکردنی کۆمەڵگا لە سیستەمی سەرمایەداریدا ئەنجامدراوە. بەڵام بناخەی ئەم کردارە لە یەکەمین قۆناخی شارستانیدا دانراوە، هەرچی لە کلتووری گریک ـ ڕۆمادایە خوازراوە ئەمە وەکو نموونەی کۆمەڵگایەکی سەرکەوتوو پێشکەش بکرێت. تەنیا لە میانەی بە

ژنکردنی پیاو دەتوانرێت باس لە بە ژنکردنی کۆمەڵگا بکرێت. کۆمەڵگای گریک ـ رۆما باش هەستی بەمە کردووە و تەگبیری وەرگرتووە. بابەتێکی زانراوە کە رەوشی کۆیلەکانی زۆر لە هی ئافرەت خراپتر بووە. کێشە بە ژنکردنی ئەو پیاوانە بوو کە کۆیلە نین. باس لە پەیوەندی زایەندی نێوان ئەندامانی خێزان، لادانی سێکسی و هاورەگەزبازی ناکەم. رەهەندی دەروونی، تەنانەت هۆکاری جەستەیی ئەو دیاردانەی کە باسیان دەکەم، پێویستە بە جیا هەڵسەنگێنرێت. بە گوێرەی مۆدێلی کۆمەلگای کلاسیکی یونان، هەر کورە لاوێکی ئازاد مسۆگەر دەبێت خاوەنێک یان (هاوجووتێکی سێکسی) پیاوی هەبێت. تا لاوەکە دەبێتە خاوەن ئەزموون، دەبێت خۆشەویستی هاوجووتە سێکسییەکەی بێت. هەر وەکو باسم کرد، تەنانەت سوقراتیش لەو بارەیەوە دەڵێت:**"لەم رووداوەدا گرنگ زۆر بەکارهێنانی لاوەکە نییە، گرنگ ئەوەیە لەم دۆخە رۆحییەدا بژی"**. زهنییەتەکەی ئێرە زۆر ئاشکرایە. لەبەرئەوەی کۆمەڵگای کۆیلایەتی لەگەڵ پرەنسیپی کەرامەت و ئازادی هەڵی نەدەکرد، دەبوایە ئەم تایبەتمەندیانە لەناو کۆمەڵگادا بسڕدرێتەوە، چونکە هەڕەشەیان لە کۆمەڵگای شارستانی دەکرد. راست بوو، شوێنێک ئازادی و کەرامەتی مرۆڤی لێبێت کۆیلایەتی تێیدا ناژی. سیستەم دەرکی بەمە کردووە و پێویستییەکانی جێبەجێ کرووە.

بێگومان کلتووری گریک ـ رۆما نەیتوانی ئەم رۆڵەی خۆی تەواو بکات. لە ناوەوە ئایینی کرستیانی کە لەمیانەی قوتابخانە ئازادەکانی فەلسەفەوە پێشکەوت، لە دەرەوەش هێرش و راپەڕینە بەردەوامەکانی ئەتنیکەکان ئەم کۆمەڵگایەی رووبەڕووی رەوشێکی دیکە کردەوە. ئەو هێمایانەش کەم نەبوون کە دەیانگوت کلتووری ماددی هەموو شتێک نییە و هێزەکەی بارتەقای هەموو شتێک ناکات. بەڵام لە سەردەمی سەرمایەداریدا بە بێ ئەوەی پێویستی بە **"نێربازی"** ببینێت، دەیتوانی کۆمەڵگا بکات بە ژن!

بەرخودانە بوێر و چاونەترسانەکەی کرستیانی و هێزەکانی تیرە

کە ئێش و ئازاری بێ کۆتاشیان رەچاو دەکرد، لەو پێناوەدا بوو کۆتایی بەم کۆمەڵگایە بێنن کە بۆ مرۆڤایەتی بە واتای لەناوچوون دەهات. سازش و رێکەوتنەکانی دواتر نەیانتوانیوە ئامانج و بەهای کلتووری ئایدیۆلۆژی ئەم بەرخودانانە پشتگوێ بخەن. ئەو بزووتنەوانەی بۆ کلتووری ماددیی هیچ گەورە بوونێکیان نییە، هەڵسەنگاندنی هەڵمەتە گەورەکانی دواتریان وەکو هەڵکشانی کلتووری ئایدیۆلۆژی راستترین شرۆڤەیە. نموونەی هاوشێوە لە پەیوەندی و پێکدادانەکانی نێوان ساسانی ـ ئیسلام و کوچکردنی تورانییەکاندا روویدا. ناتوانین لە میانەی ووشە سادەکانی فشار و چەوسانەوە قوولایی کەوتن و هەڵکشانی کۆمەڵگاکان روون بکەینەوە. رووداوەکان زۆر بەرفراوانترن. هۆکاری شیکار نەکردن و هەڵنەوەشانەوەی سەرمایەداری لە نزیکەوە گرێدراوی بەدەست نەهێنانی قوولایی چوارچێوەی پێویستە (شیکردنەوەی کومەڵگای شارستانی). شیکارەکانی دەرهەق بە سەرمایەداری بەو بەشەی چیا سەهۆڵییەکان دەچێت کە دەکەوێتە سەر ئاو. بەشە بنەڕەتییەکە کۆمەڵگای شارستانییە و ئەویش لەژێر ئاودایە.

د. جێگای گفتوگۆیە کە کرستیانی و ئیسلام شارستانییە یان بەها (ئەخلاق)ە. رۆشنکردنەوەی ئەم پرسیارە کە تا ئێستا گەورەیی و گرنگی خۆی دەپارێزێت، وەکو مەزندە دەکرێت هێندە ئاسان نییە. بە تایبەتیش کە بە زۆری ئەوانەی مێشکیان تێکەڵ و ئاڵۆز بووە، خوداناس و باوەڕمەندانی ئیسلام و کرستیانن. لە کوێ و تا کەی سیستەمێکی باوەڕی و ئەخلاق بوون، پەیوەندییان لەگەڵ کۆمەڵگای شارستانی و کۆمەڵگای پەراوێزکراو چی بوو، بە چ واتایەک شارستانیان ئاواکرد یان ئۆپۆزیسیۆنیان بەرامبەر بە شارستانی ئاواکرد؛ لە سەرەوەی ئەو بابەتانەوە دێن کە روون نەکراونەتەوە.

ئەم دوو سیستەمەی ئەخلاق و باوەڕی کە لەناو هەلومەرجی ئیمپراتورییەتی ساسانی و گریک ـ رۆمادا پێکهاتوون ـ شرۆڤەی

منه- بەرامبەر بە کلتووره ماددییه زەبەلاحەکەی سیستەمی کۆیلەداری و بەها ئایدیۆلۆژییه زۆر تێکچووەکەی، بە واتای هەڵمەتێکی گەورەی کلتووری ئایدیۆلۆژی دێت. ئەگەر بە واتای ئاواکردنی کۆمەڵگایەکی نوێی شارستانی بهاتنایه، هەر وەکو لە تەواوی ئاواکردنە کلاسیکییەکاندا دەبینرێت پێکهاتەی شار و چینیان بە بنەما دەگرت. ئامانجی شار و چینیان هەبووە. بەڵام لەپێناو گەیاندنی بە بەهای ئەخلاق و باوەڕی خۆیاندا کردبوویان بە ئامانج؛ نەک بۆ ئەوەی خۆیان ببن بە کۆمەڵگای شارستانی. لایەنی لە پێشیان بە ئامانج کردنی دەسەڵات، واتا دەستگرتن بەسەر کلتووری ماددیدا نییە، بە پێچەوانەوە ئامانجیان فەراهەمکردنی هەیمەنەی کلتوورێکی ئایدیۆلۆژیی نوێیە کە بەرامبەر بە هەبوونی زەبەلاحانەی کلتووری ماددی مرۆڤایەتی بپارێزی، چونکە بەرامبەر کلتووری ئایدیۆیۆلۆژی ناهاوسەنگ بوو و واتای خۆی لەدەست دابوو.

هەر بۆیە نرخاندنی چاخەکانی کرستیانی و ئیسلامی وەکو سیستەمی شارستانی ناتەواوە و تێگەیشتنی چەوت لەگەڵ خۆیدا دێنێت.

دەبێت بە بایەخەوە ئاماژەی پێبکرێت کە هەرەسهێنانی رۆما هەرەسهێنانی شارستانییەکی هەرەمەکی و ئاسایی نییە. لە کەسایەتی رۆمادا بەلانی کەم نەریتی کۆمەڵگای شارستانی چوار هەزار ساڵە هەرەسی هێناوە. راستتر بڵێین هەڵوەشێنراوەتەوە. لەبەرئەوەی بابەتەکەمان هۆکارە ناوخۆیی و دەرەکییەکانی هەرەس نییە، بە کورتی ئاماژەی پێدەکەم. ئەو بابەتەی ئێمە بە دوایدا دەگەڕێین پێگە و پەیوەندی بەهاکانی کۆمەڵگای شارستانییە بە هەرەسهێنانی گشتییەوە. جگە لە چین ـ لە ساڵانی ١٠٠پ. ز دا بەئەوێش گەیشتووە ـ زۆر بە ئاسانی دەتوانرێت بگووترێت کە رۆما نوێنەرایەتی تەواوی شارستانییەکانی یەکەمین و کلاسیک دەکات. ئەمەش نەک تەنیا لە رووی دەزگای کۆیلایەتییەوە، بەڵکو لە رووی کلتووری ماددی

و مەعنەویەوە. دەبێت بە گرنگییەوە ئاماژە بەو خاڵەش بکەین کە هۆکاری بەرفراوان تاوتوێ نەکردنی راستیەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئانالیزکردنی کۆمەڵگا بەگوێرەی رووداوە رۆژانەییەکانی داگیرکاری ء فشار. گەورەترین چەقبەستنی پۆزیتیڤیزم سەبارەت بەم بابەتەیە. لەوانەیە مەترسیدارترین لایەنەکانی هزری ئەوروپاش پەیوەندی بەم دەرکەوتنە پۆزیتیڤیستەوە هەبێت. تا کۆمەڵگاکان بە قووڵایی کلتووری ماددی و ئایدیۆلۆژی، ناکۆکی و پێکدانەکان، هاوسەنگی و نەگونجاوییەکانییەوە تاوتوێ نەکرێن، شرۆڤەیەکی واتادار ناکرێت، لەم سۆنگەیەوە پارادیگما بۆ ژیانێکی ئازادانەتر ئاوا ناکرێت.

کاتێک لە میانەی ئەم روانگەیەوە تەماشای بکەین دەبینین ئەوەی کە بە زۆری لەگەڵ رۆما هەرەسی هێناوە: کلتووری ماددی کە بە ئاستێکی زەبەلاحی گەیشتووە، لەگەل کلتووری ئایدیۆلۆژییە کە هیچ پەیوەندییەکی بە ژیانی واتاداردوە نەماوە. تەنانەت ئاواکردنی بیناسازی رۆما وەک شار لووتکەی نەریتی بیناسازی چوار هەزار ساڵ بەر لە خۆیەتی، لە سەرووی هەمووشیانەوە میسر. بە هەمان شێوە پەنتائۆنی رۆما دواترین و شکۆدارترین دۆخی نهۆمی سەرەوەی پێکهاتە (بونیاد)ی زەقورەکانی چوار هەزار ساڵ پێشتری راهیبەکانی سۆمەرە. دەستنیشان کردنی ئەم بابەتانە بۆ من زەحمەت نییە. هەر بۆیە ئەو کلتوورە ماددی و ئایدیۆلۆژییانەی هەرەسیان هێناوە بەلانی کەم تەمەنیان چوار هەزار ساڵە. کاتێک تەماشای رووخانیان و ناسنامەی ئەوانە بکەین کە رووخاندیانن دەتوانین شیکارێکی هاوشێوە بۆ هەردووکیان پێشبخەین. واتا لە یەکەمین هێرشەکانی ئامۆری و هۆرییەکانەوە تا دەگاتە دوا پەلامارەکانی گۆتییەکان، هێرشەکانیش یەکپارچەن. مێژووی بەرخودان و هێرشی ئەمانەش بەلانی کەم چوار هەزار ساڵە. ئەو بەرخودانەی لە ناوەوە بە **"نوح"**ی پێغەمبەر دەستی پێکرد و تا پێغەمبەر محەمەد هات وەکو ئەڵقەکانی زنجیرێک خاوەن مێژوویکی

درێژخایەنە. نەک تەنیا لە رووی ماوەوە بەڵکو جێگاکەشیان واتای مەزن لەخۆوە دەگرێت. پشتبەستن بە بیابانی عەرەبستان و بنارەکانی زاگرۆس ـ تورۆس، بیابانەکانی ئاسیای ناوین و قووڵایی دارستانەکانی ئەوروپا، لە پێکهاتنی کلتووری ماددی و مەعنەوی تیرە کۆچبەرەکاندا شوێن پەنجەی قووڵی بەجێهێشتووە. چیرۆکی هەر پێغەمبەرێک پیشانی دەدات کە دەستە و گرووپی دەوروبەری بە چ زۆر و زەحمەتییەک پێکهاتوون. ئەو کۆمەڵناسییەی مەڵبەندەکەی ئەوروپایە تەنانەت ناخوازێت ئەم بابەتە بخاتە رۆژەڤی خۆشییەوە. هەر بۆیە کاتێک بگووترێت پێکهاتەی زانیارییەکن کە ناوەندەکەی ئەوروپایە چەوت یان هەڵە نییە. تا شرۆڤەیەکی واتاداری مێژووی شارستانی نەکرێت رۆما پێناسە ناکرێت، تا مێژووی راستەقینەی رۆماش دەستنیشان نەکرێت، سەرچاوەکانی کلتووری ماددی و ئایدیۆلۆژی ئەوروپاش پێناسە ناکرێت.

مێژووی دوو سەدەی بەر لە هەرەسی روما وەکو سالانی تاریکی و ئالۆزی دەنرخێنێت. هەر بۆیە رووخان کاری رووداوی سالانە نییە.

دەتوانرێت هەمان شرۆڤە دەرهەق بە جمکەکەی یان هاوشێوەکەی رۆما لە رۆژهەلات، دەرهەق بە ئیمپراتۆرییەتی ساسانی پێشبخرێت. چیرۆکی دەوڵەتی راهیبی سۆمەرە لە رۆژهەلات. ئەگەر بە رێژەیەکی سنوورداریش بێت فاکتەری زەردەشتی کە لە بونیادەکەیدا هەیە کارەکتەری ئەخلاقیانەی بەهێز کردووە. بەلام هەر وەکو چۆن بودا نەیتوانیوە ئاواکردنی کۆمەڵگای شارستانی راجاکان بەربەست بکات کە کلتوورێکی ماددی سەیر قورساییەکەی پێکدەهێنا، دیسان سوقرات نەیتوانی تێکچوونی بنەمای ئەخلاقی کلتووری یۆنان بەلاوە بنێت، زەردەشتیش نەیتوانی خۆنواندنی کلتووری ماددی پارس و ساسانی بەربەست بکات. مێژوو پیشانی دەدات کە دوا قۆناخەکانی ئیمپراتۆرییەتی ساسانی ئێرانی لە رۆما جیاوازتر نەبووە. لە باکووری رۆژهەلات پەلاماری تورانییەکان، لە

ناوەوەش گرگرتنی باوەڕی و مەزهەبەکان کەمێک مابوو کۆتایی بە ئیمپراتۆرییەت بێنێت. کاتێک بزووتنەوەی مانیش پاکتاو کرا (٢٥٠ی زایینی) کە دەرکەوتنێکی بەهێزی کلتووری ئایدیۆلۆژی بوو، لە موتوربەکردنی ئەو گەنجێتیەش بێبەش بوو کە پێویستی پێی هەبوو. ئەگەر چەند شەڕێکی ئیسلامەکان نەبوایە، هەر وەکو راهیبە کاسۆلیکەکانی رۆژئاوا، راهیبە نەستوورییەکان[1]یش - وەک ئیمپراتۆرەکانی کلتووری ماددی، سەردەمێک ئیمپراتۆی کلتووری مەعنەویش دروست بوو بوون - لە دەروازەی تەواوکردنی فەتحی کلتووری ئایدیۆلۆژی ئێران و پایتەختەکەیدا بوون. بەڵام فەتحی ئیسلامییەکان ئەم گۆڕانکارییەی بەربەست کرد.

دوای ئەوەی بەم جۆرە واتاکانی هەرەسی دوو شارستانی گەورەی کۆیلەداریمان پێناسە کرد، با بیینە سەر پێناسە کردنی هەردوو بزووتنەوەی بەناوبانگی کرستیانی و ئیسلامی و دەستنیشان کردنی هەلومەرجەکانیان، کە خۆیان وەکو ئەلتەرناتیفی ئایدیۆلۆژی دەناساند.

رۆما لە کاتی ئاواکردنی کۆمەڵگای فەرمی خۆیدا، چەندین توێژی مارژینالی بەرفراوانیشی لەگەڵ خۆیدا ئافراند. ئەمانە گروپە کۆچەرە نەریتیەکانی قەوم نەبوون. هیچ تایبەتمەندییەکی ئەتنیکیان لە خۆوە نەدەگرت. تاقمە بێ پۆلێن و بێکارەکان بە گووتەی رۆماییەکان گروپێکی نوێ بوو کە **"پرۆلیتار"**یان پێ دەگووتن. بە گروپە خاوەن ئایدیۆلۆژییەکان نەدەژمێردران. تەواو لەناو بۆشاییدا مەلەیان دەکرد. جۆرێک لە بێکارەکانی سەردەمی کۆیلەداریبوون. کامە ئایدیۆلۆژی دەستی بۆ ببردنایە دەیکردن بە بنکەی خۆی. لە سەردەمی ئیمپراتۆرییەتی رۆمادا زەمینە پڕ بوو لەمانە. بۆ یەکەمین

---

١. نەستوورییەکان: شوێنکەوتوانی مەزهەبی نەستۆریسی کرستیانن (٣٨٦-٤٥١) کە دەڵێت یەسوعی مەسیح لە دوو کەسایەتی پێکدێت: ئیلاهی کە گوتەیە، مرۆیی ئەویش یەسوع، لای ئەوان یەکێتی نێوان سروشتی ئیلاهی و مرۆیی لە کەسایەتی یەسوعی مەسیح جێگای باس نییە ، بەڵکو تەنیا پەیوەندیەک لەنێوان مرۆڤ و خوداوەند هەیە. هەروەها دەڵێ مەریەم دایکی خودا نییە؛ بەڵکو دایکی سروشتی مرۆییە لە یەسوعدا. بەهۆی بیروباوەڕەکەیەوە ئیمپراتۆر تیۆدۆسیۆسی دووەم بۆ مێرگێکی بیابانی لیبیا دووری دەخاتەوە، هەر لەوێ کۆچی دوایی دەکات.

جار لە مێژوودا چینێکی کۆمەڵایەتییان پێکهێنابوو. پەیتا پەیتا ئەو تەریقەتانە دروست دەبوون، کە ئەم چینە بنکەکەیان بوو. هەر وەکو ئەسەنییەکانی بەر لە سەرهەڵدانی حەزرەتی عیسا.

تاکو ئێستا گفتوگۆ لەبارەی ئەو پرۆسەیەوە دەکرێت ئایا عیسا مرۆڤێکی راستییە یاخود رەمزێکە کە هەلومەرج سەپاندوویەتی. ئەم خاڵە سەبارەت بە بابەتەکەمان گرنگ نییە. لە ساڵانی لە دایکبوونی عیسادا جا ئەمە بەرجەستە بێت یان تیۆری، رۆما لە کەسایەتی یەکەمین ئیمپراتۆر (ئەگۆستس) دا بە لووتکە گەیشتووە. لە ئاکامی فەتحی رۆژهەڵاتی دەریای سپییەوە، دوای بەرخودانە مەزنەکانی پێشووتریان پادشایەتی یەهوودییەکانیش فەتحکرا. لە رێگای والی گشتییەوە بەڕێوەدەبرا. بەکرێگیراوێتی مەیلێک بوو کە چینی سەروو لە بارەیەوە کارامە و شارەزا بوون. بە گوێرەی ئەوەی یەهودییە بەکرێگیراوەکان لە سەردەمی نەمرود و فیرعەونەکانەوە خاوەن ئەزموون بوون لە بەکرێگیراوێتی کردن بۆ رۆماش زەحمەتییان نەدەبینی. بەرامبەر بەمەش لە سەردەمی حەزرەتی ئیبراهیم و موساوە بەردەوام مەیلێکی بەهێزی ئازادیخوازیش هەبووە. حەزرەتی عیسا بەردەوامی ئەم نەریتە بوو. بەردەوام قودس وەکو کچە شۆخێک شێوە دەکرێت کە بۆ تاج لەسەرنان ئامادەیە. لە باسەکانییەوە تێدەگەین کە حەزرەتی عیسا بە واتای ئایدیۆلۆژی داوای ئەم کچە دەکات. دەتوانین شرۆڤەیەکی بەم جۆرە بکەین کە دوا جووڵانەوە و ئەنجامگیر بوونی بە لەخاچدان سەرچاوەی خۆی لەم ئامانجەوە وەردەگرێت. لە دەستپێکدا نەبزاوتێکی رێکوپێکی رێکخستنی، نە مانیفیستۆی ئایدیۆلۆژی هیچیان جێگای باس نین. گروپێکی بچووکی هەیە کە هەمان پێگەی ئەویان هەیە و پەیوەندییەکی خاو لە نێوانیاندا هەیە. ئەمانەش پێشەنگەکانی یەکەمینن کە بە حەوارییەکان دەناسرێن. ناتوانرێت بگووترێت کە لەناو پلەداری، ئەتینک و فەرمیبووندا پێگەیەکیان هەبووە. لەخاچدان سیستەمێکی سزادانە کە بەردەوام لە ناوچەکەدا پەیڕەو

کراوە. داهێنانێکی ترسناکی رومایە: هەر وەکو دەرخوارد دانی شێرەکان. هەر وەکو دەزانرێت ئەوانەی لەمە ترساون لە یەکەمین دەرفەتدا بەرەو ناوەوەی سوریا و کەنارەکانی رایان کردووە. لای حەزرەتی ئیبراهیمیش لە ترسی نەمرود جوولەیەکی پێچەوانەی ئاراستەی ئەمە جێگای باسە، واتا بەرەو قودس دواتریش بەرەو ئەو ناوچەیەی ئاوایدەکات. ئاساییە لەم قوناخەدا هاتووچۆیەکی هاوشێوە لە ئارادا بێت. بەلام تەنیا دوای سەدەیەک یەکەمین گەلالەنامەی ئینجیل ئامادە دەکرێت. بۆ نموونە **"ئینجیلی مارسیور"** کە ئەمڕو لە ئارادا نەماوە، یەکێکە لەم یەکەمین گەلالە نامانە.

کرێدراو بە شوێنپێی ئیمپراتورەکانی رۆما لە سەدەکانی دووەم و سێیەمدا یەکەمین **"عەزیز"**ەکان دەردەکەون. سەدەی چواردم تەواو سەدەیەکی کرستیانییە. کاتێک ئیمپراتۆر قوستەنتین کرستیانی وەکو ئایینی فەرمی رادەگەیەنێت هەم هەبوونی **"عەزیز"**ەکان هەم ژمارەی گروپە باوەرهێنەرەکان تەقینەوە بە خۆیەوە دەبینێت. لەم قوناخەدا یەکەمین جیابوونەوەی مەزهەبەکان و کرستیانی فەرمی (کرستیانی دەولەت) دەکەوێتە رۆژەڤەوە. هەر وەکو دەزانرێت لە ئایینی کرستیانیدا **"باوەڕی سێیانە"** زالە. دەشێت دایک ـ باوک ـ کوڕ وەکو وێنەی خوداوەند شروڤە بکرێن. لەگەڵ ئەوەی بابەتەکەمان گفتوگۆی تیۆلۆژی نییە، بەلام باش دەزانرێت کە بنەماکانی ئەم باوەڕییە بۆ زۆر کۆن دەگەڕێتەوە. سۆمەرییەکان یەکەم کۆمەڵگابوون کە ئەم باوەڕییەیان بۆ زەقورەکان گواستەوە. دایکە ـ خودواوەند **"ئینانا"**، خوداوەنی باوک **"ئەن"** و خوداوەندی کوڕ **"ئەنکی"** یەکەمین پەنتائۆنی سیانییە. هەر بۆیە نابێت ئەم گوتەیە پشتگوێ بخرێت کە دەڵێت: کرستیانی بە شێوەیەکی بەهێز کاریگەری **"پاگانیزم"** (بتپەرستی)ی لەسەرە. بەلام ئەوەی زۆر سەیرترە، ئەوەیە کە حەزرەتی عیسا لە نەریتی عیبرانییەوە هاتووە یان وەها لە قەڵەم دەدرێت. نەریتی ئیبراهیمی بە توندی لەگەڵ پاگانیزم ناکۆکە. لەو رەوتە ئایینیەدا کە بە ناوی عیساوە

بەرخودانییان کردووە، هەر وەکو بلێی هەردوو نەریت سازشیان لەگەڵ یەکدی کردووە. بە گوێرەی من شرۆڤەی راستیش ئەمەیە.
ئەو بابەتەی مێشکی مرۆڤ ئاڵۆز دەکات دواتر رێگای لە پێش گفتوگۆ، پارچەبوون و پێکدادانی نێوان مەزهەبەکان کردۆتەوە، عیسا خاوەن ناوەڕۆکێکی ئیلاهی یان مرۆییە گەوهەری پێکدادانەکانی پێک هێناوە. کاتێک ئەم جیاوازییە شرۆڤە کرا، ئەوانەی دەیان گووت خاوەن ناوەڕۆکێکی ئیلاهییە زیاتر ئەو کەسانەبوون کە کرستیانی فەرمییان پەسەند کردبوو. خودی **"قوستەنتین"** لەو کەسانە بوو کە ئەم شرۆڤەیان پەسەند کردبوو، واتا ئیلاهیبوونی عیسای پەسەند کردبوو. هەر وەکو دەزانرێت دەوڵەت ئیلاهییەتێکە کە خوداوەندی بوونەکەی فەرمی بووە. بناخەکەشی لەلایەن راهیبەکانی سۆمەرەوە دانراوە. بۆ یەکەمین جار جیابوونەوەی ئایینەکان بە گوێرەی دوو بنەمای کۆمەڵگا لە سۆمەرییەکانەوە دەست پێدەکات. هەرچی خوداوەندیبوونی مرۆڤە لە کلتووری کۆمەڵگای نیولیتیکدا ماوەتەوە یاخود پاشماوەی گرنگی ئەم کلتوورە لەخۆوە دەگرێت. پاگانیزمیش کارەکتەرێکی مرۆییە، شرۆڤە یاخود مەیلی ئایینی ئەو گروپانەیە کە بەدەوڵەت نەبوون (لە دەرەوەی کۆمەڵگای دەوڵەتن). هەر وەکو جیاوازی نێوان مەزهەبی فەرمی سوننی (ئایینی دەوڵەت) و مەزهەبی عەلەوی (ئایینی کۆمەڵگای دەرەوەی دەوڵەت) ئایینی ئیسلامە. لە سەدەی چوارەمدا دوو وەرچەرخانی گەورە لە کرستیانێتیدا روودەدات. یەکەمیان، گۆڕانێتی بۆ ئایینی دەوڵەت. ئەمە لە هەمانکاتدا شێوەی بوونێتی بە ئایینی شارستانی. ئەو قەیرانە مەعنەویەی کلتووری ماددی رۆما بەدەستییەوە دەیناڵاند، واتا قەیرانی مەشروعییەت بەم جۆرە هەوڵی تێپەڕاندنی بۆ دراوە. دووەمیشیان بەگەلەریبوونێتی. لە باوەڕی گروپی تەسکی عەزیزەکانی سەدەکانی یەکەم دەرچووە، بووە بەئایینی فەرمی یان نا فەرمی گروپە مەزنەکانی گەل. ئەرمەنی، ئاشووری، هێلینییەکان و لاتینەکان لە سەرووی ئەم گەلانەوە دێن.

بەم جۆرە ددربازی زەمەنە "ماوە" بەناوبانگەکەی چاخی ناوین دەبن: واتا لەلایەک رومای ئۆرژینالْ کە هەرەسی هێناوە و رۆمای قوستەنتین کە پشت بە مەشروعییەتی ئایینی کرستیانی دەبەستێت جێی گرتۆتەوە؛ لەلایەکی دیکەشەوە گەورەبوونی رەنوو ئاسای کرستیانی کە وەکو هەلمەتێکی گەورەی کلتووری ئایدیۆلۆژییە. ئەم دوو ئەکتەرە **(ئایینی خوداییانەی فەرمی و ئایینی خوداوەندە نا فەرمییەکان)**ی ئەو ماوە زەمەنییەی بە چاخی تاریکی ناودەبرێت پێویستی باوەڕی **"سێینە"** ئایینی کرستیانی پێکدەهێنن. پارچەبوونی دیرۆکی لە چاخی ناوینیشدا بە گۆرانکارییەوە بەردەوام دەبێت. پێکدادانی نێوانیشیان زۆر خوێناوی بووە. پێکدادانی پێشتر کە لەگەڵ پاگانیستەکاندا لە ئارادا بوو، بۆ پێکدادانی نێوان عیسای خوداوەند و عیسای مرۆڤ گوڕاود. لە دوا شیکاردا ئەوەی روویداوە، نەریتی ململانێی کۆنی نێوان هێزدکانی شارستانی و هێزە چینایەتی و ئەتنیکییەکان لە هەلومەرجی نوێ و لەژێر دەمامکی تازەدا درێژەی پێدەدرێت.

شرۆڤەیەکی ئاشکراتر سەبارەت بەم پارچەبوونە بەم جۆرەیە: توێژێک کە خاوەن بنەمای قوولی هەڵمەتی کلتووری ئایدیۆلۆژی نوێیە بە شارستانی بووە، سازشی لەگەڵ کلتووری ماددیدا کردووە، هەر بۆیە خراپ بووە، بەشەکەی دیکەش دوورە پەرێزی لە سازش کردووە، بەدوای هەیمەنەی کلتووری ـ ئایدیۆلۆژییەوە بووە.

لێکدانەوەی ماوەی هەزار ساڵی دوای هەرەسی رۆما، واتا قۆناخی نێوان ساڵانی ٥٠٠ ـ ١٥٠٠ی زایینی، وەکو سەردەمی کێشمەکێش، پێکدادانی مەزن و سازشکاری نێوان ئەو مەیلەی خوازیارە درێژە بە باڵابوونی کلتووری ماددی بدات لەگەڵ ئەو مەیلەی ناخوازێت دەستبەرداری باڵابوونی کلتووری ئایدیۆلۆژی بێت، لە رووی واقیعیەتی مێژووییەوە وەڵامێکی تۆکمەترە. دەشێت شرۆڤەکانی **"چاخی ناوینی تاریک"** و **"چاخی دەرەبەگایەتی"** وەڵامی رێژەیی ئەم واقیعە بن.

هەرەسی کلتووری ماددی رۆما ناوەڕۆکی بنەڕەتی ئەم هەزار ساڵە دیاری دەکات. ئەو وەڵامانەی بدرێتەوە بۆ پرسیاری ئایا کرستیانی یاخود فاکتەرەکانی کلتووری ماددی و کلتووری ئایدیۆلۆژی دیکە ئەم بۆشاییەیان پڕکردۆتەوە کە لەئاکامی هەرەسی رۆما هاتۆتە ئاراوە؟ دەشێت دەرفەتی هەڵسەنگاندنێکی بەهێزتر بدات.

وەک فاکتەرەکانی کلتووری ماددی لە رۆژهەلات بێزەنت، لە رۆژئاوا، راستتر لە تەواوی ئەورووپادا هەڵمەتی ئەو شارۆچکانە لە ئارادایە کە تازە ئاواکراون.

لە راستیدا دەتوانین مێژووی کلتووری ماددی ئەورووپا بە بزاڤی ئەم شارانەوە ببەستینەوە. ئەگەر کۆنترین رەگی شارێکی وەک پاریس وەکو جێنشینێکی سەدەی چواری رۆما هەڵسەنگێنین، کاتێک دەگەینە سالانی ١٥٠٠ ناتوانین باس لە حاکمییەتی کلتووری ماددی (ئەورووپا) بکەین. ئەو شارانەی سەریانهەڵداوە هەر وەکو چون لەگەڵ رۆما بەراورد ناکرێن، پێکهاتەی شارەکانی میزۆپۆتامیای سالانی **"٣٠٠٠ - ٢٠٠٠پ.ز و ٦٠٠ - ٣٠٠پ.ز"**ی هەردوولای ئیجەی بە رادەیەکی ئەوتۆ تێپەڕ نەکردووە. ئەو کۆشکانەی ئاواکراون ئەوەندە قەڵاو کۆشکەکانی سالانی ٢٠٠٠ - ١٥٠٠ پ.ز بنارەکانی زاگرۆس - تۆرۆسیان تێپەڕ نەکردووە. بە کورتی دەتوانین بڵێین شارە گەورەکانی قۆناخی نێوان سالانی ٥٠٠ - ١٥٠٠ ی زایینی توانای تێپەڕ کردنی **"چاخی تاریکی"** نەبووە، کلتووری مەعنەوی نوێ، هێشتا کرستیانی زیاتر پێشەنگی هەیمەنەی کلتووری ئایدیۆلۆژییە. بێگومان بالابوونی کرستیانی بۆ مێژووی ئەورووپا زۆر گرنگە. شرۆڤەی مێژوونووسان لە بارەی ئەم قۆناخەوە کە بۆ ئەورووپا لە جیاتی فەتحکردنی لەلایەن کلتووری ماددییەوە، هەڵسەنگاندنی وەکو فەتحکردنی لەلایەن کلتووری مەعنەوییەوە، واتا فەتحکردنی لە میانەی بەهای مۆراڵ و باوەڕی کرستیانییەوە شرۆڤەیەکی گونجاو و لە جێگای خۆیدایە.

پرسیاری گرنگ و سەرەکی ئەوەیە، بۆچی رۆما تەنیا لە ئاستی کلتووری ماددی دوو هەزار ساڵ پێشتردا مایەوە؟ گرنگتریش ئەوەیە سیستەمێکی بەهای مۆراڵ و باوەڕی وەکو کرستیانی کە ناتوانێت تینوێتی و پێویستی کلتووری ئایدیۆلۆژی بڕەوێنێتەوە چۆن توانای فەتحکردنی ئەورووپای پیشاندا؟ هۆکارێکی گرنگ پاکیزەیی نیولیتیکی ئەورووپایە. چی بچێنێت دەیدروێتەوە. هەڵبەتە مێژووی هەزاران ساڵ ئەم راستییەی سەلماندووە. دووەمین هۆکار دەشێت سەرچاوەکەی دەرەکی بێت: هەرەشەی پەلاماری تورکە موسڵمان و پاگانەکان، هەڕەشەی پەلاماری عەرەبەکان لە باشوورەوە لە رێگای سیبمیلیا و ئیسپانیا. کاتێک ئەم دوو فاکتەرە یەکدەگرن دەشێت باشتر دەرک بە ماوەی درێژی "تاریکایی" ئەورووپای چاخی ناوین بکرێت. پێویستی بە کرستیانی هەبوو، چونکە پاگانیزم لەگەڵ رۆما هەرەسی هێنابوو. پاگانیزمی ئەورووپا بەر لە کرستیانی لە مێژ بوو ناتەواوی واتای موراڵ و باوەڕی خستبووە ڕوو. بەم جۆرە وەکو فاکتەرێکی کلتووری ـ ئایدیۆلۆژی هەلومەرج و زەمینە بۆ هەژموونگەرایی ئایینی کرستیانی لە باربوو. کلتووری ماددی ئەورووپا بەردەوام بەرامبەر بە رۆما کز و لاواز ماوە. نەیدەتوانی کێبڕکێ لەگەڵ کلتووری ماددی رۆژهەلاتیش بکات. لە میانەی ئەو جڤاتانەوە کە تازە لە نیولیتیک دەرچووبوون پاریسی شکۆدار ئاوا نەدەبوو. بە بڕوای من ئەم دوو نا تەواوییە، واتا زۆر دووربوونی کرستیانی لە سیستەمێکەوە کە برسێتی کلتووری ئایدیۆلۆژی بڕەوێنێتەوە، هەروەها مانەوەی بونیادی شارەکان لە ئاستی چەند هەزار ساڵێک بەر لە خۆیدا، رێگای هەڵمەتە گەورەکەی کلتووری ماددی سەدەی شازدەهەمی ئەورووپای کردەوە.

پەیوەندیەکی توند لە نێوان هەڵمەتی گەورەی کلتووری ماددی و هەژموونگەرایی ئایینی کرستیانیدا هەیە کە وەکو کلتووری ئایدیۆلۆژییە. خۆی لە خۆیدا پێکدادانە گەورەکانی نێوان ئایین و مەزهەبەکان ئەمە پشتڕاست دەکاتەوە. سەرمایەداری ئەورووپا وەکو

هەڵمەتێکی سەرسوڕهێنەری کلتووری ماددی، لاوازییەکانی ئایینی کرستیانی باش بەکارهێناوە کە لە فاکتەرە بەهێزەکانی ئایدیۆلۆژی بێبەشە؛ ئەوەی کە هیچ شارستانییەکی پێشتر بوێری بۆ نەکردووە ئەم کردوویەتی، بەردەوام خۆی شاردۆتەوە، سوودی لە بۆشایی درزەکانی ناو کۆمەڵگا بینیوە و لە سەر پێیان ماوەتەوە، تەریقەتی **"کاڵا- بەرز کردنەوەی بەهای ئاڵوگۆڕ- بازرگان - قازانج"**ی کردووە بە هێزی فەرمی شارستانی و لە ئاواکردنی چاخێکی نوێدا سەرکەوتنی بە دەست هێناوە. بەم جۆرە توانیویەتی لە قۆناخی ناوینی کلتووری ماددی ڕۆماوە بەرەو قۆناخی دوایی بپەڕێتەوە. لە بەشی دواتردا بە شیوەیەکی بەرفراوان شروڤەی دەکەین ئایا ئەم چاخەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پێدەڵێن وەکو قەیرانی شارستانی یاخود شێوە شێرپەنجە بووەکەی یان وەکو دوا قۆناخی پیری ءو پەککەوتەیی شروڤەی بکەین.

چیرۆکی ئیسلام بابەتێکی ئاڵوزترە. هەم شارستانیبوونی خێرای، هەم لە ڕۆژانی سەرەتاوە پێکدادانەکانی لەگەڵ ئایینی یەهودی و کرستیانیدا و پێکدادانی مەزهەبەکانی ناوخۆی، بەسە بۆ پیشاندانی تێکەڵی بابەتەکە.

دووسەد ساڵی بەر لە حەزرەتی محەمەد هەر وەکو پێشتریش ئاماژەمان پێکرد، دەشێت وەکو قەیرانی دوا قۆناخی شارستانی کۆیلەداری شرۆڤە بکرێت. کرستیانی بە شێوەیەکی بەهێز لەم قەیرانە دەردەچێت. دەبێتە یەکەمین و گەورەترین بزووتنەوەی توێژە هەژارەکانی کۆمەڵگا. هۆگری گەلانی هەژاریشی بە دەست هێنابوو، لەم سەد ساڵانەدا دێرەکان زۆر دەبن. کرستیانی دەبێت بە هێزێکی ئەڵتەرناتیف. سەرباری ئەوەی چەندین گرفتیان لەگەڵ یەکدا هەیە، بەڵام لەبەرئەوەی لە هەمان ریشەوە هاتوون، لەگەڵ ئیسلامدا بە یەکەوە تاوتوێیان دەکەین، بە شرۆڤە کردنی ئەگەری ئەڵتەرناتیفەکانی دیکە و دەرکەوتنی ئیسلام کۆتایی بەم بەشە دەهێنم.

شرۆڤە کردنی سەرهەڵدانی ئیسلام پێویستی بە تاوتوێکردنی چەندین فاکتەر هەیە. یەکەمیان، ئیسلام دوا ئایینی نەریتی ئیبراهیمییە. بەم جۆرە خۆی بونیاد دەنێت. بەم شێوەیە بنەماکانی بە لانی کەم بۆ شێوازی ئیبراهیمی دوو هەزار ساڵ پێشتردەگەڕێتەوە. ئەو دەرئەنجامەی لێی کەوتۆتەوە، پێکدادانی عەرەب ـ ئیسرائیلە، کە لە واتایەکدا لە پێکدادانی نێوان دوو مەزهەبی هەمان ئایین دەچێت.

دووەمیان، زهنییەتی مەککە کە شوێنی دەرکەوتنی وەکو چاخی جاهلییەت (نەزانی) هەڵدەسەنگێنێت. جۆرێکە لە رەخنە کردنی پاگانیزمی مەککە.

سێیەمیان، بە تایبەتی حەزردتی محەمەد خۆی لەبەرئەوەی لەگەڵ راهیبە نەستورییەکاندا لەناو دیالۆگدا بووە، بۆیە دەشێت پەیوەندی بە کرستیانییشەوە هەبێت.

چوارەمیان، لە سەرەتادا بوونی بە خەباتکارێک ء دواتر مێردی خەدیجەی بازرگان پەیوەندییەکەی لەگەڵ بازرگانیدا روون دەکاتەوە.

پێنجەم، بە توندی کاریگەری زەمینەی خێڵگەرایی لەسەرە، کە بەردەوام لەناو عەرەبەکاندا لە رۆژەڤدایە و بناخەکەی بۆ هەزاران ساڵ پێشووتر دەگەڕێتەوە.

شەشەم، لە دوا قۆناخی بە شان وەشەوکەوتی ئیمپراتۆرییەتەکانی بیزەنتی و ساسانیدا ژیاوە.

لەگەڵ چەندین بابەتی دیکەی لاوەکی دەتوانرێت چەندین بەرگە پەرتووک سەبارەت بەم بابەتە سەرەکیانە بنووسرێت. ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە، ئیسلام پێشکەوتنێکی **"پەرجوویەکی بیابان"** نییە، بەڵکو لە ئاکامی بەرهەمی هەلومەرجێکی مێژوویی و ماددی بەهێزەوە لە دایک بوو. بە ئەندازەی هێزەکەی لاوازییەکەشی گرێدراوی ئەم هەلومەرجانەیە. نە وەکو سۆمەری سەرەتا و نە رۆما سەنتێزی شارستانی نییە، لایەنی لە پێشی بزووتنەوەیەکی ئەخلاقی و باوەڕییە. خودی حەزرەتی محەمەد وەکو ئیبراهیم،

موسا و عیسا کەسایەتییەکی نادیار نییە. چەندین تایبەتمەندیتی دەناسریت. خودی **"قورئان"** کە پەیامەکەیەتی قەومیک، تیرە یان چینیکی تایبەت خیتاب ناکات، ئامانجی تەواوی مرۆڤایەتییە. ووشەی **"ئەللا"** کە زاراوەیەکە هەرە زیدە لە قورئاندا باس دەکریت، لە راستیدا پیویستە بابەتی سەرەکی کاردکانی تیۆلۆژی (ئیلاهیات) بیت. حەزرەتی محەمەد لەژیر کاریگەری قوولی ئەم زاراوەیەدایە. وەکو **"رەب"**ی واتا ئەفەندی تەواوی جیهان هەلیدەسەنگینیت. ئەم ووشەیە لە پەرتووکی پیرۆزدا زور باس دەکریت. ووشەی ئەللا کە زاراوەیەکی هیندە مەزنە، لە رووی کومەلناسییەود ئەو توانایەی هەیە کە ئیلاهیبوونی سروشت و ئیلاهیبوونی کومەلگا بکات بە یەک. ئەو ٩٩ سیفەتەی لەخۆوەی دەگریت گوزارشت لە کاریگەری یەکبوونی هیزەکانی کۆمەلگا و سروشت دەکات. ئەو بابەتانەی مەنسووبەکان خوازیارن وەکو **"یاسا و فەرمانی ئەبەدی"** تیبیگەن تا دوا رادە لیلە. بە ئەندازەی کاتیبوونی سیفەتە بە ریشە کومەلایەتییەکانی، هەموو دیمەنیکی سروشتیش بەهای یاسایی نییە، چونکە خودی یاساگەرایی ئەنجامیکی زیدەرۆیی ریساخوازی هۆزگەرایی یەهودییەکانە. بەردەوام لەناو کۆمەلگاکاندا قورسایی کۆمەلیک **"مەیل"** ددبیتە جیی باس. دواتر ئەم چەمکی ریساخوازییە لە کۆمەلگای ئیسلامدا ریگا لە پیش مەحافەزەکارییەکی توند دەکاتەوە. لەوانەیە لەناو تیرەدا بۆ تیپەرکردنی ئەنارشیزم یاساخوازی رەها لە رووی گەشەکردنی بە کۆمەلگابوونەوە سوود بەخش بوویت، بەلام کاتیک کارەکتەری خیرای پەرەسەندنی کۆمەلگا رەچاو بکریت، ئەوا لە خۆیەوە دەرک بە ترسناکی ئەم چەمکەی ئوممەت دەکریت.

باوەری پتەوی حەزرەتی محەمەد بە ئەللا هیزە میتافیزیکیەکەی دیاری دەکات. بەلانی کەم لە میانەی ناسینی هیزیکی لە خۆی بالاترەوە دووچاری نەخۆشی بە خوداوەند بوون نایە کە لە سۆمەرەوە تا دەگاتە رۆما ئاشنای بووین. کاتیک لەگەل ئەم شەرە مەزنە بەراوردی بکەین کە لەپیناو ئیلاهیبوونی عیسا هاتە

ئاراوە، ددبینین کە هەلویستی حەزرەتی محەمەد لە پێشترە. بەلام تێپەڕ نەکردنی ووشکایی ئایینی موسەوی لایەنی نەرێنییەتی. باجە قورسەکەشی لە پێکدادانی عەرەب ـ ئیسرائیلدا دەدرێت.

گفتوگۆی لە جۆری: لەو کۆمەڵگایەی حەزرەتی محەمەد ئاوایکرد کلتووری ماددی یان کلتووری ئایدیۆلۆژی کامەیان لەپێشتر بوون، گفتوگۆیەکی واتادارە. لە کاتێکدا لە باوەڕی کرستیانیدا فاکتەری ئەخلاقی دەرکەوتوتە پێش، بە بروای من لە باوەری ئیسلامدا هاوسەنگییەکی بەهێز ئاواکراود. هەرچەندە گەوهەردکەی ناتەواو و جێگای گفتوگۆ بێت، بەلام هاوسەنگی کلتووری ماددی و ئایدیۆلۆژی دەشێت لایەنی بەهێزی ئیسلام بێت. بە تایبەتی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر کە دەلیت **"کار بۆ ئاخیرەت بکە هەر وەکو بلێی سبەینێ دەمریت، کار بۆ دونیاشت بکە هەر وەکو تا ئەبەد دەژی"** بە شێوەیەکی باش ئەم پێکهاتەیە روون دەکاتەوە. هەر وەکو دەزانرێت سیستەمەکانی رومای کلاسیک، بیزدنت، ساسانی، تەنانەت نەمرود و فیرعەونەکانیشی نەخواستووە و بە توندی رەخنەی کردوون. لەم لایەنەوە رەخنەگرێکی بەهێزی شارستانییە. بەلام هەم هەلومەرجە ماددییەکانی ئەو سەردەمە هەم توانا ئایدیۆلۆژییەکەی تێری روونکردنەوەی چەمکەکەی ناکات دەرهەق بە **"شار"**. لە سۆسیالیستەکانی رۆژگاری ئەمڕۆمان دەچێت کە ناتوانن ئەلتەرناتیف پێش بخەن. بەلام بانگەوازە بەهێزەکانی بۆ ئەخلاق پیشانیدەدات کە تەواو هەستی بە نەخۆشییەکانی کۆمەڵگای شارستانی کردووە. لەم لایەنەوە ریفۆرمخوازێکی بەهێزە، تەنانەت شۆڕشگێڕە. ئەو کۆمەڵگایە ناناسێت کە ئەخلاق تێیدا زاڵ نییە. ئەو رێسایانەی دەرهەق بە قازانجی سەرمایە داینaوە، پیشانیدەدات کە بەربەستە لە پێش گەشەکردنی دۆخی نەخۆشی کۆمەڵگای سەرمایەداری. دەتوانین بلێین کە پێکهاتەی (باوەڕیەکەی) حەزرەتی محەمەد لە سەرەتادا سەبارەت بەم بابەتانە لە کرستیانی و یەهودی لەپێشترە. مەیلی ئەو بۆ دژایەتیکردنی کۆیلایەتی

دەزانرێت. تا دوارادە میهرەبانە و لایەنگری ئازاد کردنیانە. لەگەڵ ئەوەی هەڵوێستی بەرامبەر بە ژن دوور لە ئازادی و یەکسانییە، بەڵام نەفرەت لە کۆیلایەتییە قووڵەکەشی دەکات. ئەو ئەنجامەی لە هەبوونی چەندین ژن و کەنیزەک پێی دەگەین، هەردوو مەیلیش لە خۆوە دەگرێت. دان بە موڵکایەتی و جیاوازی چینایەتی ناو کومەڵگادا دەنێت، بەڵام تەواو وەکو سۆسیال ـ دیموکراتەکان لە ڕێگای باجی زۆرەوە هەوڵی بەربەست کردنی پاوانخوازی و هەیمەنەی کومەلایەتی دەدات.

لە میانەی ئەم کورتە باسەی ئاماژەمان پێکرد دڵنیایانە دەتوانین بڵێین کە حەزرەتی محەمەد و ئیسلام زەور شارەزایانە نە لایەنگری کلتووری ماددی ناهاوسەنگ بوو و نە خوازیار بوو وەکو کلتوورێکی ئایدیۆلۆژی ووشک بمێنیتەوە. ئەم لایەنەی زۆر بە باشی ڕوونی دەکاتەوە کە بۆچی بەرامبەر بە هێزەکانی شارستانی و پێکهاتە کلتووره ـ ئایدیۆلۆژییەکانی دیکە بە هێز بووە. جگە لە ڕاهیبەکانی سۆمەر و میسر لەوانەیە هیچ بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی بە ئەندازەی ئیسلام کارامەیی و لێهاتوویی بەردەوامی یەکێتی کلتووری ماددی و ئایدیۆلۆژی پیشان نەدابێت. ئەگەر تا ڕۆژی ئەمڕۆشمان باس لە بەهێزبوونی ئیسلامی سیاسی و ڕادیکاڵ دەکرێت، ناچارین بە باشی دەرک بەم تایبەتمەندییەی پێکهاتەکەی بکەین.

دووبارە شرۆڤە کردنی پێشکەوتن و وەرچەرخانی کلتووری ئایدیۆلۆژی و ماددی دوای هەرەسهێنانی ئیمپراتۆریەتی ساسانی و ڕۆما سوودبەخش دەبێت.

سیستەمی چوارهەزار ساڵەی کۆیلەداری لەگەڵ ئەو خراپەکارییە قووڵەی دووچاری ویژدانی مرۆڤایەتی و ئەخلاقەکەی کرد، بۆشاییەکی گەورەشی دروستکرد، هەڵبەتە لە دەرئەنجامی هەرەس هێنانیشدا دەبینرێت کە ئەو ڕێکخستنە حقوقیانەی ڕۆماش پێشیخست بۆشاییەکانی پڕ نەکردەوە. ئاشکرایە کە دونیای باوەڕیش بۆشاییەکی گەورەی لێکەوتەوە. ئەوەش ئاشکرا بووە

کە ئەو خوداوەندانەی چوار هەزار سالە هەوڵی باوەڕ پێهێنانی دەدەن، هیچ بەم جۆرە نین کە مەزندەی دەکەن. بتپەرستی پیرۆزی جارانی لە دەست دابوو. بانگەشە دەکرێت کە بە زەمانێک گەیشتوون باشترین پەیکەرەکانی چوپیتەریش تێیدا پارە ناکات. بونیادە ماددییە زەبەلاحەکان مرۆڤایەتییەکی رووخاوی لە دوای خۆی جێهێشتبوو.

شەڕە بەردەوامەکان ئاشتییان کردبوو بە یۆتۆپیایەک. دەتوانرێت بگووترێت کە قوناخ بریتی بوو لە ردوشێکی قەیران و کائیوس. لە کاتێکدا ریسا و شێوە کۆنەکانی ژیان بەهای خۆیان لە دەست دابوو، هی نوێش لە ئارادا نەبوون. هەموو کەسێک لە چاودروانی پەیامی رزگاریدا بوو. هەلومەرجەکان بیرۆکەی بەهەشت و دۆزەخیان دەهێنایە بەرچاو. بزووتنەوەی بێکاران و ئاپۆرای کۆیلە سەربەست کراوەکانی ناوەند و قەومە کوچبەرەکانی دەوروبەر چڕبووبووە. بە زەمینەیەکی مێژوویی گەیشتبوو، زەمینەیەکی نموونەیی کە پەیامی رزگاری بە باشی دەنگی دەدایەوە. کاتی بەرەبەیانی سەرهەڵدانی بزووتنەوە گەورەکانە. لەژێر ئەم هەلومەرجەدا پێویستی بە پەلە، ئەگەر بە زمانی ئەمڕۆمان بڵێین یۆتۆپیا و پڕۆگرامێکی نوێبوو. بزووتنەوە مەزنەکان دەشێت ئەنجامی یۆتۆپیا و پرۆگرامە مەزنەکان بێت. بە درێژایی مێژووی شارستانییەکانی پێشووتر پێویستی بە یۆتۆپیا و بەرنامەکانی رزگاری هەبووە. سەرجەم بزوتنەوەکانی رزگاری ناوخۆ و دەرەوە بەردەوام راچێتەیەکی یۆتۆپیا و بەرنامەی رزگارییان هەبوو. بەڵام وەک سیستەم قەیرانی بونیاد و رۆڵی ئەمجارەی کۆیلەداری زۆر قووڵ بوو. لەو پێگە و هەلومەرجە دەرچوو بوو لە میانەی سیستەمێکی نوێی کۆیلەدارییەوە بەرێوەبچێت.

لە سایەی ئەم جۆرە هەلومەرجانەدا لەگەڵ ویژدانی مرۆڤایەتی زهنییەتەکەشی لەناو تینوێتییەکی مەزندایە. کاتێک ئەو بونیادە ماددیانەی سیستەمیان لەسەر پێیان راگرتبوو بە ڕەوشێک

گەیشتن کە چیتر توانای بەردەوام بوونیان نەبێت، هەلومەرجەکان بۆ ئایینەکانی جیهان (پەیامەکانی رزگاری کە خیتابەتی ویژدان و زهنییەتی تەواوی مرۆڤایەتی دەکرد) تەواو رەخسا بوو. ئەگەر چاخی داهاتوو کۆیلەدارییەکی نوێ نەبێت ئەی شتێکی چۆن دەبێت، پرسێکی جێگای مەراق بووە.

زۆر شت لە بارەی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتییەوە گووتراوە. دەڵێن دوای سیستەمی کۆیلەداری کۆن هاتووە. بەلام هەمان جۆری ئەو میرنشینانەی پشتی پێ بەستبوون دەشێت ببرێتەوە بۆ سالانی ٤٠٠٠پ.ز. سەبارەت بە کۆشکەکانیشیان دەتوانرێت بگووترێت کە لە سالانی ٢٠٠٠پ.ز هی زور لەوە پتەوتر ئاواکراون. ئەو لادییی و خزمەتکارانەی لە دەوروبەریان بوون زۆربەیان پێشتریش لە هەموو شوێنێک پێکهێنراون. هەمیشە لە کاتی پەرتەوازەبوونی ئیمپراتورییەتەکان یاخود یەکێک لە پلەدارەکانی گروپێکی ئەتنیکیدا هەموو کەسێک توانیویەتی بە ئاسانی میرنشینی خۆی ئاوا بکات. دەوڵەتۆکە خاوەن بونیادە بچووکەکان کە دوای رۆما و ساسانییەکان ئاواکران جیاوازییەکی ئەوتۆیان لەگەڵ ئەوانەی پێشتر نەبووە. ئیمپراتۆریەتەکان جگە لە یەکیتی یان فیدراسیۆن یان کۆنفیدراسیۆنی ژمارەیەکی زۆر یان کەمی ئەمانە، بەولاوە شتێکی دیکە نەبووە. گوند و زهنییەتەکەیان جیاوازییەکی ئەوتۆیان لەگەڵ سالانی ٦٠٠٠پ.ز نەبووە کە نیولیتیک تێیدا بەدەزگابووە. هیچ گۆڕانکارییەک لە پەیوەندی نێوان ژن - پیاودا نەبۆتە جێگای باس. پەیوەندی نێوان سەپان و ئاغا هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ پەیوەندی نێوان سەردار و بەندەکانی قۆناخی کۆن نەبووە. مولکایەتی هەمان مولکایەتیی بووە.

لە ئامرازەکانی بەرهەمهێناندا رەوشێکی شۆڕشگێڕی لە ئارادانییە. بەفراوانی باسی پێکهاتەی بەڕێوەبەرایەتی و خوداوەندەکانمان کرد. لە حالەتێکی بەم جۆرەدا ئەو سیستەمە ماددیەی لە دوای سەدەکانی پێنجەم و شەشەمی زایینی بونیادنران دانانیان بە شارستانییەکی

نوێ ئاستەمە. چونکە بونیادی شارەکانی ئەوروپا بە هیچ جۆرێک بۆ شارستانییەکی نوێ تێر ناکەن. ئەو ئیمپراتۆریەتانەی ئاواکراون بەو جۆرە نییە کە بە شانوبالیدا هەڵدەدەن، جگە لە پاشماوەکانی رۆما شتێکی دیکە نیین. دەتوانرێت هەمان شت بۆ ئەوانەی رۆژهەلاتیش بگووترێت. ناوبردنیان بە پاشماوەکانی سیستەمی بەر لە سەرمایەداری بە گوێردی من واتادارترە. پاشماوە، وەکو خڵتەی ماڵ و گەڕەکەکانی وێرانەیەکە. هەرە زێدە لە رەستورەکردنی شیوەی کون بەولاوە تێپەڕ ناکەن. لەگەڵ ئەمەشدا نابێت نکوڵی لە بونیادە ماددییەکانی بەر لە سەرمایەداری بکرێت. دەشێت بونیادەکانی هەنگاونان بۆ سەرمایەداری جیاواز بێت. شارەکانی ئەوروپای دوای سەدەی دەیەم هەر وەکو بڵێی هەواڵی هاتنی سەرمایەدارییان رادەگەیاند. لە دوخێکی وەهادا گیرۆدە نەبوون بە زاراوەکانی "**دەرەبەگایەتی**" و "**چاخی ناوینی تاریکی**" دەشێت ئەزموون بەخش و فێرکەرتر بێت. شرۆڤەیەکی نزیک بە راستی: هەڵوەشانەوەی سیستەمی خوداوەندی دەمامکداری چوار هەزار ساڵی و کۆمەڵگایەکی کۆیلە کراوە لە چوارچێوەی "**درێژ ماوە**"دا. هێشتا هەڵوەشانەوەی سیستەمی نیولیتیک بەردەوامە. ئەوەی خوازیاری ئاماژە پێکردنیم، سیستەمەکانی درێژ ماوە دەشێت تەمەنی رووخانیشیان سەدان ساڵ بەردەوام بێت. دەشێت بەردەوام سەرلەنوێ بونیاد بنرێنەوە. ئەگەر ناچاری بێت دەشێت دوای پێنج ـ شەش سەدە بە سیستەمە درەنگ کەوتووەکان ناوببرێن.

تەواوی ئەم مەسەلانە سەبارەت بە ئیسلام و کرستیانی بە واتای چی دێت؟ یۆتۆپیاکانیان پڕە لە بەڵێنەکانی بەهەشت. باس لە سیستەمی بەختەوەری هەزار ساڵیش دەکرێت. ئەمە بەشێکی هەر یۆتۆپیایەک پێکدێنێت. "**بەڵێنی بەهەشت**" بەردەوام تامەزرۆیی مرۆڤی بیابانی گڕگرتوو بۆ "**مێرگ**" بەبیر مرۆڤ دێنێتەوە. بەرامبەرەکەی ژیانی چۆلەوانییە. پێغەمبەرایەتیش سەبارەت بەو جڤاتانەی خیتابیان دەکات دەشێت بەڵێنی رۆژانی پڕ لە ئومێد و

ئاییندە بدات. ئەوەی وەکو بەهەشت کراوە بە یۆتۆپیای داهاتوو جگە لە گەڕان بە شوێن دونیایەکی نوێدا شتێکی دیکە نییە. لەلایەکی دیکەشەوە دەبێت حەشارگەیەکی ئەو کەسانە بێت کە مەحکومی لە سێدارەدانن و لە چوارلاوە جیهانیان لێ تاریک کراوە، یاخود ئومێدی رزگارییان نییە لە ناچارییەوە ئاوایان کردووە. بەر لە سێدارەدانی پەیوەندی سەددام بە قورئانەوە ئەزموون بەخشە. قورئان هێزی لە سنووربەدەری زهنییە لە رووی ئاوا کردنەوە لەکاتی ژیانی قۆناخەکانی لەسێدارەداندا. ئافراندنی هیوایە دوای ئەو دۆخەی کە هیچ چارەیەکی دیکە نەماوە. تا هەلومەرجەکانی کۆیلایەتی بە تەواوی نەزانرێت پەیامی پەرتووکە پیرۆزەکان بە شێوەیەکی راست شرۆڤە ناکرێت. ئەگەر کارەکتەری میتافیزیکی مرۆڤ پشتگوێ نەخرێت، ئەوا ناچارە بە بەهەشت ـ دۆزەخیشەوە چەندین یۆتۆپیای دیکەش دابهێنێت. واقیعی مرۆڤ ئەمە دەکات بە پێویستی. لە رەوشێکی پێچەوانەدا هەر وەکو چۆن ژیان ئاسان بەدینایەت، لە هەمان کاتدا رێگای ژیانی جوانیش ناکرێتەوە.

دەبێت ئاماژە بەم خالەش بکەم: خودی ترس لە مردنیش کۆمەڵایەتییە. ئەویش یان ئاوا کراوە، یاخود لەلایەن کەسانێکەوە بە ناچاری دروستکراوە. هەر بۆیە ئەو ترسەی لە بەرامبەر مردن ئافرێنراوە دەشێت لە میانەی بونیادێکی کۆمەڵایەتی نوێوە لە ئارادا نەهێڵدرێت. تەنانەت لەوانەیە باشترین و جوانترین دۆخی ژیان لە مردن دەربهێنرێت. ئەو مردنەی لە سروشتدا هەیە هیچ کاتێک ئەو مەرگە کۆمەلاتییە نییە کە لە کۆمەڵگای مرۆڤدا هەیە. چونکە ئێش و خەمگینی مەرگی کۆمەڵایەتی پێچەوانەی راستینەی مردنی سروشتی دەکەوێتەوە. چونکە مردن نەبێت، شتێکیش بەناوی ژیانەوە بوونی نابێت. لەم سۆنگەوە بەهادارترین ژیان ئەو ژیانەیە کە بە هۆشیاری مردن گەیشتووە، یاخود نەمرییە.

یۆتۆپیاکانی ئیسلام و کرستیانی بۆ رزگاربوون لە کۆیلایەتی جێگای سەرنج بوون. بەلام روون نەبوو سەبارەت بە چۆنییەتی چ

ئەنجامێکی لێ چاوەڕوان دەکرێت، هیچ روونییەک لە ئارادا نەبوو.
لە میانەی گووتەی **"ژیانێکی وەک بەهەشت"**ەوە وێڵیان کردووە.
پیشاندانی گروپەکانی دێرو قوتابخانەکان وەکو نموونە سەبارەت
بەو کۆمەڵگا نوێیەی ئاوا بکرایە دەشێت کەمێک روونکەرەوە بێت.
قوتابخانە، دێر، تەریقەت و مەزهەبەکان بەرنامە و هەوڵەکانی
ئاواکردنی کۆمەڵگای نوێیە. هەردوو ئایینیش بە بەرفراوانی
تاقیکراوەتەوە، تاکو ئێستاش تاقیدەکرێتەوە. دوو هەزار، هەزار و پێنج
سەد ساڵ بەردەوامبوونی ئەم لێگەڕینانە نابێت سەرسامان بکەن.
لەلایەکی ترەوە گەورەکانی کڵێسای کرستیانی و فەرماندارەکانی
فەتحی ئیسلامی سیستەمێکی کۆیلایەتی درەنگ وەختی ریڤیزە
کراویان خولقاند. ئەگەر سەرنج بدرێت دەبینرێت کە ئەم سیستەمە
درەنگ وەختانەی کۆیلایەتی شوێنی حەوانەوەی کاروان سەراکانی
فەتحن. سیستەمێکی هەمیشەیی و ژیانی تەواوی کۆمەڵگا نییە.
ناوبردنی بە شارستانی ئیسلامی و کرستیانی دەبێتە ناچاری.
کاری ئەم یۆتۆپیایانە خولقاندنی شارستانی نییە، رزگارکردنی ژیان
و جوان کردنێتی. کەواتە سیستەمی ئەخلاق و باوەڕی هەردوو
ئایینەکە سەبارەت بە پرسیاری شارستانی بێبەرییە لە وەڵامێکی
دوور لە رارایی. لە بەلاوەنانی سیستەمی چوار هەزار ساڵی
رۆڵێکی دیاریکەریان هەبوو. هەندێک رژێمی کۆیلایەتی کە بەناوی
ئەم ئایینانەوە ریڤیزە کران، هەم بە شێوەی میرنشینی و شار، هەم
بە شێوەی ئیمپراتۆریەت ئاواکراون. بەڵام ئەوانە بە شارستانی
کرستیانی و ئیسلامی لەقەڵەم نادرێن. دەتوانرێت بگووترێت هەبێت
و نەبێت دۆخی چەواشەکراوی ئایینە لە رووی ئایدیۆلۆژییەوە.
نە پاپا دەتوانێت لە کڵێسا بێتە دەری و لە کۆشکی ئیمپراتۆریتیدا
دابنیشێت، نە ئیمامیش دەتوانێت لە مزگەوت بێتە دەری و ببێتە
سەرۆکی دەوڵەت. هەڵبەتە ئایین بەردەوام ئەندامە بە دەوڵەت
بووەکانی بە لادەر و نامۆ ناو بردووە. ئاگاداری ئەو بانگەوازیشیان
بە بەڕێوەبەرانی دەوڵەت داوە کە گوێڕایەڵی پێویستییەکانی ئایین

بن. لەبەرئەوەی بەم جۆرەن تا ئیستا دریژە بە هەبوونی خۆیان دەدەن. بەلام بە شیوەیەکی بیکاریگەر و بێ ئومیدانە.

ماکس ویبەر لە بارەی شارستانی سەرمایەدارییەوە دەلێت: **"ئەو شارستانییەی ئەفسوونی خۆی لەدەستداوە"** هەلبەتە لە سیستەمیکی هەرە پیشکەوتووی کلتووری ماددیدا ژیانیکی مەزن مەیسەر نابیت. ژیانی ئەفسوونی دەشیت لە دونیای کلتووری ئایدیۆلۆژیدا بەدی بیت. ئیسلام و کرستیان و کلتووره هاوشیوەکانیان ئەو بەهرەیەیان نییە دونیای ژیانی سەرمایەداری بکەن بە ئەفسوونی. تەنیا بەهرە و هیزی کۆمەلناسییەکی ئازادی دەتوانیت ئەمە بکات کە تەواوی میراسی کلتووری ئایدیۆلۆژی کردبیتە پشتیوانی خۆی. سەبارەت بەم بابەتە لە بەشی پەیوەندیداردا هەولی قوولکردنەوەی دەدەین. ئەو راستییە دەسەلمینین کە خودی ژیان گەورەترین بەهای ئەفسوونییە. دروشمی نوێ **"یان سەرمایەداری یان سۆسیالیزم"** نییە، بەلکو دەبیت **"یان سەرمایەداری یان ژیانی ئازاد"**بیت.

ئەو کاتە بە شیوەیەکی ئاسانتر دەتوانریت وەلامی پرسیاری **"بۆچی شارستانی سەرمایەداری؟"** بدریتەوە. لە میانەی کۆتایی هینانەوە بەو ئیمپراتۆرییەتە زەبەلاحانەی سەرماداریيان بەربەست دەکرد، هەروەها لە ئەنجامی شارستانی نەکردنی پیکهاتەکەیان (ئایینەکەیان) ئەگەر بە مەبەست بیت یان بێ مەبەست تارادەیەک زەمینەیان بۆ سەرمایەداری خۆشکرد. والرشتاین کاتیک دەلێت: **"ئیمپراتۆرەکان لەگەل سەرمایەداریدا ناکۆکن"** تیروانینیکی بەهیز دەخاتە روو. ماکس ویبەر لە پەرتووکی **"رۆحی پرۆتستانتی"**[1]دا باشتر روونی دەکاتەوە کە چۆن ریگا لە پیش سەرمایەداری کراوەتەوە.

کەواتە ئایا ریگە چارەیەکی بە بێ شارستانی دەکرا و گونجاو بوو؟ وەلامی ئەم پرسیارە، گەرانەوە بۆ شتیکی لە جۆری نیولیتیک

١. پرۆتستانت: یەکێک لە مەزهەبەکانی ئایینی کرستیانییە. شوێنکەوتووەکانی زیاتر لە باکوری ئەوروپا، ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئوستریالیان. لەلایەن مارتن لۆتەر لە ئەلمانیا دامەزرێنراوە.لە سەدەی شازدەهەم پرۆتستانتی لە مەزهەبی کاسۆلیکی جیابۆتەوە، چەندین لقی کلێسای لێکەوتۆتەوە. وشەی پرۆتستانت بە واتای نارازییەکان دێت.

دەبوو. لەبەرئەوەی نەدەبوو شاکارەکان لەبەین ببرێن، بازرگانی بەربەست نە دەکرا. نە دەکرا بۆ کۆمەڵگای پیاوسالاریش بەجێ بهێڵدرێت. چەندە رەخنەش بکرێت بەڵام لەو هەلومەرجانەدا دەوڵەت کۆتایی پێنەدەهێنرا. بێگومان ژیانی دێر، قوتابخانە، تەریقەت و سۆفیگەرایی ئەنجامی ئەم بێچارەییەن. کاریگەری تێکدەر و خراپەکارانەی ئەم ریزبەندە ئاماژە پێکراوەیان دەبینی و خوازیاری رزگاربوون بوون. ئەو رێگە چارانەی دەیان دۆزیەوە مارژینالّ بوون. لەبەر ئەم هۆکارانەش زەمینەیان بە کراوەیی دەهێشتەوە بۆ پێکهاتەی شارستانییەکی نوێ.

لەم نێوەندەدا جارێکی دیکە سەیر کردنی چیرۆکی هۆزی عیبرانی ئەزموون بەخش دەبێت. یەهودییەکان پسپۆری بابەتی بازرگانی و دراو بوون. هەروەها هێزی نووسینیشیان مسۆگەر بوو. لە سەردەمی روما و پارس ـ ساسانییەکاندا لە تەواوی جیهانی ئەو قۆناخەدا بڵاوببوونەوە. هێزی تەشەنە کردنی دراو و بازرگانی بەهێز بوو. وەکو رۆحی شارستانی ماددی بوون. راستتر هێزی پاڵاوتەی بوون. نووسەرەکان جێگای ئەو پێغەمبەرانەیان گرتبوو کە باشترین هەواڵنێری رابردوو و داهاتوو بوون. سەرەکیترین مەرجەکانی پێشینەی سیستەمێکی نوێی شارستانی یاخود سەرمایەداری بوون. هەڵبەتە مۆرکیان لە یۆتۆپیاکاندا هەبوو. ئایین و خوداوەندیش گۆرەپانی پسپۆرییان بوو.

کرستیانی لە سەردەمی کلتووری ئایدیۆلۆژی خۆیدا تەواوی ئەوروپای فەتح کردبوو. بە شێوەیەکی سنووردار بەرەو ئاسیا رۆشتبوو. لە شوێن پەنجەی شارستانی ئەفریقیاشدا بەردەوام هەن. ئیسلام بە شێوەیەکی خێرا لە تەواوی عەرەبستان تا باکووری ئەفریقیا و ئاسیای ناوین درێژەی بە فەتح دابوو. تەواوی ناوچەکانی شارستانی کۆن فەتحکرابوون، گۆرەپانە نوێیەکانیش تەقلی ئیمپراتۆریەتی کلتووری ئایدیۆلۆژی ببوون. بەڵام ئەوەی روویدا بوو بەرفراوانبوونی شارستانی نەبوو. دەشێت بە پێشکەوتنی

جیهانی مەعنەوی بە ناو بکریت. کاتێک کرستیانی دەیگووت: **"دەوڵەتی هەزار ساڵەی خوداوەند"** مەبەستی ئەم راستینە بوو.

بنەمای زانستی هەردوو یۆتۆپیای کرستیانی وئیسلامی زۆر لاوازە. لایەنی ئەخلاقییان بەهێزە. فەلسەفەی کلاسیکی یۆنان کاری تێکردوون. رۆڵیان لە دووبارە زیندووکردنەوەیاندا بینیوە. تیۆلۆژییەکەیان سەرچاوەی بۆ ئەرستۆ و ئەفلاتوون دەگەڕێتەوە. بەشێکیشیان لە تیۆلۆژی سۆمەر و میسر وەرگرتووە. سەبارەت بە یوتۆپیای ئازادی لە پێگەیەکی دواکەوتوودان. جارێکی دیکە ئاماژەی پی بکەین ئەوەی بۆ ئایینەکان گرنگە ئەخلاقە. هەر وەکو مەزەندە دەکرێت تیۆلۆژی بابەتێکی سەرەکی نییە. لەبەرئەوەی ئەخلاق گرنگی خۆی لە دەست نەداوە، باوەڕییەکانی لە جۆری کرستیانی و ئیسلام بایەخی خۆیان دەپاراست. سەبارەت بە شوێنیان لە کۆمەڵناسی ئازادیدا دواتر باسی دەکەین.

یۆتۆپیاکان بەردەوام بێ کەموکوڕی نین. زۆر جار خزمەت بە پێچەوانەی ئامانجەکانیشیان دەکەن. یۆتۆپیای ئیسلام و کرستیانی کەمێک لە دەرەوەی ئامانجەکەیان خزمەتیان بە سەرهەڵدانی سەرمایەداری کرد. بەڵام ئەمەش راستییەکە شەڕێکی زۆریان بەرامبەر بە سەرمایەداری کرد. لە بەشی سەرمایەداری جارێکی دیکە ئاماژەی پێدەکەین.

ئەوەی بە تایبەت سەبارەت بە ئیسلام بگووترێت ئەوەیە کە: بە شێوەیەکی ناهەقانە بۆ ئەرستۆکراتەکانی تیرە دەسەڵاتدار و بەربەرەکان ریگای زەوتکردنی کلتوور و گۆڕەپانێکی بێ سنووری خۆشکردووە. زۆر جار دەگووترێت کە کرستیانی دواخستووە. ئەمانە بابەتگەلێکن بۆ هەر ئایینێک لە جێگای خۆیدایە. خۆی لە خۆیدا هەڵسەنگاندنی پێکدادانی ئیسلامی بە دەوڵەت بوو و کرستیانی بە دەوڵەت بوو وەکو شەڕی نێوان ئیسلام و کرستیان تەواو راستی ناخاتە ڕوو. باش دەزانین کە ئەم پێکدادانانە لە ریشەدا لە نێوان خودی شارستانیدایە و ئایینیش وەکو دەمامکێک بەکاردێنن.

وەکو ئەنجام، بە گشتی کلتووری ئایدیۆلۆژی ـ کلتووری ماددی بابەتی بەگرفتن. بەڵام راستییەکیشن. پێویستی بە لێتوێژینەوە هەیە. پێکدادانەکانی نێوان کۆیلە ـ کۆیلەدار، جووتیار ـ ئاغا رۆڵیان لە گۆڕینی مێژوودا سنووردار و ناراستەوخۆیە. رەوڕەوەکانی مێژوو بە جۆرێکی دیکە دەسووڕێتەوە. لێکۆڵینەوە لەم بارەیەوە دەکەین. ئەوەی ئەنجامگمان داوە لێکۆڵینەوەیەکی قەبەو نا شارەزایانەیە. بەڵام هەم بۆ تێگەیشتنێکی راستی مێژوو، هەم بۆ وەڵامدانەوەی پرسەکانی رۆژی ئەمڕومان کار و خەباتێکی پێویستن.

تا نرخاندنێکی کورت سەبارەت بە قەومەکان نەکەین کە لقێکی دیکەی بەرخودانن ناتوانین بە شێوەیەکی سەرتاپاگیری راوەستە سەبارەت بە بابەتەکە بکەین. لە دوا قۆناخەکانی شارستانی کۆیلەداریدا، لە باکووری ئەورووپا گۆت و هونەکان، لە رێگای عەرەبستانیشەوە عەرەبەکان لە میانەی تەکتیکی بەرگری و هێرشکردنەوە هەڵمەتی یەک بەدوای یەکیان ئەنجام دەدا. بەرخودان، هێرش یاخود کۆچی قەومەکانی بەر لە شارستانی کە لە دۆخی کۆمەڵگای باوکسالاریدا بوون، پلەداری تیرە لەناویاندا پێشکەوتبوو و تەنانەت کۆمەڵگای بەربەریان پێدەڵێن جۆرێک لە بزووتنەوەی کلتووری ئایدیۆلۆژیین. بە جۆش و خرۆشترن و خوێنی تازە لە خۆوە دەگرن. سەرباری ئەوەی یۆتۆپیاکەیان بە شێوەیەکی رێژەیی فاکتەرە یەکسانیخوازەکانی پاشماوەی نیولیتیک لە خۆوە دەگرێت، زیاتر لەناو هەوڵەکانی لاسایی کردنەوەی شارستانیدان. بە ئەندازەی ئایینەکان میتافیزیکییان پێش نەخستووە. زیاتر وەکو خوێنی تازە و سەربازە مووچەدارەکانی ئیمپراتۆریەتەکانن. بەڵام دیسان یەکێک لە هێزە هەڵسوڕێنەرەکانی مێژوون.

ئەگەر لێشاوی جەرمەن، تورک، مەغۆل، عەرەبەکان، پێشتریش لێشاوی هۆری، ئامۆری و ئیسکیتەکان نەبوایە، دیارە ئاراستەی مێژوو بە جۆرێکی دیکە دەبوو. لە کاتێکدا جەرمەن و عەرەبەکان هەردوو ئیمپراتۆریەتی رۆما دەڕووخێنن، تورک و مەغۆلەکان لە رووخانی ئێران و بیزەنتییەکاندا خاوەن رۆڵن. بەڵام ئەو کارەی

گەورەی تیرەکان کردوویانە یان تاجی ئیمپراتوری نوێیان لەسەر ناوە، یاخود جێگای خۆیان لەناو سوپاو بیرۆکراسییەکەیدا گرتووە. ئەوانەی دەمانەوە یان سەرلەنوێ تیرەیان ئاوا دەکردەوە، یاخود بە شێوەی ئەندامە پەراوێزکراوەکان لەژێرەوەی کۆمەڵگا بە شێوەیەکی مارژینال دەژیان. رۆڵی ئەم دوو هێزە ناوخۆیی و دەرەکییە لە رووخانی سیستەمی کۆیلەداریدا راستییەکی حاشا هەڵنەگرە، بەڵام بە هەمان ئاست ئەڵتەرناتیف پێشکەش ناکەن و لە ئاواکردنی نوێدا رۆڵ نابینن. دەڕووخێنن، تاڵان دەکەن، بەڵام ئاواناکەن و ناتوانن بپارێزن.

ئەم کارەی تاکو ئێرەمان هێنا و دەتوانین بە لێکۆڵینەوەش ناوی ببەین، لە راستیدا لە رێگایەوە هەوڵی دارشتنی بناخەی مودێرنیتەی سەرمایەداریمان دا. هەوڵماندا پیشانی بدەین کە مودێرنیتەی سەرمایەداری بەرهەمی کامە پەرەسەندنی مێژووییە. بە بێ مێژوو خۆ پێشکەش کردن یەکێک لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی پێکهاتەی زانست ـ دەسەڵاتی سەرمایەدارییە. بۆ بانگەشەی سیستەمی دوایی و ئەبەدی، بێ مێژوویی و بێ شوێنی (بێ جوگرافیایی) گرنگە. لە نەبوونی شوێن ـ زەماندا شیکاری سەرسوڕهێنەر و وردەکارانە دەکەن. سەبارەت بە میکرۆ مێژوو و پێشکەوتنی هەنووکەیی رووداوەکان خاوەن کار و خەباتێکی بێ ژمارن. هەروەها لە میانەی تەنگ پێ هەڵچنینی کات ـ شوێنەوە، هەر وەکو بڵێی خوازیارن کاریگەری کات و شوێن نەهێڵن. لە میانەی ئەو کارەی ئەنجامدان دا، پیشانمان دا کە جیا لەوەی ئەم هەوڵانە خوازیاری بوون، لێشاوی کۆمەڵگا لە میانەی کۆششێکی سەرسوڕهێنەرانەی مرۆڤەوە بەردەوام لە دۆخی سوڕانەوە دایە. بەم بۆنەیەوە ئاماژەمان بەو راستییە کرد کە راکردن لە مێژوو مەحاڵە، هەرچەندە سەرمایەداری خۆی بە کۆتایی مێژوو لە قەڵەم بدات، بەڵام چەندین هێزی دیکەی شارستانیش هەمان بانگەشەیان بۆ سەردەمی خۆشیان کردووە. بۆ سەرهەڵدانی سەرمایەداری هەموو شتێک وەکو پێویست لە ئامادەباشیدایە. هەرچەندە دووبارەش بێت بەڵام وەکو شارستانییەک پێناسە و هەلومەرجەکانی دەرکەوتنی دیسان روون دەکەینەوە. بە تایبەتی ئاماژە بە کۆمەکەکان (رۆڵ)ی خۆی و ئەو

لایەنانە دەکەین کە لە شارستانییەکانی دیکەی وەرگرتووە.

دەشێت ئەم بەشەی بەرگرینامەکەم وەکو تێزێکی بنەڕەتی بەم جۆرە روون بکەمەوە: سیستەمی شارستانی دەوڵەتی کە لەسەر بنەمای بەناویەکداچوونی پێکهاتەی چین، شار و دەوڵەت سەریهەڵدا و تا دواچاخی سەرمایەداری، واتا سەردەمی فینانس بەردەوام لە میانەی زۆر بوونەوە خۆی پێشخست، زیاتر پشت بە چەوساندنەوە و فشار خستنە سەر کۆمەڵگای گوند و کشتوکاڵ دەبەستێت. رەنجدەرانی شاریش کە بە پێی بەسەرچوونی کات چەندەی دەچێت فراوان دەبن، رادەکێشیتە ناو سیستەمە پڕ فشار و چەوسانەوەکەیەوە. شارستانی دەوڵەتی پێنج هەزار ساڵە کە پشت بە شوێن و زەمانێکی درێژ دەبەستێت و نەیتوانییوە لە رووی ئایدیۆلۆژی، سەربازی، سیاسی و ئابوورییەوە خۆی لە دۆخی پارچەیی رزگار بکات، هۆکاری سەرەکی تا ئێستا مانەوەی بەرامبەر شارستانێتی دیموکراتی بۆ هەیمەنەی ئایدیۆلۆژی دەگەڕێتەوە. سیستەمەکانی توند و تیژی و ستەمکاری تەنیا لە رێی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژییەوە توانیویانە سەرکەوتن بەدەست بێنن. ناکۆکی سەرەکی تەنیا چینایەتی نییە، بەڵکو لە ئاستی شارستانیدایە. ئەو ململانێ مێژووییە پێنج هەزار ساڵەیەی بە نووسراویش هەیە، لە بنەڕەتدا لە نێوان شارستانی دەوڵەتی (لە بنەڕەتدا پشت بە شار، جیاوازی چینایەتی و دەوڵەت دەبەستێت) و شارستانێتی دیموکراتی بە دەوڵەت نەبوودایە، کە قەدە سەرەکییەکەی کۆمەڵگای گوند و کشتوکاڵە و لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا رەنجدەرانی شاریش لە پێکهاتنی ناوەڕۆکەکەیدا جێدەگرن. تەواوی پەیوەندی، ناکۆکی و ململانێ ئایدیۆلۆژی، سەربازی، سیاسی و ئابوورییەکانی ناو کۆمەڵگا، لەژێر سایەی ئەم دوو سیستەمە بنەڕەتییەی ژێاردا روودەدەن.

بەشەکانی دیکەی بەرگرینامەکەم بە شێوەی شیکار کردنی ئەم تێزە بنەڕەتییە و پراکتیزەکردنی لە واقیعی رۆژهەڵاتی ناوین و کوردستاندا پێشدەخرێت.

## فەرھەنگۆک

ئاکتیف کارا، چالاک
ئانترۆپۆلۆژی مرۆڤناسی
ئانسترومان ئامێری مۆسیقی
ئانیمیزم رۆحگەرایی
ئەوەنتاژ شیاوی، خاڵی
ئایدیالیزم نموونەگەرایی، (مپالیە)
ئەبستراکت نابەرجەستە (مجرد)
ئەبستمۆلۆژی زانیناسی، سیستەمی پەیرەو و گەیشتن بە زانیاری
ئەتیمۆلۆژی وشەناسی
ئەتنۆلۆژی نەژادناسی
ئەدرەس ناونیشان
ئەزبەرە دەرخکراو، لەبەرکراو
ئەرستۆکراسی خانەدانی، بەڕێوەبەرایەتی کەسانی دەوڵەمەند و ژوورین
ئەسترۆنۆمی ئەستێرە ناسی، گەردوون ناسی
ئەڵتەرناتیف (بدیل)
ئەماتۆر نا شارەزا، نا وەستا
ئەنالیز لێکدانەوە، شیکردنەوە
ئێندوستریالیزم پیشەسازیبوون، پیشەسازی خوازی، پیشەسازی پەرستی
ئەیالەت هەرێم
ئۆپۆرتۆنیزم هەلپەرستی
ئۆپۆزسیۆن (معارضة)، رکابەر
ئۆرجین رەسەن
ئۆرگانی سروشتی
ئۆرگانیزاسیۆن رێکخراو، رێکخستن
ئۆنتۆلۆژی بوونخوازی
ئێکۆنۆمی ئابووری

ئیکۆنۆمیزم ئابووری خوازی، ئابووری پەرستی
ئیکۆلۆژی سروشت پارێزی، ژینگە پارێزی
بایۆلۆژی زیندەوەرزانی
بەرخودان (مقاومة)
جڤات کۆمەڵ، مۆڵبوون
تابلێت تاتە قوڕینەکان کە نووسینیان لەسەر کراوە
تاکخودایی یەکتاپەرستی
تەرز شێواز، (اسلوب)
تراژیدیا مەرگەسات
تیۆلۆژی (إلاهیات)
پارادیگما پارادایم، جیهانبینی
پارۆمەترە پێوەر، پێوان
پاسیف نا کارا، نا چالاک
پانتەییزم یەکگرتنی سروشت و خودا
پەرجوو (معجیزة)
پەسن ستایش، مەتح، وەسف
پراکتیزە کردن پێکهێنان، جێبەجێ کردن
پرەنسیپ (مبدأ)
پرۆتۆکۆڵ ڕێکەوتن نامە
پرۆفیشناڵ وەستا، شارەزا
پۆتانسیل ماتە ووزە، وزەی شاراوە
پۆزەتیف ئەرێنی
پۆزیسیۆن دۆخ، پێگە
چالاکوان هەڵسوڕاو
جیۆلۆجی زەوی ناسی
دەستاوێز سەنەد، بەڵگە
دەسپۆت سەرەڕۆ، ستەمکار
دەستپێک سەرەتا
دۆگماتیک قاڵبگیری، بیروشکی
دووالیزم دوانەیی، دووانەگەرایی
دیماگۆجیەت قسەی بێ کردار، چەنەبازی
دیمۆگرافی باری نیشەجێیی، جوگرافیای کلتووری

